# دیبلۆماسییەتی کورد لە سەردەمی بوەیهییەکاندا

## (٣٣٤ – ٤٤٧ ك / ٩٤٥ – ١٠٥٥ز)

د. ئاراس فەریق زەینەڵ

سلێمانی

٢٠١٢

# دیبلۆماسییەتی کورد لە سەردەمی بوەیهییەکاندا


- نووسەر: د. ئاراس فەریق زەینەلْ
- بابەت: مێژوویی
- پیتچنی: نووسەر
- هەڵەچنی: چۆمان عادل
- نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
- نەخشەسازیی ناوەوە: چۆمان عادل
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵڵا
- قەبارەی کتێب: ۲۳×۲۳
- زنجیرەی گشتیی کتێب: (۸۹٤ )
- تیراژ : ( ۱۰۰۰ ) دانە
- چاپ: چاپخانەی کەمال
- نرخ: ( ۵۰۰۰) دینار
- ژمارەی سپاردنی (۲٦۰۷ )ی ساڵی ۲۰۱۲ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران
ژمارەی تەلەفۆن: ۳۳۰۱۹٤۹

پێشکەشە بە:

- دایك و باوکی شیرینم.

- (بەیان) هاوبەشی ژینم.

- گشت خوشك و براکانم.

- چاوە گەشەکانم (دیبە و ئەلەند و رەهەند).

## لیستی هێما و ناوە کورتکراوەکان

| | |
|---|---|
| سەرچاوەی پێشوو= | س. پ. |
| هەمان سەرچاوە= | هـ. س. |
| لاپەڕە= | ل. |
| بەرگ= | ب. |
| چاپ= | چـ. |
| زایینی= | ز. |
| کۆچی= | ك. |
| وەرگێڕ= | و. |
| ترجمة= | تر. |
| طبع= | گ. |
| دوکتۆر | د. |
| بێ ساڵی چاپ= | ب. س. |
| بێ شوێنی چاپ= | ب. ش. |
| الصفحة | ص |
| الصفحات | ص ص |
| الجزء | جـ |
| المجلد | مجـ |
| القسم | ق |
| تحقيق | تحـ |
| دون تاريخ | (د- ت) |

| | |
|---|---|
| دون مكان طبع | (د- م) |
| لاپەڕە | P |
| لاپەڕەکان | PP |
| چاپ | Ed |

# ناوەڕۆك

**تەوەری دووەم:**

# پێشەکی

سەردەمی دەسەڵاتی بوەیهییەکان (٣٣٤- ٤٤٧ك/ ٩٤٥- ١٠٥٥ز) گرنگترین قۆناغ بوو بۆ کورد لە مێژووی ئیسلامدا، چونکە کورد لە میانەی دامەزراندنی چەندین میرنشین لە نیشتمانەکەیاندا، وەك هێزێکی سیاسی و شارستانی دەرکەوت، ئەمە بەخاڵی وەرچەرخانێکی گرنگ دادەنرێت لە مێژووی کورددا بەجۆرێك ئەو نێوچانە ماڵئاواییان لە سەردەمی خەلیفەکانی عەبباسی کرد و پێشوازییان لە قۆناغێکی نوێی مێژوویی کرد کە خۆی لە سەرهەڵدانی چەند میرنشینێکی کوردیدا دەبینیەوە و خاوەنی سەروەری و دەسەڵاتی خۆیان بوون و سنووری دەسەڵاتیان زۆربەی نێوچە کوردییەکانی ئەو سەردەمەی گرتبووەوە کە سەربەخۆ بوون و خاوەن سەروەری و سوپاو ئابووری و پارە و کارگێڕیی خۆیان بوون، تەنانەت لەو ماوەیەدا میرنشینە کوردییەکان بوون بەیەکێك لەو هێزە سیاسیانەی کە بەهەند وەردەگیران و حسابی تایبەتیان بۆ دەکراو پێگەیەکی بەرچاویان لە نێو هێزەکانی دەوڵەتی ئیسلام لە نێوچەکەدا هەبوو، لەو سۆنگەیەوە دەبینین مەسەلەی پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی نێوان ئەو میرنشینانە و هێزەکانی دیکەی نێودەوڵەتی خیلافەتدا لە دەرەوە بایەخی تایبەتی خۆی هەبووە.

دڵسۆزی و ملکەچی میرنشینە کوردییەکان بۆ خیلافەتی عەبباسی جیاوازیان هەبوو، ئەویش بەپێی هێز و ڕادەی داکۆکیکردنیان لە مەسەلە گرنگەکانی گەل و نیشتیمان، وەك بەرەنگاربوونەوەی هێرشەکانی بیزەنتییەکان و دوژمنانی دیکە، لەبەرئەوە هێز و توانای میرنشینەکە دەیخاتە سەنگەری بەرگریکردن لە خیلافەت، لەکاتێکدا لاوازی و بێ توانایییان ڕەگەزێکە دەبێتە هۆی ڕاڕایی و پشێوی نێوان خیلافەتی عەبباسی و نێوان هێزە ناوچەییە نەیارەکانی، سەرهەڵدانی ئەو میرنشینانە بەشێکە لە ڕەنگدانەوەی ئەو ڕەوشە گشتیەی کە بارودۆخێکی بابەتیە و پەیوەستە بە

ڕووبەڕوو بوونەوەی دەوڵەتەوە.

ئەم هۆکارانەی سەرەوە، ڕەنگە کوردەکانی بەئاگا هێنابێتەوە لەوەی کە لەڕووی زمان و کلتوری نەتەوایەتیانەوە، لەچوارچێوەی کۆمەڵگەی ئیسلامدا کۆمەڵێکی جیاوازن، بەمەش ئەو تێڕوانینە ڕەویەوە کە دەیڕوانیە کورد وەك کۆمەڵێك، کەبەشێکی نا شارستانی بنوێنن لەو کۆمەڵانەی دەوروبەریان، لەبەرئەوە درووستبوونی ئەو میرنشینانە و گەشەکردنی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان، ڕەنگە فاکتەرێك بووبێت لە نەهێشتنی ئەو تێڕوانینە و پووچەڵکردنەوەی ئەو حوکمە ناڕەوایە، چونکە ئاشکرایە ئەو کوردانەی کە شانبەشانی گەلانی دەوروبەریان ژیاون، توانیویانە پارێزگاری لەتایبەتمەندییەکانی زمان و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و دیبلۆماسی خۆیان بکەن، جگە لەوەی ڕۆڵی بەرچاویان لە شارستانیەتی ئیسلامیدا بینیوە.

لەم ماوەیەشدا پێوەندی جۆراوجۆر لە نێوان بوەیهییەکان و میرە کوردەکان دامەزرا، ئەم لێکۆڵینەوەیەش هەوڵێکە بۆ بەدواداچوونی سیاسەت و پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی بوەیهیی و هێزە سیاسییەکانی نێوچەکە بەرامبەر بە کورد و میرنشینەکانیان جگە لەپێوەندییە بازرگانییەکان.

گرنگی ئەم توێژینەوەیە لەوەدا دەردەکەوێت، کە پەردە لەسەر قۆناغێکی گرنگ لەقۆناغەکانی مێژووی کورد لەسەدەکانی نێوەڕاستدا هەڵدەداتەوە، ئەم توێژینەوەیەمان هەڵبژارد، چونکە ئەم بابەتە تا ئێستە گرنگی خۆی لەدەست نەداوە و بێبەش بوو لە توێژینەوەیەکی ئەکادیمی تێرو تەسەل، هەرچەندە هەندێ توێژینەوەی ئەکادیمی دەربارەی مێژووی کورد لەسەردەمی عەبباسیدا، لەلایەن هەندێ لە توێژەرە پسپۆرەکانی ئەو بوارەوە پێشکەشکراون کە جێگەی دەست خۆشی ئەو بەڕێزانەیە، بەڵام دەربارەی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان لە مێژووی میرنشینە کوردییەکاندا تا ئەمڕۆش شاراوەیە، ئەگەر شتێکیش لەو بارەیەوە نووسرابێت پەرش و بڵاوبووە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی گشتگیر هەیە، پاڵنەرێکی دیکە بۆ هەڵبژاردنی بابەتی دیبلۆماسییەتی کوردی لەسەردەمی بوەیهییەکاندا، لەوەدا خۆ دەنوێنێ، کە کورد

لەماوەی سەرهەڵدانی بوەیهییەکان، لەمیرنشینی سەربەخۆ و نیمچە سەربەخۆ و دەسەڵات و حوکمی تایبەت بەخۆیان هەبووە لەسەر خاکی کوردستان، ئەمە جگە لە دروستبوونی پێوەندی سیاسی و دیبلۆماسی و ئابووری، کە شێوازێکی پێشکەوتووی بەخۆیەوە بینیوە لە گۆڕینەوەی باڵوێز و شاندی جۆراوجۆر.

دەبێ ئەوەش بڵێین، ئەو توێژینەوەیە هێندە ئاسان نیە و زەمینەش لەبەردەمدا تەخت و بێ کۆسپ نیە، گرفتێك کەڕوو بەڕوومان بۆوە، کەمی ئەو سەرچاوانە بوو کە دەربارەی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان لەسایەی دەسەڵاتی بوەیهییەکاندا نووسراون، چونکە زۆربەی هەرە زۆری ئەو سەرچاوانە زیاتر گرنگیان بەژیانی سیاسی و سەربازی داوە و شتێکی ئەوتۆ دەربارەی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان باس نەکراوە، هەوڵمان داوە هەرچی هەیە لێرەو لەوێ دەربارەی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان لە هەناو و دووتوێی کتێبەکاندا بیانهێنینە دەرێ و لێکۆڵینەوەی تەواویان لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازەکانی توێژینەوەی زانستیدا لەسەر بکەین، تا لە هزری خۆماندا ستراکتۆری دیبلۆماسی میرنشینە کوردییەکان دابڕێژین و توانیبێتمان وێنەیەکی دروست لەمەڕ ئەو بنیاتە لە توێژینەوەکەماندا پێشکەش بکەین.

لەم توێژینەوەیەدا بۆ گەیاندنی مەبەست و شیکردنەوەی بابەتەکان پشتمان بەڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بەستووە، لەهەمان کاتیشدا شیکردنەوەی هیچ بابەتێك پڕاوپڕ تەواو نابێت ئەگەر نەگەڕێتەوە بۆ ڕەگ و ڕیشەو بنەڕەتی بابەتەکە بە پشتبەستن بەڕێبازی شیکاری.

لێکۆڵینەوەکە پێکهاتووە لەپێشەکی و دەروازەیەك و دابەش کراوە بەسەر چوار بەشدا، کەخودی بەشەکانیش چەندین تەوەر و بڕگە لەخۆ دەگرن، سەرەتا پێشەکی و دەروازەیەك کە بریتیە لەتێڕوانینێکی گشتی لەسەر دیبلۆماسییەت و سەرەتایەك لە دیبلۆماسییەتی عەبباسی و بە کورتی زاراوە و پێناسە و مانای دیبلۆماسییەت.

بەشی یەکەم: باس لەبارودۆخی سیاسی نێوچەکە و کاریگەری لەسەر دروستبوونی

میرنشینه کوردییەکان کە خۆی لە سێ تەوەری سەرەکیدا دەبینێتەوە، وەك: بارودۆخی سیاسی و دارایی و پەشێویی بەڕێوەبردن و دەستبەسەرداگرتن و باڵا دەستی بیانی بەسەر خیلافەتی عەبباسیدا، هەروەها بەڕێوەبردنی هەرێمەکان و خواست و ئارەزووی تاکەکەسەکان بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی سیاسی، هاوکات سیستمی خێڵەکی لە نێو کوردەکاندا و کاریگەری لەو بارودۆخەی کە خیلافەتی عەبباسی پێدا تێدەپەڕی و قۆستنەوەی هەلی زێڕین بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتە سیاسییەکانی خۆیان لەسەر خاکی وڵاتی کورد.

**بەشی دووەم:** لەم بەشەدا کە لە دوو تەوەر پێکهاتووە، باس لە ڕەوشی سیاسی میرنشینە کوردییەکان و بوونی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان دەکەین بە پێشدەستییەك بە سروشتی شوێنی جوگرافی میرنشینە کوردییەکان و پێناسەیەکی نیشتیمانی کورد و دەستنیشانکردنی سنوورەکانی وەك سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، لەو ماوە مێژووییە کە لێکۆڵینەوەکە دەیخاتە ڕوو، هەروەها باس لە پێوەندییە دیبلۆماسیەکانی کورد دەکەین لەگەڵ خیلافەتی عەبباسی و دەسەڵاتی بوەیهیی و دەوڵەتی فاتمی و هێزەکانی دەوروبەر.

**بەشی سێیەم:** تەرخان کراوە بۆ دیبلۆماسییەت و بەرژەوەندیە بازرگانییەکان و جەنگ لە دوو تەوەرەدا باسمان لێوە کردووە، تەوەری یەکەمان تەرخان کردووە بۆ بەرژەوەندییە ئابوورییەکان و کاریگەری لەسەر پێوەندییە دیبلۆماسییەکان و گرنگیدانی کورد بە مامەڵەی بازرگانی لەگەڵ ڕۆمی بیزەنتیەدا و مامەڵەی بازرگانیکردنی کورد لەگەڵ هێزەکانی دیکەدا، هاوکات ئەو بەڵگانەی فراوانی ڕەهەندی ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەسەلمێنن، هەروەها لەتەوەری دووەمدا باس لە دیبلۆماسییەت و جەنگ وەك ئامرازی جێبەجێکردنی بەرژەوەندییەکانی ئابووری دەوڵەت بن، وەك گرنگترین سیماکانی سیاسەتی دەرەوەیە لە کۆمەڵگەکانی کۆن و

نێوەڕاستدا وەك یەك چارەسەركردنی كێشەكان بەڕێگەی ئاشتی و وە ئەمانەت و پەنابەری سیاسی و دیوانی داڕشتن و ڕۆڵی لەنامەكاری دیبلۆماسی هەروەها پڕۆژەی ژن و ژنخوازی سیاسی.

**بەشی چوارەم:** لەدوا بەشدا باس لە كۆتایی پێوەندییە دیبلۆماسییەكان دەكەین لەدوو تەوەردا وەك پچرانی پێوەندییە دیبلۆماسییەكان و هۆكارەكانی پچڕان و شوێنەوارەكانی پچڕانی پێوەندییە دیبلۆماسییەكان، و لەتەوەری دووەم باس لە شوێنەوارە ڕاستەوخۆكانی لەسەر لایەنە بەشەڕ هاتووەكان و شوێنەوارە ناڕاستەوخۆكان لەسەر وڵاتان و میرنشینە كوردییەكان، جگە لەسەر نێردراوەكان و ئەندامان و هاوكارانی.

لەكۆتاییدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بكەین، كەوا ڕەنگە دەسەڵاتە كوردییەكان هەموو ئەو مەرجانەی باسمان كردووە لەم دەسەڵاتانەدا هەبێت، بەڵام سەرچاوەكان ئاماژەیان بۆ زۆربەی ئەو مەرجانە نەكردووە، چونكە زیاتر باس لە ڕووداوی سیاسی و سەربازی دەكەن نەك دیبلۆماسی، بۆیە هەوڵمان داوە بەشێوەیەكی گشتی باس لەو جۆرە پێوەندییانە بكەین.

## شرۆڤەکردنی سەرچاوەکان

تاوتوێکردنی بابەتی مێژوویی پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی کورد پێویستی بە گەڕانەوە بۆ چەندین سەرچاوە و مامەڵەکردن لەگەڵیدا هەبوو لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیاریانەی توێژینەوەکە دەوڵەمەند دەکات.

بۆیە هەڵوەستەیەکمان کرد لەسەر چەندین سەرچاوەی جۆراوجۆر و کتێبی جوگرافیایی و گەریدەکان و کتێبی ژیاننامەکان، هەروەها هەندێ کتێبی وێژەیی و ئینسکلۆپیدیا و فەرهەنگی و زامانەوانی چەندین کتێبی دیکە، لێرەدا تیشك دەخەینە سەر سەرچاوە بنەڕەتیەکان و ئەوانی دی لە لیستی سەرچاوەکان، لە کۆتایی توێژینەوەکەدا ناویان دەهێنین.

### یەکەم: کتێبی مێژووە گشتیەکان

ئەم مێژووانە بەکورتی باس لە ڕووداوەکانی جیهان دەکات، ئەمەش ئەو سەرچاوانەیە کە تایبەتە بە ڕووداوە مێژوویەکان، هەندێکیان ڕێگەی ساڵانەیان گرتوەتە بەر لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا، و هەندێکی دیکەیان میتۆدی بابەتیان بەکارهێناوە لە نووسینەوەی مێژوودا و هەندێکیان ڕووداو و ژیاننامەیان تێکەڵ کردووە.

١- مێژوونووس مسکویە: (م٤٢١ك/١٠٣٠ز): کتێبی (تجارب الأمم)ە، ئەم کتێبە گرنگترین سەرچاوەی توێژینەوەیە، لەبەرئەوەی مێژوونووسەکەی شایەتی حاڵێکە لەسەر میرنشینی (حسنویە) تەنانەت خۆی بەشدار بووە لە هەندێ ڕووداوی تایبەت بەپێوەندی میرنشینەکە لەگەڵ بوەیهییەکاندا، مێژوونوس لێرەدا وردەکار بووە، هەندێ جار خۆی ڕووداوەکانی شرۆڤە کردووە و خستویەتیە ڕوو، ئەمەش لە گرنگترین

فاکتەرەکانی تێکەڵکردنی میتۆدی ساڵانە و میتۆدی بابەتیە لە تۆمارکردنی ڕووداوە مێژووییەکاندا.

**٢- مێژووی هلال الصابي:** (م٤٤٨ك/١٠٥٦ز): مێژووەکەی لە (٤٠) بەرگدا پێك دەهات کە گەیشتوەتە ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز)، تەنها بەشی (٨) گەیشتۆتە دەستی ئێمە، کە باس لە ڕووداوەکانی (٥) ساڵ دەکات (٣٨٩-٣٩٣ك/٩٩٨-١٠٠٢ز)، بەڵام لەگەڵ بچوکی قەبارەی و کورتی ئەو ماوە مێژوویەی ڕۆماڵی دەکات، ئەم سەرچاوەیە زانیاری مێژووی دەگمەنی تێدایە دەربارەی میرنشینی عەنازی و زانیاری وردەکاری تیایە لەسەر سیاسەتی میرنشینەکە لەگەڵ بوەیهیی و عقیلیەکاندا، هەروەها زانیاری و گرنگی تیایە دەربارەی پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی میرنشینی حسنویە لەگەڵ بوەیهییەکاندا.

**٣- ذيل تجارب الأمم:** نووسەرەکەی (الروذراوري) (م٤٨٨ك/١٠٩٥ز): کە پاشکۆی کتێبی (تجارب الأمم)، ئەزموونی میللەتانی مسکویە، کە ڕووداوی (٢٠) ساڵی تێدا تۆمارکراوە و لە ساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز) واتە ئەو ساڵەی کە مسکویە وەستا لە تۆمارکردنی تا ساڵی (٣٨٩ك/٩٩٨ز) کە (الروذراوري) درێژەی دا بەمێژووی (مسکویە)و لەسەر هەمان ڕێچکەی ئەو مێژووی نووسیەوە، کە بەدواداچوونی مێژوویی میرنشینی حسنویە و پەیوەندیان لەگەڵ بوەیهییەکاندا لەسەردەمی میر (بدر بن حسنويه)، هەروەها باس لەپەیوەندیان دەکات لەگەڵ خیلافەتی عەبباسی، هاوکات گرنگی داوە بەهەواڵی میر بادی کوردی دامەزرێنەی میرنشینی مەروانی و پێوەندی سیاسیان بە بوەیهییەکانەوە و کۆمەڵێك ڕووداوی مێژوویی دەگمەنی خستۆتەڕوو.

**٤- الفارقي:** (م/پاش٥٧٧ك/ ١١٨١ز)، دانەری کتێبی (تاريخ أمدو ميا فارقين)، ئەم کتێبە لە کتێبە گرنگەکانە دەربارەی مێژووی میرنشینی مەروانی و میافارقینی پایتەختیان، کە زانیاری گرنگی تێدایە لەبارەی ژیانی سیاسی و ئابووری و کارگێڕی تیادا ئەم میرنشینەوە کە لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەدا ئاماژەی بۆ نەکراوە دەربارەی ئەو زانیاریانەی لەسەر میرنشینی مەروانیەکان هاتوون، دەبینین زانیاریەکی ورد و

درشته لەبەرئەوەی خۆی خەڵکی میافارقین بووە، و پێدەچێ زانیاریەکانی لەسەرچاوەی لۆکاڵەوە کۆکردبێتەوە، ئەمە جگە لە هەندێ کتێبیی مێژوویی کە هەواڵی میرنشینی مەروانی تیادا بوو، بۆیە ئەم کتێبە پڕ زانیارییە لەسەر ئەو میرنشینە و بوو لە زۆر لایەنەوە تاکە سەرچاوەمان هەر لەپێوەندی میرنشینی مەروانی لەگەڵ خیلافەتی عەبباسی و فاتمی و بوەیهیی و بیزەنتی و حمدانی و عقیلی و سەلجوقیەکان، ئەمە جگە لە کۆمەڵێك زانیاری ئابووری کە تەنها لەم کتێبەدا بەرچاو دەکەوێت.

٥- **الأعلاق الخطيرة في ذكر أمراء الشام والجزيرة:** نووسەری ئەم کتێبە بە (ابن شداد) ناسراوە، (م٦٨٤ك/١٢٨٥ز) ئەم کتێبە لە (٣) بەرگ پێکهاتووە، بەرگی سێیەمی بابەتی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەیە دەربارەی هەرێمی (الجزيرة وحلب)، کە تیایدا ڕووداوی زۆر بەدی دەکرێت کە لە (الفارقي وأبن الأثير)یەوە وەریگرتووە، و زۆر بەوردی باس لە ڕووداوەکان دەکات هەروەها زانیاری جوگرافی گرنگی تۆمارکردووە لەسەر (دیاربەکر و میافارقین و حصن کیفا و ماردین و جەزیرەی أبن عمر)، هەروەها باس لە پێوەندی نێوان میرنشینی مەروانی و میرنشینی هەرێمی جەزیرە دەکات وەك (حەمدانی و عقیلیەکان).

٦- **مجمل التواريخ والقصص:** (م/٥٢٠ك/١١٢٦ز) نووسەرەکەی نادیارە و بەزمانی فارسی نووسراوەتەوە کە یەکێکە لە سەرچاوە سەرەکیەکانی پێوەندی سیاسی میرنشینی حسنویە لەگەڵ بوەیهییەکاندا، کە دەربارەی میرنشینەکە وردەکاری زۆری تیایە لەسەردەمی میر (بدر بن حسنوية) کە لەسەرچاوە عەرەبییەکانی بەردەستماندا بەدی ناکرێ، زۆربەی ئەو زانیاریانەی تیایدا تۆمارکراوە زانیاری دەگمەنن، ئەمیش تاکە مێژوونووسە لە نێوان مێژوونووسانی ئەو سەردەمەدا کە هەندێ لایەنی پێوەندی دەربارەی بنەماڵەی دەسەڵاتدار لەرەی و پێگەی میر بدر لەلایان.

٧- **المنتظم في تأريخ الملوك و الأمم:** دانانی (أبن الجوزي)، (م ٥٩٧ك/١٢٠٠ز) کتێبەکەی بە سەرچاوەیەکی سەرەکی ئەژمار دەکرێت کە ئێمە پشتمان پێبەستووە، کە تێکەڵەیەکە لە میتۆدی ژیاننامە و ساڵانە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا، و کۆمەڵێك

زانیاری خستۆتە ڕوو دەربارەی میرە کوردەکان و پێوەندیان لەگەڵ بوەیهییەکاندا.

**٨- الكامل فى التأريخ:** (أبن الأثير)، (م٦٣٠ك/١٢٣٢ز) لە ناوەڕۆکی کتێبەکەیدا زانیاری گرنگ هاتووە لەسەر لایەنی سیاسی و پێوەندی میرنشینە کوردییەکان بە دەوڵەتی بوەیهیەوە ئەگەر چی هاوچەرخ نەبووە بۆ ئەو ماوە مێژووییە کە ئێمە دەمانەوێت دەربارەی بدوێین، بەڵام ئەمە ناگاتە ئەوەی لە بەهای زانیارییەکانی کەم بکاتەوە دەربارەی میرنشینە کوردییەکان، چونکە بەڕاستی یەکێك لە سەرچاوە ئیسلامیە گرنگەکان و مێژوو بەگشتی، و ئەوەی جیای دەکاتەوە لە سەرچاوەکانی دیکە ئەوەیە کە زانیاری دەربارەی هەموو میرنشینەکان تۆمار کردووە و هەندێ هەواڵی مێژوویی تیایە کە لە سەرچاوە هاوچەرخەکاندا نابینرێت.

**٩- تأريخ ابن خلدون:** (العبر)، دانانی (أبن خلدون) (م ٨٠٨ك/١٤٠٦ز) شێوازێکی نوێی هێنایە کایەوە لە کتێبەکەی پەندەکان لەسەر بنەمای یەکگرتنی بابەت، هەستا بە کۆکردنەوەی هەموو ڕووداوەکانی (أبن الأثير) کە تایبەت بووە بە میرنشینە کوردییەکان بەبێ باسکردنی مێژووی ڕووداوەکان و هەموو گرنگیەکی دا بە لایەنی سیاسی و یەکێك لەو خاڵە لاوازانەی کتێبەکەی دووبارەکردنەوەی ڕووداوەکان زیاتر لە جارێك و هەڵەکردن لە ناوی خەڵك و شوێنەکان ئەمەش ڕەنگە بەهۆی دووری نووسەرەوە بووبێت لە نێوچەی ڕووداوەکان.

## دووەم: کتێبەکانی گەڕۆك و جوگرافیەوانەکان

مێژووی وڵاتەکان مێنتالێکی دەوڵەمەند دەخاتە ڕوو دەربارەی هەرێمە جوگرافیەکان کە قەوارەی میرنشینە کوردییەکان پێکدەهێنێ ئەمە جگە لە هەندێ زانیاری ئابووری و سیاسی دەگمەن کە بەشەکانی لێکۆڵینەوەکەی دەوڵەمەند کردووە بە تایبەتی ئەوبەشەی تەرخان کراوە بۆ پێوەندییە ئابووریەکان و ئەوەی گرنگی ئەم جۆرە کتێبانە زیاتر دەکات ئەوەیە کە زۆربەی نووسەرانی خۆیان شایەتحاڵی ڕووداوەکان بوون.

کتێبی (المسالك والممالك)ی (أبـن خرداذبـه) (م ٢٨٠ك/٨٩٣ز) زانیـاری گرنگـی دەربارەی ڕێگەوبانە بازرگانییەکان خستۆتە ڕوو، هەروەها کتێبی (الاعلاق النفیسة)ی (أبن رسته) (م٨٩٠ك/١٤٠٣ز) و کتێبی (البلدان)ی (الیعقوبي) (م ٢٩٣ك/٩٠٥ز) زانیاری جوگرافی و ئابووری گرنگی تێدایە، لە لێکۆڵینەوەکـەدا سـوودم لـە زانیاریـە ئابووریـەکان کتێبـی (مختـصر کتـاب البلـدان)ی (إبـن الفقیـه) (م٣١٠ك/٩٢٢ز) وەرگرتووە، هەروەها سوودی زۆریـشم لـە کتێبـی (المـسالك والممالـك) (الأصـطخري) بینیـووە (م/٣٤٠ك/٩٥١ز) کـە زانیـاری جـوگرافی گرنگـی تێدایـە سـەبارەت بـە میرنشینە کوردییەکان، ئەمە جگە لە ئەو زانیاریە سیاسـیانەی کـە لـە کتێبـەکانی مێژوو بە گشتی بەدی ناکرێن.

کتێبی (صورة الأرض)ی (إبن حوقل) (م/٣٦٧ك/٩٧٧ز) یەکێکە لـە کتێبـە پـڕ بەهاکان کە لێکۆڵینەوەکەی لەچەند لایەنێکەوە دەوڵەمەند کرد، بەڵام کتێبی (أحسن التقاسیم في معرفة الأقـالیم)ی (المقدسـی) (م ٣٧٥ك/٩٨٥ز) زانیـاری زۆری تیایـە دەربارەی شارو نێوچەو میرنشینە کوردییەکان، و تیشکی زۆری خستۆتە سـەر ئـابووری نێوچـەکە و پێوەندییـە بازرگانییـەکانیان، هـەروەها (ناصـر خـسرو)ی گـەڕۆك (م ٤٨١ك/١٠٨٨ز) لـە کتێبـی (سـەفەرنامە) زانیـاری ئـابووری و سیاسـی دەگمـەنی خستۆتە ڕوو دەربارەی نێوچە کوردییەکان.

کتێبی ژیاننامەکان (التراجم والسیر): لە لێکۆڵینەوەکەدا پـشت بەسـتراوە بەچـەند کتێبێکی ژیاننامە، چ ژیاننامەی کەسایەتیەکانی نـاو لێکۆڵینەوەکـە یـان دەربـارەی وەرگرتنی زانیاری مێژوویی، لەپێشی هەمووشیانەوە کتێبی (معجم الأدباء)ی (یاقوت الحموي) (م٦٢٦ك/١٤٢٨ز) و کتێبی (وفیات الأعیـان)ی (إبـن خلکـان) (م٦٨١ك/ ١٢٨٢ز) و کتێبی (الوافي بالوفیات) (الصفدي) (م/٧٦٤ك/١٣٦٣ز)، ئەمـە جگـە لـە کتێبـە کلتوریـەکان چ، ئـەدەبی و سیاسـی و زمانـەوانی و کتێبـی زانیارییـە گشتییەکان و ئینسکلوپیدیا.

## سەرچاوە نوێیەکان (المراجع)

بەجۆرە جیاوازەکانیەوە مێنتالێکی جۆراوجۆری سیاسی و دیبلۆماسی خستەڕوو کەلایەنی زۆری لێکۆڵینەوەکەی دەوڵەمەند کرد، ئەوەی زیاتر ئەو (المراجع)انەی بەنرختر کردووە ئەو هەمەچەشنی ڕۆشنبیرییە و سەرچاوەکانیەتی کە نووسەرەکانی بەکاریان هێناوە و فراوانیان جگە لە بۆچوونی شرۆڤەکانیان.

بۆ لێکۆڵینەوەکە لەچەندین لایەنەوە سوود لەهەندێ سەرچاوەی کوردی و عەرەبی وەرگیراوە وەك کتێبی مێژوونووس (محمد أمین زکی بگ)، مێژووی (تاریخ الدول والامارات الکردیة في العهد الاسلامي)، و ناکرێت لێرەدا ماستەرنامە بەنرخەکەی (د.حسام الدين علي غالب نقشبەندی) لەیاد بکەین دەربارەی (الکرد فی الدینور وشهرزور) و هەروەها ماستەرنامەی (قادر محمد حسن) (الامارات الکردیة في العهد البویهي)، تێبینی بۆ ئاکام و شرۆڤەی ڕووداوەکان بەو پێیەی خاوەن نامەکان پێشەنگ بوون لەو بوارەدا، هەروەها سوود لە کتێبی (الدولة الدوستکیة في کردستان الوسطی)ی نووسەر (عبدالرقیب یوسف)، ئەمە جگە لە چەند سەرچاوەیەکی دیکە کە لێکۆڵینەوەکەیان دەوڵەمەند کردووە.

# دەروازە

دیبلۆماسییەت وەك هۆكارێك بۆ پێوەندی و لێك تێگەیشتن لە نێوان كۆمەڵگەكانی مرۆڤایەتی لە چاخە كۆنەكاندا گەشەی كردووە، دواتر بوو بەسیستمێك بۆ درووستكردنی پێوەندییە دۆستانەكانی نێوان دەسەڵاتە سیاسیەكان لە قۆناغەكانی ئایندەدا.[1] هەر لەدەستپێكی كۆمەڵگە مرۆڤایەتیەكاندا قەوارە سیاسیەكان سەریان هەڵدا و بەرژەوەندیەكانیان ئاوێتەی یەكتری بوون، هەنگاوەكان خێراتر بوون بەرەو پێشكەوتن و گەشەكردن، درك بەوەكرا كە پێویستی بە گرتنەبەری سیاسەتێكی ژیرانە هەیە لە پێناوی درووستكردنی پێوەندی باش لەگەڵ دەوروبەر و دراوسێكانی. ئەمەش وا پێویستی كرد كە شێوازێكی دیبلۆماسییانە بگیرێتە بەر وەك رەفتار و هەڵسوكەوتێكی كۆمەڵایەتی كە پێویستی بەهاوكاری و لێك تێگەیشتن و سوودی هەردوولا هەبێت لە پێناو ئارامی و ئاشتی و پاراستنی ئاسایشی گشتیدا.[2]

زانستی سۆسیولۆژی بۆمان ڕووندەكاتەوە كە پەیڕەوكردنی شێوازی دیبلۆماسیی رەفتارێكی كۆنی مرۆڤ بووە، لە مامەڵەو پێوەندیكردنی بە خێزانەكان و هۆزو تیرە و كۆمەڵگەكان، ئەمەش لە پێناو زامنكردنی ئاسوودەیی و رێكخستنی كاروباری سیاسی و سەربازی و ئابووریدا. لە كۆمەڵە سەرەتایەكانیشدا ئەم جۆرە پێوەندیانە هەبوون، تیرەو هۆزەكانیش نوێنەریان لای یەكتر هەبووە، بەڵام بوونی ئەم نوێنەرە بەند بووە بە ماوەی شەڕەوە، تا كێشەكان چارەسەر بكرێت، دوای كۆتایی هاتنی شەڕیش نوێنەرەكان گەڕاونەتەوە، واتە كارە دیبلۆماسییەكان كاتی بوون، نەك هەمیشەیی.[3]

---

(١) Ed. Jonam: Encyclo Paedia of Social Sciences, Vol.V-VI.P.١٤٧.

(٢) عزالدين فودة: النظم الدبلوماسية، دار الفكر العربي، ١٩٦١، ص٢٠.

(٣) علي صادق ابو هيف: القانون الدبلوماسي، الأسكندرية، ١٩٧٥، ص ص٧٥-٧٨.

مێژووی مرۆڤایەتی گەلێ جۆرمان لە پێوەندییە دیبلۆماسییەکان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە نێوان ئەو کۆمەڵگە و قەوارە سیاسیانەدا هەبوون، ئەمەش پێوەندی لە مێژینەی دیبلۆماسییمان بۆ دەگێڕێتەوە کە تا چ ڕادەیەك مرۆڤ پێویستی پێی بووە بۆ ئەوەی بەکاری بێنێت وەك ئامرازێك بۆ لێك تێگەیشتن لەگەڵ دەوروبەری خێزانەکەی یاخود لەگەڵ ئەندامانی عەشیرەتەکەیدا، هەروەها دەربارەی پێویستی مرۆڤ لەبەکارهێنانی حیکمەت و ژیری و بلیمەتیش ئاگادارمان دەکات لە بەڕێوەچوونی کۆمەك و هاوکاریکردن لەگەڵ کەسانی دەوروپشتی خۆی و لەبەرگریکردن لەسەلامەتی خۆی و سەلامەتی عەشیرەتەکەی.[٤] هۆزە سەرەتاییەکان و کۆمەڵگە مرۆییە سەرەتاییەکان ئاشنا بوون بە جەنگ و ئاشتی و ڕێوشوێنەکانی دانوستان و ڕێکەوتنی ئاشتەوایی و ڕێوڕەسمی بۆنە ئایینی و سیاسیەکان و پێوەندییە بازرگانیەکان، هەروەها باس لە ڕێوڕەسمی مردنی سەرۆك هۆز و خێڵەکانیش دەکات یاخود ڕێوڕەسمەکانی تایبەت بەدانانی سەرۆکێکی نوێ بۆ هۆز یان عەشیرەتێك.[٥]

هەندێ لە کۆمەڵگەکان شێوازێکی دیبلۆماسی ئەوتۆیان بەکارهێناوە کە لە ڕووی پێشەکەوتوویی هیچی وای کەمتر نەبووە لەگەڵ هەندێ شێوازی دیبلۆماسی کە ئەمڕۆ لە چوارچێوەی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا بەڕێوەدەچێت، بەڵکو لە نێو شێواز و کلتورە دیبلۆماسییەکانی ئەمڕۆدا، بەشێکیان ڕەگ و ڕیشەیان بۆ کلتوری دیبلۆماسی کۆن دەگەڕێتەوە. لێکۆڵینەوەکانی مێژووی دیبلۆماسییەت، هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە جیاوازی نێوان کۆمەڵگەی کۆن و کۆمەڵگەی نوێی بۆ ڕوونکردوینەتەوە کە جیاوازیەکە لەڕووی چەندایەتیەوەیە نەك لە ڕووی چۆنایەتیەوە، بەواتایەکی دیکە ڕەنگە لە بەدوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکان و ئەزموونەکان و ئاڵۆزی پێوەندیە

---

(٤) Ragnar Numelin. The Beginnings of Diplomacy,Copenhagen, ١٩٥٠,PP١٨-٢٠;Harold Nicolson.The Evolution of Diplomatic Method, ١٩٥٤,P.٢.

(٥) عزالدین فودة: س. پ، ل٢٠.

کۆمەڵایەتیەکان و نێودەوڵەتیەکان بووبێت لەڕووی فۆرم و لقەکانیدا، نەك لە گەوهەر و شێوازە گشتیەکەیدا بوو بێت.[٦]

گریکەکان لە قۆناغێکی زۆر زووەوە سیستمێکی ڕێکوپێکیان لە پێوەندیە دیبلۆماسییەکاندا هێنایە کایەوە و گەشەیان پێدا، ئەمەش لەئەنجامی ئەو سیستمە سیاسیەدا بوو لە نێو شارستانیەتی گریکیدا لە ئارادا بوو، ئەم سیستمەش پشتی بەو بیرۆکەیە بەستبوو کە شاری بەناوکی (کرۆك) یەکەم درووست بوون و سەرهەڵدانی دەوڵەت دادەنا لە قۆناغی ئاییندەدا. سیستمی ئەو دەوڵەتە دەیان شاری دەروبەری دەستنیشانکرد کە بەرژەوەندیە هاوبەشەکان بەیەکەوەی گرێی دەدان، ئەو بەرژەوەندیانە ئەو شارانەی پابەند کردبوو کە پێوەندی دیبلۆماسی لە نێوانیاندا بەڕێوەبچێت هەرکاتێك کە پێویستی کردبایە ئامرازی ئەو پێوەندیکردنەش کەسێك بوو کە نامەی تایبەتی پێدا دەنێررا لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە، هەروەك هەموو پاشاو سەرۆکێك بانگەوازکەرێکی (جارچی) تایبەتی هەبوو کە ویست و فەرمانەکانی بەگەل ڕادەگەیاند، گەلێ جار هەمان جارچی وەك نێردراوێك بۆ لایەنەکەی دیکە بەکاردەهێنرا بۆ گەیاندنی هەر پەیام و خواستێکی پاشا یاخود گەورەکەی. جا ئەوە پەیامی دانوستان و گفتوگۆبایە یاخود هەر ڕاسپاردە و پەیامێکی دیکە بوایە دەربارەی پێوەندیەکانی نێوان هەردوولا، ئەمەش بوو بەیەکەم شێوازی نواندنی دیبلۆماسی لەلای ئەو شارانە، ئەویش بە دیبلۆماسی بانگەوازیی ناسرابوو (Herald-Herarit)[٧] گریکەکان هەر لە زووەوە ئاشنای بیرۆکەی دانوستان بوون، هەروەك باسمان کرد، ئەم بیرۆکەیە و چەند بیرۆکەیەکی دیکەیش لەڕێگەی ئەوانەوە گەیشتە ڕۆمانەکانیش، بەڵام ئەوان (واتە ڕۆمانەکان) سوودیان لێ وەرنەگرت، چونکە پێوەندیەکانیان بەگەلانی دیکەوە وەك نیمچە ئیمپریالیزمیەك وابوو. پێوەندیەکان

---

(٦) علي حسين الشامي: الدبلوماسية، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٩٤، ص٢١.

(٧) علي صادق ابو هيف: القانون الدبلوماسي، ص٧٥؛ غازي حسن صبار: الدبلوماسية المعاصرة، الدار العلمية الدولية، عمان، ٢٠٠٢،ص٢٤.

بەپێی لۆژیکی بەهێز لاواز داگیر دەکات، دامەزرابوو.[8] ئەو لۆژیکە بۆ چەندین سەدە بەردەوام بوو، وەك هێرشێکی سەربازی وابوو، دوور لە هەموو شێوازێکی ژیرانە و ڕێبازی دیبلۆماسی، بەڵام ڕۆمانەکان ڕۆڵی بەرچاویان لە گەشەکردنی سیستمی دیبلۆماسییدا لەڕووی تیۆریەوە هەبوو، ئەوەی دەربارەی ئەوان زانراوە، پێوەندیەکانیان لەگەڵ ئەو گەلانە و ئەوشارانەی داگیریان دەکرد لە ئیتالیا لەڕێگەی پەیماننامە و ڕێکەوتنەکانەوە بارودۆخەکەیان هێور دەکردەوە، بەوەی کە بڕیاری جۆرێك لە خود موختاریان بۆ ئەو گەلانە و ئەو شارانە زامن دەکرد،[9] بەڵام سەبارەت بەو نێوچە و هەرێمانەی دەرەوەی ئیتالیا کە ڕۆمانەکان دواتر داگیریان کرد، ئەوان ڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمانەکاندا بوون، ئیش و کارەکانی بەیاسایەك بەڕێوە دەبرا کە جیاواز بوو لە یاسای ڕۆما و پێی دەگوترا (یاسای گەلان)، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لەو هەرێمانە نیمچە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوون و سیستمی پێوەندیەکانیان لەگەڵ ڕۆمانەکاندا، سیستمی پەیماننامەکان بوو. ڕۆمانەکان پێوەندیە سیاسیەکانی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتە گەورە سەربەخۆکاندا لە نێوچەی دەریای سپی نێوەڕاست پاراست کە ئەو سەردەمە یاسای نێودەوڵەتی گریکیان پەیڕەو دەکرد.[10]

بابەتەکە هەرچۆنێك بووبێت لە هەردوو سەردەمی گریکەکان و ڕۆمانەکاندا دیبلۆماسییەت لە ڕووخساردا شەقڵێکی جێگیری پێوە دیاربوو، بەڵام ڕێکخراو نەبوو، دامەزراندنی کەسێك لە پۆستی دیبلۆماسییدا جێگەی شەرەف و بەپرسیاریەتی بوو، تا ئەو کاتەش دیبلۆماسییەت جێگیر و ڕێکخراو نەبوو، تەنها لە نێوچەیەکی جوگرافی دیاریکراودا قەتیس مابوو. ئەویش بە هۆی سەختی هاتووچۆ و پێوەندیەکانەوە لەو

---

(٨) هشام الشاوی: الوجيز في فن المفاوضة، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٦٩، ص٣٧٤.

(٩) ابراهيم احمد العدوي: المجتمع الأوروبي في العصور الوسطى، دار المعرفة، القاهرة، ١٩٦١، ص٢٨.

(١٠) علي صادق ابو هيف:س. پ، ل ٧٧؛ غازى حسن صابر: س. پ، ل٢٧.

سەردەمەدا. پێوەندیەکانی نێوان شارەکان و میرنشینەکان زۆر سنووردار و ناجێگیر بوون.

لەسەردەمی دەوڵەتی عەبباسیدا پێشکەوتنێك لە هاوکێشە نێودەوڵەتیدا دەرکەوت، ئەویش بەهۆی جێگیری دەوڵەتی عەبباسییەوە بوو، ئەمەش کاریگەریەکی زۆری لەسەر بنیادنانی پێوەندی و زۆربوونی چالاکی دیبلۆماسی هەبووە. یەکەم ئاماژەشی بۆ ئەو هاوکێشە جیابوونەوەی ئەندەلوس بوو لە خیلافەتی عەبباسی لە ساڵی (١٣٧ ك/ ٧٦٥ ز)دا، لەم مێژووە بە دوواوە، سەرکردە موسڵمانەکان پێوەندی دیبلۆماسی ڕوون و ئاشکرایان لەگەڵ بێزەنتەکاندا بەست. هەر بۆیە دەوڵەت دەستی بە ناردنی باڵوێزەکانی کرد بۆ وڵاتی ڕوم لە کەستەنتینە و سەرکردەی ڕۆمەکانیش باڵوێزەکانیان نارد بۆ پێتەختی دەوڵەتە ئیسلامیەکان، وە هەردوولا هاندەربوون لەسەر ئەم ئاڵوگۆڕە دیبلۆماسییانە.[١١] لەسەردەمی دەوڵەتی عەبباسیدا مەبەستە دیبلۆماسییەکان جۆراوجۆر بوون و تەنها بە یەك لایەنەوە نەبەسترابووەوە، بەڵکو هەمەلایەنە بوو بۆ نموونە: بەهێزکردنی پێوەندیە بازرگانیەکان و ئاڵوگۆڕکردنی دیلەکان و کۆتاییهێنانی ئاژاوەکان و بەستنی پەیماننامەکان، تا وای لێهات دیبلۆماسییەت لەم سەردەمەدا ئاراستەیەکی نوێی وەرگرت و جۆرێك لە ئاڵوگۆڕی سیاسی ڕوویدا ئەویش بە بوونی دوو هێزی دیکە، تا وای لێهات جیهان دابەش بوو بە سەر چوار هێزی کێبڕکێدا. خیلافەتی عەبباسی پێتەختەکەی بەغدا بوو، میرنیشینی ئومەویش لە ئەندەلوس (قرطبة)* پێتەختی بوو، ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی پێتەختەکەی کەستەنتینە بوو، دەوڵەتی فەرەنجەش کێ بڕکێی بوو لە گەڵیدا و پێتەختەکەی ئەکسی لاشابل بوو. لەم سەردەمەدا شانبەشانی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان پێوەندی زانستیش

---

(١١) وهبة الزحيلي: اثار الحرب في الفقه الاسلامي، مطبعة شفيق، بغداد، ١٤٠٣هـ، ٣٢٣.

* قرطبة: شارێکی مەزنە لە ئەندەلوس، میرەکانی (بني امية)ی تێدا دەژیا، بە دیواری بەردین شورا درا بوو، هاوکات یەکێك بوو لە شارە بەناوبانگەکانی ئەورووپا. (ياقوت الحموي: معجم البلدان، دار صاد، بيروت، د.ت، ٣٢٤/٤-٣٢٥).

دەستی پێکرد. لەسەردەمی خەلیفەی دووەم (ابوجعفر المنصور)**دا(١٣٦-١٥٨ك/٧٥٣-٧٧٤ز) نوێنەر- بالۆێزخانەیەکی زانستی ڕەوانەی شاری کەستەنتینە کرد کە لە چەند زانایەکی موسڵمان پێکدەهاتن، بە مەبەستی هێنانی کتێبی دەگمەن و دەستیان کرد بە سەردانی کتێبخانە زانستیەکان لەوێ و بە کۆمەڵێك کتێبەوە گەڕانەوە، لەوانە کتێبی ئەقلیدس*، جگە لەوە کۆمەڵێك کتێبی پزیشکی و فەلسەفییان کڕی.[١٢] هەر ئەم خەلیفەیە شاندێکی ناردە لای ئیمپراتۆری فەرەنسا. پێوەندیەکانی دەوڵەتی عەبباسی لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا شێوازێکی جۆراوجۆری وەرگرت کە ئەویش پێوەندی بە بارودۆخی تایبەتی نێوخۆ و نێودەوڵەتییەوە هەبوو لە ڕاستیدا ئەو پێوەندیانە تەنها پێوەندی جەنگی نەبوون، بەڵکو پێوەندی دیبلۆماسییش. لە ساڵی (١٥٩ ك/ ٧٧٥ ز) لە نێوان ئەمان و دەوڵەتی بیزەنتیدا دەستی پێکرد

---

** ابو جعفر المنصور: ناوی (عبدالله بن علی بن العباس)ە دووەم خەلیفەی عەبباسی بوو لە نێو ساڵانی (١٣٦-١٥٨ك/٧٥٣-٧٧٤ز) یەکەم کەس بوو کە گرنگی بە زانستدا و شارەزا بوو لە ئەدەب و فقە، هەروەها دروستکەری شاری بەغدایە، بۆ جێگیرکردنی دەسەڵاتی خەڵکێکی زۆری کوشت، لە ساڵی (١٥٨ك/٧٧٥ز) لە حەج کۆچی دوایی کرد. (ابن الأثير: الكامل في التأريخ، دار صادر بيروت، ١٩٦٦، ٥/٩٩؛ الخطيب البغدادي: تاريخ بغداد، مطبعة السعادة، مصر، ١٣٤٩هـ، ١٠/٥٣-٦١).

*. ئەقلیدس (٣٦٥/٣٠٠پ.ز) ئەم فەیلەسوفە لەئەسکەندەرییە لەدایك بووە، وە لە ئەسینا خوێندوویەتی، پاشان لەلایەن (بەتلیمۆس) گرنگی زۆری پێ ئەدرێ، لێرەوە ئەقلیدس بەدیارترین کەسایەتی قوتابخانەی ئەسکەندەرییە دەناسرێت، سەرباری ئەمانەش لەبواری زانستدا بەدیارترین زانای بیرکاری دائەنرێ کە کاریگەری لەسەر جیهان هەبووە وە هەروەها گرنگی بەکاری ڕێکخستن ئەدا لەبواری لۆژیکدا بەتایبەتی بۆ بواری ئەندازیاری، لەسەر کۆمەڵە سیستمێکی بەڵگەیی داڕشت لە زاراوەکانی ئەندازیاری وەك خاڵ، هێڵ، ڕاستە، جگە لەمانەش بۆ سەلماندنی بەڵگەکانی خۆی هەموو کات پشتی بەمەرجەکانی ئەرستۆ ئەبەست لەبواری زانستی بەڵگەییدا. (یاسین خلیل: التراث العلمي العربي، دار أحياء التراث العلمي العربي، جامعة بغداد،١٩٨١، ج١/ص٤٣).

(١٢) هاشم عبدالراضي: قضايا ومواقف من التاريخ العباسي، دار النشر للجامعات، القاهرة، ٢٠٠١، ص٩٣.

کاتێك شاندێکیان نارد بۆ کەستەنتینە بۆ پیرۆزباییکردن لە ئیمپراتۆری بیزەنتی بە بۆنەی دەسەلأت گرتنەدەست، هەروەها پێوەندی لە نێوان (هارون الرشید* و چارلمان)ی پادشای فەرەنجەدا درووست بوو کاتێك هەوڵی سەرکەوتنی دەدا بەسەر پادشای کەستەنتینە(نقفوردا)، بۆیە بۆ ئەو مەبەستە باڵوێز و شاندی بۆ بەغدا ڕەوانەکرد بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی (هارون الرشید).(١٣)

هاوکات چارلمان ئامانجێکی دیکەی هەبوو لەم پێوەندیە دیبلۆماسییەی هارون، ئەویش لاوازکردنی دەوڵەتی ئومەوی بوو لە ئەندەلس، بەمەش باڵوێزەکەی چارلمان توانی ڕەزامەندی هارون بەدەست بهێنێت و ئەمەشی بە سەرکەوتنێکی گەورە ئەژمارکرد بەسەر نقفوردا. بۆیە دەبینین باڵوێزی هارون لە لایەن چارلمانەوە زۆر بە گەرمی و ڕێزەوە پێشوازی لێکرا.(١٤) لە باڵوێزە ناوبانگەکانی سەردەمی خیلافەتی عەبباسی (نصر بن الازهر) بوو کە خەلیفە (المتوکل علی اللە)** ناردی بۆ

---

* هارون الرشید: کوڕی (محمد المهدی ابن المنصور)ە پێنجەم خەلیفەی عەبباسی بوو لە نێو ساڵانی (١٧٠-١٩٨ك/٧٨٦-٨١٣ز) فەرمانڕەوایی خیلافەتی عەبباسی کردووە، زانا بوو لە هەواڵی عەرەب و فقە و حەدیث، هەروەها شەڕی لە پێناو خودا زۆر بوو بە شێوەیەك، ساڵێك بۆ شەڕ (جیهاد) یاخود (غەزا) و ساڵێك بۆ حەج کردن چووە. (الطبري: تأریخ الرسل و الملوك، تح. محمد ابو الفضل ابراهیم، دار المعارف بمصر، ١٩٦٠، ٢٣٠/٨ ؛ ابن کثیر: البدایة والنهایة، في التاریخ، حققە محمد ابو ملحم وآخرون، دار الریان للتراث، القاهرة، ١٩٨٨، ٢١٣/١٠/٤؛ الحنبلي: شذرات الذهب في اخبار من ذهب، دار احیاء التراث العربي، ٣١١/٢-٣١٢).

(١٣) مجید خدوري: الصلات الدبلوماطیقیة بین هارون الرشید و شارلمان، مطبعة التفیض، بغداد، ١٩٣٩، ص ص ١٦-١٩.

(١٤) محمد الخضري بگ: محاضرات في التاریخ العباسي، دار النفائس، بیروت، ١٩٦٥، ص ١٣٣.

** المتوکل علی الله: لە ساڵانی (٢٣٢-٢٤٧ك/٨٤٧-٨٦١ز) بە هێزی تورکەکان دەسەلأتی خیلافەتی عەبباسی گرتە دەست، خاوەن بیرێکی تەسك بوو، باوەڕی بە (التسلیم والتقلید) بوو، لەبەرئەوە رقی لە (المناظرة والمجادلة)بووە، دژی قوتابخانەی عەقڵی بوو، کە گروپی (المعتزلە) پەیڕەویان دەکرد، وە بەزەندەقە تاوانبار کرابوون، بۆ دوو مانگ خیلافەتی گواستەوە شاری

کەستەنتینیە لە بەرامبەر باڵوێزخانەی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بە سەرکردایەتی چەند کەسێکی شارەزا لە بواری دیبلۆماسییدا بە ئامانجی سەقامگیربوونی ئاشتی لە نێـوان هەردوو وڵاتدا و لەگەڵ گۆڕینەوەی دیلەکاندا، ئەمەش بووە مایەی زۆربـوونی چـالاکی دیبلۆماسی لە نێوان هەردوولادا.[15] جێی سەرنجە کە کـورد لـە سـەردەمی یەکـەمی دەوڵەتی عەبباسیدا هیچ شتێکی نەبوو شـایەنی باسـکردن بێـت، بەهـەمان شـێوەی سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی و بە بەراورد لەگەڵ میللـەتانی دیکـەی خۆرهەڵاتـدا وەك فارس وتورك و دەیلەم کە ڕۆڵیـان هـەبوو لـە ژیـانی سیاسـی دەوڵـەتی عەبباسـیدا. لەوکاتەدا ئەو میللەتانە توانیان سنووری وڵاتەکانیان بەجێ بهێڵن و بچنە نێو قـوڵایی دەوڵەتی عەبباسیەوە و بەشداری ئـەکتیڤیان هـەبێت لـە ڕووداوەکانـدا لـە بەغـداو سامەڕا. کورد بەردەوام بوو لەسەر ژیانی تایبەتی خۆیان لە وڵاتەکەیدا کە سـیمایەکی شاخاوی و ئابووریەکی شوانکارەیی و کشتوکاڵی بوو، و دوور بوون لە بەشـداریکردنی ڕاستەوخۆ لەو ڕووداوانەدا، سەرباری نزیکی وڵاتەکەیان لـە مەڵبەنـدی دەوڵەتـەوە بـە بەراورد لە گەڵ وڵاتی ئەو میللەتانەدا.

---

دیمەشق پاشان گەڕایەوە سامراء وە لەشەوێکدا کوژرا. (ابن خلکان: وفیات الأعیان، دار الثقافة، تح- احسان عباس، بیروت، ١٩٦٩، ج١، ص٣٥٠؛ الخطیب البغدادي: تاریخ بغداد، ج٧/١٦٧-١٧٢، ابن الاثیر: الکامل، ج٧/ص٨٢).

(١٥) الخطیب البغدادي: تاریخ بغداد.ج٧/ص١٦٧-١٧٢؛ ابراهیم احمد العدوي: السفارات الاسلامیة الی اوروپا في العصور الوسطی، دار المعارف، مصر، ١٩٥٧ص٦٧-٨٠.

# زاراوەكانی دیبلۆماسییەت

زاراوەی دیبلۆماسییەت لەپێوەندیە نێودەوڵەتیەكان و یاسای نێودەوڵـەتی گـشتیدا جێگەی بایەخی توێژەروان بوو، و هەوڵیان داوە لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار واتاو ڕەچەی ئەو زاراوەیە ڕاڤە بكەن، جێگەی خۆی بووە كە ئەم هەموو گرنگیەی پێبدرێت، ئەگـەر نا، هیچ بایەخێكی لە مێژووی مرۆڤایەتی و پێوەندیە نێودەوڵەتیەكاندا نەبووە.[١٦]

دیبلۆماسییەت زاراوەیەكی كۆنە و بۆ یاسا كلاسیكیەكان دەگەڕێتەوە، یۆنانیـەكان بۆ یەكەمجار بەكاریان هێناوە، لەوانیشەوە بۆ ڕۆمانیەكان گوێزراوەتەوە، دواتر بۆ زمانە تازەكانی وەك فەرەنسی و ئینگلیزیش، دوای ئەوانیش بۆ سەرجەم زمانەكانی دیكـەیش گوێزراوەتەوە لە وانەش زمانی كوردی و عەرەبی.

زاراوەی دیبلۆماسییەت یاخود دپلۆماسی، لە وشەی (دپلۆم-Diplome) وەرگیراوە كە بەزمانی یۆنانی پێچانەوە یاخود قەدكردن دەگرێتەوە، ڕەنگە مەبەست لە هەڵگرتن یاخود داخستنی شتێك بێت، و هەر لەوەشەوە ناوی ئەو بەڵگەنامەیـە یـاخود پەیامـە ڕەسمیە هاتووە كە دەپێچرێتەوە یاخود قـەد دەكرێـت و بـەناوی (دپلـۆم- Diplome) ناسراوە و ماناكەی خستنەسەریەك، یاخود پێچانەوە، یاخود نوشتاندنەوە دەگرێتەوە.

لە كۆنـدا هـەموو پاسـپۆرتەكان و مۆڵـەتی تێپـەڕبوون بـە ڕێگـە و بانـەكانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا و لیـستی گەشتیاران و كاڵاكان و كەلوپەلی بازرگـانی لەسـەر پارچە پلێتێكی كانزایی مۆر دەكران كە دوو ڕووی هەبوو بەشێوازێكی تایبەتی جووت كرابوون و نوشتابوونەوە، ئەو كارتانەی تێپـەڕبوون پێیـان دەوتـرا (دپلۆمـات) وشـەی دیپلۆما بە جۆرێك فراوان بوو، هەتا بەڵگەنامە ناكانزاییە ڕەسمیەكانیشی دەگرتەوە كە

---

(١٦) عمر كمال توفيق: الدبلوماسية الأسلامية، مؤسسة شباب الجامعة، الأسكندرية، ١٩٨٦، ص٢٧.

ڕێکەوتننامــەکانی لــەخۆ دەگــرت کــە لەگــەڵ کۆمەڵــەکان و هــۆزە بیانیەکانــدا مۆرکرابان.[17]

لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا/ یانزەیەمی زاینیدا ئەم چەمکە فـراوانتر بـوو کـە دواتر بوو بە چــەمکی (بەڵگەنامــە ڕەسمیــەکان) یـاخود بەڵگەنامــەی کاروبارەکــانی پەیوەست بە پێوەندیە نێودەوڵەتیەکان کە دەوڵەتەکانی پێکــەوە دەبەســتەوە،[18] ئـیتر دیبلۆماسییەت بە (هونەری ممکــن) و (هونــەری تــەوافق) و (هونــەری زۆرلێکــردن) ناسرا. هەروەها بە (هونەری دانوستان)یش ناســرا، واتــە هونــەر و زانــست و ئیــدارەی کاروباری دەرەوە، و بەمانای زانستی هونەری دانوستان دێت، ئەگەر زانست بە خوێنــدن و تێڕوانین بەدەست بێــت، ئــەوا هونــەر بەپلــەی یەکــەم پــشت بــە بــەهرەی شەخسی دەبەستێت،[19] هەروەها بە تواناو لێهاتویی و بلیمەتی نێــرراوە دیبلۆماســییەکەش، و لە هەردوو حاڵەتەکەدا هیچ جیاوازی و دژواریەك لە نێــوان زانــست و هونــەردا بــەدی ناکرێت لە کاری دیبلۆماسی و سیاسیدا.[20] هەر لەم بارەیەوە کالیێر بــیرو ڕایــەکی وا دەردەبڕێ کە لە کاتی خۆیدا پاڵپشتیکردنی دیبلۆماسییەت بە ئەرکێکی شۆڕشــگێڕی دەژمێردرا، بۆ پاڵپشتیکردنی دیبلۆماسییەت. ڕەنگە ئەمــە بــۆ ئــەم ســەردەمانەشمان سوودی هەبێ کە دەڵێ: "حکومەت بۆی هەیە پارە بە باڵوێزە هەژارەکەی بدات، بــەڵام ناتوانێ مێشك بــە بــاڵوێزی دەبــەنگ ببەخــشێ"،[21] هــەروەها کــالیێر لــە درێــژەی نووسینەکانی باس لــەوە دەکــات و دەڵێــت: "نهێنــی ســەرکەوتن لــە گفتوگــۆدا لــە تێگەیشتنی جیاوازیەکانی ئەو کارەدایە کە هەڵــسەنگاندنی لــە نێــوان بەرژەوەندییــە

(١٧) علي حسين الشامي: س. پ، ل٣١.

(١٨) سهيل حسين الفتلاوي: تطور الدبلوماسية عند العرب، دار القادسية للطباعة، بغداد، ص٣.

(١٩) علي صادق ابو هيف: س. پ، ل٢٧.

(٢٠) علي عبدالقوي الغفاري: الدبلوماسية القديمة والمعاصرة، الأوائل للنشر و التوزيع، دمشق، ٢٠٠٢، ص١٩.

(٢١) وەرگیراوە لە جارل ثائر: الدبلوماسي، تر. خيري حماد، بيروت، ١٩٦٠، ص٣٤٥.

ڕاستەقینەکانی هەموو لایەنە بەشداربووەکانی گفتوگۆکە ئەنجام بدات".[٢٢]

ئەم زاراوەیە گوێزرایەوە بۆ لاتینی و ڕۆمانەکان بە شێوازێکی نزیک لە شێوازی یۆنانەکان بەکاریان هێنا، یۆنانیەکان ئەم زاراوەیەیان بۆ بەڵگەنامە داواکراوەکان و مۆرکراوەکان بەکاردەهێنا کە دەوڵەت دەیدایە ئەو کەسانەی ئەرکێکی ڕەسمی پێ دەسپاردن و دەوڵەت چاودێری تایبەتی لە ئاستیاندا دەگرتە ئەستۆ.[٢٣] بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم ڕاستیەش، سیاسەتمەدار و یاساناسی ڕۆمانی شیشرون (١٠٦-٤٣پ.ز)، وشەی (دیپلۆم)ی بە واتای (ڕاسپاردە-التوصیة) لە نووسینەکانیدا بەکارهێناوە بۆ ئەو کەسایەتیانەی بە ئەرکێکی ڕەسمی بۆ لایەنە بیانیەکان دەنێرران، کە بەهۆیەوە دەیانتوانی گەشت و هاتوچۆکانیان بەسەلامەتی ئەنجام بدەن. هەروەها بەهۆی ئەو بەڵگەنامەیەوە (دیپلۆما) ئەو نێرراوانە گرنگی و بایەخی تایبەتیان لەلایەن ئەو دەوڵەتانەی کە بۆی نێردرابوون پێدەدرا. پێدەچێ ئەوەی ئەمڕۆ لە پاسپۆرتی تایبەت بەکەسایەتیە دیبلۆماسییەکاندا دەیبینین ڕێچکەی ئەو نەریتە کۆنە بێت، هەڵگرانی پاسپۆرتی دیبلۆماسی کۆمەڵێك (حەصانە) و ئیمتیازاتی تایبەتیان هەیە کە بە (الحصانة الدبلوماسية) ناسراوە.[٢٤] وشەی (دیبلۆماسییەت) ئەگەر چی وشەیەکی ڕەسەن و دێرینە، بەڵام لە واتاو ناوەڕۆکدا تازەیە، لەسەردەمی ڕۆمانیدا ئەو نووسراو و مۆڵەتنامە و ڕاپۆرت و بڵاوکراوانەی کە پەیماننامەکان و ڕێکەوتننامەکانی لەخۆ دەگرت و لەگەڵ گەلان و تیرەو هۆزە بیانیەکاندا مۆرکرابوون و هەڵگرانی ئیمتیازاتی تایبەتیان هەبوو لە زمانی یونانیدا بە وشەی (دیپلۆم) ناسرابوو، کاتێك ئەو پەیماننامانە و بەڵگەنامانە لە دیوانەکاندا کەڵەکە بوون و ڕۆژگاریان بەسەردا تێپەڕی، پێداچوونەوەیان و خوێندنەوە و تێگەیشتنی وشەو بابەتەکانی بووە کارێکی زەحمەت، بۆیە تەرخانکردنی کەسانی پسپۆڕ و شارەزا لەو بوارەدا بوو بەمەسەلەیەکی

---

(٢٢) وەرگیراوە لە هارولد نیکلسون: الدبلوماسية عبر العصور، بيروت، {د.ت}، ص٩٦.

(٢٣) عمر كمال: الدبلوماسية الأسلامية، ص١٨.

(٢٤) وەرگیراوە لە عمر كمال: س.پ، ل١٨.

پێویست بۆ تۆمارکردنیان و ڕاڤەکردنی هێماکان و لێکدانەوەی وشەکانی و دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستیان، ئەو کەسەش کە ئەو ئەرکەی پێ سپێرا بە وشەی (دیبلۆماسی) ناوبرا و ئەو زانستە تایبەتیەش بە (دیپلۆماتیك) ناسرا، لە سۆنگەی وشەی (دیپلۆم)ەوە، واتە ئەو نووسراوەیە لە سەرۆکی دەوڵەتەوە ئیمزا دەکرا.[٢٥]

ئیتر ناوەڕۆکی وشەی (دیپلۆم) و ئەو واتایانەی دیکەیش کە لێی وەرگیرابوون لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا گەشەیان کرد و بەرەوپێش چوون، جگە لەوەی کە بەڵگەنامەی سەفەری دەگرتەوە کە باسمان کرد، سەرجەم بەڵگەنامە ڕەسمیەکانی دیکەیشی گرتەوە وەك، هەموو ئەو ڕێکەوتنامانە و پەیماننامانەی کە زۆری نەخایاند خانەی پاراستن (الأرشیف)ی لێ پڕبوو، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کارمەندی شارەزا و مەشقپێکراوی بۆ دابمەزرێنێت بۆ ئەوەی هەرکات پێویستی کرد ئەرکی ئەرشیفکردن و پۆلێنکردنیان و جیاکردنەوە و لێکۆڵینەوەیان بگرنە ئەستۆ، ئینجا لێرەوە زارەوەی (کاروباری دیبلۆماسی—الشؤون الدبلوماسية) یاخود کاری دیبلۆماسی، کە هەتاکو سەرەتاکانی مێژووی نوێش، مەبەست لێی کاروباری تایبەت بە ئەرشیفکردن و پاراستنی (الدبلومات) بوو.[٢٦]

---

(٢٥) مامون الحموي: الدبلوماسية، دمشق، ١٩٥٨، ص٢.

(٢٦) هارولدنيكلسون: الدبلوماسية، ٥٤؛ عمر كمال: س. پ، ١٨.

# پێناسەی دیبلۆماسییەت

دیبلۆماسییەت چەند پێناسەیەکی هەیە، پێویستە هەندێ لەو پێناسانە بخەینە ڕوو کە نووسەران و زانایان ئاماژەیان پێکردووە، هەرچەندە لە واتاو ناوەڕۆکدا وەکو یەکن، بەڵام بەشێوەیەك لە شێوەکان هەندێ جیاوازی لە دیدو بۆچوونەکانیان بەدی دەکرێت.

توێژەرەوەی بەریتانی (هارۆلد نیکلسۆن) بەم جۆرە پێناسەی دیبلۆماسییەتی کردووە: "بەڕێوەبردنی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکانە لەڕێگەی دانوستانەوە ئەو شێوازەیە کە (باڵیۆز)* و نێردراوەکان (السفراء والمبعوثون) بەکاری دێنن لە بەڕێوەبردن و ڕاپەڕاندنی ئەو پێوەندیانە"،[27] بەڵام فەرهەنگی ئۆکسفۆردی ئینگلیزی بەم جۆرە پێناسەی دەکات: "بەڕێوەبردنی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکانە لەڕێگەی دانوستانەوە ئەنجام دەدرێن و باڵیۆز نێردراوە دیبلۆماسییەکان لە ئەستۆی دەگرن".[28]

بەڵام بەچەمکی فەرەنسایی دیبلۆماسییەت بەم جۆرە پێناسە کراوە: "بەمانای نێردە یاخود کۆمیسار، واتە ئەو کەسە بە ئەرکێکی ڕەسمی دەنێردرێت، بەڵام وشەی سەفیر لە هەردوو وشەی (تابع و خادم) وەرگیراوە کە دوو نازناون تەنها بە نوێنەرانی پاشا و سەرۆکەکان دەبەخشرێن"،[29] ئیسپانیەکان یەکەم کەس بوون وشەی باڵیۆز یاخود سەفارەتیان بەکارهێناوە، دوای ئەوەی لە دەربڕینێکی کەنیسیەوە گوێزراوەتەوە کە بەواتای (خادم) یاخود سفارەت یان باڵیۆزخانە دێت.[30]

---

* باڵیۆز- وشەی باڵیۆز (Ambssadeur) لە بنەڕەتدا لە زمانی (السلتیە) وەرگیراوە بە واتای خزمەتکار دێت. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (سموحي فوق العادة: الدبلوماسية الحديثة، دار اليقظة العربية، دمشق،١٩٧٣،ص٥٦٣).

(٢٧) الدبلوماسية،١٠٧.

(٢٨) سموحي فوق العادة: س. پ، ل٢: هارولد نيكلسون: س-پ، ل٥٤.

(٢٩) علی عبدالقوی الغفاری: الدبلوماسية القديمة و المعاصرة، ص١٩.

(٣٠) عزالدين فودة: النظم الدبلوماسية، ص٥٢.

لێرەدا دەتوانین بڵێین دانوستان (التفاوض) لە ئەرکە سەرەکیەکانی دیبلۆماسییەتە. واتــە دانوســتان یەکــەم هــەنگاوە کــە بەمەبەســتی یەکلاکردنــەوەی ناکۆکیــە نێودەوڵەتیەکان دەنرێت، هەروەها لەچوارچێوەی پێناسەکانی دیبلۆماسییەت پێناسەی خەلیفەی ئومەوی (معاویة بن ابو سفیان) لەقسە بەناوبانگەکەیدا دەڵێت: "ئەگەر لە نێوان من و خەڵکدا تاڵە مویەك هەبێت، ناهێڵم بپچڕێت، ئەگەر شلیان کـرد تونـدی دەکەم و ئەگەر توندیان کرد من شلی دەکەم".[٣١] بەڵام (ئارنس ساتو) بـەم شـێوەیە پێناسەی دیبلۆماسییەت دەکات: "دیبلۆماسییەت بریتیە لـە بـەکارهێنانی ژیـری و بلیمـەتی لـە بـەڕێوەبردنی پێوەندیـە ڕەسمیـەکانی نێـوان حکومەتـەکانی دەوڵەتـە سەربەخۆکان و هەندێ جاریش پێوەندی نێوان حکومەت و ئەو وڵاتانەیش دەگرێتەوە کە هێشتا سەربەخۆییان بە دەست نەهێناوە"،[٣٢] و(سموحي فـوق العـادة) بـە کۆمەڵـە یاســاو ڕێـسایەك و دابونــەریتێکی نێودەوڵــەتی پێناســەی دەکـات: "کـە بایـەخ بەرێکخستنی پێوەندیەکانی نێوان دەوڵەتان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان و ئەو شێواز و ڕێوڕەسمانــەی کــە پێویــستە پــەیڕەو بکرێـت لــە جێبــەجێکردنی ئــەحکامی یاسـا نێودەوڵەتیــەکان و بــەدیهێنانی هاوســەنگی لــە نێــوان بەرژەوەندیــەکانی دەوڵەتــە جیاوازەکانــدا"،[٣٣] و ئەنجامــدانی گفتوگــۆ و دانوســتانەکان و بەســتنی کــۆنگرە نێودەوڵەتیەکان و ئیمزاکردنی ڕێکەوتنامەکان و پەیماننامەکان.[٣٤] لەهـەمان کاتـدا سیاسەت مــەداران و دیپلۆماتــانی کـوردیش لـەم بارەیـەوە چـەند بـیرو بۆچـوونێکی جیاوازیان هەیە، بۆ نموونە لە دەوڵەتی مەڕوانی کوردیدا، بە تایبەتی لە سەردەمی میر (أحمد بن مروان) دا کەبە (نـصر الدولـة) ناسـراوبوو، دیبلۆماسـییەت بـەم شـێوەیە

---

(٣١) اليعقوبي: تأريخ اليعقوبي، تحـ: عبدالامير مهنا، طبعة بيروت، ١٩٦٠، ٢٣٨/٢.

(٣٢) وەرگیراوە لـە: (محمـود خلـف: النظريـة والممارسة الدبلوماسية، المركـز الثقافي العربي، لبنان، ١٩٨٩، ص٤٧).

(٣٣) سەرچاوەی پێشوو، ل٣.

(٣٤) علي حسين الشامي: الدبلوماسية، ص٣٤-٣٥.

شیکراوەتەوە: "خەباتی گفتوگۆکردنە سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی نێوان هەردوو لای ناکۆك تا بە هەر نرخێك بێت ئاشتی بەرجەستە بکرێ لەگەڵ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیەکانی نێوانیاندا".[٣٥]

شایانی باسە کە دیبلۆماسییەت بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە و گەشەی کردووە، بۆ ڕێنماییکردنی ئەو شێوازەی کە دەوڵەت بەهۆیەوە پەیڕەوی دەکات لە بەڕێوەبردنی پێوەندیەکانی بەدەوڵەتانی دیکەوە، و بنیادنانی سیاسەتی دەرەوە بەهۆی کارمەندانی ڕێبازی دیبلۆماسی کە جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتەکانیان لە ئەستۆ دەگرن. (چارڵ کالڤۆ-C.Calvo) بەم شێوەیەی خوارەوە پێناسەی دیبلۆماسییەت دەکات و دەڵێ: "دیبلۆماسییەت زانستی پێوەندی نێوان دەوڵەتە جیاوازەکانە لەئەنجامی بەرژەوەندیە هاوبەشەکان و پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی و دەقی پەیماننامە و ڕێکەوتنەکان و زانینی دەستور و داب ونەریتەکان درووست دەبێت و گەشە دەکات کە بۆ بەڕێوەبردن و بەدواداچوونی کاروبارە گشتیەکان و دانوستانەکان پێویستە بەدەربڕینێکی ڕاستتر، دیبلۆماسییەت زانستی پێوەندیەکانە، یاخود ئاسانتر بڵێین هونەری دانوستانە، هونەری ڕابەرایەتی و ئاڕاستەکردن و بەدواداچوونی مەرجەکانی دانووستانە سیاسیەکانە بەشێوەیەکی ژیرانە".[٣٦] (رۆژل جینیە-R.Genet) دەڵێ: "دیبلۆماسییەت تەکنیکی نوێنەرایەتی حکومەت و چاودێریکردنی بەرژەوەندیەکانی وڵاتە لەلای حکومەتە بیانیەکان، و داکۆکیکردنە بۆ ئەوەی مافەکانی وڵات پارێزراوبێت و ناوبانگ و ئابڕووی لە دەرەوەی وڵات بەڕێز بێت، هەروەها مەبەست لە دیبلۆماسییەت بەڕێوەبردنی کاروباری نێودەوڵەتیەکانە بە ئاراستەکردنی دانوستانە دیبلۆماسییەکان و بەدواداچوونی قۆناغەکانی بەپێی ڕێنماییە دیاریکراوەکان،

---

(٣٥) عبدالرقیب یوسف: الدولة الدوستكية، في كردستان الوسطى، مطبعة اللواء، بغداد، ١٩٧٥، ١/٧-٨: صابر مامە سینی: دبلۆماسیەتی کورد بە درێژایی مێژوو، چاپخانەی ئاسا، چاپی یەکەم، سلیمانی، ٢٠٠٢، ل٣٥.

(٣٦) وەرگیراوە لە مأمون الحموي: الدبلوماسية، ص٤.

جەختکردنەوەیە لەسەر جێبەجێکردنی یاسا لە پێوەندیە نێودەوڵەتیــەکان و پرنــسیپە یاساییەکان کە ببێتە بناغەی هەڵسوکەوتکردن لە نێوان گەلاندا".[٣٧]

لە سەرجەم ئەو چەمك و پێناسانەی لەلایەن بیرمەنـدان و زانایانــەوە خراونەتــە ڕوو دەتوانین بڵێین دیبلۆماسییەت پرۆسەیەکی سیاسیە ڕاستەوخۆ پەیوەســتە بــە ئیــدارە و ئاراستەکردنی پێوەندیەکانی دەرەوەی دەوڵەتان و گەلانەوە لــە پێنــاو خزمــەتکردن بــە بەرژەوەندیەکانیان.

بەو واتایە، دیبلۆماسییەت لەسەر چەمکێکی زانستی وەستاوە کە شێواز و دەستور و تایبەتمەندی دیاریکراوی هەیە بۆ ئەوەی دیبلۆماسییەت ببێتە چــەمکێکی دوور لــە ئاڵۆزی و نهێنی و نادیاری یاخود نەبێتە زانستێك لەسەر نهێنی و نادیــاری وەســتابێت پێویستی بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی قووڵ هەیە بــۆ دەستنیــشانکردنی مەبەســت و بنەماکانی، خۆ ئەگەر زۆربەی بیرمەندان تا ئەمڕۆ دوو دڵ بن لە ئاست پێناسەیەك بــۆ دیبلۆماسییەت لەوەی کە زانستە یاخود تەکنیکە یاخود پیشەیە، ئەوا ئێمــە لەلایــەن خۆمانەوە دیبلۆماسییەت بەمەیدانێکی فراوان لە زانست و زانین دەژمێرین، جــا هــەر سیفەت و تایبەتمەندیەکی درابێتە پاڵ، چونکە دیبلۆماســییەت مێژوویــەکی تایبــەت بەخۆی هەیە، واتە سەرهەڵدان و گەشەکردنی، هەروەها دەستور و شێواز و پرۆگرامــی تایبــەت بــە خــۆی هەیــە، و مەبەســتی دیــاریکراوە و ڕەوانــی بەســەر بوارەکــان و مەیدانەکانی دیکەی زانست و زانین و بوار و بابەتەکانی دیکەدا هەیە.

لــە کۆتاییــدا دەتــوانین بڵــێین دیبلۆماســییەت، زانــستە، تەکنیکــە، پیــشەیە، بەرنامەیە،[٣٨] خاوەن مێژوویەکی دیاری کــراوەو پەیوەســتە بەمێــژووی پێوەندیــەکانی

---

(٣٧)Traite de Diplomatie et droit dipomatique، Ed.A, Pedon, Paris,١٩٣١,t,١.PP.١٥-١٦.

(٣٨) پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کەوا کاری دیپلۆماسیەت تەنها تایبەت نیە بە دەوڵەتەوە، بەڵکو چەند لایەکی دیکەش هەن کەوا ئەم کارە دەکەن وەك ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان، و پارتە

نێوان ئادەمیزاد و دەوڵەتانەوە، لە بواری تیۆری و پراکتیکدا سەری هەڵداو گەشەی کرد، وەك هەموو زانستێکی سیاسی یاخود یاسایی (مافپەروەری)دا، کە بەرنامە و شێوازێکی دیاریکراو لە خۆ دەگرێت بۆ تێگەیشتنی و کارامەیی لە پەیڕەوی کردنیدا.

کەواتە دیبلۆماسییەت، تەکنیکی بەڕێوەبردنی پێوەندیەکانە لە نێوان کەسایەتیە نێودەوڵەتیەکان و پیشەی نوێنەرە دیبلۆماسییەکان یاخود پۆستێکە کەسانی دیپلۆمات پەیڕەوی دەکەن و گۆڕەپانی ئەو پۆستەیە، هەروەك پێوەندیەکانی دەرەوەی دەوڵەتان و نەتەوەکان و گەلانی جیهانیش.

هەروەها دیبلۆماسییەت پێویستی بە تواناو دەسەڵات هەیە بۆ ئەوەی بەزۆری حوکم بەسەر شتەکاندا بدات و خێرایی و چاپوکی دەخوازێت لە وەرگرتنی بڕیاری عەقلانی و یەکلاکەرەوەدا، کارامەیی لە ئەرکی دیبلۆماسییەتدا بە ئەزموون نەبێت بەدەست نایەت، هەروەها لێهاتوویی و باڵادەستی لە کاری دیبلۆماسییەتدا، بەرهەمی ئەزموون و قاڵبوونەوە زیاتر لەوەی بەرهەمی تیۆری ڕووت بێت.[٣٩] و وەك هەموو زانستێك دیبلۆماسییەتیش هەندێ نهێنی و نادیاری (غموض) لەخۆ دەگرێت، ئەو نهێنیانەی هەندێ لە نووسەران دەیدەنە پاڵ دیبلۆماسییەت وەك ئەوە وایە لە گەوهەردا بەپێی بۆچوونی ئێمە پەیوەست بێت بە (منطقی دەوڵەت).

پێویستە مرۆڤ لەوە تێبگات کە مەبەست لە بەرژەوەندی دەوڵەت چیە، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو نهێنیانە لێکبداتەوە و لەباروودۆخێکی گونجاودا ڕاڤەیان بکات. بۆیە دەبێت لەوە تێبگەین کە دیبلۆماسییەت بۆخۆی زانستێکە لەسەر پێی خۆی وەستاوە، و هەموو زانستێکیش پێویستی بە شێوازێکی دیاریکراو هەیە لە تەکنیك و چاپوکی، پێویستە لەو سۆنگەیەوە لە گوتەی هەندێ لە نووسەران بگەین، کاتێك دەستنیشانی پێناسەیەك بۆ دیبلۆماسییەت دەکەن، وەك زانستێك دەیناسێنن و لەهەمان کاتیشدا

---

سیاسیەکان، و گەلە کۆمە سیاسیەکان، و کۆمپانیاکان، و هتد...، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (علي حسين الشامي: س. پ، ل٣٧).

(٣٩) محمد سامي جينيه: القانون الدولي العام، القاهرة، ١٩٣٣، ص ص١٦-١٧.

وەك تەكنیكێك و وەك پیشەش، (جینیە) بە پشتبەستن بە (فودریە) دەڵێ:

"دیبلۆماسییەت زانستە، وەختێك پێویستە فێری بنەماو یاساكانی بیت، و تەكنیكە وەختێك پێویستە فێری دۆزینەوەی نهێنیەكانی بیت".[٤٠]

یاخود وەك (عزالدین فودە) دەڵێت: "دیبلۆماسییەت تەكنیك و زانست و یاسایە: تەكنیكە فێری دەبی، زانستە دەخوێنرێت، یاسایە پابەندی دەبیت".[٤١]

---

(٤٠) محمد سامي جينيه: س. پ، ل١٧.

(٤١) النظم الدبلوماسية، ص٥٣.

# واتای دیبلۆماسییەت

وشەی دیبلۆماسییەت چەند واتایەك لـەخۆ دەگرێـت، ڕەنگـە هاوواتـای دانوسـتان (مفاوضـة) و هـەموو ڕێوڕەسـم و شێوازەکانیـشی بگرێتـەوە، هـەروەها دەشـێ وەك هاوواتایـەك بـۆ سیاسـەتی دەرەوە بـەکاربهێنرێت، یـاخود بـەواتای ئـەو دەزگایـە بەکاربهێنرێت کە کاروباری دەرەوەی وڵاتان بەڕێوە دەبات، یـاخود ڕاسـتەوخۆ بـەمانای پیشەی پیاوێکی سیاسەتمەدار دێت. هەروەها دەشێ بەگەلێ واتای دیکـەیش بێـت وەك، سروشت، نەریت، بەهرە، ڕووخۆشی، چاپوکی، بلیمەتی، کارامـەیی، لـە بـەڕێوەبردنی دانوسـتانەکان و گفتوگـۆ نێودەوڵەتیەکانـدا، بەتایبـەت کاتێـك وەك سـیفەتێك بـۆ کەسێکی دیاریکراو بەکاردێت بەو مەزەندەیەی کـە هـەڵگری ڕۆحێکـی دیبلۆماسـی بەرزە.[٤٢] هەروەها دەشێ لای هەندێ کەسی دیکە مانایەکی سەلبی هەبێت، وەك ئـەو گوتەیـەی بـۆ نموونـە دەڵێـت: "دیبلۆماسـییەت فـرت و فـێڵ و چـاوو ڕاو هەڵخەڵەتاندنە"،[٤٣] تەنانەت نهێنی و نادیاریش بەتایبەت کاتێـك دەوترێـت، فلانـە کەس دیبلۆماسییە، واتە شێوازی نادیاری بەکارهێناوە وەك فرت وفێڵ و فریـودان بـۆ ئەوەی بگاتە مەبەستەکانی و ئارەزووەکانی بێنێتەدی.[٤٤]

وشەی دیبلۆماسییەت واتا گەلێکی جیاواز لـەخۆ دەگرێـت، بـە پێـی چوارچـێوەی گشتی کە لەمیانەیدا بەکاردەهێنرێت و بـۆ ئـەو نێوەرۆکـە واقعیـەی کـە بەسـەریدا جێبـەجێ دەبێـت، و دەیگرێتـەوە، دواتـریش بـەهۆی لایەنـە جیاوازەکانیـەوە کـە لەمیانەیاندا بۆ کەسی چاودێر دەردەکـەوێت. جگـە لەوانـەش مانایـەکی نادرووسـتی

---

(٤٢) هارولد نیکلسون: الدبلوماسیة، ٤٤: علی حسین الشامي: الدبلوماسیة، ٢٧.

(٤٣)R.Genet:Traite de diplomatie et droit diplomatique،Ed.A.Pedon، Paris، ١٩٣١ t، PP. ١٥-١٦.

(٤٤) ادونیس العکره:من الدبلوماسیة الی الأستراتیجیة، دار الطلیعة، بیروت، ١٩٩١، ص١٦.

هەیە کە زۆر وردنیە ئەویش ئەو واتا ناسراو بلاّوەیە کە هەموو واتاو ناوەڕۆکەکانی لـە زاراوەکەدا دەماڵێت ئەویش بەکارهێنانی دیبلۆماسییەتە بـۆ ناسـاندنی کەسـێك کـە شێوازی هەڵسەکەوت و مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا باش بێت و ڕووخۆش و زمان شیرین و نەرم بێت، بتوانێت کێشە ئاڵۆزەکان بـەلێهاتوویی و ژیرانـە چارەسـەر بکـات، ئـەو کەسە پێی دەوترێت پیاوێکی دیبلۆماسییە لە گوفتار و ڕەفتاریدا، مەبەسـت لـەوەش چاپوکی و کارامەییەتی لە هەڵسوکەوت و ڕاییکردنی کاروبارەکانی لەگـەڵ کەسـانی دیکەدا.

دوای ئەوە مانا ورد و پڕاوپڕەکانی دێت، ئەویش بە پێـی جیـاوازی ئـەو ڕوانگەیـەی دەگۆڕێـت کـە لێـوەی تەماشـای بابـەتی دیبلۆماسـییەت و پێکهاتـەکانی دەکرێـت هەریەکەیان بە جیاواز.

یەکەم: یەکەم واتا، لە واتا پـڕ بەپێـستەکانی چـەمکی دیبلۆماسـییەت، زانینـی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکان و بەرژەوەندیەکانی سەر بە هەر یەکێکـە لـە دەوڵـەتان کـە بەهۆی پەیماننامە و پرۆتۆکۆڵەکانەوە بەڕێوە دەچێت، و پێوەندی نێوان دەوڵـەتان ڕێـك دەخات، دیبلۆماسییەت بەو مانایەی بـەزۆری لـە زانکۆکـان و پەیمانگاکانـدا بـەکار دەهێنرێت بۆ ناساندی ئەو بابەتـەی ئـەو نـاوە هەڵـدەگرێت یـاخود ئـەو بـوارەی کـە توێژینـەوە و لێکۆڵینـەوەی پەیوەسـت بـە ممارەسـەکردنی سیاسـەتی دەرەوە چـۆنیەتی بەڕێوەبردنی و شێوازەکانی ئەو ممارەسەیە، سەرئەنجام واتایەکی ئەکادیمیە.[٤٥]

دووەم: دیبلۆماسییەت بریتییە لە خودی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکان، لەڕووی ئـەوەی کە کۆمەڵە چالاکیەکی سیاسـی و نەوعییـە (Speci Fiques) کەسـانێکی پـسپۆر بەڕێوەی دەبەن کە دەوڵەتەکانیان دەستیشانیان دەکەن و دەیان نێرن بۆ ڕاپەڕاندنی ئـەو

---

(٤٥) شامر كامل محمد: الدبلوماسية المعاصرة و استراتيجية إدارة المفاوضات، دار المسيرة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٠، ص٢٢.

ئەركانــەيان لەگــەڵ دەرەوەدا، وەك ســەفيرەكان و نێردراوەكــان و كۆمیــسیارەكان و بریكارەكان و ئەوانەش كە ئەركی سیاسەتی دەرەوەیان پێسپێراوە.(٤٦)

سێیەم: واتای سێیەمی پیشەییە، واتە لێرەدا ئاماژەیە بۆ فرمانێك یاخود كارێك بە كەسی نێردراو دەسپرێت بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی وڵاتەكەی لە دەرەوە بكات، بەو پێیــەی دیبلۆماسییەت بوارێكە بۆ ئەرك و چاكی نەوعی، بۆیە پێویستی بەدەزگایەك هەیە لە فەرمانبەران كەلە میانەیدا هەستن بەو ئەرك و كارانەی كە پێیان سپێرراوە، هەركەسە بەپێی پسپۆری و پلەی فرمانەكــەی لــە بازنــەی دیبلۆماســییەتدا. لەبەرئــەوە هــەر پۆستێك لەو بوارەدا بە ئەركێكی دیبلۆماسی دادەنرێت جا لــە هــەر پلــەو پایەیەكـدا بێت، بۆنموونە، دەوترێت فلاّن لە بواری دیبلۆماسییەتدا كار دەكات واتــە پیــشەیەكی دیبلۆماسی هەیە.(٤٧)

چوارەم: دیبلۆماسییەت ئەو دەزگا پیشەییەیە كە سەرجەم ئەندام و كارمەنــدەكانی ئەو بوارە دەگرێتەوە، بۆ نموونە، دەوترێت دیبلۆماسییەتی فلاّنی بەتــەواوی ئەنــدامانی سلكی (ڕێبازی) دیبلۆماسی یاخود ستافی دیبلۆماسی یــاخود دەســتەی دیبلۆماســی ئامادەی فلاّن ئاهەنگ بوون.(٤٨)

سەرئەنجام دیبلۆماسییەت گەلێ جار بەمانای نواندنی سیاسەتی دەرەوەی ئــەو وڵاتــە دێت لــە دەرەوە، واتــە نوێنەرایــەتی ئــەو پڕەنــسیپ و بنەمایانــە دەكــات كــە لەبــەر ڕۆشــناییان سیاســەتی دەرەوەی ئــەو وڵاتــە بەڕێوەدەچێت لەســەر شــێوازی ئوســوڵی پەیڕەوكراو لەبەدیهێنانی ئەو ئەركەدا.

---

(٤٦) مامون الحموي: الدبلوماسية، ص٢٤.

(٤٧) علي حسين الشامي: الدبلوماسية، ص٣٤.

(٤٨) عبدالفتاح شبانة: الدبلوماسية، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٢، ص١٤.

# مێژووی دیبلۆماسییەت

لەگەڵ سەرهەڵدانی یەکەم کۆمەڵی ئادەمیزاددا، پەیوەندیەکان ئاوێزان بوون و لە نێوان تاك و کەسایەتیەکاندا لەدایکبوون، بۆ نموونە وەك ڕاگرتنی شەڕ و کوشتارەکان، لە نێوان بەرژەوەندیە هاوبەشەکانیان، بۆ وەرگرتنی پشویەك یاخود بۆ سۆراخکردنی کوژراوان و تیمارکردنی برینداران، یاخود دابەشکردنی هەرێمەکانی دەسەڵات، یاخود دیاریکردنی ڕووخسار و ڕواڵەتەکانی ئایینده، یان هەر مەسەلە و بابەتێکی پەیوەست بە پەیوەندیە دیبلۆماسیەکان. بێگومان هەمیشە کەسانی ژیر و بلیمەت و قسەزان و بە ئەزموون و بەشەخسەیەت و عاقڵ چوونەتە ژێر باری ئەرکێکی وەها هەستیار و چارەنووسسازەوە، چونکە ڕاپەڕاندنی ئەم جۆرە ئەرکانە، کەسانی نەفس درێژ و شایستەو قسەزان و مەند و لەسەرخۆی گەرەکە، بۆ ئەوەی ئەرکەکانیان بەئەنجام بگەیەنێت، لێرەوە پەیوەندییە دیبلۆماسیەکان سەرچاوەیان گرت.

هەر لەگەڵ گەشەکردنی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، پەیوەندیە دبلۆماسیەکانیش لە نێوان کەسایەتیەکاندا گەشەی کرد، ئامانج و بوارەکانیشی زیادیان کرد. لەگەڵ پێشکەوتنی گەلاندا و زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و زیادبوونی پێداویستیەکانی هەر یەکێکیان، بازنەی هەڵسوکەوت و مامەڵە لە نێواندا فراوانبوو، بەرژەوەندیەکان زیاتر ئاڵۆزبوون و بەیەکاچوون، وایلێهات پەیوەندی نێوانیان بوو بە زەرورەتێك کە هەرگیز ژیانی گەلانی و دانیشتوان بەبێ ئەو پەیوەندیانە سەقامگیر نابێت.

هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەتانەوە بەسادەترین شێوەی سیاسیان، پەیوەندیەکانی نێوانیان جێگەی بایەخ و گرنگی ئەو دەوڵەتانە بوو، چونکە ئەو پەیوەندیانەیە دەستنیشانی ئاراستەکانی دەوڵەتێك لەبەرامبەر دەوڵەتێکی دیکەدا دەکات، لەهەردوو حاڵەتی جەنگ و ئاشتیدا، مێژووی پەیوەندیە دبلۆماسیەکان لە نێوان کۆمەڵگاکان و دەوڵەتاندا بە مێژوویەك دادەنرێت بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، کە لە

کۆنــەوە مرۆڤایــەتی بــەردەوام لــە ســازش و دانوســتاندا بــووە کــە ســەرجەم بــوارە سەربازیەکان و سیاسیەکان و شارستانیەکانی گرتۆتەوە، وە لەسایەی ئەو پەیوەندیانەوە ئیمپراتۆریەتەکان درووست بوون و گەشەیانکردووە و بالادەست بوون بەسەر دەولەتان و گەلاندا، و هەندێکی دیکەیشیان پوکانەوە و لەبەین چوون.

# مێژووی دیبلۆماسییەت

دیبلۆماسییەت بە چەند قۆناغێکی جیاوازدا تێپەڕیوە و لەگەڵ قۆناغەکانی پێشکەوتن و گەشەکردنی میللەتاندا هەنگاوی ناوە و بە پێی گۆڕانکاری هەر قۆناغێك لەگەڵیدا ڕۆیشتووە، لێرەدا وتەکەی ئەرستۆ بە بیر دێنینەوە کە دەڵێ: ((شتە جێگیرەکان گۆڕاون، کە ئەم شێوە گۆڕاوانەش کاری دیبلۆماسییەتە)). ئەو توێژینەوانەی سەبارەت بە مێژووی دیبلۆماسییەت کراون ئاماژە بە بەستنی پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان دەکەن، ئەو پەیماننامانەی کە سەرباری کۆنی و سەرەتایی یان... چەند بەندێکی زۆر گرنگی لەخۆ گرتبوو کە باس لە مەرجەکانی ڕێکەوتن و ئاڵوگۆڕکردنی دیلکراوەکانی جەنگ و هێرش و پەلامارەکان و دابەشکردنی دەستکەوتەکان و دەست بەسەراگرتنی داگیرکراوەکان دەکات لەگەڵ دەستنیشانکردنی ناوچەی دەسەلآتی هەر ولآتێك. لە ڕابردوودا پەیماننامە و ڕێککەوتننامەکان لەسەر بنەمای پرنسیپی دانوستاندن بە ڕێوە چووە لە نێوان کۆمەڵگەکان و ئەو گەلانەی پێوەندیان پێکەوە هەبووە. دەوترێت کۆنترین پەیماننامە بە زمانی ((مسماری – مێخی)) لە نێوان هەردوو دەوڵەتی بابلیدا ((لاتشی و ئوما))دا نووسراوەتەوە، هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە نێوان ئەو پەیماننامانەدا لە نێوان ((حیثیەکان و فرعونیەکان)) بووە کە لە ساڵی ١٢٧٨ پ –ز بەسترا، هەروەها ئەو پەیماننامانەش کە پێوەندی یان هەبووە بە خواوەندپەرستی و بەستنی ئاگر بەست[٤٩]، بەلآم لە کاتی گەڕاندا بە نێو لاپەڕەکانی مێژوودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە دیبلۆماسییەت لە چاخە کۆنەکانی کوردستانی کۆندا زۆر لە پێش ئەو ساڵانەی کە ئەوان باسی لێوە دەکەن هەبووە، بێگومان کاتێك پەیوەندی دیبلۆماسی پەیدا دەبێت کە دەوڵەت یان هێزی سیاسی لە ئارادا بێت، ئەوەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بەرژەوەندی سیاسی،

٤٩– عبدالفتاح شبانة: الدبلوماسية ،١،مكتبة مدبولي ، ط١، القاهرة ،٢٠٠٢، ص ١٤.

ئابووری و... تاد. تا ئێستە کۆنترین پێوەندی دیبلۆماسی لە کوردستاندا کـە زانرابێـت دەگەڕێتەوە، بۆ ناوەڕاستی هەزارەی سێیەم پ.ز. ئەوکات دەوڵەتێك بە ناوی خەمازی[٥٠].
لە ناوچەی زاموا (شارەزووری ئێستا) سەری هەڵدابوو، ئەم زانیارییانەش لە ئەرشـیفی ئیبلادا دۆزراوەتەوە کە بریتیە لە نامەیەك کە لـە لایـەن (ئـەرکب - دامـو) پاشـای (ئیبلا)[٥١] بۆ (زیزی) پاشای (خەمازی) نێررا بوو، لە نامەکەدا داوای سـەرباز کـراوە (فوزی رشید) پێی وایە ترسی هەردوولا لە دەوڵەتی کیش، هەبوو کە لەو سـەردەمەدا دەیویست هێرش بکاتە سەریان، ئەو پەیوەندییە درووست بووە بێگومان، ئەوە نیشانەی هێز و توانای دەوڵەتی خەمازییە کە دەسەڵاتی هەموو ناوچەکانی خۆرهـەڵاتی دیجلـەی گرتبووەوە[٥٢].

دوای ئەو ماوەیە بە گشتی زانیاری مێژوویمان دەربارەی پەیوەندییـە سیاسـییەکان کەم دەبێتەوە، هەرچەندە گۆتیەکان (٢١٩٨- ٢١١٦ پ. ز) دەسەڵاتیان هەبووە، بـەڵام بەهۆی نەبوونی سەرچاوە وە زانیاری ئەوتۆمان لە بەردەستدا نیـە. تـا لـە سـەدەی ١٩

---

٥٠- تا ئیستا نزیکترین ناو لە خەمازییەوە، گوندی ((خەمزە))یە لە باکوری ئەزمڕدا، بۆیە پێدەچێت ناوەندی شانشینی خەمازی لەو ناوچەیەدا بووبێت، تا ئێستاش ئەم بۆچوونە لە هەموو بۆچوونەکانی تر نزیکترە لە ڕاستییەوە، چونکە ناوەکە زۆر لە ناوی (خەمازی)یەوە نزیکە و بۆچوونەکانی تر بەڵگەی هاوشێویان نییە. بڕوانە: (فوزی رشید: مملكة خمازي، مجلة كاروان، عدد ٢١، (بغداد: ١٩٨٤)، ص ١٤٥)

٥١- ناوە نوێیەکەی (تل ماریخ)ە، دەکەوێتە باشوری حەلەب لە دەریا بە دووری ٧٠ کم، لە ساڵی ١٩٧٨ دا لە لایەن ئیتالییەکانەوە بە سەرپەرشتی (پێتیناتۆ) پشکنینی تێدا ئەنجام دراوە، و ١٦ هەزار تابلۆی قوڕی تێدا دۆزرایەوە، کە تیشکێکی گەورە دەخاتە سەر مێژووی خۆرهەڵاتی کۆن و کوردستان، بڕوانە: فوزی رشید، س.پ: ل ١٤٤)

٥٢- س.پ، ل ١٤٧.

پ.ز دا هۆزەکانی تورووککـوی خـوری[53] بـە سـەرکردایەتی زازیـا (Zazia) هـەموو ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دیجلە و ئیکاللاتوم لە خۆرئاوای دیجلەدا، کـە یـەکێك بـوو لـە ناوەندەکانی ئاشور، کەوتە دەسـت زازییـاوە ئەگـەر هێرشـی گۆتیـەکان نـەبوایا زۆری نەمابوو شوبات – ئینلیلی ناوەندی ئیشمی – داگانی کوڕی شمشی – ئـەدەد بگـرن[54]. دوای ئەو ماوەیە چەندین جار ناوچـەکانی کەڕانـە و ئاشـور کەوتبوونـە بـەر هێرشـی توروکییەکان و شارێکییان بە ناوی ماردەمـان لەسـەر دیجلـە خـستە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیانەوە و (نەینەوا) یان کرد بـە ناوەنـدێکی گرنگـی خۆیـان[55]. شـایانی باسـە کـە دەوڵەتی توروکو بە شێوەیەکی زۆر فراوان بڵاوبوو بووەوە، لە خۆرهەڵاتەوە تا زاگرۆس و لە خۆرهەڵاتەوە تا خۆرئاوای دیجلە بوو، کە دواتر ببوە بەشێك لە دەوڵەتی میتانی، کە لە ڕاستیدا ئەوەش هەڕەشەیەك بوو بۆ سەر دەسەڵاتی دەوڵەتـەکانی ئاشـور، کەڕانـە و بابل، بۆیە پێوەندی دیبلۆماسی کەوتە نێوانیانەوە، تەنانەت نوێنەری زازییا کە لە بابل بووە بەدیل کراوە و پاشای ئاشـوری (ئیـشمی - داگـان) چـەند جارێـك داوای پەیوەندیکردنی لەگەڵ (زازیا) کردووە.[56]

لەو ماوەیـە بـەدواوە، حـامورابی (١٧٩٢-١٧٥٠ پ.ز) پاشـای بابـل، دەسـەڵاتی بەهێزبوو بوو، لە ساڵەکانی سی و حەوتەمینی فەرمانڕەوایەتیدا باسـی لـە بەزانـدنی

---

٥٣- دەربـارەی خوریـەکان بڕوانـە: کـامران محمـد جـلال، نـوزی لـە هـەزاری ٢ی پ.ز دا، نامـەی ماسـتەر (بلاونـەکراوە) پێـشکەش بـە بەشـی مێـژووی کـۆلیجی زانـستە مرۆڤایەتیـەکان کـراوە، ٢٠٠٤، ل ٢٨ – ٤٢.

٥٤-Ahmed , Kozad: The Northern Transtigris In the First Half of the Second Millennium B.c, (University of Leiden – The Netherlands: ٢٠٠٣) , P. ١٢٥.

٥٥ –Ibid , Pp. ١٢٣ f .

٥٦- زازییا کچێکی خۆی بە کوڕێکی ئیشمی – داگان دا، لە بەرامبەردا زێڕ و زیوی وەرگرت، تا لە لای ئیشنونا و توڕوکو دڵنیابێت، لەو کاتـەدا حـەمورابی لـە باشـورەوە لـە گەشەسـەندندا بوو، بڕوانە: Laessøe , PAA (P.٤٣).

هاوپەیمانێتی ئیشنۆنا، مالیگیوم[٥٧]، گوتی، ئاشور و ئەنداریق[٥٨] و تورۆکوی کردووە[٥٩].
بەلاَم بەلگەیەك بە دەستەوە نییە کە حەمورابی بەسەریاندا زاڵ بووبێت یان ولاَتەکانیانی داگیر کردبێت، چونکە ئەو سەرکەوتنە دوای ئەوە بووە کە هێزەکانی ئەو هاوپەیمانێتیە لە داگیرکردنی بابلەوە نزیك بووبووەوە، هەروەها ناچاربووە کە پەیوەندی لەگەڵ زازییایدا ببەستێت و دواتریش، سامسو - ئیلۆنای (١٧٤٩ - ١٧١٤ پ. ز) کوڕی حەمورابی ژمارەیەك لە دیلەکانی جەنگی بۆ گەڕاونەتەوە.[٦٠]

لە ناوەڕاستی هەزارەی ٢ پ.ز دا دەوڵەتی گەورە لە کوردستاندا سەری هەڵداوە، بەتایبەت دەوڵەتی میتانی. سەرهەڵدان و فراوانبوونی دەوڵەتی میتانیی - خوری و هاوپەیمانەکانی لە سەردەمی پاراتارنادا بووە هۆی دەست بەسەرداگرتنی ڕێگە بازرگانییەکانی ناوچەکە، بەلاَم لەشکرکێشییەکانی سەر لە نوێی میصر لە سەردەمی تحوتمسی سێیەمدا (١٤٩٠ - ١٤٣٦ پ.ز) لە نزیکەی ١٤٥٧ پ.ز و دواتر لە نزیکەی (١٤٤٧-١٤٣٨ پ.ز) تارادەیەك بە شێوەیەکی کاتی کاریگەری هەبوو[٦١]. چونکە بەشێکی زۆری ئەو ناوچانەی خۆرئاوای فوراتی داگیرکرد و هاوپەیمانەکانی میتانی بۆ ماوەیەك کەوتنە ژێر دەسەلاَتی میصرەوە[٦٢]. دوای (پاراتارنا) ناوچەکە ماوەك پڕبوو لە شەڕوشۆڕ، وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا کە سنووری دەوڵەتی میتانی کەوتە بەر هێرشی

---

٥٧- شانشینێك بوو لە باشوری ناوچەی بەیەکگەیشتنی دیالە بەدیجلەدا بووە، کە تا پارێزگای ناصریەی ئێستای گرتبۆوە، محمد طه الاعظمي: حمورابي (١٧٩٢-١٧٥٠ق-م)، شركة عشتار للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٩٠، ص٧٢.

٥٨- ئەم دەوڵەتە لەسەر دیجلەدا، لە نێوان ئەڕاپخا و ئیکاللاتوم بووە، س.پ، ل٧٦.

٥٩- هـ.س، ل ٧٦ - ٧٧.

٦٠- کامران محمد جلال: س.پ، ل ٦٦.

٦١-جرنی: س.پ، ل٤٧.

٦٢-Wilson , John A ,"Eygptian Historical Texts –The Asiatic Campaignsof Tut –mose III", in ,ANET, P.٢٣٥.

دراوسێکان و لەو ماوەیەدا لەو زانیاریانە زیاتر کە دەربارەی دەوڵەتی هیتی و میصر هەبوون، هیچی دیکە لەبەر دەستدا نییە.

دواتر لە دوای لەشکرکێشییەکانی تحوتمسی سێیەم لە دەوروبەری ١٤٣٠ پ.ز دا پاشایەکی دیکە دەسەڵاتی وەرگرت بەناوی میتانی شەوشتەتار (ŠauŠtatar)، دەرکەوت کە دەوڵەتی میتانی لاوازی و کە نەفتەکاری پێوە دیاربوو. ڕێکخستنەوەی وڵات، لەو سەردەمەداو واشوگاننی[٦٣] پایتەختی میتانی بووە دەستی بەڵام دواتر فراوانخوازی ئەم دەوڵەتە ڕووی لە گەشەسەندن و پەرەسەندندا بوو کە توانی سەرلەنوێ لە باشوورەوە شانشینی ئاراپخا (کەرکوکی ئێست) بخاتەوە سەر دەوڵەتی میتانی، بەمەش سنووری گەیشتە حەمرین و دیالە، لە خۆرئاواشەوە توانی دووبارە شاری ئالالاخ بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی و نەوەیەکی ئیدریمی بە ناوی نیقمێپیا (Niqmepea) لەسەر فەرمانڕوایەتی دانا.[٦٤]

پاش ئەوەی ئەم دەوڵەتە هەندێك لە ناوچەکانی سوریای گرتەوە ئیدی هەنگاوێکی دیکەی ئەوەبوو کە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ (فیرعەون)دا ببەستێت، تا بەیەکجاری دەوڵەتەکەی بەهێز بکاتەوە، هەر بەهۆی دڵنیابوونی لە سنوورەکانی خۆرئاوایدا لە هەنگاوێکی دیکەیدا بەهۆی لەشکرکێشیەکەوە ئاشوری داگیرکرد و دەسەڵاتی بەسەردا سەپاند.[٦٥]

---

٦٣- بە بۆچوونی هەندێ زانا دەکەوێتە (تل فخاریە) لە سەرچاوەکانی خابور لە سنوری سوریا- تورکیا ، یان لە گەڵ شاری یکانی (راس العین)دا لێکی دەدەنەوە، بەڵام بەهۆی تاقیکردنەوەی تیشکدانەوەی نیترۆنی لە سەر نامەکەی توشراتا، کە دەبێ لەوێوە بۆ فیرعەونی ناردبێت، ئەمەی نەسەلماند، بەڕای (ڤیلهلم) دەکەوێتە نزیك ماردین: (الحوریون، ص٦٢).

٦٤-Geld , I: "Hurrians and Subarians", in: OIP, Vol. ٢٢, (Chicago:١٩٥٤), Pp. ٧٦ -٧٧.

٦٥- جمال رشید احمد و فوزی رشید: تاریخ الکرد القدیم، مطابع دار الحکمة، اربیل، ١٩٩٠، ص٧٣.

دوای مردنی باوکی ارتاتاما له نزیکەی ١٤٠٠ پ.ز هاته سەر تەخت، لەو کاتەدا ناوبەناوە تحوتمسی چوارەم (١٤٠٠ – ١٣٩٠ پ.ز) هێرشی دەبردە سەر سوریا، بەڵام دوای ئەوەی کە تحوتمسی چوارەم چوارجار داوای کچە پاشای میتانی کرد و ئەرتەتامای یەکەم ڕازی بوو کە کچەکەی خۆی بە فیرعەون بدات، ئەمجارەیان بەشێوەیەکی چەسپاوتر پەیوەندی دیبلۆماسی کەوتە نێوانیانەوە[٦٦]. هۆی دامەزراندنی ئەم پێوەندییەی نێوان میصر و میتانیش بۆ بەرژەوەندی هەردوولا لە بەرابەر دەسەڵاتی هیتی لە لایەك و بارودۆخی ناوخۆیی هەردوولا لە لایەکی دیکەوە دەگەڕایەوە[٦٧].

شوتتارنای دووەم لە دەوروبەری (١٣٨٠ پ.ز) جێی باوکی گرتەوە ئەوەی لە سەردەمی ئەم پاشایەدا زانراوە ئەوەیە کە لە هەموو ڕوویەکی سیاسی و سەربازییەوە توانیبووی هێز و شکۆی دەوڵەتەکە بپارێزێت و هەرێمەکانی سەر بە میتانی لە گەشەیەکی بەرچاودا بوون، بە تایبەتی ناوچەی ئەڕاپخا بووبووە ناوەندێکی ئابووری گەورە. لە ڕووی سیاسییەوە پەرەی بە پێوەندییەکانی لەگەڵ میصردا دابوو، پێوەندییەکانی باوکیشی بە ناردنی کچێکی بەناوی کیلو-خیپات (Kilu-Ĥepat) بۆ ئەمنوفسی سێیەم (یان ئەمنحوتب) (١٣٩٠ - ١٣٥٣ پ.ز) دووپات کردەوە[٦٨].

لە سەردەمی هەردوو ئەو پاشایانەدا پەیوەندییەکانیان بەرەو پێش دەچوون، کاتێك کە فیرعەون نەخۆش کەوت و شوتتارنا بەمەی زانی پەیکەری خواوەند شەوشکا (عشتار)ی نەینەوای بۆ نارد، کە بە توانایی چاکبوونی نەخۆشی ناسرابوو[٦٩].

دواتر دەوڵەتی میتانی بە سەردەمێکی لاوازدا تێپەڕی تا هاتنەسەر تەختی پاشایەکی دیکە کە ئەویش توشراتا بوو، دوای ڕێکخستنەوەی وڵات، هەوڵیدا بۆ گێڕانەوەی پەیوەندی لەگەڵ میصردا و پاش دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ نامەیەکی

---

٦٦- .Gelb, I: op. cit., p.٨٠

٦٧- کامران محمد جلال: س.پ، ل٨٢.

٦٨- جمال رشید و فوزي رشید، س.پ، ل ٧٣-٧٤.

٦٩ - . Gelb , Op. Cit., p.٧٧

دوورودرێژی، لەگەڵ کچێکی بە ناوی تادو – خیپات بۆ ئەمنوفسی سێیەمی نارد.

(Tadu-Ĥepat) کە درابوو بە فیرعەون، لە بەرامبەر هاوپەیمانێتیکردنی لە دژی دوژمنانی هەردوو وڵات، بوو لە بواری یارمەتی ئابووریدا، بە تایبەتی زێڕ، چونکە میصر بە زێڕ دەوڵەمەند بوو. دوای ماوەیەك دووبارە دەوڵەتی هیتی لە سەردەمی (تودخالیاش) لە باکووری خۆرئاواوە توانی کیزواتنای هاوپەیمانی میتانی بە پەیماننامەیەك ببەستێتەوە، بەوەش میتانی بەشێك لە هاوپەیمانەکانی خۆی لە دەستدا کە لە نێوان شاوشتەتار و شنوشورای پاشای کیزواتنادا بەسترابوو[٧٠]. توشراتا، تا ئەو کاتە توانیبووی دەسەڵاتی دەوڵەتی میتانی بپارێزێت، ئەمەش لەگەڵ چەند نامەیەکدا[٧١] دەردەکەوێ کە دەستکەوتەکانی شەڕی لەگەڵ خاتیدا بۆ فیرعەون ناردووە[٧٢]، توشراتا بۆ جاری دووەم ئامادەیی بۆ ناردنی خواوەند شاوشکا بۆ چاکبوونەوەی فیرعەون دەربڕی، هەرچەندە ڕاوبۆچوونی وا هەیە کە لەو کاتەدا ئاشور لە لایەن پاشایەکییەوە ئاشور-ئوبلگ (١٣٦٥-١٣٣٠ پ. ز) خۆی لە دەسەڵاتی میتانی رزگار کرد، کە لە نامەکەیدا بۆ ئەخناتون (امنوفسی چوارەم) ١٣٥٣-١٣٣٦ پ. ز وەك پاشایەکی هاوتای (فیرعەون) خۆی پێشانداوە، بۆیە مەرج نییە شاوشکا ئەوە بگەیەنێت کە ئاشور لەژێر دەسەڵاتی میتانیدا بووبێت، بەوپێیەی شاوشکا لە پایتەختی (میتانی)شدا پەرستراوە.[٧٣]

هەرچۆنێك بێت، پێناچێت ئوشراتا سەرقاڵی ڕووداوی لەو جۆرە بوبێت وەك لە نامەکانیدا دەردەکەوێت کە بۆ (ئەخناتون)ی ناردبوو، چونکە تەنها باس لە هێرشەکانی هیتی کردووە و ڕێی تێدەچێت ئەو نامەیەی ئاشور ئوبلگ کە بۆ

---

٧٠- فلهلم ، ج: الحوريون، تروت: فاروق اسماعيل، دار جدل، (حلب:٢٠٠٠) ، ص ٦٩.

٧١- چەند نامەیەکی دیکەی توشراتا کە بۆ فیرعەونی ناردووە، ژمارەیەکیان بە زمانی ئەکەدی بوون، بڕوانە: Gelb, HS, P. ٧٢ .

٧٢- جرنی، الحيثيون: س–پ، ل ٤٩.

٧٣- فلهلم: س. پ، ل٧٠.

ئـەخناتونی نـاردووە، لـە دوای وەرگرتنـی دەسـەڵاتی لـە ئاشـور، بەتایبـەتی پـاش ڕێکخستنی دەوڵەتەکەی بوویێت کە ئەوەش پێویستی بە ماوەیەك هەبووە.

لە دوای دەوڵەتی میتانی دەسەڵاتی سیاسیی نیشتمانی نەما، تـا لـە سـەدەی ٧ ی پ.ز دا دەوڵەتی ماد[٧٤]، دامەزرا. کیاکسار (کەی ئەخسار) پاشای ماد لە دوای چـەند شەڕێك لە گەڵ ئاشورییەکاندا توانی هەموو ناوەندەکانی ئاشوریەکان لـە ناوچـەکانی زاگرۆسدا بخاتە ژێررکێفی خۆیەوە و لە ساڵی ٦١٤پ.ز دا گەیشتنە شـاری ئـەڕاپخا[٧٥] (کەرکوکی ئێستە). دواتر کیاکسار لە هێرشـەکانیدا بـۆ سـەر نەینـەوای پایتـەختی ئاشوری سەرکەوتوو نەبوو، لە هەمانکاتـدا نابوبلاسـر(٦٢-٦٠٤پ. ز) پاشـای بابـل دوای سەربەخۆ بوونی وڵاتەکەی لە دەست ئاشوریەکان نەیتوانیبوو شاری ئاشور داگـیر بکات، بەو شێوەیە هەردوو هێزی (ماد و بابل) لە هاوپەیمانێك دەگەڕان کە بەهۆیـەوە بتوانن بەیەکجاری دەوڵـەتی ئاشـوری لـە ناوبـەرن، لەبەرئـەوەی دوای گرتنـی شـاری ئاشور[٧٦]، کیاکسار و نابوبلاسر پەیوەندیان بە یەکەوە کرد و لەم شارەدا ڕێکەوتنێکیان لە دژی ئاشور مۆرکرد[٧٧]. بە پێی ڕێکەوتنەکە کچی کیاکسار بە ناوی ئەمیتس درایـە نەبوخەدنەصری کـوڕی نابوبلاسـر، هـەر بـەپێی ڕێکەوتنەکـە دوای ڕووخـانی ئاشـور بڕیاردرا بەشی باکووری خۆرهەڵاتی ئاشور بدرێتە ماد و بەشـی باشـوری خۆرهـەڵاتی

---

٧٤- زاراوەیەکی جوگرافیە بۆ ناوچەیەکی دیاریکراو لە زاگرۆس بۆ یەکەم جار لە سـاڵنامەی شەلمانـصەری سێیەم (٨٥٨-٨٢٤ پ. ن) بـەکارهاتووە، بـەڵام دواتـر بەسـەر گـەلانی ناوچـەکەدا سەپاوە و ئەو دەوڵەتەی هینـدۆ – ئێرانیەکان دایانمەزراند بە ماد ناسرا. جمال رشید و فوزی رشید، س. پ،ص ١١١-١١٢.

٧٥- ئی. م. دیاکۆنۆف: میـدیا، وە. بورهـان قـانع، چ٢، مەکتـەبی ناوەنـدی ڕاگەیانـدنی (ی.ن.ك)، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٧٠-٢٧١.

٧٦- ئێستا شەگاتی پێ دەوترێت لەسەر ڕووباری دیجلە لە خۆرئاوای کەرکوك بە ٨٤ کم.

٧٧- هـاری سـاکز: عظمـة اشـور، تـر. خالـد اسـعد عیسـی و احمـد غسـان سبانو. ط١، مؤسسـة رسلان علاءالدین، دمشق، ٢٠٠٣، ص ١٦٤.

بدرێت بە بابل[78]. بەڵام تا ئێستە بە تەواوەتی چۆنیەتی دەستپێکردنی پێوەندی ئەم دوو دەوڵەتە نەزانراوە، گەرچی لە ڕووداوەکاندا وا دەردەکەوێت کە هەردوولا پێویستیان بە یەکتری هەبوو بێت.

لە دوای ڕووخانی ئاشور کیاکسار بەرەو باکوور و باکووری خۆرئاوا فراوانخوازی دەست پێکرد و پاشان ڕوو بە ڕووی دەوڵەتی لیدیا (لە خۆرئاوای ئاسیای بچوك)بووەوە، بەڵام هیچیان نەیانتوانی بە سەریەکدا سەربکەون، بۆیە دوای ناوبژیکردنی بابل ڕێکەوتن کەوتە نێوانیانەوە کچی پاشای لیدیا درایە ئاستیاگزی کوڕی کیاکسار.[79]

هەروەها هەندێ لە سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن سەرهەڵدانی دیبلۆماسییەتی کۆن لە دەریای ناوەڕاستدا بووە ئەو ناوچەیەی کە شارستانیەتە کۆنەکانی تێدا دەرکەوتووە. هەر سەبارەت بە دیبلۆماسییەتی کۆن لەم ناوچانەدا، ئەوە دەردەکەوێ کە جیهان بەو کاتانەدا بە جیاوازی شارستانیەکانەوە پێوەندی بازرگانی و دیبلۆماسی لە نێوان پادشاکاندا درووستکردووە[80] کە ئەمەش لە ڕێگەی نێردراوەکانیانەوە ئەرکی دانوستاندن و نوێنەرایەتی و پێوەندیکردنیان پێدەسپێردرا، لەو سەردەمانەدا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە ئەورووپا خاوەنی زۆرترین هێز و دەسەڵات بوون بە بەراوردکردن لەگەڵ شارستانیەکانی دیکەدا، دواتر ڕۆمان پاش گریکەکان کارێکی زۆریان پێشکەش بە دیبلۆماسییەت کرد بە درێژایی قۆناغەکانی مێژووی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، کە لێرەدا دەکرێ دابەش بکرێت بۆ دوو قۆناغ:-

**قۆناغی یەکەم:-** قۆناغی درووستبوونی دەوڵەتی یەکگرتوو کە لە سەرەتای سەدەی یەکەمی پێش زاینیدا بوو، واتە پاش سەرکەوتن بەسەر شارستانیەتی یۆنانیەکاندا، فراوانبوونی لەچەند ناوچەیەکی وڵاتانی دەریای ناوەڕاستدا.

---

٧٨- جمال رشيد و فوزي رشيد، س. پ، ل١١٤.

٧٩- دیاکۆنۆف: س.پ، ل ٣٨٧.

٨٠- لويسی دوللو: التاريخ الدبلوماسي، ت-د. سموحي فوق العادة، عويدات للنشر و الطباعة، بيروت، ١٩٩٩.

**قۆناغی دووەم:-** قۆناغی دابەشبوونی ئیمپراتۆریەکە بە دوو کەرتەوە، واتە بەدوو ئیمپراتۆریەت:

أ/ ئیمپراتۆریەتی رۆژئاوای پیرۆز و پێتەختەکەی رۆمایە.

ب/ ئیمپراتۆریەتی رۆژهەلاتی (بیزەنتی) و پایتەختەکەی کەستەنتینیە.[81]

مێژووی دیبلۆماسییەت بریتییە لە مێژووی پێشکەوتنی پێوەندی نێوان ولاتان وەك قەوارەیەکی سەربەخۆ کە لەسەر نەخشەی جیهاندا بوونیان هەبوو پێوەندی جۆراوجۆر لە نێوانیاندا دروست دەبێت.

لێرەدا رێرەوی ژیانی سیاسی لەناو دەولەتاندا بە واتای مێژووی دیبلۆماسی و نایەت بابەت بۆی تەنها ئەوە نەبێت کە کاریگەری لەسەر پێوەندیەکانی دەرەوە دەبێت کە راستەوخۆ لە نێوان ئەو ولاتانەدا دروست دەبێت، ئەمەش لە لایەك وەك پێداویستی ئابووری و سیاسی و لە لایەکی دیکەوە کارکردنە لە نەهێشتنی کۆت و بەندە جوگرافیە لێکچووەکان و گەیشتنە بەسنوورە سروشتی یەکان و دەریا ئازادەکان یاخود رووبەرووبوونەوەی قەیرانەکانی ئەو ناوچانەیە کە منشاری دانیشتوانی زۆریەیان لە سەرە یان بە مەبەستی پاراستنی رێگە ستراتیژیەکانە[82]. لە هەمان کاتدا گەشەکردنی سیاسەتی دەرەوە بەدوو ئاراستەی ئالۆزدا تێپەریوە کە هەردووکیان تەواوکەری یەکترین لە پێناوی ئامانجە دیاریکراوەکاندا کە ئەوانەش ئاراستەی ئاشتی و شەرن. مێژووی دیبلۆماسییەتیش بۆ خۆی لە چوارچێوەی سیاسەتی دەرەوەدا دەست پێدەکات کە ئەمەش لە خۆیدا واتای ئاشتی دەگەیەنێت و رووداوە سەربازیەکان بەلایەکدا جێدەهێلێت، بەلام بێ ئەوەی لە سوود وەرگرتن و بەکارهێنانی ئەم توانا سەربازیەیان دەستبەر دابێت کە تا ئەندازەیەکی زۆر کاریگەری لە سەر دیبلۆماسییەتی ولاتاندا

---

٨١- علي حسين الشامي: س.پ، ل ٢٣.

٨٢- ادونيس العكرة: من الدبلوماسية الى الاستراتيجية، دار الطليعة، ط١، بيروت،١٩٨١، ص١٤.

جێدەهێڵێت. بەدەستەواژەیەکی دیکە، مێـژووی دیپلۆماسـییەت سـوود لـە لایـەنی ئاراستەی جەنگ وەردەگرێت لە پێوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا بەقەد ئەوەی کـە بتوانێـت بنەمای نویّ دابرێژرێت و دەرخستنی بەخشەرێکی نویّ بێت بە مەبەستی دامەزراندن و درووستکردنی پێوەندی ئاشتیخوازانەی نویّ. بێگومان لـە مێـژووی دیپلۆماسـییەتدا هێندە ناڕوانرێتە ناوی جەنگ و ئەفسەرەکانی بـەو ئەندازەیـەی کـە دەڕوانرێتـە نـاوی رێککەوتننامە و پەیماننـامە و ئاگربەست و ئاشتبوونەوەکان.[٨٣]

مێژووی دیبلۆماسییەت بەم شێوازە کلاسیکیەی لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەستپێدەکات واتە پاش شەڕی سەد ساڵەی نێوان فەڕەنسا و بەریتانیا (١٣٣٧-١٤٥٣ ز)، کاتێك دەوڵەتی نویّ سەری هەڵدا، و بیرۆکـەی ئیمپراتۆریـەتی جیهـانی (میراتـی ڕۆما) شکستی هێنا کە (چارلمان و ئوتۆی) گـەورە بـە شـێوەیەکی کـاتی هەوڵیانـدا زیندووی بکەنەوە، هەروەها (شارل – کان) هەوڵیدا بە قازانجی خۆی دووبارەی بکاتەوە، بـەڵام بـێ هـودە بـوو، و هەریـەك لـە بـەریتانیا و فەڕەنـسا و ئیـسپانیا و سـوید دەستپێشخەربوون لە پێکهێنانی گروپێکی سیاسی یەکگرتوودا یان پێکهێنانی لە ژێر سایەی پادشایەتیەکی بەهێزدا. تا لێـرەدا کێبڕکـێ نیـشتمانیەکان جێگـەی کێبڕکێـی سـەرکردە فیۆداڵـەکانی گرتـەوە و هـیچ دەسـەڵاتێك نەمایـەوە بـۆ پیـاوانی ئـایینی مەسیحی. لە هـەمان کاتـدا سـەردەمی ڕێنیـسانس بـواری بـۆ عەلمانیـەت و گیـانی ڕەخنەگرتن ڕەخساند، و ئەو تەباییە روحیەی هەڵوەشاندنەوە کە لەو ڕۆژگار و چەرخەدا بە دەستییەوە دەیناڵانـد. هـەر لـە هـەمان سـەردەمدا ١٤٥٣ز تورکـە عوسمانیـەکان دەستیان بەسەر شاری کەستەنتینیەدا گرت، و لە لایەکی دیکـەوە دەرکردنـی عەرەبـە موسوڵمانەکان لە ئەندەلوس و دۆزینەوەی جیهانی نویّ (ئەمریکا) لە سـاڵی ١٤٩٢دا و دەستپێکردنی بزووتنەوە جوگرافیەکان، ئەمانە هـەموو هۆکـاربوون بـۆ وروژانـدنی

---

٨٣– عزالدين فودة: س. پ، ل ٢٢.

کێشەی ڕۆژهەڵات و پەیدابوونی کێبڕکێی یەکەمی ئیمپریالیزمی، کە ئەمانەش تێکڕا ئاسۆی دیبلۆماسەتیان فراوان کرد تا ئەوکاتەی لە ئەورووپای ڕۆژئاوا و ناوەڕاستدا سنووردار بوو.[84]

---

٨٤- علي عبدالقوي الغفاري: س.پ، ل٢٧.

## دیبلۆماسییەت لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ)

نیمچە دورگەی عەرەب وەك پێگەیەك ڕێگە کاروانەکانی نێوان باکوور و باشوور و ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی بەیەکەوە دەبەستەوە کە ئەمەش یارمەتیدەر بوو لە درووستبوونی پێوەندی بازرگانی و چەندین پێوەنی دیکە لە نێوان عەرەب و دراوسێکانیدا. وەك سەرەتا لە نێوان تیرەکانی دورگەی عەرەب و پاشان لە نێوان ئەوان و هێزە سیاسیەکانی ئەو سەردەمەدا کە گرنگترینیان فارس و ڕۆمەکان بوون.[85] بە واتایەکی دیکە عەرەب پێش ئیسلام شاند و پێوەندی دیبلۆماسی خۆیان هەبوو و گەشتکردن بۆ ئەوان بە کاروانی بازرگانی و کۆبوونەوە لە بازارەکاندا لە سەردەمی حەجدا و ڕۆشتنی شاعیرەکان بۆ لای پادشاکانی (فارس و حیرە و غاسنە و حمیر) وەك ئامرازی پێوەندیکردن و درووستبوونی پێوەندی دیبلۆماسی لای عەرەب پێش ئیسلام هەر هەبووە لە لایەکی دیکەوە یەکێتی پێکهاتن و زمان و داب و نەریتەکان و چەمکەکان هۆکارێك بوو بۆ بەهێزکردنی پێوەندیەکانی عەرەب بەیەکتریەوە لە پێش ئیسلامدا، جگە لەوە بەهۆی ئەو بنکە ستراتیژی و مەڵبەندە بازرگانیە لە نێوان میرنشینەکان و گەلانی دیکەدا کاریگەری لەسەر هاندانی پێوەندیەکی نوێ و درووستبوونی پێوەندی دیبلۆماسی هەبوو.[86] (الواقدی) وای دەگێڕێتەوە کە قورەیش پێش ئیسلام گەر نێردراوێکیان بناردایەتە لای پادشاکان پێیان دەوت ((شتێك لەبەر بکە و چانسێکە دەرفەت وەربگرە،...هتد)).[87]

بۆ نموونە لەو باڵوێزخانە عەرەبیانەی کە پێش ئیسلام زانراون، باڵوێزخانەی

---

٨٥- جمال بركات: الدبلوماسية ، ماضيها و حاضرها و مستقبلها، مطابع الاهرام، القاهرة،١٩٩١.ص٣٥.

٨٦- هشام الشاوي: س-پ، ل٣٥.

٨٧- بۆ زیاتر بڕوانە (ابن الفداء: كتاب رسل الملوك و من يصلح للرسالة او السفارة، تحقيق د.صلاح الدين المنجد، القاهرة ، ١٩٤٧،ص ٢٨)

(عبدالمطلب بن هاشم)بوو بۆ لای ئەبرەهەی حەبەشی لەکاتی هاتنی بەرەو مەکە دانوستاندنی لەگەڵدا کرد بە مەبەستی گێڕانەوەی وشترەکانیان کە حەبەشیەکان دەستیان بە سەردا گرتبوو.[88] بەڵام پاش هاتنی ئیسلام دیبلۆماسییەت گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەبوو، بە تایبەتی پاش پێکهێنانی یەکێتییەکی رامیاری و دامەزراندنی دەوڵەت لە شاری مەدینەدا بە سەرۆکایەتی (محمد) د.خ. پاشان لەسەر حسابی گەلانی دیکە سنووری دەوڵەتەکەیان فراوان کرد و ئیمپراتۆریەتەکەیان دامەزراند. هەڵبەت لە سەرەتادا پێوەندیەکانیان لەگەڵ میللەتانی دیکەدا تەنها پەیوەست نەبوو بە بازرگانییەوە، بەڵکو پەلی هاوێشت بۆ ئاسۆیەکی پرشنگدار کە هونەری دانوستاندنی دیبلۆماسی پاش شەڕ بووە یەکێك لە ئامرازە بنچینەکان لە جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەوەیان.

دیبلۆماسییەت لە سەردمی پێغەمبەر و خەلیفەکانی ڕاشیدیدا بە مەبەستی بانگەوازکردن بۆ ئایینە نوێکە بەکارهاتووە، بە مەبەستی ڕاگەیاندنی جەنگ و بەرگریکردن لێی لە هەمان کاتدا هەوڵدان بۆ بەستنی پەیماننامە لە گەڵ نوێنەرانی ناوچە دەست بەسەردا گیراوەکان هەر ئەو دەمە. پێغەمبەر شاندێکی وەك نوێنەرایەتی کردن نارد بە مەبەستی پێوەندیکردن لە گەڵ سەرۆك هۆزەکانی ناوچەکە دا ناردووە و پاشان لە گەڵ پادشا و سەرۆکی وڵاتانی دەور وبەری حیجاز دا پێوەندی بەستووە بە ئامانجی ناساندن و ئاشنابوون بە ئایینە نوێکە و بانگەشەکردنیان بۆ هاتنە ناو ئایینی ئیسلام، لە سەرەتادا پێغەمبەر نوێنەری خۆی ناردە لای هەر یەك لە نەجاشی پادشای حەبەشە[89]، و هرقل ئیمپراتۆری رۆم[90] و کیسرای ئەنوشیروانی شای ساسانیەکان[91] و

---

٨٨- ابن هشام: السيرة النبوية، تحقيق شيخ محمد محي الدين عبدالحميد، القاهرة، ١٣٥٦،ج١/ص ٤٢-٤٣.

٨٩- ابن هشام: س. پ، ١ / ٣٥٧-٣٥٨ ؛ القلقشندي: صبح الاعشى في صناعة الانشاء، شرحة و علق عليه: يوسف علي طويل، دار الكتب العلمية، ج٦ / ١٩٨٧،٣٦٠، ٣٧٠، ٣٨٠-٣٨٢.

مقەوقسی پادشای میسر[٩٢]، کە ئەمەی دووایی یان بە ناردنی دوو کەنیزەك بە ناوی (ماریای قیبطی و شیرینی خوشکی) وەڵامی دایەوە و لەسەر دەستی پێغەمبەردا بوونە ئیسلام. پێغەمبەر ماریای خواست و کوڕێکی لێ بوو بە ناوی ئیبراهیم کە هەر بە منداڵی کۆچی دوایی کرد، شیرینی خوشکیشی بەخشیە (حسانی کوڕی پابت)، ئەمە و جگە لە ناردنی نوێنەرانی بۆ لای ئەسقەفی نجران و سەرکردەی جولەکەکانی خەیبەر و پادشاکانی عومان و بەحرین و یەمەن، هەروەها نوێنەری ناردووەتە لای کۆمەڵێك خێڵ و هۆزی جیاواز لە نیمچە دورگەی عەرەب و دەوروبەریدا[٩٣]. کە هەڵبەت ئەو نێردراوانەش ڕۆڵی خۆیان لە بەدەستهێنانی ئامانجێکی دیاریکراودا لەو ماوەیەدا بینیوە و بەئەرکەکانیان هەستاون، هاوکات لەگەڵ ئەو شەڕانەی پێغەمبەردا کە لە دژی قوڕەیش و جولەکەکان کردی شەپۆلێك لە شاندی دیبلۆماسی بە مەبەستی دانوستاندن لە پێناوی ئاگربەست و ئاڵوگۆڕکردنی دیلەکان و بەستنی ڕێکەوتننامە و پەیماننامە و ئاشتەوایی لە دوای جەنگەکان وەك (ڕێککەوتنی حودەیبیە)[٩٤].

ئەو باڵوێز و نێردراوانەی کە کاریان کردووە پێغەمبەر ناردبوویە لای قەیسەر و کاربەدەستانی وڵاتی مصر و شام هیچ ئاکامێکی ئەوتۆی نەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گومانی تیادا نیە کە لەڕووی مەعنەویەوە کاریگەری لە وڵاتی ڕۆمانی و لە کڵێسەدا هەبووە، هاوکات لای فارسەکانیش هیچ ئاکامێکی لێ نەکەوتەوە و کیسرا بە

---

٩٠- الطبری: تاریخ الرسل و الملوك، تحقيق: محمد ابوالفضل ابراهيم، طبع بمطابع دار المعارف، ط٤، القاهرة، ١٩٧٩.ح٢ / ٦٤٤؛ القلقشندي: س. پ، ٦ / ٣٧٦.

٩١- ابن سعد: الطبقات الكبرى، ١/ ٢٥٨-٢٥٩ ؛ الطبري: تاريخ الرسل، ٢/ ٢١٨.

٩٢- ابن هشام: س. پ ، ٢/ ٢٧٨-٢٧٩؛ خليفة بن الخياط: تاريخه تحقيق در اكرم ضياء العمري، النجف،١٣٨٦، ج١/ ٤١ ، الطبري: ٢/ ٦٤٤، ابن الاثير: الكامل في التاريخ ، دار صادر بيروت، بيروت ،١٩٦٦،ح٢/ ص ٢١٠.

٩٣- ابن سعد: س. پ ، ٢٥٨/١؛ ابن الاثير ، الكامل، ٢٣٢/٢؛ اسد الغابة في معرفة الصحابة، دار الشعب، القاهرة،١٩٧٠، ٤/ ٤١٧.

٩٤- ابن هشام: س. پ، ٣/ ٣٦٦؛ ابن سعد: س. پ، ٢/ ٩٧؛ الطبري: س. پ، ٢/ ٢٨١.

گاڵتەپێکردن وەڵامی دایەوە و نوسراوەکەی پێغەمبەری دڕاند. لە ئەنجامی ئەو ڕەتدانەوەیەدا پێغەمبەریش وتی(خوا پادشایەتیەکەی تێك بدات)[95].

ئەوەی پێوەندی بە کورد و دیبلۆماسییەتی سەردەمی پێغەمبەرەوە هەبوو بێت ئەوا، پێوەندی دۆستانە لەسەر ئاستی تاکە کەس هەبووە، نەك لەسەر ئاستی دەوڵەت یاخود دەسەڵاتی سیاسی. بۆ نموونە: یەکێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر بە ناوی – گاوانی – گابانی کوردی –(جابان الكردی) بووە وبە (ئەبی بصیر) یان (ئەبی نصیر) ناسراوە و چەندین فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە کە ژمارەیان گەیشتۆتە (١٠) دە فەرموودە و زۆربەیان لەسەر ژیانی هاوسەری بووە[96]. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت پێغەمبەریش هاوەڵی کوردی هەبووە هەروەك چۆن ڕۆمەکان -سوهەیلی ڕۆمیان-- هەبووە و فارسەکان سەلمانی فارسیان هەبووە و حەبەشیەکان بلالی حەبەشیان هەبووە، کوردیش گاوانی کوردی هەبووە[97]، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم پێوەندیە تاکەکەسیە هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە لەسەر خاکی کوردستان، چونکە لە پاش ئەو سەردەمە هێرشی عەرەبە موسڵمانەکان بۆ کوردستان دەستی پێکرد[98].

هەروەها بەدلیسی باس لە پێوەندییەکی دیکەی کورد دەکات و دەڵێت:- کاتێك پێغەمبەر نامەی بۆ پادشاکانی جیهان نارد، سوڵتانی تورکستان بەناوی (اوغوزجان) (پیاوماقوڵێکی) ناودارێکی کوردی بەناوی (بغدوز) (بەگ دۆز) ڕەوانەی لای پێغەمبەر کرد[99]، بەڵام ئەم ڕووداوە زۆر لە ڕاستی یەوە دوورە ناتوانرێت پشتی پێ

---

٩٥- الطبري: س. پ، ٢/ ١٠٢؛ القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/ ٣٨٠.

٩٦- العسقلاني: الاصابة في تمييز الصحابة، القاهرة،١٣٢٥هـ،١/٤٢٩؛ الذهبي: المشتبه من الرجال اسمائهم وانسابهم، ١/ ٦٣٤.

٩٧- البدليسي: شەرفنامە، ل١١٧؛ محمد امين زكي: خولاصیەتێکی تاریخی کورد و کوردستان دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢. ل ٩١٠.

٩٨- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە شوان عوسمان مستەفا: کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلامکردنی کورد سەنتەری چاپ و پەخشی تەما، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ١٤١-١٤٣.

٩٩- شەرفنامە، ل ٢٦-٢٧؛ شوان عوسمان مستەفا: س. پ، ل١٤٢-١٤٣.

ببەستریّت ئەویش لەبەر چەند هۆکاریّك، بەر لە هەموو شتیّك بەدلیس پشتی بە هیچ سەرچاوەیەکی میّژووی پیّش خۆی نەبستووە، هاوکات هاوچەرخی ڕووداوەکان نەبووە یان نزیك نەبووە لیّی جگە بەوە ئوغۆزخان دەوروبەری پیّنج سەد سالّ دوای پیّغەمبەر ژیاوە، ئەمە جگە لەوەی کە ئیّمە هیچ شتیّکی وامان لەبارەی ئەو ناوەوە لە کتیّبە میّژوویەکان و وەرگیّڕدراوەکان و تەنانەت لە فەرهەنگەکاندا بەرچاو نەکەوتووە. گوایا (بەگدوز) ئەوەندە ناشیرین بووە، پیّغەمبەر دوعای لیّ کردووە، چونکە گەر یەکبگرن هەموو دونیا دەخەنە ژیّر دەسەلاّتی خۆیانەوە. جا ئایا پیّغەمبەریّك گەر نیّردراوی ئیّزدان بیّت چۆن دەبیّت جیاوازی نیّوان (جوان و ناشیرین و ڕەش و سپی و هەژار و دەولّەمەند..) بکات لە کاتیّکدا کە ئیّزدان فەرمانی پیّدراوە (یەکسانی و ڕاستگۆیی و بیّ جیاوازی و تەبایی) لە نیّوان گەلاندا بلاّوبکاتەوە و ببیّتە خەمخۆری هەموو دەستکورت و لیّقەوماو و خوداپەرستیّك.

# دیبلۆماسییەت لە سەردەمی دەوڵەتی راشیدیندا
## ١١-٤٠ك / ٦٣٢ – ٦٦٠ز

لە ماوەی خیلافەتی راشیدیندا (١١-٤٠ ك / ٦٣٢ – ٦٦٠ز) ئەو دیبلۆماسییەتەی کە خەلیفەکان پەیڕەویان دەکرد درێژەدانی هەمان دیبلۆماسییەتی سەردەمی پێغەمبەر بوو کە ئەویش بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام و دروستکردنی پێوەندی بوو لە گەڵ گروپ و دەوڵەتەکانی دیکەدا لە ڕێگەی گفتوگۆ و دانوستاندنەوە هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی و جعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم﴾[100]. جێی ئاماژەیە بۆ کردنە دەوڵەتی راشیدی لە هەندێ لە کاتەکاندا دیبلۆماسییەت پەیڕەوبکات لە فەرمانڕەواییدا لە میانەی ئامادەکردن و نووسینەوەی نامەکانی پێغەمبەر بۆ پادشا و سەرۆکەکانی وڵاتانی دراوسێ و هەندێ هێزی ئۆپۆزسیۆن لەناو وڵاتەکەیدا. پێڕەوکردنی دیبلۆماسییەت لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی خەلیفەکانی ڕاشیدیدا لە ڕێی نووسینەوە ئامادەکردنی نامەکانی پێغەمبەرەوە بوو بۆ پادشا و سەرکردەی وڵاتە دراوسێکانیان و هەندێك لە هێزە بەرهەڵستکارەکانی ناو وڵاتی خۆشیان. خەلیفەکان جگە لە ڕاوێژکردن، متمانەشی دابووە نوێنەرەکانیان لە هێنان و بردنی نامە و نووسراوەکاندا، بۆ نموونە:

١- لە نووسراوەکاندا ئەوە هاتبوو کە خەلیفە هەڵگرەکەی سەرپشك دەکات بە ناوی پادشا یاخود گەورە بەرپرسی وڵاتەکەوە قسە بکات.

٢- هەڵگری نامە یاخود نێردا سەرپشك کرابوو کە دۆکومێنتە دیاریکراوەکان واژۆ بکات.

---

١٠٠- سورەتی الحجرات، ئایەتی ژمارە (١٣).

٣- نێردراو وەك كەسێكی باوەڕپێكراو و نوێنەری یەكـەم دەبـوو لێـزان و شـارەزا و زمان پاراو بووایا لە بواری دیپلۆماتدا.

هەڵبەت لە سەردەمی پێغەمبەردا بناغەی كاری دیپلۆماسییەت[١٠١] دانـرا و دوای خۆی جێگرەكانی پێڕەویان دەكرد. ئەبوبەكر وەك یەكەم خەلیفـەی راشـیدی (١١-١٣ك / ٦٣٢ – ٦٣٤ز) یەك لە گرنگترین كارەكانی لە پاش مردنـی پێغەمبـەر شـەڕكردن بوو لەگەڵ هەڵگراوەكانی نیمچە دورگەی عەرەب كە هەندێكیان گەڕانـەوە سـەر بـت پەرستی و هەندێكیان زەكاتیان ئەدا و هەندێكی دیكە وازیان لەنوێژكردن هێنـا، بـۆ ئەم مەبەستەش ئەبوبكر (١١) یـازدە (لیـوا – لـشكر)ی سـەربازی لـە دژی ئـەمان پێكهێنا.[١٠٢]

كاتێك نوێنەری گروپە هەڵگـەڕاوەكان چـوونە لای ئەبوبـەكر، ئـەو هـیچ كـردار و رەفتارێكی لاریبوونی ئەنجام نەدا لە بەرامبـەریاندا، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەوان هاتبوون هەر لە سەرەتاوە ئەبوبەكر گومانی لە نیەت پاكی ئەو نێردراوانە هـەبوو[١٠٣]، چـونكە بـەلای ئـەوەوە هەڵـسەنگاندنی پـەیام هـەڵگرە كـە پێوەنـدی بـە بـەها و ئاكـاری بەرپرسەكەیەوەیە كە بۆ ئەو جێگەیەی ناردووە.[١٠٤] بەواتایـەكی دیكـە ئەبوبـەكر لـە نیەت پاكی بەرامبەرەكەی بە گومان بوو. شـایانی باسـە كـە خەلیفـەی موسـڵمانان، ئەبوبـەكری سـەدیق لـە مـاوەی دوو سـاڵ فەرمانڕەوایەتیـدا نـەیتوانی هـیچ جـۆرە پێوەندییەكی دیپلۆماسی ئاشـتەوانی و دۆسـتایەتی لەگـەڵ وڵاتـانی دەوروبەرەكەیـدا درووست بكات.

---

١٠١- مامون الحموي: س-پ ،ل٤٣.

١٠٢- مسكويه: تجارب الامم و تعاقب الهمم ه – ف – امد رور. مطبعة شركة التمدن الصناعية ، مصر،١٩١٤م، ح١/ ١٨١-١٨٢.

١٠٣- الطبري:س-پ،٢/٦٥٤ ، مسكويه:س-پ،١٧٨,١.

١٠٤- محمد حسين هيكل: الصديق ابوبكر مطبعة مصر ،١٩٥٨، ١١٤.

به مردنـی ئەبوبـەکر، عومـەری کـوڕی خـەتاب (١٣-٢٣ك/٦٣٤-٦٤٤ز) جێـی دەگرێتەوە. عومەر لە گەنجێتیدا سەرقاڵی کاری بازرگانی بووە، بەڵام لە پـاڵ ئەوەشـدا کاروباری باڵوێزخانەکانی نێوان قورەیش و ویلایەتەکانی دیکەی گرتبووە دەست.

وەك دەردەکەوێ عومەر کەسایەتیەکی بەهێز و جێی ڕێزلێنانی خەڵکی بـووە، هـەر لەبەرئەوەش پێغەمبەر نزای کردووە کە ئیـزدان ئیـسلام بـە یـەکێك لـە عومـەرەکان (عومەری کوڕی خەتاب یاخود عومەری کوڕی هـشام) پایـەدار بکـات [١٠٥] عومـەری کوڕی خەتاب بە یەکێك لە کەسـایەتیە ناودارەکـانی عـەرەبی پـێش ئیـسلام ئـەژمار دەکرێت و نوێنەری حکومەتی (الملا)بوو لە شاری مەککە. و لـە کـاری دیبلۆماسـیدا چەند نەرم بوو هێندەش توندبوو. لە زاری عومـەرەوە دەگێڕنـەوە:- ((نابێـت کەسـێك سەرکردەی ئەم میللەتە بێت گەر بێتو هەڵگری ئەم خەسڵەتانە نەبێت ((نەرم و نیـانی لەلاوازیەوە نەبێت، توندو تیژی لە زەبرو زەنگەوە نـەبێت، خۆگرتنـەوە جگـە لەوەچـە، لێخۆشبوون بەبێ پێـوەدان*)) [١٠٦]. هاوکـات مـەرجـەکانی نێـردراوی دیـاری کردبـوو وتبووی: ((ئەگەر ڕێگەتان پێ درا، باشـترین کەسـتان بنێـرن، ئەگـەر چـوونە ژوورەوە جوانترین و ڕێك و پێکترین دەم چاو پێشکەوێت، ئەگەر قسەتان کـرد زمانتـان جیاتـان دەکاتەوە، هتد...)) [١٠٧].

---

١٠٥- احمد شلبي: التاريخ الاسلامي، ج٢/٣٩٠.

* سف: مارێکی درێژ و ناسکەو لە نێو بەردو زیخەو بازدەداحت و عەرەبەکان وتوویانە دەفڕێ بۆیە ناویان لێناوە باڵگرتوو، مەبەست لێرەدا لێخۆشبوونە بەبێ تۆڵەسەندنەوە. (ڕزگار کەریم: فەرهەنگی دەریا، ٤٢٥/١).

١٠٦- محمـد عـزة دروزة: تـاريخ العـرب في الاسـلام، تحـت رايـة الخلفـاء الراشـدين، المكتبـة العصرية، صيدا، بيروت، ص ٢٨٥.

١٠٧- بۆزیاتر زانیاری بڕوانە: ابن الفراء: س-پ ، ل ٢٤٧.

پاش مردنی عومەری کوڕی خەتاب بە ٣ سێ ڕۆژ، عوسمانی کوڕی عەفان دەسەڵاتی خیلافەتی گرتە دەست (٢٤-٣٥ ك/ ٦٤٤-٦٥٥ ز)[١٠٨]. لە ساڵی ٦ شەشی کۆچی عوسمانی کوڕی عەفان باڵوێزی پێغەمبەر بووە بۆ لای قورەیشیەکان، کاتێك کە قورەیش ڕێگەی نەدا پێغەمبەر بچێتە مەکە بە مەبەستی عەمرەکردن[١٠٩]. لەبەرئەوەی عوسمان خاوەن کەسایەتیەکی کاریگەر بووە لای قورەیشیەکان و توانی زۆربەیان ڕابکێشێت بەلای خۆیدا، پێغەمبەریش لەبەر شەرمی و ڕەوشت بەرزی زۆری خۆشویست، لە ماوەی دەسەڵاتیدا بڕێك پارەی (بیت المال)ی تەرخان کرد بۆ پێشوازیکردن لە نماینده بیانیەکان و سەرفکردنی خەرجی لەکاتی مانەوەیاندا[١١٠]. هاوکات داوای لە هەموو کاربەدەستەکانی خۆی کرد بۆ گفتوگۆکردن لە پێناو دروستکردنی پەیوەندی دۆستایەتی و دیبلۆماسی بەئامادەبوونی گەورە هاوەڵەکانی پێغەمبەر[١١١].

پاشان عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەسەڵاتی خیلافەتی گرتە دەست. عەلی پێی وابوو نێردراو گوزارشت لەو کەسە دەکات کە ناردوویەتی و لەمبارەیەوە وتویەتی:- ((نێردراوت تەرجومانی هزرتە و نوسراوەکەت ڕەوانترین زمانە لە جیاتیت))[١١٢]. واتە کەسی نێردراو یاخود نوێنەر دەبێ قسەکانی بە تەواوی گوزارشت لە بۆ چوون و هەڵوێستی دەسەڵاتدارەکەی یاخود وڵاتەکەی بکات.

---

١٠٨- محمود شيت خطاب: السفارات النبوية مطبعة المجمع العلمي العراق، بغداد ،١٩٨٩، ٢٢٩.

١٠٩- محمد احمد سعد: موسوعة التاريخ الهجري، دار صفاء للنشر و التوزيع، ط١، عمان، ٢٠٠٣. ص ٣٤.

١١٠- ابراهيم احمد العدوي، المسلمون و الجرمان دار المعرفة، ط١، القاهرة،١٩٦٠. ص ٢٨١.

١١١- الصفدي: الوافي بالوفيات باعتناء – هلموت ريتر، شركة الفجر العربي، بيروت، ١٩٦٢. ص ٣٩.

١١٢- ابن ابي الحديد شرح نهج البلاغة، طبعة بيروت، ١٩٦٣. ص ٧٢.

## دیبلۆماسییەت لە سەردەمی ئومەویدا

بەدرێـژایی سـەردەمەکان هێـرش و پـەلامار و شـەڕەکان پێوەندیـە سیاسـی و دیبلۆماسییەکانی بـەرەو چـالاکی بـردووە. و توانیویـەتی لـە ئـەنجامی هەوڵەکانیـدا کۆتایی بەشەڕ بێنیٚ و دانوستاندن بەرقەرار بکات بە مەبەستی هێنانە کایەی ئاشـتی و گۆڕینـەوەی دیلـەکان و بەسـتنی ئاگربەسـت یـاخود ڕێککـەوتنێکی کـاتی یـا هەمیشەیی.

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ئومەوی دا، گۆڕینەوەی باڵوێزخانە و ناردنی نوێنەران لەگەڵ ڕۆمە بێزەنتیەکاندا سیمایەکی ڕێکخراوەیی وەرگرتبوو ئەویش بـەهۆی نزیکی دیمشق لە کەستەنتینیەوە. جگە لەوە خراپی بـارودۆخی نـاوخۆی هـەردوولا زۆر جار ببووە هۆی ئەکتیڤکردنی پێوەندیـە دیبلۆماسـییەکان لـە نێوانیانـدا. بێگومـان دەوڵەتی ئەمـەوی پێی باش بووە پێوەندی دیبلۆماسی لە گەڵ نـەیارەکانی دابمـەزرێنیٚ، لەم ڕووەشەوە توانی باڵیۆزخانەی خۆی درووست بکات کـە ئـەرك و چـالاکیەکانی بـە ئەنجام گەیاندنی پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی هەردوولا بووە. هەڵبەت لەو سـەردەمەدا ئەم کارە وەك ئەلتەرناتیڤێك جێی شەڕ و دووژمنایەتی گرتووەتەوە لـە هـەمان کاتـدا سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی ئەمەویشی دیاریکردووە لە فراوانکـردن و بڵاوکردنـەوە بـە ئەنجامـدانی بیروباوەڕەکانیـدا[113]، نـاردنی نوێنـەر بـۆ لای ڕۆمـەکان و ڕێککـەوتن لەگەڵیاندا بۆ مەعاویەی کوڕی ئەبوسفیان زۆر گرنگ بووە، بە تایبەتی کە مەعاویـە لەناوخۆی وڵاتەکەیدا سەرقاڵی خۆڕێکخستنەوە نەهێشتنی نـا تایبەتییـەکان بـوو[114]. بەڵام پاش ئەوەی موسڵمانان لـە ئابلۆقـەدانی شـاری کەسـتەنتینیەدا (٤٩ك/٦٦٩ز)

---

١١٣- مجيد خدوري: الصلات الدبلوماطيقية بين هارون الرشيد و شارلمان، مطبعة التفيض، بغداد، ١٩٣٩.ص٢٣٩,٢٤٢.

١١٤- ابن الطقطقي: الفخري في الاداب السلطانية و الدول الاسلامية مطبعة محمد علي صبيح و اولاده بالازهر، القاهرة، ص٨٣.

شکستیان هێنا. ئەوجا لەگەڵ ڕۆمەکاندا لە سەر ئەوە ڕێککەوتن کە ساڵانە باج و سەرانە بدرێت بە دەوڵەتی بیزەنتی کە ئەمەش بۆ خۆی نیشانەیەك بوو لە لایەن خیلافەتەوە بۆ هێوەربوونەوە و ئاشتبوونەوە لەگەڵ بەرامبەرەکەیاندا. دوا بەدوای ئەمەش چەند جارێك شاندی دەوڵەتی بیزنتی چوونە دیمەشق بۆ هەوڵدانی زانینی نیەتی خیلافەت و ئامادەکاریەکانی بزانن و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە پێوەندیەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت جێی باس وگفتو گۆ بوو[115]. جێی ئاماژەپێکردنە کە معاویەی کوڕی ئەبوسفیان پیاوێکی دیبلۆماتی خاوەن ئەزموون بووە پاش بیرکردنەوەیەکی قوڵ بڕیاری یەکلاکەرەوانەی دەدا. مەعاویە بەکارهێنانی هێزی لە یەکلایی کردنەوەی کێشەکاندا ڕەتدەکردەوە، ئەو تەماشای مەسەلەکانی لە هەردوولاوە دەکرد بۆ ئەوەی هەموو هێزە کارلێککەریەکانی تیادا ببینێ، و بتوانێت لە ڕێگەیەکەوە دووبارە هێزەکانی بە شێوەیەکی زیرەکانە ڕێك بخاتەوە و بگاتە ئاکامێکی باش، ئەوجا بە شێوەیەکی دیبلۆماسیانە کە ڕێز و جوامێری و مەردایەتی و ژیری تیا بەدی دەکرا لە مامەڵەکردنی لەگەڵ دوژمنە دڕاوەکانیدا هەوڵی بەدەستهێنانی خۆشەویستانی دەدا. لە بەناوبانگترین بنەما دیبلۆماسییەکان کە معاویە داینا و تا ئێستەش لە مامەڵە یاخود کرداری دیبلۆماسیدا هەر کاری پێدەکرێت، ئەوەی پێی دەوترێت (تاڵە موەکەی معاوییە) کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد[116].

بۆ نموونە، لە یەکێك لە وتە دیبلۆماسییەکانیدا مەعاویە دەیگوت: (من شمشێرەکەم هەڵناگرم بەرامبەر کەسێك بێ شمشێر بێت، ئەگەر بێتوو بە وشە چارەسەر نەکرێت...هتد)[117]. لە لایەکی دیکەوە (الیعقوبي) دەیگێڕێتەوە کە (حجاج بن یوسف الثقفي) والی عێراق (عمار بن تميم اللخمي) بە نوسراوێکەوە ناردووە بۆ لای (رتبیل)ی پادشای سجستان تیایدا داوای لێدەکات کە (عبدالرحمن بن الاشعث)ی بۆ بنێرێتەوە

---

١١٥- ابن الاثیر: الکامل، ٣/٤٥٨ – ٤٥٩.

١١٦- بڕوانە دەروازەی ئەم کتێبە.

١١٧- مسکویة: س-پ ، ٢/٢١.

پاش شکستی بزوتنەوەکەی، ئەویش لە ژێر فشار و هەڕەشەدا ڕازی بوو لە گەڵیدا ڕێکبکەوێ و کوڕی (ئەشعەث) لەگەڵ نێردراوەکەیدا بۆ بنێرێتەوە[118]. هەروەها سەرچاوە چینیەکان لە مێژووی (تانغ) باس لەوە دەکەن کەوا لە سەردەمی ئومەویەکاندا (١٧) حەڤدە باڵوێزخانەیان چوونەتە چین. سەرچاوە چینیەکان دەڵێن نێردراوێك بە ناوی (سلیمان) لە لایەن خەلیفە (هشام بن عبدالملك) چووە بۆ لای ئیمپراتۆری چینی (هیوان تونج) ساڵی ١٠٨ ك/ ٧٢٦ و پێوەندیە سیاسیەکان باش بووە لە نێوان عەرەب و چیندا تا کۆتایی فەرمانڕەوایی ئەو ئیمپراتۆرە[119]. هەروەها باس لەوە دەکرێ کە شاندێك لە ساڵی (١١٠ ك/٧٢٨ ز) کە لە (٨) هەشت کەس پێکهاتبوو، چووەتە چین بە سەرۆکایەتی (دیدو) کە یەکێك بووە لە فەرمانده‌کان، ئیمپراتۆریش ڕێزی لێگرتووە و بە پلەی ئەسپ سوارێکی پلەیەك دایناوە و زۆر ڕێزی لە شاندەکە گرتووە، پێ دەچێت ئەم فەرماندە بە نەژاد تورك بووبێت لە ژێر فەرمانی یەکێك لە سەرکردەکانی بخارا یاخود سمرقندا بووبێت[120]. لە میانەی نمایشکردنی مێژووی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان لە سەردەمی ئومەویدا دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستیەی کە هەوڵی سەربازی ئومەوییەکان بە درێژایی ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەیان کە نزیکەی (٩٠) ساڵ بووە ناچاری کردوون پێوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ دراوسێکانیاندا ببەستێت ئەوەش لەگەڵ ڕۆمەکاندا ڕوویدا. پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی دەوڵەتی ئومەوی ئەنجامی بەردەوامی جەنگە سەربازییەکان بوو و لە لایەکی دیکەوە بە هۆی بارودۆخی ناوخۆ کە هەردوو لای ناچارکرد یەکتر ڕازی بکەن و پەیماننامە و ڕێککەوتننامە ببەستن بە مەبەستی هێورکردنەوەی بارودۆخی ناوخۆی وڵاتەکانیان.

---

١١٨- تاريخ ، ٣٢/٣.

١١٩- زكي محمد حسن: الصين وفنون الاسلام، ص ١٠.

١٢٠- بدرالدين الصيني: العلاقات بين العرب والصين، ص ١٥٨.

لێرەدا جێی ئاماژەبۆکردنە کە کورد هیچ کارێکی دیبلۆماسی ئەوتۆی نەبوو کەوا شایەنی باسکردن بێت لەو هەگبەیەدا، جگە لەوەی کە خاکی کوردستان گۆڕەپانی ململانێ و شەڕی نێوان دەوڵەتی ئومەوی و شۆڕشگێڕان بوو لە دژی دەسەڵاتی خیلافەتی ئومەوی، بەڵام سەبارەت بە پێوەندی نێوان کورد و ئومەوییەکان ئەوا بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستمانە هەرچەندە کەمە، بەڵام دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستیەی کە کورد بەپێی بەرژەوەندیەکانی لایەنگری بزوتنەوەکانی (شیعە وخوارج)ی دژی دەسەڵاتی ئومەوی بوون، بۆیە ڕێکەوت و دەگمەن نەبوو کە ئەم بزوتنەوانە لایەنگریان لە ناوچە کوردیەکاندا هەبێت، لە کاتێکدا کورد یەکێك بوون لە گرنگترین میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و لە وڵاتەکەیاندا کە ناوی کوردستانە دەژیان، بەڵام ئەوەی پێی دەوترێت پێوەندی جێگیر لە نێوان کورد و ئومەوییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی (٤-٥ ك/١٠-١١ ز) کاتێك نەوەی ئومەوییەکان خەریکی کار و چالاکی ئایینی و سیاسی بوون لە نێو کوردان و خاکی کوردستاندا[١٢١].

هەتا گەلان و دەوڵەتان لەسەر شاڕێی پێشکەوتن و شارستانیەت ڕێکەون، هەست و شعوریان لە ئاست بوونی ئەو پەیوەندیانە و توندوتۆڵکردنی بنەماکانی زیاتر دەبێت، دوای ئەوەی لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار و نەوەکاندا، دەرکەوت کە زمانی لێکتێگەیشتن و لێك حاڵیبوون لە نێوانیاندا لەزۆربەی کاتەکاندا باشتر و بەسوودترە، لەپێناو پاراستن و بەدیهێنانی ئامانجەکاندا، لەوەی کە دوورەپەرێز بن و ناکۆکی و زمانی هەڕەشەو هێز زاڵبێت بەسەر زمانی لۆژیك و عەقڵ و لێکتێگەیشتن و پەیوەندی بەردەوام لە نێوان دەوڵەتان لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا بۆتە مەسەلەیەکی گرنگ کە هیچ دەوڵەتێك ناتوانێت دەستبەرداری بێت، لەپێناو بەهێزکردنی پێگەی خۆی و زامنکردنی بەرژەوەندیەکانی و بەدیهێنانی ئامانجەکانی.

---

١٢١- ابن خلكان: وفيات الاعيان و ابناء الزمان، تحقيق: احسان عباس، دار الثقافة، بيروت، ١٩٦٩. ج١/ ص ٤٣٧.

لەبەر رۆشنایی ئەمانەدا پەیوەندیە دبلۆماسیەکان رۆڵێکی گرنگی دەبێت لە چوارچێوەی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا. لێرەدا ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێبکەین، ئەوەیە کە توێژەرەوە کاتێك دەست دەداتە توێژینەوەی مەسەلەی دبلۆماسیەت و مێژووی دیبلۆماسی، ئەو شێوازەی کە پێویستە پەیرەوی بکات لەو بوارەدا جیاوازە لەگەڵ ئەو پەیرەوەی لە توێژینەوەی مێژووی سیاسی گشتیدا پیادەی دەکات. مەبەست لە مێژووی دبلۆماسی ئەو پەیوەندییە ئاشتەواییە فەرمیانەی نێوان دەوڵەتان و ئەو فاکتەرانەیە کە پاڵ بە هەر یەکێکیانەوە دەنێ بۆ دامەزراندنی ئەو پەیوەندیانە، ئەمانەو سەرەڕای لەخۆگرتنی سیستمی نواندنی دبلۆماسی ئەو یاساو ڕێسایانەش کە تایبەتن بە تەمسیلی دبلۆماسی.

مێژووی دبلۆماسی باس لە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کاروباری نێودەوڵەتیش دەکات لە ڕێگەی نامە گۆڕینەوە و دیالۆگ و گفتوگۆوە کە سەفیرەکان ئەنجامی دەدەن، جگە لە خۆ ئامادەکردن بۆ ئیمزاکردنی پەیماننامەکان و ڕێکەوتننامەکانی نێودەوڵەتان، لەپێناو بەرژەوەندیەکی دیاریکراو، پێویستە توێژەرەوە لەو بوارەدا، بزانێت کە دبلۆماسیەت وێڕای ئەوەی سروشت و تایبەتمەندی نێودەوڵەتی هەیە، لەهەمان کاتیشدا بەپێی سیستەمەکان و أحکام و یاساکانی، پەیوەستە یاخود پابەندە بەدەستوور و یاساکان و نیزام و ڕەوشی ناوخۆوە لەهەر دەوڵەتێکدا، هەروەها پابەندە بەکێشە دەرەکیەکانیشەوە، بۆیە پێویستە توێژەرەوە بایەخ بەسەرجەم ئەو ڕەگەزانە بدات، بۆ ئەوەی ڕادەی کاریگەری لە بەڕێوەچوونی پەیوەندیە دبلۆماسیەکان دەربخات.

# بەشی یەکەم
# بارودۆخی سیاسی نێوچەکە و کاریگەری لەسەر دروستبوونی میرنشینە کوردیەکان

## تەوەری یەکەم
- بارودۆخی سیاسی و دارایی و پەشێویی بەڕێوەبردن
- دەستگرتن و باڵادەستی بیانی بەسەر خیلافەتی عەبباسیدا

## تەوەری دووەم
- بەڕێوەبردنی هەرێمەکان
- ویست و توانایی و شیاویی و لێهاتوویی
- هۆکاری تر

## تەوەری سێیەم
- سیستمی خێڵەکی لە نێو کوردەواریدا
- باوبوونی جیابوونەوە
- بەڵگە و نموونە لەسەر کاریگەری بارودۆخی سیاسی

## تەوەری یەکەم

## بارودۆخی سیاسی و دارایی و پەشێوی بەڕێوەبردن

دەوڵەتی عەبباسی لە بارودۆخێکی سیاسی شێواودا دەژیا، ئەویش ئەنجامی لاوازی دەسەڵاتی خەلیفە بوو، ئەم بارودۆخەش لە باری ئابووری و کارگێڕیشدا ڕەنگی دابووەوە، چونکە بە هێزی دەوڵەت بە پێی چەندایەتی و چۆنایەتی توانای لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا پێوەرێکە بۆ پێدانی هێزیی دەوڵەت، چونکە ئەو دامودەزگەیانە بڕبڕەی پشتی دەوڵەتن کە تواناو لێهاتوویی دەبێتە مایەی درووستبوونی پێوەندییەکی پتەو لە نێوان دەوڵەت و خەڵکیدا، بۆیە پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ململانێ لە نێوان سوپا و کارگێڕیدا دەبووە هۆی شپرزەبوونی دامودەزگا ئیدارییەکان، زۆر جاریش دەبووە مایەی لاوازبوونی دەوڵەت وەك چۆن لە سەردەمی خەلیفە (المتوکل علی الله) (۲۳۲-۲٤۷ك/۸٤۷-۸٦۱ز) ڕوویدا. بەڵام لاوازبوونی دامودەزگا ئیدارییەکان لەسەردەمی (المقتدر باللە)*دا (۲۹۵-۳۲۰ك/۹۰۸-۹۳۲ز) کە لە تەمەنێکی هەرزەکاریدا خیلافەتی گرتبووە دەست گەیشتە ئاستێکی ترسناك بەو رادەیەی

---

* المقتدر باللە: لە نێو سالانی (۲۹۵-۳۲۰ك/۹۰۸-۹۳۲ز) دەسەڵاتی خیلافەتی عەبباسی وەرگرت، جێگای ئاماژە بۆ کردنە کەوا (المقتدر) لە ئاستی ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی نەبوو، هەروەها (مؤنس الترکي) کاروباری خیلافەتی بەڕێوە دەبرد، هاوکات دیاردەی دەست تێوەردانی ژنان لە کاروباری دەوڵەت سەری هەڵدا جگە لە ئاشوبی ناوخۆ ودەرەوە.(الطبري: تاریخ الرسل والملوك، ج۱۰/۱٤۱؛ المسعودي: مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار الاندلس، بیروت، ۱۹۸۲، ۲۱٤/٤).

هەرەشەی لەناوچوونی خیلافەتی تیا بەدی دەکرا.(١٢٢)

هەر لە سەردەمی ئەودا دەزگە وەزارییەکان زۆر پەشێواو بوون بە شێوەیەك دوانزە وەزیری بۆ دانرا.(١٢٣) هەر ئەوەدەمە بۆ خەلکی ڕوون بووەوە کە دەولەت توانای ئەوەی نییە یەکسانی کۆمەلایەتی و ئاسایش بپارێزێت و دابینی بکات.(١٢٤) ئەو بارودۆخە کاریگەری خراپی بەسەر هەرێمی ئیسلامییەکانەوە هەبوو لە وانەش ولاتی کورد. شایانی باسە کە ڕۆلی سیاسیی کورد هەر لەسەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچییەوە دەرکەوت،** چەندین شۆڕشیان دژی دەسەلاتی دەولەتی عەبباسی کرد بەتایبەتی دوای لاوازبوونی و توانییان چەندین میرنشینی سەربەخۆ یان نیمچە سەربەخۆ لە هەرێمە جیا جیاکانی ولاتی خۆیان دابمەزرێنن، بەلام لەگەل ئەوەشدا هێشتە باوەڕیان بە دەسەلاتی ڕۆحی خەلیفە هەبوو، ئەویش بەهۆی پێوەندی بەهێزیان بە ئایینی ئیسلامەوە کە خەلیفەی مسولمانان نوێنەرایەتی دەکرد، لەبەرئەوە نکۆلیان لە خیلافەت نەبوو، بەلکو بەردەوام لەسەر مینبەرەکانەوە بانگەوازیان بۆ دەکرد و نێویان لەسەر سکەی پارەکانیان دەنووسی و بەشداری جیهادیان دەکرد،(١٢٥) ئینجا هەندێ لە

---

(١٢٢) ابن دحية: النبراس في تاريخ خلفاء بني العباس، تعليق: عباس العزاوي، بغداد، ١٩٤٨، ص٩٥.

(١٢٣) المسعودي: التنبيه و الاشراف، بيروت، ١٩٨١، ص٣٤٤.

(١٢٤) حمدان عبدالمجيد الكبيسي: عصر الخليفة المقتدر بالله، النجف الاشرف، ١٩٧٤، ص٥٦٥.

** جێگەی ئاماژە بۆ کردنە کەدەسەلاتی عیشانییەکان (العيشانية) لە سەرەتاکانی سەدەی چوارەمی کۆچی و دەیەمی زایینی دەرکەوتووە، و نێوچەیەکی زۆری لەبەردەستدا بوو لە ڕۆژئاوایی هەرێمی چیا تا سنووری ئازەربیجان بۆ نزیکەی (٥٠) پەنجا سال لە نێو سالانی (٣٠٠- ٣٥٠ك/ ٩١٢- ٩٦١ن فەرمانڕەوا بوون، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ابن الاثير: الكامل ١٠١/٧؛ قادر محمد حسن: الامارات الكوردية في العهد البويهي، رسالة ماجستير، غير منشورة، مقدمة الى كلية الاداب، صلاح الدين، ١٩٩٩، ص١٠).

(١٢٥) حسام الدين على غالب: الكرد في الدينور وشهرزور، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى كلية الأداب، بغداد، ١٩٧٥، ص١١٤.

وەزیرەکان لە سەردەمی (المقتدر بالله)دا نەیاندەتوانی کاروباری خۆیـان وەك پێویـست بەجێبهێنن، دیارتریشیان وەزیر (ابوعلي الخاقاني) بـوو کـە کورەکـانی دەسـتیان لـە کاروبـارە ئیدارییـەکان وەردەدا. ئەمـەش بـووە هـۆی دواکـەوتنی وەزارەت لـەو سەردەمەدا.[١٢٦] ئینجا زۆربوونی لە کارخستنی والییەکان بۆ نموونـە (دینـەوەر)* لـە ماوەی بیست ڕۆژدا حەوت کاربەدەست دامەزرێنران.[١٢٧] ولە ڕۆژێکدا لـە جـەزیرە لـە (باقردا و بازیدا)* پێنج کار بەدەست دامەزرێنران.[١٢٨] ئەم گەندەڵییە ئیدارییـە بـووە هۆی بڵاوبوونەوەی بەرتیل خواردن لە نێو کاربەدەسـتانی خیلافـەتی عەبباسـیدا، بـۆ نموونە هەندێ لە وەزیرەکان وایان دەڕوانییە ویلایەتەکان کـە هـەوڵ و بوارێـك بـن بـۆ دەسکەوت و کۆکردنـەوەی سـەرمایە. بۆیـە هـیچ گرنگـی بـە توانـا و لێهـاتوویی و دەستپاکی (کاربەدەسـت) نـەدەدرا، جگـە لەمـەش هەنـدێ جـار ولایـەت دەدرا بـەو کەسانەی کە دەتوانن پارەی زیاتر بدەن.[١٢٩] ئەبێ ئاماژە بۆ ئـەوەش بکـەین کـە ئـەو پارانە هەمووی لە ڕێی زیادکردنی باجەوە بەدەست دەهێنرا، واتە ئەرکەکـەی دەکەوتـە سەر خەڵکی، بەتایبـەتیش خەلیفـەکان هـەوڵی ئـەوەیان دەدا کـە قـەرەبووی کـەمی داهاتەکەیان بە زیادکردنی باجی سەر ئەو نێوچانەی لە ژێر دەسەڵاتیاندان چەند جـارە

---

(١٢٦) ابن الاثير: الكامل، ١٣٩/٦.

* دینـەوەر: دەکەوێتـە نێـوان کنگـور لەباشـووری ڕۆژهەڵاتیـەوە، وە قرماسـین (کرماشـاە) لەباشووری ڕۆژئاوایەوە، دووری لەهەردوو شارەکە وەکو یەك وایە. (الأصطخري: المسالك و الممالك، مطبعة بريل، ليدن، ١٩٢٧، ١١٥؛ ابن حوقل: صورة الأرض، ص٣٠٨).

(١٢٧) الهمداني: تكملة تاريخ الطبري، تح: البرت يوسف كنعان، بيروت، ١٩٦١، ص٢٠١.

* باقرداو بازیدا: دوو گوندن بە پێچەوانەی یەکتر دەکەون لەسەر ڕووباری دیجلە لە (جزیرە ابن عمر) یەکەمیان دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتیەوە و دووەمیان لە ڕۆژئاوای ڕووبارەکەیە. ئێستاش بازیدە ماوە سەر بە پارێزگای دهۆکە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣٢١/١).

(١٢٨) مسكويه: تجارب الامم، وتعاقب الهمم، هـ. ف- امدروز، مطبعة شركة التمدن الصناعية، مصر، ١٩١٤، ٢٣/١.

(١٢٩) هلال الصابي: الوزراء او تحفة الامراء في تاريخ الوزراء، تح: عبدالستار احمد فراج، بغداد، ١٩٥٨، ص٢٨٦.

زیاد بکەن کە ئەمەش بووە هۆی تێکچوونی باری ئابووری ئەو هەرێمانە،[١٣٠] و زیاد بوونی زۆرداری ئەو کەسانەی کە باجیان کۆدەکردەوە بەرانبەر بە خەڵك.[١٣١] دەبینین سەرۆکەکانی بوەیهی یان سەلجوقیەکان چەندین هۆکاری فێڵ و تەڵەکە و شکاندنی پەیمانیان لەدژی کوردەکان بەکاردەهێنا، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر نەیانتوانیایە بە هێز بیانخەنەژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە دەتوانین هۆکاری شۆڕش و بزووتنەوە کوردیەکان دژی دەسەڵاتی مەڵبەند جگە لە ئارەزووی سەربەستی، بگێڕینەوە بۆ نالەباری بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتیان، ئەویش بەهۆی خراپی سیستمی دارایی دەوڵەتی عەبباسی و زەبرو زەنگی سەرۆکەکان لە سەندنی خەراج و باجەکانی دیکە و بەفیڕۆدانی پارە وخەرج نەکردنی بەسەر دانیشتوانی ئەو نێوچانەی باجەکەیان لێکۆکراوەتەوە، بەڵکو زۆربەی دەنێردرا بۆ پیتەختی خیلافەت تا لەزیادەڕۆیی خەرجیەکانی خەلیفەو میر و وەزیر و کەسانی تردا خەرج بکرێت،[١٣٢] باشترین ڕێگە بۆ ئەم ڕاستیە باج نەدانی خەڵکی شارەزوور بوو لە کۆتایی سەدەی (٣ك/ ٩ز)دا.[١٣٣] ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ خەلیفەدا کە ماوەی (٢٠) ساڵ بە سەریانەوە بوو تەنها (هارون بن غریب الخال)* لە ساڵی (٣١٧ك/٩٢٩ز) (٣٧هەزار) دینار و (٢٠٠) هەزار درهەمی لێوەرگرتن.[١٣٤]

---

(١٣٠) Bol, shakov, O.G: The Abbasids (Great Soviet Encyclopedia)، (Moscow: ١٩٧٣) Vol، P.٧.

(١٣١) محمد جمال الدين سرور: تاريخ الحضارة الاسلامية في الشرق من عهد نفوذ الاتراك الى منتصف القرن الخامس الهجري، دار الحامي للطباعة، القاهرة، ١٩٧٣، ص ٦٩.

(١٣٢) ماري بن سليمان: أخبار فطاركة كرسي المشرق في كتاب المجدل، (رومية الكبرى)، ١٨٨٩، ص٩٢.

(١٣٣) حسام الدين علي غالب: الكرد، ص١١٥.

* هارون بن غریب الخال: کوڕی خاڵی خەلیفە (المقتدر بالله) بوو، خەلیفە نێوچەی (الدینور وماسبذان) پێ دا، شەڕی سوپای خیلافەتی کرد دوای ئەوەی (الراضي بالله) (٣٢٢ك-٩٣٤ز) دەسەڵاتی گرتە دەست، بۆ ئەوەی خیلافەت وەربگرێت، ئەوە بوو لە ساڵی (٣٢٢ك/٩٣٤ز) کوژرا. (ابن الأثير: الكامل، ٦، ص ص٢٣٩، ٢٤٠).

(١٣٤) الهمذاني: تكملة تأريخ الطبري، ص٢٦٤.

ولاّتی کوردیش وەك هەموو هەرێمە ئیسلامییەکانی دیکە تووشی شێوان بوو بـوو لـە ئەنجامی ئەو سیاسەتەی دەسەلاّتدا، بەتایبەتی لە سەرەتای سـەدەی (٤ك/١٠ز)ەوە تـا سەرهەلّدانی میرنشینە کوردییەکان بەم شێوەیە ئەو نێوچەیە بوو بە مەیـدانی شـەڕ و پێکدادان، ئەمەش بووە هۆی تێك چوونی بارودۆخی ئاسایش تێیداو دواجار کاریگـەری خراپی بەسەر دانیشتوانی نێوچەکەوە لـە ڕووی کۆمەلاّیـەتی و ئـابووری و ئیدارییـەوە هەبوو، بە هۆی مـەترسی هێزە نێوخۆییەکانەوە وەك (بنو حمـدان)* و (بنوالـساج)** و هێـزە هـاتوو و هاوردەکـانی وەك (زیارییـەکان، مـسافرییەکان والـسامانیون)*** و

---

*بنو حمدان: بنەماڵەیەکن لە (تغلب بن واصل) لەبەرەبابی (بنی ربیعة) لە نێو سالاّنی (٢٩٣-٣٩٢ك/ ٩٠٥- ١٠٠١ز) فەرمانڕەوایی (موصل وحلب)یان کردووە، و سەرەتای دەرکەوتنیان لە هەرێمی (الجزیرة الفراتیة) بوو کاتێك لایەنگری خەوارج بوون، ئەمەش ببووە هۆی سەرهەلّدانی چەند شەڕێك لەگەڵ خەلیفەی عەبباسی (المعتصد)، (ابن حوقل: صورة الأرض، منشورات دار مکتبة الحیاة، بیروت، ١٨٧-١٨٨" ابن خلکان: وفیات، ١٧٥/١).

** بنو الساج: بەنێوی بنەماڵەی ساجیە فەرمانڕەوا بوون لە نێوچە ئازەربایجان، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (مسکویە: تجارب الأمم، ١٦/١: حسام الدین علی غالب: ئازەربایجان، رسالة دکتوراە، کلیة الآداب، جامعة بغداد، ١٩٨٤م).

*** زیارییـەکان: بنەماڵەیـەکن لەفارسـەکان لـە سـەدەی (٤-٥ك/١٠-١١ز) فـەرمانڕەوایی نێوچەکانی (جرجان وقومس و طبرستان) و هەندێ نێوچەی دیکە، دامەزرێنەری ئەم بنەماڵەیە (مرداویج ابن زیار بن وردان شاە الجیلي) (حسین عماری: مادة آل زیار، دائرة المعارف الأسلامیة الکبری، طهران، ١٩٩١، ٥٢١/١).

مـسافرییەکان:- بنەماڵـەی (المـسافریة) یـاخود (ال المـسافر) بنەماڵەیـەکی دیلەمییـە، ولاّتـی ئازەربایجان و ئەرمینیا لەژێر فەرمانڕەوایەتیان بوو لەسەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچیدا) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (القلقشندی: قلائد الجمان في التعریف بقبائل عرب الزمان، تح، ابراهیم الابیاری، دار الکتب الحدیثة، القاهرة، ١٩٦٣، ص٨٨).

السامانیون: یەکێکن لە بنەماڵە ناودارەکانی ولاّتی فارس کەوا لەسەر ئایینی زەردەشتی بوون، لەسەر دەستی باپیرە گەورەیان کە نێوی (سامان خداە) بوو بوونە ئیسلام لە سەردەمی خەلیفەی ئومەوی (هشام بن عبدالملك) و لە نێو سالاّنی (٢٦١-٣٨٩ك/٨٧٤-٩٩٩ز) فەرمانڕەوایی ولاّتی ئەو دیوی ڕووبار تا ولاّتی فارس بەنێوچەکانی (خراسان، طبرستان، الری، الجبل، سجستان)

البويهيون و دواتریش سەلجوقییەکان**** جگە لەمانەش هێزە ناموسڵمانەکان وەك (ڕووس و بیزەنتیەکان).[135] حەمدانیەکان جگە لە موسڵ حوکمڕانی نێوچەکانی (دیار بەکر و جزیرە)شیان دەکرد و هەروەها هەندێ لە میرەکانیان دەسەڵاتی هەندێ نێوچەی ڕۆژئاوای هەرێمی چیا یان دەستکەوت.[136] بە شێوەیەك کە ئەو نێوچانە بوونە مەیدانی هێرشکردن و شەڕەکانیان. بۆ نموونە دەبینین (حسین بن حمدان)* دوای شکستهێنانی بەرانبەر بە سوپای خیلافەت لە ساڵی (٣٠٣ك/٩١٥ز) دەستی کرد بە

---

بوو.(عباس اقبال: تأريخ ايران بعد الأسلام، تعريب. محمد علاء الدين منصور، دار الثقافة للنشر والتوزيع، القاهرة، ١٩٩٠، ص١٣٣؛

G: Literary History of Persi. Cambridge ،E،Brown . ٢٩٩.،٣٦٩،PP.٢٥٦،I،١٩٥٩،University

**** سەلجوقییەکان: دەگەڕێنەوە سەر (سلجوق بن تقاق) خاوەن بیروڕایەکی بەتوانا بوو، سلجوق چەند کوڕێکی هەبوو بەناوی (ارسلان، میکائیل، موسی)، سەلجوق لە جوند نزیك بوخارا لە تەمەنی (١٠٧) ساڵی کۆچی دوایی کردووە، میکائیل چەند کوڕێکی بەجێما لەوانە (بیضر، طغرل بگ، جغری بگ) ڕەچەڵەکی سەلجوقیەکان دەگەڕێتەوە تورکەکانی ئەو دیوی ڕووبار، کە گوێڕایەڵی هیچ سوڵتانێکیان نەدەکرد تا ئەوەی ویستمان بۆیان چووە سەر. (ابن الأثير: الكامل، ٣٢١/١٩؛ حسام الدين علي غالب: ئازەربایجان، نیشتمان بشير محمد: الكرد و السلاجقة، رسالة دكتوراه، مقدمة الى كلية الآداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٠).

(١٣٥) قادر محمد حسن: الأمارات الكوردية، ص٥٠.

(١٣٦) مسكويه: تجارب الامم، ٧٥/١؛ ابن الأثير: الكامل، ٦/ ١٦٦، ١٨٥، ٢٠١، ٢٠٧، ٢٠٩؛ ابن خلدون: العبر وديوان المبتدأ والخبر في ايام العرب والعجم والبربرو من عاصرهم من ذوي السلطان الاكبر، (تاريخ العلامة ابن خلدون)، دار الكتاب اللبناني، بيروت، ١٩٨٦، مج٧٩٧/٣/٣.

* حسین بن حمدان: لە بنەماڵەی حمدانیەکان لە موصل توانی لەسەردەمی خەلیفە (المعتضد بالله) سەرکەوێت بەسەر (هارون الشاري) ڕابەری خەوارجەکانی ئەو نێوچەیەو بەدیل گرتنی و هێنانی بۆ خەلیفە، پاشان خەلیفە بڕیاری لە سێدارەدانیدا لە ساڵی (٢٨٣ك/٨٦٩ن)، بەمەش خەلیفە لە پاداشتی ئەم کارە باوکی ئازاد کرد. (الطبري: تأريخ الرسل والملوك، ١٧٠/٨-١٧٤؛ فيصل السامر: الدولة الحمدانية في الموصل و حلب، مطبعة الايمان، بغداد، ١٩٧٠، ص ص٣٨-٤٠).

سوتاندنی شارۆچکەی (تل فافان)**ی ڕۆژئاوای (ئامد) و کوشتنی دانیشتوانی.(١٣٧) هەروەها (بنو حمدان) بەوە تۆمەتبار کراون کە لە نێوچەی (دیار ربیعە)*** دەستیان گرتووە بەسەر سەروەت و سامانی خەڵکیدا.(١٣٨) دەتوانین بڵێین کە نێوچەی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بووە مەیدانی ململانێی سیاسی و شەڕ و پێکدادان لە نێوان هێزەکانی ئەو نێوچەیە، وەك شەڕی نێوان (دیسم بن إبراهیم الکردي و سالار مرزبان)،**** چونکە

---

** تل فافان: شوێنێکە دەکەوێتە سەر ڕووباری دیجلە لە خوارووی میافارقین. (یاقوت الحموي: معجم البلدان،٣/٨٤٥).

(١٣٧) ابن الأثیر: الکامل، ٦، ص١٥١؛ عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستکیة في کردستان الوسطی، بغداد، ١٩٧٥، ج٢/ ص٢٢.

*** دیار ربیعە: یەکێکە لە ناوچەکانی هەرێمی جەزیرە و پێکهاتووە لە (نصیبین، ارزن، امد، راس العین، میافارقین، ماردین، باعر بایا، بلد، سنجار، قردا وبازبدا وطور عابدین) (ابن خرداذبة: المسالك والممالك، ٨٦).

(١٣٨) مجهول: العیون و الحدائق في اخبار الحقائق، تح: نبیلة عبدالمنعم داود، مطبعة النعمان، النجف، ١٩٧٢، ٤ / م٢/٧٠.

**** دیسم بن ابراهیم الکردی: لە نێوچەکانی ئازەربایجان سەریهەڵداو توانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی و دەیەمی زانینی فەرمانڕەوایی ئازەربایجان و هەندێك لە نێوچەکانی ئەرمینیا و ئاران بکات، دەتوانین بڵێین دەسەڵاتی دیسم بە سەرەتای دەسەڵاتە سیاسیەکانی کورد دابنرێت لەو سەردەمەدا پێ دەچێت لە نێو سالانی (٣١٥-٣٤٥ك/٩٢٦-٩٥٦ز) حوکمڕانی بووە لەو نێوچەیە. (مسکویە: تجارب الأمم، ٢/ ٣٣؛ ابن الأثیر: الکامل، ٦/٢٨٦)؛ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (قادر محمد حسن: الأمارات الکردیة، ١٣-١٩).

مرزبان سالار:- ناوی (محمد بن مسافر الدیلمی) پێی دەوترا میری مسافری خاوەن ئازەربایجان، شەڕی لەگەڵ (رکن الدولة) کرد و لەو شەڕەدا بەدیلی گیرا، بەڵام لە ساڵی (٣٤٢ك/٩٥٣ز) توانی لە زیندان هەڵبێت و دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئازەربایجان بگیرێتەوە، لە ساڵی(٣٤٦ك/٩٥٧ز) کۆچی دوایی کرد (مسکویە: تجارب الأمم،٢/ص ص ١١٥،١٦٦؛ ابن الأثیر: الکامل، ٦/٣٣٠،٣٤٣،٣٥٢)..

یەكەمیان هەستا بە ڕووخانی شوورەی شاری (اردبیل)* بە سەر دانشتوانی نێوچەكەدا لەبەرئەوەی پشتگیری (دیسم)یان كرد لە ساڵی (٣٣١ك/٩٤٣ز) تا دەستی بە سەر سامانی پیاوچاكان و بازرگانەكاندا گرت و دەربەدەری كردن.(١٣٩) ئەمە و هەرێمی چیا (اقلیم الجبال)ە لە بارودۆخێكی باشتردا بوو بە بەراورد لەگەڵ هەرێمەكانی دیكەدا لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە، بە تایبەتی دوای هێرشكردنی (مرداویج بن زیار)** بۆ سەر نێوچەكە لە (٣١٦ك/٩٢٨ز) دەستگرتنی بە سەر نێوچەی (جبل)دا.(١٤٠) هەروەها لە ساڵی (٣١٩ك/٩٣١ز) دەستی گرت بە سەر (همدان)دا و تاڵانی كرد.(١٤١) هەر بەمەشەوە نەوەستا، بەڵكو لە هێرشەكانی بەردەوام بوو بەرەو شارەكانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیا، بە (دینور)یشەوە و دەستی كرد بە كوشتنی دانشتوانی.(١٤٢) كە ناچار بوون بەرەو بەغدا هەڵبێن و داوای كۆمەك و یارمەتی لە خەلیفە بكەن.(١٤٣) بوەیهییەكان لە دەوروبەری ساڵی (٣٢٠ك / ٩٣٢ز)دا كاتێ پێوەندیان بەهێزی سەربازی (مرداویج بن زیار)ەوە كرد لەسەر شانۆی سیاسەت دەركەوتن، و (أحمد) كرا

---

* اردبیل: بەناوبانگترین و شورابنترین شارەكانی ئازەربیجانە، دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئازەربیجانی ئێران نزیك دەریای قەزوین (القزوینی: اثار البلاد واخبار العباد، دار صادر، بیروت، د.ت،٢٩١؛ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (حسام الدین علی غالب: ئازەربایجان، ص٧٥).

(١٣٩) ابن حوقل: صورة الارض، ٢٨٧-٢٨٨.

** مرداویج بن زیار: یەكێك بوو لە فەرماندە سەربازیە سەركێشەكان، چاوی لە پلەی سەربازی بڵند بوو لە سێبەری میرنشینێكی لاواز، توانی لەگەڵ (اسفار بن شیرویە) سەربكەون بەسەر (ماكان)، هەرچەندە (اسفار) لە ساڵی (٣٢٣ك/ ٩٢٨ز) كوژرا، بەڵام دەسەڵاتەكەی گەیشتە دەستی (مرداویج وشمكیر)ی برای، ئەم سەركەوتنەی مرداویج هۆكاری یەكەم و ڕاستەوخۆی سەرهەڵدانی (بنی بویە) بوو.(احمد شلبی: موسوعة التاریخ الأسلامی و الحضارة الأسلامیة، القاهرة،د-ت،٤١٦/٣).

(١٤٠) ابن خلدون: العبر، م ٣ / ق٤ / ص٨٠٣.

(١٤١) القزويني: اثار البلاد واخبار العباد، ٤٦٨؛ الذهبي: دول الاسلام، ح١/ ص١٩٢.

(١٤٢) المسعودي: مروج الذهب، ح٤/ ص٤٣٠؛ ابن الاثير: الكامل، ٢١٤/٦.

(١٤٣) الاصفهاني: تاريخ سني ملوك الارض و الانبياء، دار مكتبة الحياة، بيروت، ص١٥٩.

بەوالی کەرەج* لە باشوری خۆرهەلاتی هەمەدان کە بچوکترینی هەرسێ کوڕەکەی (شجاع بویه) بوو: (علی و حسن) جگە لە (أحمد)، و عەلیش بوو بە (ضامن)ی ئیلتزامی نێوچەکانی ماهی بەصرە (نەهاوەند)،** هەرسێ برا توانیان دەستبگرن بەسەر هەرێمی فارس و نێوچەکانی سەر بەهەرێمەکە و لە سالّی(۳۲۳ک/۹۳۵ز)دا چیاکانیش کەوتە ژێر دەستیانەوە، دوای کوشتنی (مرداویج) لەسەردەستی تورکەکان، ئەحمەدیش بەردەوام بەرەو داگیرکردنی ڕۆژئاوا دەڕۆیشت و حسنی براشیان حکومڕانی ولاتی چیاکانی دەکرد، دوای ئەوە ئەحمەد چووە بەغداد و لە سالّی (۳۳٤ / ۹٤٥ز)دا حسن نازناوی (رکن الدولة)ی*** وەرگرت و ئەحمەدیش نازناوی (معزالدولة)**** و (ابو الحسن علی)ی براشیان نازناوی (عماد الدولة م۳۳۸ک/۹٤۸ز)ی وەرگرت،(١٤٤) بەلام کوژرانی (مرداویج) بەدەستِ غولامە تورکەکانی خۆی سالّی

---

* کەرەج: شارێکە دەکەوێتە نیوەی ڕێگەی نێوان همذان واصفهان.(یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/٤٤٦).

** نەهاوەند: بەکۆنترین شار دادەنرێت لە هەرێمی چیا، دەکەوێتە باشووری هەمەدان، و نزیکەی (٨٤کم) لێیەوە دوورە، هەلکەوتەی ئەم شارە کەوتۆتە سەر چیا هەر بۆیە کەش وهەوایەکی گونجاوی هەیە. (الیعقوبي: کتاب البلدان، المطبعة الحیدریة، ٣٩؛ ابن خرداذبة: المسالك و الممالك، ١٩٩).

*** رکن الدولة: ناوی (ابو علی الحسن بن بویه)ە میری بوەیهی بوو، هاوکات خاوەنی (اصبهان والری وهمدان) بوو، لە سالّی (٣٦٦ك/٩٧٦ز) کۆچی دوایی کردووە. (ابن خلکان: وفیات،٢/ص ص ١١٨،١١٩؛ ابن الأثیر: الکامل، ٣٦٣/٨).

**** معز الدولة: ناوی (ابوالحسین احمدبن بویه)ە میری بوەیهییەکان بوو، هەروەها خاوەنی (العراق والأهواز) بوو، لە سالّی (٣٥٦ك/٩٦٦ز) کۆچی دوایی کردووە (ابن خلکان: وفیات، ١٧٤/١-١٧٦؛ ابن تغری بردي: النجوم الزاهرة في ملوك مصر و القاهرة، وزارة الثقافة، دار الأرشاد القومي، مصر، ١٤/٤).

(١٤٤) حسام الدین علي غالب: الکرد، ١١٣.

(٣٢٣ك/٩٣٥ز).[١٤٥] بووه هۆی جێ لەقبوونی دەسەڵاتی زیارییەکان لە نێوچەکەدا، چونکە برازاکەی (قابوس بن وشمکیر)* لە جێی دانیشت تورکەکان بوون بە دوو گروپەوە، گروپێك چوونە نێو بوەیهییەکانەوە و گروپێکی بەرەو هەرێمی چیا،[١٤٦] بەڕێکەوتن و باج و سەرانەی دەینەوەریان هێنا.[١٤٧] بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین خەڵکی ئەو نێوچەیە نێچیرێکی ئاسان بوون بە دەستی تەماحکارانەوەو بوونە قوربانی ئەو بارودۆخە شێواوە، بۆیە دەبینین یەکێ لە سەرکردە پێشووەکانی زیارییەکان کە نێوی (یشکری) بوو سێ ملیۆن درهەمی لە ماوەی یەك حەفتەدا لە دانیشتوانی (نهاوەند) سەند.[١٤٨]

دوای ئەوە نێوچەکە بوو بە مەیدانی ململانێی نێوان بوەیهی و سامانییەکان، چونکە هەردوو لا هەوڵی ئەوەیان دەدا دەست بەسەر شارەکانی هەرێمی چیا بگرن و چەندین شەڕ و پێکدادان لە نێوانیاندا ڕوویدا، و میر (رکن الدولة)ی بوەیهی توانی لە ساڵی (٣٣٥ك/٩٤٦ز)دا بەسەر سامانیەکاندا زاڵ بێت و هەموو شارەکان بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی.[١٤٩] ئەمە و جگە لەوەی کە نێوچەی (ثغور)ی** جەزیرە و ئاران

---

(١٤٥) ابن الأثير: الكامل،٦/٢٤٤ ؛ ابوالفدا: المختصر في اخبار البشر، دار المعرفة للطباعة والنشر، بيروت،٢،١٩٦٠/٨٢.

* قابوس بن وشمكير: ناوی (شمس المعالی ابو الحسن قابوس بن ابی طاهر و شمكير بن زيار)، میری (جرجان، الجبل، طبرستان) بوو، دەسەڵاتەکەی لە باوکی گوێزرایەوە بۆ براکەی (مرداويج بن زيار)، هەرچەندە کەسێکی بەتواناو دووربین بوو، بەڵام لەهەمان کاتدا زۆردارو ستەمکار بووە، هاوکارانی لەدژی هەستاو (منوجهر)ی کوڕیان ناچار کرد باوکی زیندانی بکات، تاوەکو لە ساڵی (٤٠٣ك/ ١٠١٢ن) کۆچی دوایی کرد، (ابن الجوزي: المنتظم في تاريخ الملوك والامم، مطبعة دائرة المعارف الاسلامية، حيدر اباد، ٤/ ٢٦٩؛ ابن خلكان: وفيات، ٤/٨١).

(١٤٦) ابن الجوزي: المنتظم، ٦ / ٣٢٠-٣٢٢.

(١٤٧) المسعودي: مروج، ٤/٤٣٢ ؛ ابن الأثير: الكامل،٦/٢٤٦.

(١٤٨) الهمذاني: تكملة تاريخ الطبري، ٢٦٥؛ ابن الاثير: الكامل، ٦/٢١٤.

(١٤٩) مسكويه: تجارب الامم، ٢ /١٠٨؛ ابن الأثير: الكامل، ٦/٣٢٤.

** ثغور: مەبەست لە ثغور ناوچە سنوریەکانە لەگەڵ هێزە بیانیەکاندا.

دووچاری هێرشی هێزه دەرەکییەکان بوون، وەك هێرشی بیزەنتیەکان بۆ سەر نێوچەکانی (ئامەد، میافارقین، ارزن، نصیبین و خەلات).*** ئەم هێرش کردنە ماوەیەکی زۆری خایاند.[150] هەروەها مەترسی هێرشکردنی ڕووسیش بۆ سەر نێوچەکانی (ثغور) لە ئاران لە زیادبووندا بوو، چونکە ساڵی (٣٣٢-٣٣٣ك/٩٤٣-٩٤٤ز) هێرشیان کردە سەر شاری (بردعه)،* بەڵام تووشی بەرگرییەکی سەخت بوون لە لایەن دانشتوانی ئەو نێوچەیە.[151] وەك لەم ڕوونکردنەوەیەدا دەردەکەوێت، ڕووداوە خوێناوییەکان ئێش و

---

*** ئامەد: شارێکی کۆنەو دەکەوێتە بەشی خۆرئاوای ڕووباری دیجلە، و ڕووباری دیجلە وەك دەمەداس بەدەوریدا سوڕاوەتەوە، ئێستا پێی دەوترێت دیاربەکر. (ابن حوقل: صورة الأرض، ٢٨؛ القزويني: آثار البلاد و اخبار العباد، ٤٩١).

میافارقین: دەکەوێتە نێوان جەزیرە و ئەرمینیا، شارێکی گەورەیە و شوورایەکی لەبەرد درووستکراوی هەیە و هەروا خەندەقێکی قووڵی هەبووە، هەر لە کۆنەوە کوردی تیادا نیشتەجێ بووە. (ابو الفداء: تقويم البلدان، ٢٧٩؛ ابن حوقل: صوة الأرض، ٢٠١).

ارزن: شارێکی بەناوبانگە لەنزیك خەلات، قەڵایەکی سەختی هەیە. (ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣٥/١).

نصیبین: بەبنکەی دەڤەری ڕەبیعە دادەنرێ و چیای جودی دەکەوێتە بەشی باکووری و هەروا خۆشی دەکەوێتە باکووری سنجار، و ڕووباری هەرمان بەتەنیشت شورای ئەم شارەدا دەڕوات. (ابن جبير: رحلة ابن جبير (تذكرة بالأخبار عن الأتفاقات و الأسفار، دار صادر، بيروت، ١٩٥٩، ١٧١؛ ابو الفدا: تقويم البلدان، ٢٨٣).

خەلات: شارێکی ئەرمینیای نێوەڕاستە دەکەوێتە سەر دەریاچەی (اخلاط) لە جوانیدا کەم وێنەیە. (ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣٨٠/٢، ٣٨١).

(١٥٠) ابن كثير: البداية و النهاية، ٢٨٩/١١/٦، ٢٤٧؛ ابن الوردي: تتمة المختصر في اخبار البشر، منشورات المطبعة الحيدرية، النجف، ١٩٦٩، ٤٠٤/١، ٤١١، ٤١٣.

* برذعة: شارێکی گەورەیە لە وڵاتی ئاران، ئەم شارە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانیەکان و شاە قوباد بنیادی ناوە، و نزیکەی (١٠٠كم) لە دوین دوورە، و خاکەکەی بەپیت و بەرهەمە. (قدامة بن جعفر: الخراج و صناعة الكتابة، ٣٢٢؛ احمد كسروي: شهرياران گمنام، ٢٥٥).

(١٥١) مسكويه: تجارب ٨١/٢؛ ابن الأثير: الكامل، ٢٩٧/٦-٢٩٨ ؛ ابو الفدا: المختصر، ٩١/٢؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ٢٢١/١١/٦.

ئازاری خەڵکی نێوچەکەی زیاد دەکرد، هەروەها خراپی بارودۆخی خیلافەتی عەبباسی لە هەموو ڕوویەکەوە کاریگەری زۆری لە سەریان هەبوو، هەر بۆیە کوردیش لە پێناوی بەڕێوەبردنی نێوچەکەیان لەلایەن خۆیانەوە هەوڵی یەکخستنی کارەکانیان دا، چونکە ئەمانیش وەك سەرجەم گەلانی نێوچەکە ئارەزووی سەربەستی و ئازادی بوون و بڕوای تەواویان پێی بوو، لەبەر ئەوە دەبینین داگیرکەر لە هەر کوێیەك بووبێت زۆر چالاکانە بەرەنگاری بوونەتەوە و هەموو جۆرە دەست تێوەردانێکیان ڕەتکردۆتەوە و تەنانەت هیچ سەرۆك و والیەکیش نەیتوانیوە لە خاکیاندا بمێنێتەوە و بۆ خۆیان حوکمڕانی خۆیان بوون، و تەنها بەنێو سەر بەدەوڵەتی عەبباسی بوون ئەمەش ڕێی لە پێشکەشکردنی دیاری و دارایی بۆ دەسەڵاتی مەرکەزی لێ نەدەگرتن، بەڵکو لەلایەنی سەربازیشدا سستیان نەدەنواند بۆ لەناوبردنی دژەکانیان و لەناوبردنی ئەو شۆڕش و بزووتنەوانەی لەدژیان دەکران، ئەو سەرۆکانەش لە نێویاندا بوەیهییەکانیش کوردیان لەزۆربەی کاتەکاندا بۆ ئەم مەبەستە بەکاردەهێنا، سودیان لە توانای سەربازی و ئازایەتی و نەترسیان وەردەگرت بەم شێوەیە کورد ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە لە یارمەتیدانی سەرۆکی گەلانی دیکەدا.[١٥٢]

---

(١٥٢) حسام الدين علي غالب: الكرد، ص١١٤-١١٥.

## دەستگرتن و باڵادەستی بیانییەکان بەسەر خیلافەتی عەبباسیدا

یەکێ لە دیارترین و گرنگترین ئەو دروشمانەی کە عەبباسییەکان لە قۆناغی نهێنی کارکردنیاندا بەرزیان کردبووەوە و جاڕیان بۆ دەدا چاککردنی باری گوزەرانی لایەنگرانی (موالی)* بوو لە ڕووی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە و یەکسانبوونیان لەگەڵ عەرەبەکاندا. هەروەها عەبباسییەکان لە لایەکەوە بانگەوازی یەکسانیان لە نێوان عەرەب و لایەنگرە دەرەکییەکان بە تایبەتی خوڵقاندنی هەماهەنگییەك لە نێوان عەرەب و فارسەکاندا دەکرد و لە لایەکی تریشەوە کۆششی لایەنگرە دەرەکییەکان بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی لەدەستچوویان وەك دەرفەتێك دەقۆستەوە بۆ خوڵقاندنی گیانی هاوکاری لە نێوان هەموو چین و توێژ و ڕەگەزێکی وڵاتدا بۆ دەستەبەرکردنی بنەماکانی دەوڵەتە نوێیەکەیان.(١٥٣) خەلیفە عەبباسییەکان پشتیان بە وەزیری فارسی دەبەست وەك کاتێك (مأمون)** خیلافەتی وەرگرت، پشتی

---

* موالی: (کۆی مولی)یە بەدیلەکانی شەڕی دەوڵەتی ساسانی دەگوترا کە لەلایەن عەرەبە موسڵمانەکانەوە گیرابوون و ببوون بە موسڵمان، ئەوانە وەك هاوڵاتی ژمارە دوو، یاخود چینی ناوەند بوون لە نێوان گەورەکانیان (عەرەب) و نێوان کەسانی دیکەی عەرەبدا، بەڵام بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار بە هەموو موسڵمانێکی ناعەرەبیان دەگوت موالی کە زیاتر بەماناو مەبەستی خزمەتکار دەهات. (ولهارزن: الدولة العربية و سقوطها، نقله الى العربية: يوسف العش، مطبعة الجامعة السورية، دمشق، ١٩٥٦، ١٧٤؛ شوان عوسمان مستەفا: کوردستان و پرۆسەی بەئیسلامکردنی کورد، سلێمانی، ٢٠٠٢، ٢٨٩؛ نەریمان عبداللە علی: ڕەوشی موالی لەسەردەمی ئومەوییدا، ماستەر، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، بەشی مێژوو، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٥).

(١٥٣) عبدالعزيز الدوري: دراسات في العصور العباسية المتاخرة، مطبعة السريان، ١٩٤٥، ص١٠.

**مأمون: ناوی (عبدالله بن هارون)ە حەوتەمین خەلیفەی بنەماڵەی عەبباسییەکان بوو لە نێو ساڵانی (١٩٨-٢١٨ك/٨١٣-٨٣٣ز) خیلافەتی عەبباسی گرتە دەست، کەسێکی نزیك بوو لە

بە سەرکردەی سەربازی فارسی دەبەست لە شەڕیدا لەگەڵ (ئەمین)ی*** بڕایدا. بۆیە دەبینین کاروباری بە دەستەوە دەدەن و پلەوپایە زۆر گرنگ و سەرەکییەکانی دەوڵەتی پێ دەبەخشین.(١٥٤) (مأمون) دوای شکستی (بني سهل) بەجێهێشتنی مەڕو و گەڕانەوەی بۆ بەغدا، خۆراسانییەکانی بێ ئومێد کرد. دیارترین ئەو خالآتەی کە سەردەمی (المعتصم بالله)* (٢١٨-٢٢٧ك/٨٣٣-٨٤٢ز) جیادەکاتەوە زۆربوونی تورکەکان بوو لە سوپادا و بلاوبوونەوەیان لە ولآتدا، لەبەر پێویستی زۆری ولآت بە سەربازی چالاك و بە توانا، ئاشکرایشە کە سەربازی تورك ناسراون بە توانایی و دڵسۆزی، لەبەرئەوە دەوڵەتی ئیسلام پشتی پێ دەبستن، بەڵام ئەمە بووە هۆی بێزاربوونی خەڵکی بەغدا، چونکە ئەو سەربازە تورکانە زۆر توندوتیژانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد، هەر بۆیە (المعتصم) بڕیاریدا بە گواستنەوەی خیلافەت لە بەغداوە بۆ سامەڕا.(١٥٥) لە سەردەمی (الواثق بالله)**دا دەسەلآتی

---

زاناو فقیهەکان، تەواوکاری ڕێگەی باپیری (ابو جعفر المنصور) بوو لە وەرگێڕانی کتێبی زانستی و فەلسەفی. (الطبري: تاريخ الرسل والملوك، ٥٢٧/٨؛المسعودي: مروج الذهب، ٣٩٥/٢ ؛ السيوطي: تأريخ الخلفاء، ٤٩٠).

*** ئەمین: ناوی (محمد بن هارون)ە و پێیان دەوت (ابو موسى) دایکی (زبیدە)ی ناوبوو کچی (جعفر بن ابي طالب) بوو، لە نێو ساڵانی (١٩٣-١٩٨ك/٨٠٨-٨١٣ن) خیلافەتی عەبباسی گرتە دەست، لە ساڵی (١٩٨ك/٨١٣ن) لەو ململانێی لەگەڵ مامونی برای کوژرا. (الطبري: تاريخ الرسل والملوك، ٣٦٥/٨؛ السيوطي: تأريخ الخلفاء،٤٧٤).

(١٥٤) ستانلي لينبول: طبقات سلاطين الاسلام، تر-مكي طاهر الكعبي، بغداد، ١٩٦٨، ١٢٠.

* المعتصم بالله:- ناوی (ابو اسحاق محمد بن الرشيد)ە لە نێو ساڵانی (٢١٨-٢٢٧ك/٨٣٣-٨٤١ن) دەسەلآتی خیلافەتی عەباسی گرتە دەست، وشاری (سامراء)ی درووست کرد لە نێو بەغدا وتکریتدا، لەسەردەمی ئەودا (بابك الخرمي و جعفر بن فهرجس الكردي) کوژران. (الطبري: تاريخ الرسل و الملوك، ٥٢،١١٦/٩؛ ابن الأثير: الكامل، ٦/ ٢١، ٧٠).

(١٥٥) جون جلوب: امبراطورية العرب، تر: خيري حماد، بيروت، ١٩٦٦، ص ٦٤٩؛ فاروق عمر فوزي: الخلافة العباسية في عهد الفوضى العسكرية، ١٩٧٧، ص ٣٦ – ٣٧.

تورکەکان زۆر زیادی کرد و ئەو سەردەمە بە سەردەمی بوژانەوەی دەسەڵاتی تورکەکان ناسرابوو کە تییدا (الواثق بالله) ناچار کرابوو پلەی سوڵتان ببەخشێ بە (اشناس) بەمەش دەسەڵاتێکی وای پێ بەخشیبوو کە لە دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و عەسکەرتاری زیاتر بوو، هەر بۆیە کاتێك خەلیفە کۆچی دوایی کرد، (اشناس) خۆی دەسەڵاتی باڵای خیلافەتی بە دەستەوە گرت و هەر ئەویش خەلیفەی هەڵدەبژارد کە (جعفر المتوکل)بوو.(١٥٦)

کە (المتوکل) خیلافەتی وەرگرت بینی چ پشێوییەك وڵاتی تەنیوە لە ئەنجامی دەسەڵاتداری تورکەکان، بۆیە بیری لەوە کردەوە کە سنوورێکیان بۆ دابنێت و دەسەڵاتیان کەم بکاتەوە، بەڵام تورکەکان دەستپێشخەربوون لەگەڵ کوڕەکەی (المنتصر بالله)*دا ڕێککەوتن و توانیان خەلیفە بکوژن. ئەم ڕووداوە بەڵگەیەکی دیاری پەشێوی بارودۆخی وڵات و خاڵێکی وەرچەرخان بوو، چونکە بەڕێوەبردنی خیلافەت ڕێڕەوێکی دیکەی گرتە بەر، کە تێیدا دەسەڵاتی سەربازی تورك زۆر بەهێز بوو لە بەرامبەریشدا دەسەڵاتی خەلیفە زۆر لاواز بوو بوو، بەڵکو خیلافەتی عەبباسی هیچ دەسەڵاتێکی

---

** الواثق بالله:- ناوی (ابو جعفر هارون بن محمد بن هارون الرشید)ە لە نێو ساڵانی (٢٢٧-٢٣٢ك/٨١٤-٨٤٦ز) خەلیفەی خیلافەتی دەوڵەتی عەبباسی بوو، تاقیکردنەوەی خەڵکی کرد لە (خلق القرآن) و لە نێویان (احمد بن حنبل) لەشاری (سامراء) کۆچی دوای کرد. (ابن قتیبة الدینوری: المعارف، مکتبة العلوم والحکمة، بیروت، ١٩٦٠، ٣٩٢/٢ ؛ الخطیب البغدادي: تاریخ بغداد، ٢٩٧/١).

(١٥٦) کارل بروکلمان: تاریخ الشعوب الاسلامیة، نقله الی العربیة: نبیه امین فارس و منیر بعلبکي، بیروت، ١٩٧٧، ص٢١٢.

* المنتصر بالله:- ناوی (ابو عبداللهبن جعفر بن المتوکل بن محمد المعتصم بن هارون الرشید)ە لەشاری (سامراء) لە دایك بووە، لە نێو ساڵانی (٢٤٧-٢٤٨ك/٨٦١-٨٦٢ز)، باوکی خۆی کوشت و تەنها (٦)شەش مانگ خەلیفە بوو لە تەمەنی (٢٥)ساڵی کۆچی دوای کرد، (ابن قتیبة الدینوری: المعارف، ٣٩٢؛ الطبري: تاریخه،٢٣٤/٩؛ ابن الکازروني: مختصر التاریخ، حقق وعلق علیه مصطفی جواد، بغداد، ١٩٧٠، ١٤٩).

سیاسی نەبوو، تەنها لە سەردەمی (المعتضد باللە)** و دوای ئەویش کورەکەی (المکتفي باللە)***دا نەبێت کە خیلافەت هەندێ دەسەلاتی بەدەست هێنابووەوە، بەلام ئەمەش زۆری نەخایاند و تورکەکان گەڕانەوە نێو دەسەلات و دەستیان بە سەر بەڕێوەبردنی ولاتدا گرت.(١٥٧)

سەرکەوتنی زۆری تورکەکان و دەسەلاتداریان لە ولاتدا بووە هۆی زیاتر لاوازبوونی خەلیفەکان و تا ڕادەیەکیش سوك و ڕسوابوونیان لای تورکەکان کە بە ئارەزووی خۆیان ولاتیان بەڕێوەدەبرد و چیان بویستایە دەیانکرد، گەر بیانویستایە خەلیفە لابەرن لایاندەبرد و گەر بیانویستایە بیکوژن دەیانکوشت.(١٥٨) لە ڕاستیدا خەلیفەکان کاروباری ولاتیان بە تەواوی بەدەست تورکەکانەوە دابوو، دەسەلاتی خەلیفە تەنها نێوێك بوو و هیچی تر. خەلیفەکان لە بە

رانبەر خواست و ئارەزووی تورکەکاندا هیچیان پێنەدەکرا و نەیاندەتوانی ڕوو بە

---

** المعتضد باللە:- ناوی (ابو العباس احمد بن الموفق بن احمد بن المتوکل) لە سالی (٢٤٢ك/٨٥٦ن) لەدایك بووە، و لە سالی (٢٧٩-٢٨٩ك/٨٩٢-٩٠١ن) خیلافەتی عەبباسی گرتە دەست، توانی لەماوەی دەسەلاتیدا دادپەروەری لە نێو خەلکیدا بلاوبکاتەوە و دەستی کرد بە چاکسازی نێوخۆیی ئەمە جگە لە حەج و غەزاکردن لە پێناو خوادا.( ؛الطبري: تاریخ،١٠/٣٠؛ المسعودي: مروج الذهب،٢/٥٩٧ الحنبلي: شذرات الذهب،٢/١٧٢).

*** المکتفي باللە:- ناوی (ابو محمد علی بن المعتضد)ە لە سالی (٢٦٤ك/٨٧٧ن) لە دایك بووە، لە نێو سالانی (٢٨٩-٢٩٥ك/٩٠١-٩٠٧ن) خیلافەتی عەبباسی گرتە دەست، لەو سەردەمەدا (جامع القصر ودار الخلافە)ی درووستکرد، هاوکات هەستا بە قەتلوعامکردنی (خوارج) هەروەها (القرامطة)، هەروەها توانی شاری (انطالیا) لە ولاتی ڕۆم فەتح بکات.(ابن العبري: تأریخ مختصر الدول،١٥٢؛ ابن الکازروني: مختصر التاریخ، ١٦٨؛ السیوطي: تاریخ الخلفاء، ٦٠١-٦٠٢).

(١٥٧) محمد ماهر حمادة: الوثائق السیاسیة و الاداریة العائدة للعصر العباسي المتتابعة،١٩٧٧، ص١٦.

(١٥٨) ابن الطقطقی: الفخري في الاداب السلطانیة والدول الاسلامیة، ص٢٤٣.

ڕوویان ببنەوە لە ئەنجامدا دەوڵەتی ئیسلام دابەش بوو بۆ چەندین میرنشین و دەوڵـەتی بچووك بچووك.(١٥٩)

دوای ئەوەی کە میرەکانی دەوروبەری خیلافەت بە میرە کوردەکانیشەوە هەستیان بـە لاوازی خیلافەتی عەبباسی کرد لە ئەنجامی باڵادەستی تورکەکاندا زانیان کە دەرفەتی ئەوە ڕەخساوە دەست بەسەر ئەو نێوچانەدا بگرن کە لـە ژێـر دەسـەڵاتیاندایە، چـونکە ئەوان هیچ کاتێ خۆیان لە تورکەکان بە کەمتر نەدەزانی کە لە نێوجەرگەی پێتـەختی خیلافەتدا دەسـەڵاتیان بـە دەسـتەوە گرتبـوو، بـەم شـێوەیە لـە نێوەڕاسـتی سـەدەی (٤ك/١٠ز) خیلافەتی عەبباسی بـە چـەندین دەوڵـەت و میرنـشین کـە بـەڕێوەبردنی جیابوو لە دەوڵەتی عەبباسی دەورە درابوو.(١٦٠)

لە ساڵی (٣٢٤ك/٩٣٥ز)دا خەلیفەی عەبباسی تـەنها نێوچـەی نێـوان بەغـدا و (واسط)ی بەدەستەوە مابوو کە بێگومـان ئەمـە بـووە هـۆی کەمبوونـەوەی داهـات، تەنانەت داهات ئەوەندە کەم بوو بووەوە کە نـەدەتوانرا مووچـەی سـەربازەکان بـدرێت، ئەمە بۆ خۆی خەلیفە (الراضي بالله)ی* ناچـار کـرد کـە (ابـن رائـق)** سـەرکردەی

---

(١٥٩) گوستاف لوبوون: حضارة العرب، تر: عادل زعيتر، القاهرة، ١٩٥٦، ص١٧٧.

(١٦٠) حسين مجيب المصري: الصلات بين العرب و الفرس و الترك، ١٩٧١،ص ٩٤.

* الراضي بـالله:- لـە نێو سـاڵانی (٣٢٢-٣٢٩ك/٩٣٤-٩٤٠ز) خیلافەتی عەبباسـی گرتـە دەسـت، لەبەر لاوازی خـۆی وڵات دابـەش بـوو و گەنـدەڵی بڵاوبـووە، ڕۆمـەکانی نێوچـە سـنوریەکانیان گیرایەوە، هەروەها هەستا بە بڕینی دەستی (ابن مقلة الكاتب) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (الطبري: تاريخه،٢٩١/١١؛ ابن العبري: تاريخ مختصر الدول، ١٦٢؛ السيوطي: تاريخ الخلفاء، ٦٢٣).

**ابـن رائـق: لەسـەردەمی خەلیفـە (الراضـي بـالله) ببـووە میری میـران پـاش ئـەوەی (الكرخـي و سـليمان بـن الحـسن مخلـد) بـەهۆی زیـادبوونی دەسـەڵاتی فەرمانـدە سـەربازیەکان، نـەیانتوانی کاروبـاری وڵات ببـەن بـەڕێوە بەمـەش (ابـن رائـق) دەسـەڵاتی زۆر فـراوان بـوو، هـەر بـە خـۆی والیەکانی دادەنـا و لادەبرد، پلەوپایەی لەلای خەلیفـە لـە وەزیـر زیـاتر بـوو. (مسكويه: تجارب الأمم، ٣٥٠/١؛ حسن ابراهيم حسن: تاريخ الأسـلام السياسي والـديني والثقـافي والأجتمـاعي، دار الجيل، ط١٥، بيروت، ٣٣/٣.

تورکەکان بانگ بکات و وەك(أمیر الأمراء)*** میری میرانی دابمەزرێنێت بەرانبەر بە خەرجکردنی مووچەو دابینکردنی پێویستیەکان.[١٦١]

بەم شێوەیە (ابن رائق) و نووسەرەکەی (کاتبەکەی) بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتیان بە دەستەوەگرت، و ئەوانەش کە دوای ئەمان هاتن هەمان ڕێڕەوی ئەمانیان دەگرتە بەر و هەموو داهاتی وڵاتیان دەگواستەوە خەزنەکانیان بە گوێرەی خواست و ئارەزووی خۆیان لێیان خەرج دەکرد و چەندیان بویستایە ئەوەندەیان دەدایە خەلیفە، تەنانەت زۆرجار خانەی داهات (بیت المال) ئەوەندەی تێدا نەبوو کە بەشی پێویستییەکانی دەوڵەت بکات.[١٦٢]

لەڕاستیدا زۆر لەوانەی کە پلەی (میری میران)یان بە دەستەوە دەگرت لەو سەربازە تورکانە بوون.کە خاوەن ئەزموونی سیاسی نەبوون، بەڵکو تەنها لە خەمی پلەوپایەدا بوون، بۆیە بە شێوەیەکی زۆر توندوتیژانە هەڵسوکەوتیان دەکرد ، ئەوەش کە هۆکارێک و پشتیوانیان بوو لە ڕەفتاری توند و تیژییاندا (دەیلەمییەکان) بوون. هێز و ژمارەی دەیلەمییەکان لە خیلافەتدا زۆر زیادی کرد و لە سوپای میری میران (بجکم)* و (احمد

---

*** امیرالامراء-میری میران: فەرمانەدەی گشتی سوپایە، خەلیفەی عەبباسی (الراضي بالله) لە ساڵی (٣٤٢ك/ ٩٣٥ ز) دای هێنا، کاتێك فەرمانده بچووکەکان دەستیان لە کاروباری خیلافەت وەردەدا، بۆیە خەلیفە (محمد بن رائق)ی ڕاسپارد بۆ ئەم کارە بەمەرجێك پێداویستیەکانی دارایی خیلافەت دابین بکات. (ابن الأثیر: الکامل، ١٨٥/٥؛ ابن تغري بردی: النجوم الزاهرة، ٢٥٨/٣؛ ابن خلدون: العبر،٤١١/٣؛ حسام قوام السامرائي: المؤسسات الأداریة في الدولة العباسیة خلال الفترة ٢٤٨-٣٣٤هـ، دار الفکر العربي، القاهرة، ٧٧).

(١٦١) ابن الاثیر: الکامل، ٣٢٢/٨-٣٢٣؛ عبدالعزیز الدوري: دراسات، ص٣٢.

(١٦٢) مسکویه: تجارب الامم، ٣٥٢/١.

* بجکم: غولامێکی تورکیە هی (مرداویج بن الزیار) بوو، لەسەردەمی خەلیفە (المتقي لله) لەپاش کوشتنی مرداویج هات بۆ عێراق و ببووە میری میران، لەشاری (واسط) لە ساڵی (٣٢٩ك/٩٤٤ز) لە ئەنجامی هێرشی بۆ سەر ماڵ و حاڵیان بەدەستی کوردەکان کوژرا. (ابن الجوزي: المنتظم،٣٢٠/٦-٣٢٢).

البريـدی)دا تەنانـەت مـیری مـیران (قـرەتكین) دەیلـەمی بـوو، هـەر بۆیـە دەتـوانین دەسـتگرتنی بووەیهیـەكان بەسـەر خیلافەتـدا بگەڕێنینـەوە بـۆ زۆری ژمـارەی دەیلەمییەكان لە سوپای خیلافەتدا.[163] لە ڕاستیدا سیستمی میری میران توانـای جێگیركردنی بـەڕێوەبردنی كاروبـاری وڵاتـی نـەمابوو لـە كاتێكـدا كـە كۆچـكردنی بوەیهییەكان لە وڵاتی فارسدا جێگیربوو بوو. ئینجا بۆ (احمد بن بویـە)یـان نووسـی و داوایان لێكرد بڕوا بۆ لایان، ئەویش بەڕێ كەوت و چووە نێو بەغدا و بـوو بـە (مـیری میران) ئەمـەش بۆ خۆی سەرەتای بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی بوەیهی بوو لە بەغدا.[164]

بەم شێوەیە دەبینین لاوازی خیلافەت پاڵپشتی بوو بۆ بیانییەكان كە دەسـت بەسـەر پلەوپایە بەرزەكانی دەسەڵاتدا بگرن، جگە لەوە بارودۆخی خیلافـەت هانـدەر بـوو بـۆ والییەكانی هەرێمەكان كە جیاببنـەوە، دوای ئەوەی كـە خیلافـەت شـكۆمەندی خـۆی لەدەسـتدا، والییەكان هەستیان بەوە كرد كە پێویست ناكات سەر بە خیلافەتێكی بـەو شێوە لاوازە بن، هەر بۆیە بە دوای یەكدا هەرێمەكان جیابوونەوەی خۆیان ڕاگەیاند.

---

(١٦٣) مسكويه: تجارب الامم ٨٤/٧-٨٥.

(١٦٤) ابن الاثير: الكامل ٤٤٨/٨-٤٤٩.

## تەوەری دووەم

## بەڕێوەبردنی هەرێمەکان

مامەڵەکردنی خیلافەتی عەبباسی لەگەڵ ئەو هەرێمانەدا کە سەر بە ئەو دەوڵەتە بوون هەندێ شێوازی بەکار دەهێنا کە جیاواز بوون لەو ڕێوشوێنانەی کە دەوڵەتی ئومەوی بەکاری دەهێنان. بۆ نموونە دەوڵەتی عەبباسی لەسەرەتای دروستبوونیەوە بە تەواوەتی دەستی گرتبوو بە سەر هەرێمەکانیدا و والییەکانی ئەو هەرێمانە بە تەواوەتی سیاسەتی خەلیفەکانیان پێڕەو دەکرد، چونکە لە زەبر و زۆر و دەسەڵاتی خەلیفەکان دەترسان. بەتایبەتی سەردەمی عەبباسی یەکەم، (١٣٢-٢٣٢ك) والیەکان ئەوەندە دەسەڵاتیان نەبووە، و دەسەڵات هەموو کەوتە دەستی خەلیفە، بە تایبەت سەردەمی خیلافەتی (أبو جعفر المنصور و هارون الرشید)، عەبباسی لە دوای دروستبوونی، دەستی بەسەر هەرێمەکاندا لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا گرت، بەڵام ئەمە ماوەیەکی کەمی خایاند و جیابوونەوەی هەرێمە دوورەکان دەستی پێکرد وەك هەرێمەکانی ئەندەلوس ئینجا (المغرب الاقصى) و (تونس) و (دیار مصر) لە نێوچە عەرەبیەکانی دەوروبەری خیلافەت و ئینجا یەمەن و دواتریش وڵاتی خۆراسان.[١٦٥]

لە ڕاستیدا بارودۆخی خیلافەتی عەبباسی کاریگەری زۆری لە سەر دەزگەکانی دەوڵەت هەبوو، چونکە ئەو دەوڵەتە کێشەی جۆری دەسەڵاتی هەبوو لە نێوان دەسەڵاتی ناوەند و لامەرکەزیدا کە جۆرە ئازادییەك بە میرنشینەکان دەبەخشێت لە بەڕێوەبردنی

---

(١٦٥) محمد حلمي احمد: الخلافة و الدولة في العصر العباسي، القاهرة، ١٩٧٥، ص ٢٢٦.

هەرێمەکاندا کە ئەمەش کاریگەری لە سەر دەسەڵاتی والییەکان هەبوو بۆ نموونە (ابوجعفر المنصور) کە بە دامەزرێنەری دەوڵەتی عەبباسی دادەنرێت، دەسەڵاتی ناوەندی پێڕەو دەکرد، بەڵام والی هەرێمەکان دەسەڵاتیان کەمتر بوو وەك ئەوەی کە لە سەردەمی (هارون الرشید)دا و ئەوان دوای ئەو پەیدایان کرد، چونکە لەم سەردەمانەدا هەرێمەکان ئازادی زۆریان بە دەستهێنا و دەسەڵاتیان زۆر زیادی کرد و لە هەندێ شوێن گەیشتە دامەزراندنی میرنشین وەك نێوچە کوردییەکان و نێوچەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.(١٦٦)

(الماوردي) سیستمی میرنشین لە وڵاتدا بە سەر دوو جۆردا دابەش دەکات:-

١. میرنشینی (استکفاء) لەو جۆرە میرنشینەدا خەلیفە خاوەن دەسەڵاتی تەواوە بەسەر هەموو کاروبارێکدا. خەلیفە نێوچەکە دەبەخشێت بەوالییەك یاخود سەرکردەیەکی سوپا، یان سەرکردەیەکی خێڵایەتی.(١٦٧)

٢. میرنشینی (أستیلاء) بەزۆری وەکو داگیرکردن وایە، میرێك یاخود والیەك لەسەر نێوچەیەك خۆی دەچەسپێنێت سەر نێوچەیەکی دیکە، دەسەڵات ڕاگرتن لە میرنشیندا کە وێنەیەکی تەواوی لامەرکەزییە.

لەو دوو جۆرە میرنشینەدا دەسەڵاتی والی زۆر زیاد دەکات و بە هەموو هێزیکەوە هەوڵی پاراستنی دەسەڵاتی خۆی دەدات لە بەرانبەریشدا خەلیفە ناچار دەبێت کە وازی لێ بهێنێت و بەو بارودۆخە ڕازی بێت.(١٦٨)

سیستمی لامەرکەزی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بوو بە نموونەی سەرهەڵدانی دەوڵەتە هەرێمیەکان، هەروەها ئەو سیستمە بووە بنەمای پێوەندی نێوان حکومەتی مەرکەزی و دەوروبەر، چونکە دوای ئەوەی کە عەبباسیەکان هەستیان بەوە کرد کە دەوروبەر لە ژێر رکێف و دەسەڵاتیاندا نەماوە سیستمی لامەرکەزییان بەناچاری قبوڵ کرد و تەنها

---

(١٦٦) حسن احمد محمود: العالم الاسلامي في العصر العباسي، القاهرة، ١٩٦٦، ١/ ١٣٦-١٣٧.

(١٦٧) الاحكام السلطانية و الولايات الدينية، القاهرة، ١٩٦٦، ص ٢٧.

(١٦٨) هـ. س، ل٢٧.

سەرپەرشتی دوور بە دووریان پێ باش بوو، مەبەستیشیان لەم ڕازی بوونە تەنها بەردەوامبوونی دەوڵەتەکەیان بوو، هەر بۆیە کاتێ کە دەوڵەتی عەبباسی زۆر لاواز بوو ئەو دەسەڵاتە لامەرکەزییانە بوون بە بزوتنەوەی سەربەخۆیی خواز و خیلافەتیش هیچ دەسەڵاتێکی لە بەرامبەریاندا نەبوو بۆیە پشتگوێ خرابوو.[١٦٩]

لە لایەکی تریشەوە خەلیفەی عەبباسی دەسەڵاتی ویلایەتەکانی دەدایە دەستی سەرکردە و کەسوکاری خۆی. والیەکانیش کەسانێکیان لە جێی خۆیان دادەنا کە کاروباری ولایەتەکان بەڕێوەبەرن و خۆشیان لە بەغدا یان لە سامەڕا نیشتەجێ دەبوون، کە ئەمە دەرفەتی بۆ جێگری والی دەڕەخسان ڕەچاوی بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆی بکات و باشترین ڕێگەش بۆ بەدەستهێنانی ئەو مەبەستە زۆر کردن بوو لە خەڵکی ڕەش و ڕووت، هەروەها دەبوو جێگر پارە وسامانی باش بۆ والی و ئینجا بۆ خەلیفەش بنێرێ کە لە بەغدا نیشتەجێ بوون، کە ئەمانە هەموویان کاردانەوەی خراپیان لە لایەن خەڵکییەوە لێدەکەوتەوە و خەڵکی تەواو وەڕس و بێزار بوو بوون لەو ڕژێمە و ئەو ڕەفتارانە وای لە خەڵکی دەکرد کە هاوکاری ئەو کەسانە بکەن کە بۆ جیابوونەوە لە خیلافەتی عەبباسی کاریان دەکرد.[١٧٠]

هەروەها خیلافەتی عەبباسی شێوازێکی دیکەی لە بەڕێوەبردنی هەرێمەکان گرتەبەر ئەویش بەخشینی دەسەلاتی ولایەتێك زیاتر بە یەك والی بوو کە ئەمە دەرفەتی باشتری بۆ والییەکان دەڕەخسان کە بازنەی دەوروبەری خۆیان فراوانتر بکەن.[١٧١] هەروەها بەخشینی دەسەڵاتی ولایەتێك زیاتر بە یەك والی، والی ناچار دەکرد کە کەسانێکی دیکە لەجێی خۆیان دابنێن بۆ هەڵسوڕانی کاروباری ولایەتەکان و زۆر جاریش والی هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر جێگرەکانی خۆیدا نەدەبوو. بەم شێوەیە زۆر

---

(١٦٩) حسن احمد محمود: العالم الاسلامي في العصر العباسي، ج ١/ص ١٢١-١٢٢.

(١٧٠) يوسف العش: تاريخ عصر الخلافة العباسية، راجعه ونقحه: ابو فرج العش، دمشق، ص١٢٢.

(١٧١) شاكر مصطفى: دولة بني العباس، وكالة المطبوعات الكويتية، ١٩٧٣، ج١/ص٥٥٩.

جار خیلافەت ناچار دەبوو (تەقلید) بنێرێت بۆ والی بێ دواکەوتن مەگەر هەندێ جار نەبێت کە سوپای دەنارد بۆ بەدەستهێنانەوەی ئەوەی والی لە دەستیدا بوو گەر لە توانایشیدا نەبایە ئەوا (پەیمانی والیەتی) نوێ دەکردەوە بۆ والیەکان بۆ پاراستنی شوێنە ڕەمزییەکەی.[172]

بەم شێوەیە دەبینین هۆکاری بەڕێوەبردنی هەرێمەکان کاریگەری دیاری هەبوو لە پەیدابوون و سەرهەڵدانی بیرۆکەی جیابوونەوەی ولایەت و میرنشینەکان لە دەسەڵاتی مەرکەزی کە لە خراپی بەڕێوەبردن لە خیلافەتی عەبباسیدا و تەنانەت لە لایەن هەندێ والییەکانیشەوە ڕەنگی دەدایەوە.

---

(١٧٢) احمد ابراهيم الشريف: العالم الاسلامي في العصر العباسي، ج ٢/ص٤٥٣.

## ویست و توانایی و شیاویی و لێهاتوویی

له هەموو کیانێکی سیاسی و ئیداریدا کەسایەتیەکی نـاودار و سـەرکردە هـەبوو ڕابەڕایـەتی بزوتنـەوەی جیـاخواز و سـەربەخۆی دەکـرد ، کـە گەیـشتن بـە مەرکـەزی فەرمانڕەوایی و دەسەلات پالنەرێکی سەرەکی بوون. سەرکەوتنی ئەو کەسە بە گەیشتن بەمەبەستەکانی خۆی پالنەرێك و هاندەرێك بـوو بـۆ والییـەکانی دیکـە کـە هـەمان ڕێگەی ئەو بگرنەبەر بە تایبەتیش کە والییەکان هەمان دەسەلات و مـافی خەلیفـەی عەبباسیان پەیدا کرد.[173] ئەو کەسانەی کە مەبەست و خواستی ئاشـکرایان هـەبوو توانیان بەپێی پلانێکی داڕێژراو سەرکەوتنی باش بە دەستبهێنن و سـەرنجی خـەڵکیش بۆ لای خۆیان ڕابکێـشن و وایـان لێبکـەن کـە پـشتگیرییان بکـەن.[174] بـۆ نموونـە ئارەزووەکانی (طاهر بن الحسین) کاریگـەری زۆری هـەبوو لـە دامەزرانـدنی دەولـەتی (طاهرییەکان).* ئەگەر ئارەزووی خۆی نەبایە نەدەگەیشتە ئەو پلەوپایە بەرز و نزیکـە لە خەلیفەی عەبباسی (مأمون).[175] هەروەها (یعقـوب بـن اللیـث الـصفار)** لـە

---

(١٧٣) گوستاف لوبوون: حضارة العرب، ص ٦٠٩.

(١٧٤) یوسف العش:س-پ، ص ١٢٦-١٢٨.

* طاهرییەکان: دەوڵەتی تاهیری لە نێو سالانی (٢٠٥-٢٥٩ك/٨٢٠-٨٧٣ز) بە ویستی خیلافەت و لەسەر دەستی (طاهر بن الحسین) کەوا یەکێك بوو لە فەرماندەکانی خەلیفە (مأمون) کاتێك کردی بـە والی بەسـەر خوراسـان لـە سـالّی (٢٠٥ك/٨٢٠ز)، وسـنوری دەسـەلاتیان نێوچـەکانی ڕۆژهەلات و باکوری خوراسان تا سنوری هند و تورکەکان بوو، لە سالّی (٢٠٧ك/٨٢٢ز) مرد و گومانی ئەوە دەکرێت کەوا خەلیفە دەرمان خواردی کردبێت. (الطبري: تأریخ الرسل والملوك، ٥٧٧/٨؛ الیعقوبي: تاریخه، ٤١٣/٢).

(١٧٥) ابن خلکان: وفیات الاعیان، ٥١٨/٢.

** یعقـوب بـن اللیـث الـصفار: دامەزرێنـەری دەوڵـەتی صـفاری بـوو لـە نێـو سـالانی (٢٥٤-٢٦٥ك/٨٦٨-٨٧٨ز) و توانی هێرش بکاتە سەر دەوڵەتی (طاهری) لە خوراسان، یعقوب لەگەل

سەرەتای پێوەندی کردنیەوە بەتیپی خۆ بەخشان بۆ شەڕی (خەوارج)ەکان لـە هـەرێمی (سجـستان) ئـارەزوو و مەبەسـتی خـودی هـەبوو و هـەروەها ئـازایی و لێهـاتوویی یارمـەتیدەری بوون کە ببێت بە سەرکردەی سوپا و توانی کاروباری وڵات بە باشی ڕێـك بخات.[(١٧٦)] ناکرێ خواسـت و ئـارەزووی سـامانییەکان لـە فراوانکردنـی دەسـەڵاتیاندا پشتگوێ بخرێت، وەك (اسماعیل بن احمد) سامانی کە دەسـت بگرێـت بەسـەر هـەموو ولایەتەکانی براکانیدا بە تایبەتی دوای مردنی (نصر) کە توانی نێوچە (اشروسنە) لە نێو بەرێت و خۆراسان بخاتە سەر نێوچەی دەسەڵاتی خـۆی دوای ئـەوەی کـە دەسـەڵاتی (صفاری)* کۆتایی پێهات، هەروەها لە ساڵی (٢٨٧ك/ ٩٠٠ز) توانی (محمد بن زیـد العلوي) خاوەنی (طبرستان)** لە نێو بەرێت و بیخاتە سەر ئەو نێوچـەیەی دەسـەڵاتی خۆی.[(١٧٧)]هەروەها (محمد بن زید العلوي) خواستی ئەوەی هـەبوو کـە دەسـت بگرێـت بەسەر خۆراساندا، بەڵام هەوڵەکەی سەری نەگرت، چونکە (اسماعیل السامانی) توانی بە سەریدا زاڵ بێت.[(١٧٨)] جگە لەمەش هێرشی دیکەی سەر کۆمـەڵی تـورك کـە لـە ترکمانستانی ئەفغانەوە هاتبوون و سەرکردەکەیان (الب تکین) بوو توانیبوویان دەسـت

---

عومەری برای کاری (صـفار-زەردك)یـان دەکـرد پـێش وەرگرتنـی دەسەڵاتی ئـەم دەوڵەتـە. (ابـن خلكان: وفيات الأعيان،٢/٣١٢؛حسن ابراهيم حسن: تاريخ الأسلام، ٣/٧٢).

(١٧٦) ابن الاثير: الكامل، ٧/٦٤-٦٥.

* صـفاری: ئـەم دەوڵەتـە لـە نێـو سـاڵانی (٢٥٤-٢٩٨ك/٨٦٧-٩١١ز) لـە ڕۆژ هـەڵاتی ئیسلامی دامـەزرا لەبەشـی باشـوری ئێـران و پـاش دەست بەسـەراگرتنی بەسـەر دەوڵـەتی تـاهیری توانیـان سنوری دەسەڵاتیان فراوان بکەن بەرەو خوراسان و سجستان لەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی باشوری ئێران تـا دولـەکانی (كابـل والـسند ومكـران) (اليعقـوبي: تاريخـه، ٢/٤٥٩-٤٦٠؛ ابـن الأثـير: الكامـل، ٥/٢٣٧-٢٣٨).

** طبرسـتان:- وڵاتێکـی فراوانـە و (مازنـدەران)یـشی پـێ دەوترێـت، دەکەوێتـە نێـوان (الـری) و قومس و دەریای قەزوین وڵاتی دەیلەم و چیاوە. (ياقوت الحموي: معجم البلدان،٣/٥٠٢).

(١٧٧) ابن الاثير: الكامل، ٧/٥٠١-٥٠٤.

(١٧٨) الطبري: تاريخ،١٠/٨١-٨٢.

بەسەر نێوچەی (غەزنە)دا بگرن و (دەوڵەتی غەزنەوی)** لە نێوان ساڵانی (٣٥٢-٥٨٢ك/٩٦٣- ١١٨٦ز) دابمەزرێنن.[١٧٩] جگە لەمانەش ئارەزووەکانی (مرداویج بن زیار) کە پلانی داگیرکردنی بەغدا و ڕووخانی خیلافەتی عەبباسی دارشتبوو، بەڵام کوشتنی بووە هۆی لە نێوچوونی هەموو خواست و ئارەزووەکانی، ئینجا (علی بن بویە) ویستی وا بوو کە بنکەی دەسەڵاتی خۆی زۆر فراوان بکات و هەرێمی فارس بکاتە بنکەی دەوڵەتێکی گەورە کە هەموو ویلایەتەکان لەخۆ بگرێت.[١٨٠]

هەروەها ئارەزووی (معز الدولة) لە داگیرکردنی بەغدادا ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز)و وەرگرتنی نازنێوی میری میران و وەرگرتنی دەسەڵاتی تەواو لە (دار الخلافة).[١٨١] سەلجوقییەکانیش لە ڕێی کردەوە سەربازییەکانیانەوە دەردەکەوێت کە چەند خواست و ئارەزووی فراوانکردنی دەسەڵاتیان هەبووە تا توانیان لە ساڵی (٤٤٧ك / ١٠٥٥ز) بگەنە بەغدا و دەستی بەسەرا بگرن.[١٨٢] ئەو ڕاستیەی کە ناتوانرێ نکۆڵی لێ بکرێ خواست و ئارەزووی میری میرنشینە کوردیەکانی ئەو ماوە مێژووییەی خیلافەتی عەبباسییە، بە تایبەتی میر (محمد بن شداد) کە هێز و دەسەڵاتێکی فراوانی لە

---

** غەزنەوی: لە نێو ساڵانی (٣٥٢-٥٨٢ك/٩٦٣-١١٨٦ز) یارمەتیدەر و هۆکاربوون بۆ نەهێشتنی دەسەڵاتی بوەیهییەکان، چ لە ڕێگەی کێبڕکێی سەربازی لە هەندێ نێوچەی دەسەڵاتیان، یالە ڕێگەی چالاکیەکی بەرفراوان بۆ پاڵپشتی مەرکەزیەتی دەسەڵاتی خەلیفەی عەبباسی بەهێزی مەعنەوی و بەرزکردنەوەی ورەیان و وەستان لەپێش هەموو هەوڵێکی بوەیهییەکان بەمەبەستی ڕوخاندنی دەسەڵاتیان. بڕوانە (حسن ابراهیم حسن: تاريخ الأسلام، ٨٥،٩٠؛ نیکیتا ایلیسیف: الشرق الاسلامي في العصر الوسيط، تر-منصور ابو الحسن، دار الكتاب الحديث، بيروت، ١٩٨٦، ٣٠٩).

(١٧٩) ويل ديورانت: قصة الحضارة، تر: محمد بدران، جامعة الدول العربية، القاهرة، ١٩٧٩، ١٠/١٣.

(١٨٠) احمد إبراهيم شريف: العالم الاسلامي في العصر العباسي، ص٥١٤.

(١٨١) ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٢٨٥/٣.

(١٨٢) الثعالبي: يتيمة الدهر في محاسن اهل العصر، تحـ: محمد محي الدين عبدالحميد، دار الفكر، بيروت، ٢١٨/٢.

نێوچەی (أرآن)دا هەبوو و بەهۆی خواستەکانییەوە توانی میرنشینی شەدادی دابمەزرێنێت.[183] جگە لەوەیش میر (حسنویه بن الحسین) توانی میرنشینی حسنویه دابمەزرێنێت.[184] هەروەها میر (باد)ی کوردی کە کەسایەتیەکی نێودار بوو توانی کیانێکی سەربەخۆ لە خیلافەت دابمەزرێنێت.[185] هەمان شتیش دەوترێت سەبارەت بە (ابوالفتح محمد بن عناز) دامەزرێنەری میرنشینی (عەناز)ی یە.[186] هەروەها خواستی میرەکانی نێوچەی (اربل) و دەوروبەری خۆرهەلاتی شاری موسڵ لە خواستی هاوتاکانیان کەمتر نەبوو لە پێناو دامەزراندنی میرنشینێکدا بۆ خۆیان لە (اربل).[187] بەم شێوەیە دەبینین کە هۆکاری خواست و ئارەزووی تاکەکەس ڕۆڵێکی کارای هەبوو لە بزوتنەوە سەربەخۆ خوازەکاندا یان لە دامەزراندنی دەوڵەت و میرنشینی سەربەخۆ یان شێوە سەربەخۆدا. بە تایبەتیش لە کاتێکدا کە دەوڵەتی مەرکەزی بە بارودۆخێکی نالەباردا تێدەپەڕێ، هەروەها دەوڵەتی مەرکەزی بەتین و بە هەموو شێوازێکی شەرعی یان ناشەرعی کاری بۆ ئەوە دەکرد کە خواست و ئارەزووی ئەو سەرکردە و کەسایەتیانە لە نێو بەرێت، بەلاّم هەوڵەکانی زۆرجار بەفیڕۆدەچوو لە کارەکەیدا سەرکەوتوو نەدەبوو.

---

(١٨٣) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (اسماعیل شکر: الامارة الشدادیة الکردیة في بلاد اران، اربیل، ٢٠٠١).

(١٨٤) ابن الاثیر: الکامل، ١٠١/٧، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (حسام الدین علي غالب: الکرد).

(١٨٥) الروذ راوري: ذیل تجارب الامم، مطبعة شرکة التمدن، مصر، ١٩١٦، ٣ /٨٤.

(١٨٦) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (محمد امین زکي: تاریخ الدول و الامارات الکردیة في العهد الاسلامي، عربه محمد علی عوني، ١٩٤٥، ص١٢٧؛ حسام الدین علي غالب: الکرد في الدینور وشهرزور، ٢٠٢.

(١٨٧) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:– احمد عبدالعزیز: الامارة الهذبانیة الکردیة، اربیل، ٢٠٠٦.

## هۆکـــاری دیکە

جگە لەو هۆکارانەی کە پێشتر باسمانکرد و ڕۆڵیان بینی لە سەرهەڵدانی بزوتنـەوە ڕزگاریخوازەکانـدا کـە ئامانجیـان جیابوونـەوە بـوو لـە خیلافـەتی عەبباسـی چـەند هۆکارێکی تریش هـەبوون کـە بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان کاریگـەرییان لـە سـەر والییەکان هەبوو و هاندەریان بـوو بـۆ جیابوونـەوە، لـەو هۆکارانـەش: فراوانـی زۆری ڕووبەری دەوڵەتی عەبباسی، چونکە ئەم دەوڵەتە میراتگری دەوڵەتێکی زۆر فراوان بـوو کە لە (سنووری چین)ەوە تا (المغـرب الأقـصى)ی دەگرتـەوە، لەبـەر ئـەوە خیلافـەتی عەبباسی ناچار دەبوو کە جۆرێك سەربەخۆیی ببەخشێ بە میری نێوچە دوورەکـان کـە ئەمە بوو بەهۆی هەڵوەشانەوە و دابەشکردنی دەوڵەت.[188] هەروەها سـستی گەیانـدن هۆکارێك بوو وڵاتانی دەوڵەتی عەبباسی، کە دابـەش بـوو بـۆ چـەند میرنـشین و دەوڵەتی بچووك (دویلات) بۆ دابەشبوونی هەرێمەکان لە دەوڵەت، بـۆ نموونـە کاتێـك کە خیلافەت کۆمەك و یارمەتی دەنارد بـۆ والی بـۆ زاڵبـوون بـە سـەر دووبـەرەکی و ئاژاوەدا یارمەتییەکان لـە کـاتی پێویـستدا نەدەگەیشتن، بۆیـە سـوپای خیلافـەت نەیدەتوانی بە سەر بارودۆخە شێواوەکەدا زاڵ بێـت و لـە ئەنجامـدا هەرێمەکـە جیـا دەبووەوە. ڕۆژهەڵاتناس (ستانلی لین پول)یش ئەو ڕایەی لاپەسەندە کە فراوانی ڕووبەری دەوڵەتی عەبباسی هۆکارێك بوو بۆ دابەشبوون و هەڵوەشـاندنەوەی، چـونکە دەوڵـەتی عەبباسی زۆر فراوان بوو نەدەتوانرا هەموو لایەکی بخرێتە ژێر دەسەڵاتی مەرکەزییەوە. لەبەرئەوە چەند سنوور و ڕووبەری دەوڵـەت فـراوان بێـت هۆکـاری دابەشـبوونی زیـاد دەبێـت. یەکـەم کەسـیش کـە جیـابووە (عبـدالرحمن الـداخل) بـوو کـە لـە سـاڵی

(١٨٨) فاروق عمر فوزي: الخلافة العباسية في عهد الفوضى العسكرية، ص ٢١٦؛ عبدالحميد العبادي وآخرون: الدولة الاسلامية تاريخها و حضارتها، دار النهضة المصرية، القاهرة، د.ت، ص٧٥.

(١٣٨ك/٧٥٥ز) دەوڵەتێكی سەربەخۆی لە ئەندەلوس ڕاگەیاند و پێی دەوترا (الدولـة الأموية في ألأندلس)، لە خۆرهەڵاتیش (طاهر بـن الحـسين) میرنـشینی تاهیرییـەكانی دامەزراند، دوا بەدوای ئەویش دەوڵەتەكانی تر.[١٨٩] لەوانەش میرنـشینە كوردیـەكان. هۆكارێكی دیكەی گەشەكردنی كێـشەكان لـە پێنـاوی جیابوونـەوەدا ئـەوە بـوو كـە خەلیفەكان دەسەڵاتێكی زۆریان دەدا بەو سەركردە سەربازییانەی كە دەیانناردن بۆ لـە نێوبردنی ئاشوب و ئاژاوە چییان، دەرئەنجام هەندێ لەو سـەركردانە ئـەو دەسـەڵاتەیان وەك هەلێك دەقۆستەوە بۆ جیابوونەوە لەو ویلایەتەی كە بۆیان دانرا بوو، كـە ئەمـەش زۆرجار دەبووە هۆی لاوازی دەسەڵاتی عەبباسی.[١٩٠] دوای ئەوەی كە سوپا هەستی كـرد كە خیلافەت پێویستی پێیەتی زەبر و زەنگی زیادی كرد و بودجەی لـە سـەر دەوڵـەت زۆر زۆر بوو بە-ڕادەیەك كە نیوەی داهاتی دەوڵەت بۆ سوپا تەرخانكرابوو، بـەڵام كـاتێ كە دەوڵەت نەیدەتوانی ئەو داهاتە بۆ سوپا دابین بكات ئـەوجا گـەورە سـەركردەكانی سوپا داوای جیابوونەوەیان لە خیلافەت دەكرد. بەرانبەر بـەوەی كـە خۆیـان بەرپرسـی دارایی سوپا بن لە داهاتی ئەو ویلایەتانەی كە جیایان دەكردەوە.[١٩١]

لە ڕاستیدا بەخـشینی دەسـەڵات لـە هەرێمەكانـدا بـە سـەركردە سـەربازییەكان، هەڵەیەكی زۆر گەورە بوو، چونكە ئەو سـەركردانە بـەڕێوەبردنی كاروبـاری دەوڵـەتیان نەدەزانی و شارەزاییان لێنەبوو لەبەرئەوە زۆرجار پەنایان دەبردە بەر بەكارهێنانی هێـز و زەبروزەنگ كـە ئەمـە زۆرجـار دەبـووە مایـەی نیگـەرانی خـەڵكی لـە دەسـەڵات و كۆبوونەوە لە چـواردەوری هـەر بزوتنەوەیـەكی جیاخوازیـان دژ بەدەسـەڵات، بزوتنـەوە جیاخوازەكانیش پشتیان بە هاوكاری خەڵك دەبەست لەو ویلایەتانە ڕای دەگەیانـد كـە

---

(١٨٩) طبقات سلاطين الاسلام، ص ١٦-١٧.

(١٩٠) ابراهيم احمد العدوي: التاريخ الاسلامي في آفاقه السياسية و ابعاده الحضارية، القاهرة، (د.ت)، ص٣٢٩.

(١٩١) كلودكاهن: تاريخ العرب و الشعوب الاسلامية منذ ظهور الاسلام حتى بداية الامبراطورية العثمانية، تر: بدرالدين قاسم، دار الحقيقة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٢، ص ٢٤٥-٢٤٦.

دامەزراندنی ئەو بزووتنەوانە لە ئەنجامی نـارەزایی و نیگـەرانی خـەڵك بەرانبـەر بـە سیاسەتی دەوڵەتی مەرکەزیە لەبەرئەوەی ماف و پێویستییەکانی ژیانیان بۆ دەسـەبەر نەکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا پێوەندی ئەم دەوڵەت و میرنشینانەی کە جیادەبوونەوە لەگـەڵ خیلافەتدا هەر بەردەوام دەبوو لەبەر چەند هۆکارێك بـە تایبـەتیش هۆکـاری رۆحـی و بیروباوەڕ، هەروەها پـەیڕەوکردنی سیاسـەتی لامەرکـەزی لەلایـەن بوەیهییەکانـەوە، و بەخشینی دەسەڵات بۆ والیەکان و سەرۆك هۆز و سەرکردەی سوپا، کاریگەری گـەورەی بوو بۆ جیابوونەوە.

# تەوەری سێیەم
# سیستمی خێڵایەتی لە کوردەواریدا

خێڵ (هۆز) یەکەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسییە لە پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردەواریدا و سیمایەکی کۆمەڵی شێوە کشتوکاڵی و ئاژەڵداری وەرگرتووە و زۆرجاریش هەرێمێك پەیوەست دەبێت بە نێوچەیەکی جوگرافی دیاریکراوەوە کە ئەمە لە هەمان کاتدا دەیکات بە یەکەیەکی ئابووری.(١٩٢) بەم پێیە (هۆز) لە کەسانێك پێك دێت کە یەك هەستیان هەیە بەرانبەر بە نەژاد و ڕەسەنیان کە کۆیان دەکاتەوە و گیانی هاوکاری و پەیڕەوکردنی ڕێسا و دابوونەریت لە نێوانیاندا دەچەسپێنێ و یەك بوون لە کەسایەتی سەرۆك هۆزەکانیدا بەرجەستە دەبێت، چونکە کورد ناسراون بە ڕێزگرتن و گوێڕایەڵی سەرۆك هۆزەکانیان.(١٩٣) ئەم دیاردەیەش ڕەگ و ڕیشەیەکی خۆی هەیە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردەکاندا.(١٩٤) بۆیە دەبینین مێژوونووسان کە دێنە سەر باسی کورد باسی هۆزەکانیشیان دەکەن.(١٩٥) ئەمەش وادەگەیەنێت کە

---

(١٩٢) مارتن ڤان برون: ئاغا و شێخ و دەوڵەت، و.کوردۆ، ستوکهولم، ١٩٩٦، ١٠٢/١.

(١٩٣) محمود بایەزیدی: عادات و رسوماتنامەی اکرادیە، موسکو، ١٩٦٣،ل ١٦٩.

(١٩٤) م-س لازاریف: چەند کێشەیەکی دیموکرافی و مێژوویی و سیاسی و پێوەندی کۆمەڵایەتی و ئابووری کورد، و.کاوس قەفتان، گۆڤاری کوڕی زانیاری عیراق دەستەی کورد، بەغداد، ١٩٨٧،ب/١٦،١٧،ل ٣٩٢.

(١٩٥) بڕوانە: المسعوي: مروج الذهب،١٣٥/٢؛ التنبيه والأشراف، ٩٤؛ النويري: نهاية الارب في فنون الأدب، مطابع كوستاتسوماس وشركاه، القاهرة، د-ت، ص٢٩٠؛ المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، حققه وضع حواشيه. محمد مصطفى زيادة، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة، ١٩٣٤، ح١ / ق١ /٤.

کوردەکان لە شێوەی کۆمەڵی بچووکدا بوون کە هۆزیان پێك دەهێنا و لێرە و لەوێش میرنشینیان دادەمەزراند.[196] بوونی (هۆز) بەلای کوردەکانەوە زۆر پێویست بوو بۆ ئەوەی هەست بە یەکبوونیان بکەن و بتوانن ماڵ و بەرژەوەندییەکانیان بپارێزن. (المقریزی) لەم بارەیەوە دەڵێت: "دەزانن کەوا خەڵکی دەربارەی کوردەکان ڕای جیاوازیان هەیە"، هەروەها سەبارەت بەڕەسەنیان دەڵێت: "هۆزێکن لە هۆزەکانی عەجەم پێکهاتوون لە چەند هۆزێك"[197] سیستمی بەڕێوەبردن کە بە درێژایی مێژوو ژیانی کوردەواری ڕێك دەخست بریتی بووە لە سیستمی خێڵەکی و یەکبوونی خێڵەکان لەسەر بنەمای ڕۆشنبیری (یەکزمانی) و هەرێمی جوگرافی، بە واتایەکی دیکە خاوەنی یەکەیەکی سیاسییە نەك خزمایەتی وەك یەکێ لە توێژەرەکان وای دەبینێت.[198] کە کەمجار ئەو سیستمە لەسەر بنەمای خزمایەتی یان ڕەسەن دادەمەزرێت وەك زۆر جار لە خێڵە عەرەبییەکاندا دەبینرێت. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین خێڵی کورد خێڵێکی لەسەر بنەمای خزمایەتی دامەزراو نییە، بەڵکو خێڵەکە یەك زەوی و خاکە. ئەمەش زیاتر لە شێوەی گوندێکی کۆچەریدایە کە گەرمیان و کوێستان دەکات.[199] خێڵە کوردەکان لە کۆچەر و نیوە کۆچەر و نیشتەجێیان پێك هاتوون، بەڵام خێڵە کۆچەرەکان بەردەوام لە کەمیدان و زۆریان جێگیربوون و ئەوانی دیکەشیان بەرەو جێگیربوون دەچن. خێڵە کوردە کۆچەرەکان بەشێوەیەکی ڕێك و پێك لە هاوین و زستاندا لە نێوان بەرزایی و نزمایییەکاندا دەگوێزنەوە، لە وەرزی هاویندا بۆ نێوچە بەرزاییەکان لە خۆرهەڵاتی کوردستان یان لە نێوچەی باکووری کوردستان یا بۆ نێوچە دوورەکان لە باکوور کۆچ دەکەن، و لە زستانیشدا دەگەڕێنەوە بۆ دەشتاییە نزمە گەرمە بزوێنەکان، کەواتە

---

(١٩٦) تومابوا: لمحة عن الاكراد، تر: محمد شريف عثمان، النجف الأشرف، ١٩٦٩، ص١١.

(١٩٧) الخطط والآثار، ٨٣/٣.

(١٩٨) شاكر خصباك: العراق الشمالي، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٣، ١٧٥.

(١٩٩) عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، مطبعة المعارف، بغداد، ٢٧، ١٩٤٧.

کۆچکردنی ئەم خێڵانە بریتیە لە کۆچکردنێکی وەرزی کە بەپێی هەلومەرجی ژینگە لە ڕووی لەوەڕ و گەرمیەوە دەیسەلمێنێ.

بینای خێڵی کوردی جیاوازیەکی بنەڕەتی لەگەڵ بینای خێڵی عارەبیدا هەیە. بڕبڕەی پشتی خیڵی عارەبی پێوەندی خزمایەتی و بنەچەیە، بەڵام بڕبڕەی پشتی خێڵی کوردی زەوی یە، لە ڕاستیدا بەشەکانی یەك خێڵی کوردی ڕەنگە بەهیچ جۆرێك پێوەندی خزمایەتی لە نێوانیاندا نەبێ، بەڵام ئەم بەشە جیاوازانە لەیەك نێوچەدا بەیەکەوە دەژین و گوێڕایەڵی فەرمانی تیرەیەکن لە تیرەکان کە ئەویش خێزانی دەسەڵاتدارە لە نێو خێڵەکەدا. ئەم هۆکارەش کاریگەری لەسەر ڕووداوەکان درووست کرد، چونکە کوردستان سروشتێکی شاخاوی سەختی هەبوو و کوردەکان لەو نێوچە شاخاوییە سەختەدا بەوە ناسرابوون کە هیچ پشتێکیان نیە چیاکان نەبێت[200] و نێوچەکانیشیان تاڕادەیەك لە دەسەڵاتی خیلافەتی عەبباسیەوە دووربوو، بیرۆکەی سەرهەڵدان و دامەزراندنی دەسەڵاتی کوردی سەری هەڵداو هەر هۆزە و لەژێر سەرکردایەتی سەرۆك هۆزەکەی و لە نێوچەکانی خۆیاندا بنەمای چەند دەسەڵاتێکی خۆجێیەتیان دامەزراند لە سەرو ئەو هۆکارانەشەوە درووستبوونی پێوەندییەکی دۆستانە بوو کە لە نێوان بوەیهییەکان و میرنشینە کوردیەکان دامەزرا،[201] بەوەش بوەیهییەکان بوونە پشتیوان و یارمەتیدەری ئەوان و کەوتنە دامەزراندنی ئەو دەسەڵاتە نیمچە سەربەخۆیانە. پێوەندی تیرەکان لەگەڵ یەکتردا لە پابەندبوون و گوێڕایەڵی (ولاء)یاندا بۆ یەك دەسەڵاتدارێتی نێوەندی خۆی دەنوێنێ، لە نێوان تیرەکانی یەك خێڵیشدا ئەگەر یەکێکیان بکەوێتە شەڕەوە لەگەڵ خێڵێکی دیکەدا هاریکاری دەکرێ، کەواتە لە نێوان بەشە زۆرەکانی یەك خێڵدا جۆرە هاوپەیمانییەك هەیە.[202]

---

(٢٠٠) ابن حوقل: صورة الأرض، ٣١٥..

(٢٠١) مسكويه: تجارب الأمم، ٢/١٣٩-١٤٠؛ ابن الأثير: الكامل، ٦/٣١٥.

(٢٠٢) شاكر خصباك: س. پ، ل٦٩، ٧١.

ئەم دیاردەیە بە ڕوونی (ابن حوقل) ئامـاژەی بـۆ کـردووە و دەربـارەی بزوتنـەوەی خێڵەکی کوردەواری دەڵێت: "لە زستان و هاوینـدا بـە لەوەرگـە و هاوینەهەوارەکانـدا دەسوڕێنەوە، وە تەنها کەمێکیان نەبێت کە لەسەر سنوورەکان دەمێننەوە"[٢٠٣]، بـەڵام خەڵکی (گەرمیان). تا ئیستەش ماونەتەوە و کۆچ ناکەن مەگەر تەنها بە نێوچـەکانی خۆیاندا.. لـەو سـەردەمەدا کـە لاوازی خەلیفـە و ململانـێ نێوخـۆیی و دەرەکیـەکان دەوڵەتی عەبباسی دەهاڕی، لەناو کوردەکانیشدا ململانێیەکی توند بـۆ سـەرۆکایەتی هۆزەکەیان و دامەزراندنی دەسەڵاتێکی خۆجیەتی سـەری هەڵـدا، دیـارە بـەو پێیـەی کۆمەڵگەی کوردی بەدرێـژایی مێـژوو سـیمایەکی هۆزایـەتی پێـوە دیـاربوو، ڕەگ و ڕیشەی لە نێو ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردا داکوتابوو،[٢٠٤] هەروەها زەمینـەی ئەو واقیعەی ڕەخساند ئەوەش زیاتر یارمـەتیدەر بوو لە دابەشبوونی جیاجیای کوردەکان لە شێوەی کۆمەڵی هۆزایەتی و هەر کۆمەڵـە لـە شـوێنێکی دیـاریکراودا،[٢٠٥] کـە سەرئەنجام هەر کۆمەڵە بەپێی سروشتی نێوچەکەی ئەو بارودۆخە سیاسـیەی دەوڵـەتی عەبباسیان قۆستەوە و کەوتنە دامەزراندنی چەندین دەسەڵاتی خۆجێیەتی.

لە ڕاستیدا ئەم ماوەیە لە مێژووی خیلافەتی عەبباسی گـەلێ ڕووداوی زۆر گرنگـی بەخۆوە بینی، لەوانە: جیابوونەوەی هەندێ لە سـەرکردەکانی دەوروبـەر لـە خیلافـەت لەبەر لاوازی میرنشینی تایبەت بە خۆیان دامەزراند، بەڵام دان بـە بـوونی خیلافەتـدا دەنێت بە شێوەیەکی فەرمی یان، شێوە دانپیانانێك، لـە سـیماکانی ئـەو دانپێدانانـە نێوهێنانی خەلیفە لە خوتبەی جومعەکاندا و هەردوو جەژنەکە و نووسینی نێـوی لـە سەر سکە و پارە، جگە لەمانەش ناردنی هەندێ پارە و سامان بۆ بارەگـای خیلافـەت. لە کاتێکدا هەندێ لە سەرکردەکانی ئەو میرنشینانە دانیان بە خیلافەتدا نەدەنا، نەك هەر ئەمە، بەڵکو هەندێکیان دژی خیلافەت وەستان و هێرشیشیان دەکردە سـەر، وەك

(٢٠٣) صورة الأرض، ص٢٤٠..

(٢٠٤) م. س لازاریف: کێشەی دیموگرافی و مێژوویی، (١٦-١٧)،٣٩٢.

(٢٠٥) تومابوا: لمحة عن الاکراد،١١.

(مرداویج) میری میرنشینی (زیارییەکان)، ئەمەش شتێکی ئاسایی بوو، چونکە ئەوان جگە لەوەی کە لاوازی خیلافەتیان قۆستەوە لە هەمانکاتدا سیستمی خێڵەکی کە بنەمای ژیانی کۆمەڵایەتی بوو لای کوردەکان، بێ گومان یارمەتی پەیدابوونی سیستم و ڕێکخستنی ئیداری بوو، کە ئەمەیان لەسەرووی هەرەمەکەوە دەبێت گەر سیستمی خێڵەکە وەك سیستمێکی خێڵەکی هەرەمی سەیر بکرێت و لە سەر رووی ئەم هەرەمەشەوە سەرکردەی میرنشینەکە دەبێت، کە هەر خۆی گەورەی سەرۆکی خێڵەکەیە. هەروەها هێزی ئەم میرنشینە لە هێزی خێڵەکەدا بەرجەستە دەبوو و لێوەی هەڵدەقولا، لە لایەك و نەبوونی ململانێکە چ لەسەر سەرۆکایەتی میرنشینەکە و چ لە سەر ئەو زەوییەی کە خێڵەکە وەك لەوەڕگە بەکاریدەهێنن. لە لایەکی ترەوە، جگە لەمانەش شارەزایی سیاسی و دنیادیدەیی سەرۆکی خێڵەکە (الشيخ). میرو شارەزایی و بەتوانایی لە نێوبردن و تەفر و تونا کردن هەوڵی نەیارانی، ئەمەش بە ڕوونی لە سیاسەتی میر (حسنوية بن الحسين البرزيكاني)دا دیارە کە دژ بە بوەیهییەکان بەکاریهێنا، بەڵام ئەمە پێچەوانە بووەوە بە مردنی، واتە دوای مردنی (حسنويه)، بوەیهییەکان هەمان سیاسەتیان دژ بە کوڕەکانی بەکارهێنا کە بووە هۆی جیابوونەوە و تەفر و تونابوونیان و یەکنەبوونی قسە و باسیان.[٢٠٦] (عضد الدولة)ی بوەیهی کوڕەکانی (حسنويه)ی کوشت، تەنها (عبد الرزاق وبدر)ی بەجێهێشت، ئەوە بوو، بەدر هاتە سەر دەسەڵات، و بەدر تاکو (بهاء الدولة) مرد ملکەچی بوو، (اطاعة)ی کرد، و بەرەنگاری نەکرد.[٢٠٧] هەر لەو ماوەیەدا دوای ئەوەی کە خێڵەکان هەستیان بە لاوازی خیلافەت کرد هەوڵی ئەوەیان دەدا لەگەڵ میرەکانیاندا کە بیر لە دامەزراندنی میرنشینی تایبەت بە خۆیان بکەنەوە و خۆیان فەرمانڕەوایی بکەن.[٢٠٨] بۆیە دەبینین کوردەکان لە ڕێی خێڵەکانی

---

(٢٠٦) مسكويه: تجارب الامم، ٢ / ٣٦٥-٣٦٦.

(٢٠٧) حسام الدين علي غالب: الكرد، ص١٥٨.

(٢٠٨) محمود ياسين التكريتي: الدور السياسي للقبائل العربية في الشام و الجزيرة الفراتية بحث منشور في مجلة اداب الرافدين، الموصل، ١٩٧٦، عدد ٧، ص١٧٨.

وەك (هەزبانی و بەرزیكانی و شازنجانی و...هتد)ەوە توانیوویانە میرنشینی تایبەت بە خێڵەكانیان دابمەزرێنن، ئەمەش تا ڕادەیەك ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن كە گەر ئەو خێڵ و سەرۆك خێڵ نەبووایە ئەوا دامەزراندنی میرنشین و بەدەستهێنانی دەسەڵات كارێكی زۆر گران و دژوار دەبوو، هەرچەندە بارودۆخی لە باریش لە ئارادا بوو بێت، چونكە سەرۆك خێڵەكان كاری بەڕێوەبردن و سەرۆكیان لەچوارچێوەی خێڵەكیشدا بێت ئەنجام دابوو پێش ئەوەی میرنشینەكانیان دابمەزرێنن. پێویستە ئەو ڕاستیەش بوترێت كە پەیدابوونی میرنشینە كوردییەكان بە پێی ڕەزامەندی و ڕێگەپێدانی میر و والی یەوە نەبوو كە خەلیفە دایان دەنێت بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری هەرێمەكان ئینجا دەسەڵاتی پێش بخات و وردە وردە جیابێتەوە لە بەڕێوەبردنی نێوچەكەدا. واتە پەیدابوونی ئەو میرنشینانە بە شێوەیەكی ئاشكرا و دیار نەبوو وەك (تاهیری و حەمەدانیەكان و...هتد)، بەڵكو لە كیانی خێڵەكان و لەسەر دەستی سەرۆك خێڵەكانەوە سەریهەڵدا و پەیدابوو، دوای ئەوەی كە كاروباری بەڕێوەبردنیان لە چوارچێوەی خێڵەكانیاندا ئەنجامداوە، بۆیە دەبینین میر (محمد بن شداد) خاوەنی هێز و دەسەڵاتێكی زۆر بوو لە نێوچەی تاران، چونكە خاوەنی هۆزێكی گەورە بوو. ئینجا توانی ئەو هێز و دەسەڵاتەی پەرەپێبدات و دواتریش میرنشینی (شەدادییەكان) دابمەزرێنێت.[209] هەروەها میر (حسنویە بن الحسین) بەرزیكانی كە سەرۆكی خێڵی بەرزیكان بوو و سەركردەی سوپاكەیش بوو و خاوەنی دەسەڵاتێكی زۆر بوو لە نێوچەی ڕۆژئاوای هەرێمی (چیا)دا.[210] بەڵام میر (باد) دامەزرێنەری میرنشینی مەروانییەكان لە كوردە

---

(٢٠٩) بروانە منجم باشي: جامع الدول باب في الشدادية، عني بتحقيق ونشره فلاديمير مينورسكي، لندن، ١٩٥٣،ص ٣.

(٢١٠) ابن الاثير: الكامل، ١٠١/٧؛ ابن خلدون: العبر، ٩٥٠/٤/٤؛ ستانلي لينبول: طبقات سلاطين الأسلام، ١٣٣،١٣٣؛ تسترشتين: مادة حسنوية، دائرة المعارف الأسلامية، ٣٧٤/١٤.

(حميدييەكان)* بوو خاوەنی دەسەلاتێکی زۆر بوو لە نێویاندا و دوای ئەوەی کە لە دیاریەکر دەسەلاتی جێگیر بوو،...[٢١١] هەروەها میر (أبوالفتح محمد بن عناز) دامەزرێنەری میرنشینی عەنازییەکان سەرۆك هۆزی (شاژنجان) بوو.[٢١٢] هەروەها سەرۆکەکانی خێڵی (هەزبانییەکان) لە نێوچەی (اربل) و دەوروبەری خۆرهەلاتی شاری موسڵ ڕۆڵێکی دیاریان هەبوو لە کۆتاییەکانی سەدەی (٣ك/٩ز) تا توانیان لە سەرەتاکانی سەدەی (٥ك/١١ز) لە (اربل) میرنشینێکی تایبەت بە خۆیان دابمەزرێنن.[٢١٣] جگە لەمەش دەبینین لەو کاتانەدا هۆزە کوردەکان بەهۆی خزمایەتی و بەرژەوەندی هاوبەشەوە لە شەڕە دەرەکییەکانیاندا یارمەتی و کۆمەکی یەکدیان دەکرد. ئەم هاوکاری یەکترکردنە زۆر جار ڕۆڵێکی دیاری دەبوو لە سەرهەڵدان و دامەزراندنی میرنشینە کوردییەکاندا. بۆ نموونە کوردەکانی (پەشنەوی) خاوەنی قەلای (فنك)* کە هاوکاری هێزی میرنشینی مەروانییەکانیاندا لەکاتی دامەزراندنیدا و لە هەندێ لە شەڕەکانیدا بەشدارییان لە گەڵدا دەکرد.[٢١٤] هۆز و تیرەگەری شێوەیەکی باو بوو لای کورد لە سەرەتای پەیدابوونییەوە تا سەردەمی عەبباسییەکان. لە زۆر نێوچەی کوردستاندا هەتا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە و هەندێك جار میرنشینێکی

---

* لە جەزیرەدا کۆمەڵێك قەلا هەبوون لەوانە قەلاکانی (عەقرەوشۆش)، هۆزی (حمیدی) یاخود حمیدیەکان خاوەن قەلای (عقر)بوون کە بە عەقرەی حمیدییە ناسرا. (یاقوت الحموي: معجم البلدان،١٣٩/٤؛ القلقشندی:صبح الأعشی،٣٧٥/٤).

(٢١١) الروذراوري: ذيل تجارب الامم، ٣ /٨٤؛ ابن الأثير: الكامل١٢١/٧.

(٢١٢) حسام الدين علي غالب: الكرد، ص٢٠٢؛ محمد امين زكي: تاريخ الدول والأمارات، ص١٢٦.

(٢١٣) بڕوانە احمد عبدالعزيز: الهذبانيون، ٥٢-٥٣.

* قەلای فنك: قەلایەکی سەختە دوری (٢) فەرسەخ واتا (١٢کم) دورە لە جەزیرەی (ابن عمر) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:( القزويني:آثار البلاد،٤٣١؛ ابن عبد الحق: مراصد الأطلاع على الامكنة والبقاع، القاهرة، ١٩٥٤، ١٠٤٥).

(٢١٤) ابن الأثير:الكامل،١٤٢/٧-١٤٣؛ عبد الرقيب يوسف: الدولة الدوستكية، ٣٦٥/٢-٣٦٧.

کوردی لەناو دەچوو بۆ نموونــە وەك (حەســـنەوی و شـــاژنجانی) بــەهۆی نـــاکۆکی هــۆزە کوردیەکانەوە و تەنانەت ناکۆکی نێو بنەمـالّەی دەسەلاّتداریشدا.

# باوبوونی جیابوونەوە

لە نێوەی سەدەی سێیەمی کۆچی و نۆیەمی زایینیدا دەوڵەتی عەبباسی پێی نایە قۆناغێکی نوێی لاوازبوون و بەرەو ڕووخان ڕۆیشت و ئەمەش بووە هۆی تێکچوونی بنەماکانی و لە دەستدانی شکۆمەندی. ئەم دیاردەیە بە هەر شێوەیەك بێت لە شێوەکان کاریگەری لەسەر هەرێم و گەلانی موسڵمان هەبوو و پاڵی پێوەنان بۆ کۆبوونەوە لە چواردەوری خیلافەت، چونکە خیلافەت بەلای موسڵمانانەوە هێماو ڕەمزێکە کە یەکێتی سیاسی جیهانی ئیسلامی تێدا بەرجەستە دەبێت و بە هێزی خیلافەت مانای تۆکمەیی یەکبوون و لاوازیش واتای لەتبوون و جیابوونەوە دەگەیەنێت. لەم قۆناغەشدا هەرێمەکانی دەوروبەر لە مەرکەزی خیلافەت جیابوونەوە تەنها بەغدا و دەوروبەری لە ژێر دەسەڵاتیدا مابوونەوە.[٢١٥] هەر لەم قۆناغەدا دەسەڵاتی خەلیفە بە تەواوی لاواز و پەشێو بوو بوو، لاوازی گەیشتبووە ڕادەیەك کە ژنان و خزمەتکارانی نێو کۆشکی خیلافەت دەستیان وەردەدایە کاروباری خیلافەتەوە[٢١٦] و خەلیفەش بوو بوو بە گاڵتەجاڕی دەستی پیاوانی کۆشك و تورك و دەیلەمیەکان. ئەم بارودۆخەی خیلافەت لە هەرێمەکانی دەوروبەریشیدا بە خۆرهەڵات و ڕۆژئاواوە ڕەنگی دایەوە، و لە هەندێ لەو هەرێمانەدا ئارەزووی جیابوونەوە سەریهەڵدا. بەڵکو هەندێ لە سەرکردە سیاسی و سەربازییەکان هەوڵی ئەوەیان دەدا کە دەسەڵاتێکی سیاسی سەربەخۆ و تایبەت بە خۆیان دابمەزرێنن و بە تەواوی لە خیلافەت جیاببنەوە، تەنها بە شێوەیەکی ڕەمزی یان بەناو، دان بە خەلیفەدا بنێن وەك هێمایەکی ئایینی. هۆکاری لاوازی دەسەڵاتی مەرکەزی لە خیلافەتدا دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی هەڵەی هەندێ لە خەلیفەکان لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا، وەك وازهێنانیان لە

---

(٢١٥) ابن الاثير: الكامل، ٦ / ٢٥٥؛ الحنبلي: شذرات الذهب في اخبار من ذهب، ٢/ ٣٠٦.

(٢١٦) المسعودي: التنبيه و الاشراف، ٣٣١؛ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٣ / ٢٣٤.

ڕزگارکردن و (فتوحات)، جگە لەمە پشتبەستنی تەواویان بە دەزگە سەربازییەکان و بەکارهێنانیان لە نێوخۆدا کە ئەمە بووە هۆی زۆربوونی دەس و دایرەی سەرکردە سەربازییەکان و دەست وەردانە کاروباری دەسەڵاتەوە، و لەگەڵ ئەمەشدا بە بەردەوامی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی هەبوو دژی دەوڵەت. وەك (خەوارج و عەلەوییەکان) جگە لە هەندێ بزوتنەوە و شۆڕشی تردا. کە ئەمانە بێگومان ڕۆڵیان هەبوو لە لاوازبوونی دەوڵەتدا. ئەوەی ئەو لاوازییەی زیاتر دەکرد وەرگرتنی پۆستی خیلافەت بوو لە لایەن کەسانی لاوازەوە. لە سەردەمی خەلیفە (المتوکل علی الله) (٢٣٢-٢٤٧ك/٨٤٧-٨٦١ز) کە بە سەردەمی دابڕانی خیلافەت لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا دادەنرێت بۆ تورکەکان.[٢١٧] هەر لە سەردەمی ئەو خەلیفەیەدا تورکەکان دەستیانکرد بە دەستیوەردانە کاروباری خیلافەتەوە کە ئەمە هۆکارێك بوو بۆ دابڕانی خەلیفە لە دەسەڵات.[٢١٨] هەر لەو ماوەیەدا زنجیرەیەك گیروگرفت لە نێوان خەلیفەکان و تورکەکاندا پەیدابوو. لە ئەنجامدا کەمبوونەوەی دەسەڵاتی خەلیفە و فراوانبوونی دەس و دایرەی تورکەکانی لێکەوتەوە.[٢١٩] کە ئەمەش ڕەنگدانەوەی لە سەر شان و شکۆی خەلیفە هەبوو لە نێو خەڵکدا. هەروەها سەردەمی خەلیفە (المقتدر بالله) (٢٩٥-٣٢٠ك/٩٠٧-٩٣٢ز) کە سەردەمەکەی بە شێواو دادەنرا،[٢٢٠] دەوڵەت تووشی شکست بوو. لە هۆکارەکانی شکستهێنانی دەوڵەت لەو سەردەمەدا هەرزەکاری خەلیفە بوو، چونکە تەمەنی منداڵ بوو، توانای بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتی نەبوو، چاوچنۆکی سوپا و سەربازانی سوپاش لەلایەکی دیکە، ئەمانە هەموو بوونە هۆی

---

(٢١٧) القيرواني: زهر الاداب و ثمر الالباب، تحـ: محمد محي الدين عبدالمجيد، دار الجيل، بيروت، ١٩٧٢، ١ج/ص٣٢٣.

(٢١٨) نادية حسني صقر: مطلع العصر العباسي الثاني، جدة، ١٩٨٣،ص ٥٩.

(٢١٩) حافظ احمد حمدي: الشرق الاسلامي قبيل الغزو المغولي، مصر، ١٩٥٠،ص ٢٤.

(٢٢٠) فاروق عمر فوزي: تاريخ العراق في عصور الخلافة العربية الاسلامية، بغداد، ١٩٨٨، ص٢٣٤.

لاوازی خیلافەت بە ڕادەیەك کە هیچ دەسەلات و ڕێزێکی لە نێو خەڵکیدا نەما.[٢٢١] دەرەنجام خەلیفە لەلایەن هێزی سەربازییەوە لە ساڵی (٣١٠ك/٩٢٢ز)دا لابرا و دواتر هێنرایەوە.[٢٢٢] بەڵام دووبەرەکیی و گرانی زۆر زیادی کرد تا لە کۆتاییدا خەلیفە لە ساڵی (٣٢٠ك/٩٣٢ز) کوژرا.[٢٢٣] هەروەها لە سەردەمی خەلیفە (القاهر بالله)*دا لە ساڵانی (٣٢٠-٣٢٢ك/٩٣٢-٩٣٤ز) دەسەڵاتی سوپا و هێزی سەربازی زیادیکرد و زیاتر دەستیان لە کاروباری خیلافەت وەردەدا.[٢٢٤] تا گەیشتە ڕادەیەك کە خەلیفە (القاهر بالله) لە دوای کەمتر لە دوو ساڵ بە سەر خیلافەتیدا لابرا. ئینجا بەیعەت درا بە (الراضي بالله) لە (٣٢٢-٣٢٩ك/٩٣٤-٩٤٠ز).[٢٢٥] بەڵام دووبەرەکی و پەشێوی و شکستی سیاسی هەر لە زیادبووندا بوو.[٢٢٦]تا پاشماوەی دەسەڵات و شوێنی خیلافەت تەفرو تونابوو.[٢٢٧]

---

(٢٢١) محمد الخضري بك: محاضرات في تاريخ العباسي، ص٣٢٧.

(٢٢٢) ابوالفدا: المختصر، ج٢/ص٧٤.

(٢٢٣) التنوخي: نشوار المحاضرة واخبار المذاكرة، تحـ: عبود الشالجي، بيروت، ١٩٧١،ج ١/ص٣٢٤.

* القاهر بالله:- ناوی (ابو منصور محمد بن المعتضد بن طلحة بن المتوكل)ە لە نێو ساڵانی (٣٢٠-٣٢٣ك/٩٣٢-٩٣٤ز) خیلافەتی عەبباسی گرتە دەست، یەکەم خەلیفە بوو کە چاویان دەرهێنا تا ساڵی (٣٣٣ك/٩٤٤ز) زیندان بوو، پاشان ئازادیان کرد، ڕۆژێکیان لە مزگەوتی منصور سواڵی دەکرد زانییان پێی و نەیانهێشت دەرچێت تا لە ساڵی (٣٣٩ك/٩٥٠ز) کۆچی دوای کرد. (الطبري: تاريخه، ج١١/ص٢٧٣؛ الذهبي: العبر، ١٣/٢؛ السيوطي: تاريخ الخلفاء، ٦٢١-٦٢٢).

(٢٢٤) ابو الفدا: المختصر، ج٢/ص٧٧.

(٢٢٥) ابن عبدربه: العقد الفريد، تح:محمد سعيد العريان، بيروت، د-ت، ج٥/٣٥٠-٣٥١.

(٢٢٦) محمد الخضري بك: محاضرات – الدولة العباسية، ٣٦١.

(٢٢٧) سيد امير علي: مختصر تاريخ العرب تر: عفيف البعلبكي، دارالعلم للملايين، بيروت، ١٩٦١، ص ٢٦٤.

له بەرانبەر ئەمانەدا (الراضي بالله) هەوڵیدا هەندێك ڕێ و شوێن بگرێتە بەر تا بتوانێ ڕێ لە ڕوودانی شکستی زیاتر بگرێت، وەك نوێکردنەوەی پایەی میری میران لە ساڵی (٣٢٤ك/٩٣٦ز).[٢٢٨] بەڵام وەك دەرەنجامێك بۆ ئەو کارەی ڕابەرایەتی ئایینی لە دەستدا.[٢٢٩] لەبەرئەوە دەبینین لاوازی خیلافەت لە دوو لایەنەوە کاریگەری لە سەر دەوڵەت و هەرێمە ئیسلامیەکان هەبوو:-

١- لایەنی یەکەم: ئەم لاوازییە بووە هۆی ئەوەی کە دەوڵەت نەتوانێ هیچ چالاکییەکی سەربازی ئەنجام بدات. ئەمەش ڕێی لە دەوڵەت دەگرت کە هێزی خۆی پیشان بدات. لەبەرئەوە والییەکان بۆ خۆیان بەپێی ڕاوێژی خەلیفە کاروباری ولایەتەکانیان بەڕێوەدەبرد،[٢٣٠] و ئەمەش هانی هەندێکی دا کە لە ڕووی سیاسی و ئیدارییەوە لە خیلافەت جیاببنەوە.[٢٣١]

٢- لایەنی دووەم: زاڵبوونی تورکەکان بە شێوەیەکی فەرمی بوو بەهۆی شێوانی باری سیاسی و ئیداری لە دەوڵەتی عەبباسییدا، جگە لەوە لە دەستدانی شکۆمەندی لە نێو گەلە موسڵمانەکاندا و پیرۆزی دەوڵەتی مەرکەز بووە جێی گومان، لەبەرئەوەی ڕەمز و هێمای دەوڵەت ڕوو شکستخواز بوو، ئەو بارودۆخە شێواوە بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی بنەماکانی پێکەوە بەستراوی دەوڵەت، ئینجا ئەو دەوڵەتە لە چەند ویلایەتێك پێك دەهات کە یەکەیەکی ئیداریی بنکەیی نەبوو هەموویان بە مەرکەزەوە ببەستێتەوە، بۆیە پێوەندی هەریەکێ لەو ولایەتانە بە پێتەختەوە دەرکەوت.[٢٣٢]

---

(٢٢٨) ابن العمراني: الأنباء في تاريخ الخلفاء، تحـ: قاسم السامرائي، الأيدن، ١٩٧٣،١٦٣؛ ابو الفدا: المختصر، ٨٤/٢؛ تقي الدين عارف الدوري:عصر امرة الأمراء في العراق، بغداد، ١٩٧٥، ص٣٥.

(٢٢٩) كارل بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلامية،٢٤٠.

(٢٣٠) ويل ديورانت: قصة الحضارة (عصر الأيمان)، ج٢/ مج٤/ ص٩٩.

(٢٣١) جرجي زيدان: تاريخ التمدن الاسلامي، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، د. ت، ٤٦٧/٣.

(٢٣٢) حسام قوام السامرائي: المؤسسات الادارية في الدولة العباسية، ١٦٤ –١٦٥.

دەوڵەتی ئیسلام گەلانی جۆراوجۆری لەخۆ گرتبوو لەبەرئەوە کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەیەکی هەمەجۆر بوو، خیلافەت نەیدەتوانی لەگەڵ ئەم کۆمەڵگە جۆراوجۆرەدا لە ڕووی جوگرافی و کۆمەڵایەتی و ئابووری ڕۆشنبیرییەوە ڕێک بکەوێت.[233] ئەمە جیابوونەوەی ئاسانتر دەکرد و پەیدابوونی دەوڵەت و میرنشینی زیاد دەکرد، هەروەك چۆن دەوڵەتی عەبباسی لە سەر ئەو بنەمایە دامەزرابوو. ئەم دیاردەیە بێگومان کاریگەری لە سەر کوردیش هەبوو، گەر بێت و سنووری جوگرافی و کاریگەری سیاسی لە لایەك و لێك نزیکی مێژوویی لە ڕووی لێکچوونی پێکهاتەی شارستانی دانیشتوانی ئەو نێوچەیە بە کوردیشەوە لەلایەکی ترەوە بە هەند وەربگیرێت.

جیابوونەوەی هەندێ لایەن لە دەوڵەتی عەبباسی لە زۆر زووەوە دەستی پێکرد، لە ئەندەلوسەوە لە خۆرئاوای دەوڵەتی ئیسلامییەوە.[234] بەڵام لە سەرەتای سەدەی (٣ك/٩ز)ەوە جیابوونەوە و شێوەیەکی فراوانتری وەرگرت، تا نیوەی سەدەی ٣ك دەوڵەتی عەبباسی بە شێوەیەك بوو کە لە هەموو لایەکەوە ویلایەت و میرنشینی جیابووەوە لە ڕووی ئیدارییەوە دەورە درابوو.[235] بۆ نموونە لە خۆرهەڵاتی ئیسلامییەوە کۆمەڵێك دەوڵەت و میرنشین پەیدابوون وەك (الطاهرية، الصفارية، السامانية والغزنوية..هتد).[236] کە لە سەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچیدا درووست بوون. (٤ك/١٠ز)، دەوڵەتی عەبباسی لە نێوەوە لە زیادبووندا بوو بە تایبەتی لە سەردەمی خەلیفە (المقتدر بالله)دا. ماوەی زۆر و درێژی فەرمانڕەوایی ئەم خەلیفەیە هۆکارێك

---

(٢٣٣) محمد عابد الجابري: العصبية والدولة في فكر ابن خلدون، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٢، ٤٢٣.

(٢٣٤) فليب حتي: موجز تاريخ الشرق الادنى، تر انيس فريحه، مطبعة الغريب، بيروت، د.ت،،٢٠٩-٢١٠؛ روم لاندو: الأسلام والعرب، نقله الى العربية، منير البعلبكي، بيروت، ١٩٧٧، ص٨٣-٨٤.

(٢٣٥) حسين مجيب المصري: صلات بين العرب و الفرس والترك، ٩٤.

(٢٣٦) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: الاصفهاني: تاريخ سني ملوك الارض و الانبياء، ١٦٧- ١٧٢؛ قادر محمد حسن: الأمارات الكوردية: ص٤٧.

بوو بۆ زیادبوونی شکست و نسکۆکاری دەوڵەت و جیابوونەوەی ویلایەتەکانی، ئەمەش بەردەوام بوو تا سەردەمی (الراضي) کە فەرمانڕەواییەکەی تەنها بەسەر بەغدا و دەوروبەریدا بوو، هەموو دەوروبەری دەوڵەت لێی جیابووبوونەوە.[237] پێش سییەکانی سەدەی (٤ك/١٠ز) جیابوونەوە لە دەوڵەتی عەبباسی گەیشتە ڕادەیەك کە پێشتر ئەو شێوەی بە خۆوە نەدیبوو. مێژوونووسان باسی دەوروبەریان کردووە و نێوی هەریەکێ لە بەریدیەکان لە ئەهواز و لە بصرە و (عماد الدولة بن بویە) لە فارس و حەمدانییەکان لە موسڵ و جەزیرە.[238] وڵاتی کوردیش لەو ڕووداو و گۆڕانکارییانە بەدەر نەبوو بە تایبەتی دوای هاتنی بوەیهییەکان و دەستگرتنیان بەسەر بەغدادا. دەستیان خستە کاروباری خیلافەتەوە و نووسەرێك (کاتب)ێکیان بۆ خەلیفە دانا لە جێی وەزیر.[239] بەم شێوەیە بارودۆخی دەوڵەت لەخراپەوە بەرەو خراپتر دەڕۆیشت.[240] چونکە بوەیهییەکان دەوڵەتەکەیان لەسەر حسابی دەوڵەتی عەبباسی دامەزراند و پاراستنی یەکێتیەکەی زۆر گرنگ نەبوو بە لایانەوە بە گوێرەی گرنگی بەرژەوەندی و دەسەڵاتەکەی خۆیان. کوردەکان خۆیان ڕووبەڕووی ئەم بارودۆخە نوێیە و لە نێو جەرگەی ململانێدا دۆزییەوە کە لە سەر خاك و لە وڵاتەکەیاندا ڕووی دەدا. لەبەرئەوە هەندێکیان چوونە نێو سوپاکانی دەوروبەرەوە و هەندێکیان چوونە پاڵ میرە دەسەڵاتدارەکانی بەغدا، ئەوەش بەو مەبەستە بوو کە لە وڵاتی خۆیاندا پلەوپایەیەك بەدەست بهێنن بێ بەریەرەکانی کردنی خیلافەت. تاڕادەیەکیش ئەو مەبەستەیان

---

(٢٣٧) الدميري: حياة الحيوان الكبرى، دار الفكر، بيروت، د-ت،٩١/١؛ سيد امير علي: مختصر تاريخ العرب، ٢٦٤.

(٢٣٨) الصولي: اخبار الراضي والمتقي بالله، ٢٨٤-٢٨٥؛ مؤلف مجهول: العيون والحدائق، ج٤/ق٢/٤٨؛ ابن الأثير: الكامل، ٢٥٥/٦؛ ابن الطقطقي: الفخري في الأدب السلطانية، ٢٢٦؛ الدميري: س. پ،ج ١/ص٩١.

(٢٣٩) ابن الكازروني: مختصر التاريخ، ص ١٨٧.

(٢٤٠) عبدالعزيز الدوري: دراسات في العصور العباسية المتأخرة، ص ٢٤٧.

بەدیهات و چەند میرنشینێك لەسەر ئەو بنەمایە بۆ ماوەیەك دامەزرا، بەمەش چاخی سەرکردایەتیکردنی سەرۆك هۆزی کە دەسەڵاتێکی کەم و دیاریکراوی هەبوو کۆتایی پێهات بە تایبەتیش لە نێوچەی شارەزووردا. بە ڕادەیەك کەمتریش لە نێوچە شاخاوییە دوورەکانی وڵاتی کورد وەك نێوچەکانی هەکاری و خەفتیان و دەوروبەری، هەروەها باکووری خۆرهەڵاتی موسڵ و نێوچە شاخاوییەکانی هەرێمەکانی (جزیرەو ئەرمینیا) و نێوچەکانی قرمسین** و حولوان*** و لوڕستان لە دیارترین سیماکانی ئەو میرنشینانەی قەڵابوو کە وەك مەرکەزی دەسەڵاتەکان بەکاریان دەهێنا.[241] پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەو هەرێمانەی هەندێ نێوچەی وڵاتی کوردیان لەخۆ گرتبوو لەو بارودۆخە نالەبار و پەشێواوە دانەبڕابوون، بۆ نموونە حەمدانییەکان موسڵ و جەزیرە و هەندێ نێوچەی ئەرمینیایان خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە[242] بەمەش هەندێ هێمنی و ئارامی بۆ خۆی بینی. هەروەها خۆزستان بەدەستی بەریدییەکانەوە بوو،[243] شارەزووریش میرە کوردەکان فەرمانڕەواییان دەکرد[244] لە ئازەربایجانیش (دیسم بن أبراهیم) خەباتی لە پێناو مانەوەی فەرمانڕەواییەکەیدا دەکرد و هەروەها بە مەبەستی

---

** قرماسین: دەکەوێتە هەرێمی چیا لە نزیك دینەوەر، لە هەموو شارەکانی دیکەی ئەم هەرێمە جوانتر و مەدەنی ترە، شارێکی ئاوەدانە و ڕێژەی دانیشتوانی بەرزە، زۆربەیان کورد و فارسن. بڕوانە: (الیعقوبي: کتاب البلدان، ص٣٧؛ حسام الدین علي غالب: الکرد، ص٢٢-٢٣).

*** حولوان: ماوەیەك سەر بە هەرێمی عێراق بوو، دواتر خرایەوە سەر هەرێمی چیا، دەتوانین بڵێین حولوان شاری شەنیای نێوان عێراق و هەرێمی چیاکانە، دەکەوێتە بناری چیا. (الأصطخري: المسالك والممالك، ١١٨ ابن عبد الحق: مراصد الأطلاع، ١٢/٣٠٦؛ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: شوان عوسمان مستەفا: کوردستان، ٦٣-٦٤).

(٢٤١) الطبري: تاریخ، ١٠ / ٣٨-٤٠؛ ابن الاثیر: الکامل، ٦ / ٧٧-٧٨؛ شرفخان البدلیسي: الشرفنامە في تاریخ الدول والامارات الکردیة، تر: جمیل بندي رۆژبیانی، مطبعة النجاح، بغداد، ١٩٥٣، ٣٩١.

(٢٤٢) ابن الاثیر: الکامل، ٦/ ٢٠٧.

(٢٤٣) مسکویە: تجارب الامم، ١/ ٣٦٧.

(٢٤٤) الاصطخري: المسالك و الممالك، ٢٠٠.

دوورخستنەوەی دەیلەم لەو شوێنە.[٢٤٥] ئینجا هەرێمی (چیا) کێشەو ململانێیەکی زۆری بەخۆوە بینی لە نێوان (مەرداویج) و دوای ئەویش براکەی (وشمکیر بن زیار الدیلمی) لە لایەك و بوەیهییەکان لە لایەکی ترەوە، لە پێناو دەستبەسەراگرتنی ئەو هەرێمە و خۆتێدا قایمکردن بە مەبەستی خۆئامادەکردن بۆ چوونە نێو بەغداوە، دواتریش هێزی سێیەمیان بەرانبەر پەیدابوو ئەویش میرنشینی سامانییەکان بوو کە سوپاکەی گەیشتبووە شارە کوردەکانی ئەو هەرێمە.

(٢٤٥) ابن حوقل: صورة الارض، ٣١٤.

# بەڵگە و نموونە لە سەر کاریگەری بارودۆخی سیاسی

کە لە ساڵی (١٣٢ك/٧٤٩ز)دا دەوڵـەتی عەبباسـی دامـەزرا، خەلیفـە شـوێن و ڕێزێکی دیاری هەبوو و هەردوو دەسەڵاتی ئایینی و فەرمانڕەوایی بە دەستەوە بوو، لەم بارەیەوە وتەیەکی بەنێوبانگی خەلیفە (أبو جعفر المنصور) هەیـە کـە دەڵـێ: "مـن سوڵتان و دەسـەڵاتداری خـوای پـەروەردگارم لەسـەر زەوی، بـە ئـەمر و بەیارمـەتی و پشتگیری و ڕێنمایی و ڕێپیشاندەری ئەو کارە دەکەم".[٢٤٦] ئەم حاڵەتەش بـەم شـێوەیە مـایەوە تا کۆتایی چاخی عـەبباسی یەکەم، بەڵام وەك (ابـن خلـدون).[٢٤٧] دەگێڕێتـەوە سەرەتای پشێوی کە تووشی خیلافەتی عەبباسی بوو بـە کوشـتنی خەلیفـە (المتوکـل علـی الله) سـاڵی (٢٤٧ك/٨٦١ز) بەدەسـتی تورکـەکان دەسـتی پێکـرد.[٢٤٨] بـە واتایەکی دیکە هـەر سـەرۆکێ دەسـتی گرتبـوو بەسـەر خـوارووی خۆیـدا و بەتـەنها فەرمانڕەوایی دەکرد، وەك پەیدابوونی دەوڵەتی (بنو الصفار) ساڵی (٢٥٤ك/٨٦٧ز)، دوای ئەوەی دەستیان گرت بەسەر هەرێمی سجستان و چـەند نێوچـەیەك لـە هـەرێمی خۆراسان. ئینجا لەگەڵ سەرەتای ساڵی (٢٥٤ك/٨٧٧ز)دا (أبن طولون) فەرمانڕەوایی شـام و میـسری گرتەدەسـت.[٢٤٩] دواتـر(بنـو سـامان)یـش لـە کۆتاییـەکانی ساڵی٢٦٠ك/٨٧٣ ز دا فەرمانڕەوایی (وڵاتی ئەودیوی ڕووبار -بلاد ماوراء النهر)*یان گرتە دەستەوە، لەوەش خـراپتر و سـەیرتر پەیـدابوونی چـەند بزووتنەوەیـەك بـوو کـە

---

(٢٤٦) الطبري: التأريخ، ٨ /٨٩.

(٢٤٧) التأريخ: ٣/ ٢٨٠.

(٢٤٨) المسعودي: التنبيه والاشراف، ٣٢٩.

(٢٤٩) اليعقوبي، ٢ / ٦٢٤؛ ابن العبري: تاريخ مختصر الدول، ١٤٨.

* بـلاد مـاوراء النهـر: واتـە ئـەو دیـوی ڕووبـاری جیحـۆن، کـە ئێـستا پێـی دەوترێـت ڕووبـاری ئامۆداریـا، واتـە بـاکوری ڕۆژهـەڵاتی ئـەم ڕووبـارە دەگرێتـەوە. کـە لـە تورکمانـستانەوە تـاکو ناوەراستی ئاسیا درێژدەبێتەوە. (یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٤/٤٠٠).

بانگهێشتی ڕووخانی خیلافەتیان دەکرد بەهەر شێوەیەك بێت و کاریان بۆ دەستبەسەر خیلافەتدا گرتن دەکرد، وەك بزووتنەوەی (زنج)** کە سالّی (٢٥٥ك/٨٦٨ز) پەیدا بوو، ئینجا بزوتنەوەی (القرامطة)* لە سالّی (٢٧٦ك/٨٩٩ز)دا و دواتر بانگەوازی (أبو عبدالله) تا پەیمان بدات بە (عبیدالله) کە بە (المهدي) ناوی نرابوو لە ئەفەریقیا لە سالّی (٢٨٦ك/٨٩٩ز).[٢٥٠] لە لایەکی تریشەوە لابردن و کوشتنی خەلیفەکان لەو سەردەمەدا بوو بوو بە کردەوەیەکی زۆر باو و بلاّو لەو چاخە نالەبارەی خیلافەتی عەبباسیدا. بۆ نموونە خەلیفە (المنتصر بالله) دەرمان خوارد کرا پێش ئەوەی شەش مانگ بەسەر خیلافەتەکەیدا تێپەڕێت.[٢٥١] هەروەها خەلیفە (المستعین بالله)**

---

** زنج:- ئەم بزوتنەوەیە لەلایەن کەسێك بەناوی (علی بن محمد)ی خەڵکی (الطالقان)ە ڕابەرایەتی دەکرا، خۆیان کۆمەڵێك بوون لە کۆیلەکانی ئەفریقیا، مەترسی و دڵەڕاوکێیان خستە نێو خیلافەتی عەبباسی، توانیان لە سالّی (٢٥٧ك/٨٧٠ز) شاری بصرە داگیر بکەن و ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی سەربڕن، و مزگەوتە گەورەکەیان تێکدا و ئاگریان لە شارەکە بەردا. (ابن الأثیر: الکامل،٧/٨٦-٨٧؛عبدالعزیز الدوري: دراسات في العصور العباسیة المتأخرة، ٦٧-٧٧)

* القرامطة: ڕەچەڵەکیان دەڕواتەوە سەر (حمدان بن الأشعث) ناسراو بە (القرمطي) توانیان دەوڵەتێك لە(بحرین) دروست بکەن بەسەرۆکایەتی (ابو سعید الجنابی) و سنوری دەسەڵاتیان فراوان بوو تاوەکو (الأحساء والشام) و بوونە مایەی مەترسی لەسەر خیلافەتی عەبباسی (الطبري: تأریخ الرسل والملوك، ٨/١٥٩-١٦١؛ البغدادي: الفرق بین الفرق، تح.محمد محی الدین عبدالحمید، المکتبة العصریة، صیدا، لبنان،١٩٩٠، ص ص٢٨٢،٢٨٣).

(٢٥٠) ابن کثیر: البدایة والنهایة، ١١ / ٨١.

(٢٥١) السیوطي: تاریخ الخلفاء، ٣٠٣.

** المستعین بالله: ناوی (ابو العباس احمد بن الامیر محمد المعتصم بن هارون الرشید)، لە سالّی (٢٢١ك/٨٣٥ز) لەدایك بووە، لە نێو سالانی (٢٤٨-٢٥٢ك/٨٦٢-٨٦٦ز) دەسەڵاتی خیلافەتی عەبباسی وەرگرتبوو، و لەبەر تێکچوونی دۆخی دوورخرایەوە بۆ (واسط)، لە سالّی (٢٥٢ك/٨٦٦ز) لە (سامراء) کوژرا. (الدینوری: المعارف، ٣٩٣؛ الطبري: تاریخە،٩/٣٠٥؛ السیوطي: تأریخ الخلفاء، ٥٧١).

(٢٤٨ك/٨٦٢ز) دوای لابردنــی ســـەر بــڕا، بــەڵام خەلیفــە (المعتــز بــالله)*** (٢٥٢ك/٨٦٩ز) لــە تینــوان خنکــا، و(المقتــدی بــالله)**** (٢٥٥ك/٨٦٩ز) دوای خەساندنی مرد.[٢٥٢] دوای ئەوەی کە خەلیفەکان نەیانتوانی ئەم کێشەیە کـە ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ خراپتر دەبوو چارەسەر بکەن، خەلیفە (الراضي بـالله) (٣٢٢-٣٢٩ك/٩٣٣-٩٤٠ز) هەندێ ڕێو شوێنی گرتە بەر وەك چارەسەرێك بۆ ئەم بارودۆخە نالەبارە، بـەڵام بووە هۆی زیادبوونی نالـەباری و پەشـێوی. وەك لـە سـاڵی (٣٢٤ك/٩٣٥ز) خەلیفـە (الراضي بالله) پلە و پایەی (میری میران)ی نوێکردەوە بۆ ئەو مەبەستەش بـەهێزترین ململانێ کەرانی کە ئـەویش (إبـن رائـق) بـوو دەستنیـشان کـرد، هـەروەها هەنـدێ دەسەڵاتی خەلیفەی پێبەخشی، بەو پێیەو لە ماوەی یەك ساڵدا چوار کەس ئـەو پلـە و پایەیان گرتە دەست (٣٢٩ك/٩٤٠ز)، زۆر جاریش گەیشتنی کەسێك بەو پلە و پایەیە لە ڕێی لە نێوبردنی نەیارانییەوە دەبوو.[٢٥٣] لەم ماوەیەدا و لە بەرزاییەکانی ئێرانـەوە و لە باشووری دەریای خزر (قەزوین)ەوە خێزانێك لە دەیلەمێکان پەیدابوو، ئەم خێزانـە سەر بە بوەیە بوو، کە سێ برا بوون (علی، حسن، احمـد) کـوڕانی بویـە لـە ڕاسـتیدا کێشەی ململانێی نێوان سەرکردەی هەرێمەکان لە بەرزاییەکانی ئێران و دەسـتوەردانی

---

*** المعتز بالله: ناوی (ابو عبدالله بن المتوکل بن المعتصم بن الرشید) لە ساڵی (٢٣٢ك/٨٤٦ز) لەدایك بووە، لە نێو ساڵانی (٢٥٢-٢٥٥ك/٨٦٥-٨٦٨ز) لە گرنگترین ڕووداوەکانی سەردەمی دەرچوونی (مساور الخارجي) و (احمد بن طولون) لە مصر و (علی بن محمد- صاحب الزنج) لە بصرە. (الیعقوبي: تاریخە، ٢/٢٢٢؛ الطبري: تاریخە، ٨/٤١٠؛ ابن خلکان: وفیات الاعیان، ١/١٧٣).

**** المقتدی بالله: ناوی (ابو القاسم عبدالله ابن الأمیر بن المقتدر)ە، لە نێو ساڵانی (٤٦٧-٤٨٧ك/١٠٧٤-١٠٩٤ز) خیلافەتی عەبباسی گرتە دەست، پیاوێکی ئایین پەروەر و چاکساز بوو، لە خانەدانەکانی بنەماڵەی عەبباسی بوو، گۆرانی بێژە ژنەکان (القیان) لە شاری بەغدا دوورخستەوە. (ابو الفداء: المختصر،٢/١٩١؛ السیوطي: تأریخ الخلفاء،٤٢٣).

(٢٥٢) السیوطي: هـ.س، ٣١٠.

(٢٥٣) ابن الاثیر: الکامل، ٥ / ١٩٢.

تورکەکان لە کاروباری خیلافەتی عەبباسی لە بەغدا پاڵپشتی بوو بۆ سەرهەڵدانی (أبو شجاع علی بن بویه بن فناخسرو)* وەك سەرکردەی خێزانی بوەیهییەکان. جگە لە خەسڵەتە تایبەتییەکانی کەسایەتییەکە و ژیری و دانایی لە چۆنییەتی ڕاکێشانی پیاوان بۆ لای خۆی وەك (مسکویە) دەڵێت: "هۆکاری بەرزبوونەوەی پلە و پایەی (علی بن بویه) سەرکەوتن و سنگ فراوانی بوو، هەروەها ڕەوشتی جوان و خاوێن و لەوەش جوانتر و خاوێنتر، زیرەکی و ئازایەتی بوو".[٢٥٤] کە توانی بە هۆیانەوە دەست بگرێ بەسەر هەرێمی فارسدا و هەروەها دواتر لە گەڵ براکانیدا (احمد و حسن) توانیان دەست بەسەر ئەهواز و عێراقیشدا بگرن. ئینجا ڕووداوەکانی بەغدا لە ساڵانی (٣٣٤ك/٩٤٥ز)دا هەلی باشی بۆ بوەیهییەکان ڕەخساند کە بچنە نێو بەغداوە و (أحمد بن بویه) لە جەمادی دووەمی ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز)دا چووە نێو بەغداوە و گەیشتە لای خەلیفە و بەڵێنی لە گەڵیدا بەست و خەلیفە نازناوی (معز الدولة)ی بەخۆی بەخشی و نازناوی (رکن الدولة)شی بە (الحسن)ی برای بەخشی، ئەم نازناوانەش دواتر بەنی بوەیهی پێناسراو نێوبانگیان پێدەرکرد.[٢٥٥] لەم مێژووەوە خیلافەتی عەبباسی کەوتە ژێر دەسەڵاتی بوەیهییەکان تاوەکو هاتنی سەلجوقیەکان لە ساڵی (٤٤٧-١٠٥٥ز).

---

* ابو شجاع فنا خسرو بن رکن الدولة: دوای (عماد الدولة)ی مامی حوکمڕانی هەرێمی فارسی کردووە و ساڵی (٣٦٧ك/ ١٩٧٧ز) چۆتە ناو بەغداو خەلیفە (الطائع لله) پێشوزای لێکردووە و جلوبەرگی دەسەڵاتی پێبەخشی، و فەرمانی کرد لەسەر مینبەرەکانی بغداد وتار (الخطبة)ی بۆ بخوێنرێ و نازناوی (تاج الدولة)ی پێدا، و یەکەم کەس بوو لە ئیسلامدا ناوی (شاهنشاه)ی لێنرا، هەروەها بەناوبانگترین کەسایەتی بوەیهییەکان دادەنرێت. (الروذراوری: ذیل تجارب الامم، ٣/ ٣٩- ٥٧؛ ابن الجوزي: المنتظم، ٧/ ١١٣- ١١٤؛ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٤/ ١٤٢).

(٢٥٤) تجارب الامم،١/٢٧٧.

(٢٥٥) مسکویه: تجارب الامم، ٢/٨٥ ؛ ابن الاثیر: الکامل، ٦ /٣١٤.

# بەشی دووەم
# ڕەوشی سیاسی میرنشینە کوردیەکان و
# بوونی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان

**تەوەرەی یەکەم**

**- سروشتی ڕووبەری جوگرافی میرنشینە کوردیەکان**

**- ناکۆکی و ململانێی نێوان میرنشینە کوردییەکان و کاریگەری لەسەر پێوەندییە دیبلۆماسییەکان**

**تەوەرەی دووەم**

**- پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی کورد لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا**

**- پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی کورد لەگەڵ دەسەڵاتی بوەیهییەکاندا**

**- پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی کورد لەگەڵ دەوڵەتی فاتمیدا**

# تەوەری یەکەم
# سروشتی رووبەری جوگرافی میرنشینە کوردیەکان

کورد بە یەکێك لەکۆنترین و رەسەنترین رەگەزەکانی مرۆڤایەتی دەژمێرێت لە خۆرهەلاتی نێوەراستدا، و لە نێوچەکەدا و لەکۆنترین سەردەمەکانی مێژووەوە رۆڵی کاریگەریان بووە لەرووی سیاسی و سەربازی و شارستانیەوە. ئەو کەسەی بەدوای دیاریکردنی سنووری وڵاتی کوردانـدا دەگەرێت، ئەو وڵاتەی هەتا ئێستەش و بەشێوەیەکی بەردەوام جێگەی نیشتەجێ بوونی کوردە،[٢٥٦] رووبەرووی چەندین بەربەست دەبێتەوە. چونکە ئەو سنوورە بەشێوەیەکی ورد لە سەرچاوە مێژوویەکانی سەدەکانی نێوەراستدا دیاری نەکراوە. سەرەرای بەکارهێنانی دەستەواژەی (کوردستان) لە هەندێك سەرچاوەی مێژوویی کۆنـدا، هەروەها لە دیاریکردنی تەواوی هەرێمە جوگرافیەکانی وڵاتی کوردانـدا گشتگیر و ورد نەبووە،[٢٥٧] ئەوەش سەرەرای رەسەنایەتی وەکو (گەل)ێکی سەربەخۆی خاوەن سەروەری هەروەکو رۆژهەلاتناس (هنری فیلد) دەڵێت: "باوەری باو ئەوەیە کە ئەو رەگەزە پاك و رەسەنە توانیویەتی پارێزگاری لە رەسەنایەتی خۆی و زمانەکەی بکات"،[٢٥٨] هەروەها ئەو رۆڵە کاریگەرەی گێراویەتی

---

(٢٥٦) هنری فیلد: جنوب کردستان دراسة انثربولوجیة، نقله الى العربیة جرجیس فتح الله، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربیل، ٢٠٠١، ٧.

(٢٥٧) محمد ئەمین زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، چاپخانە و ئوفسێتی شڤان، سلێمانی،٢٠٠٠، ١٤/١.

(٢٥٨) جنوب کردستان، ٨.

لە نێوچەکەدا لە لایەنەکانی سیاسی و سەربازی و شارستانیدا بە درێژایی سەدە کۆنەکان.[٢٥٩]

کورد بوونی خۆی لە خۆرھەڵاتی ئیسلام و جڵەوی ئەرکەسیاسی و شارستانیەکاندا شانبەشانی نەتەوەکانی دەوروبەر سەپاندووە. کاریگەری لەسەر دروستکردنی مێژوو و دەوڵەمەندکردنی ھەبووە و ڕۆڵێکی بەرچاوی دیوە. دەستنیشانکردنی سنووری ئەو نێوچانەی کە لە ماوەی ئیسلامیدا کوردی لێی نیشتەجێ بووە کارێکی ئاسان نی یە، چونکە بەشێوەیەکی ورد و جێگر دیاری نەکراوە ئەویش بەھۆی دابەشبوونی ئەو وڵاتە لە نێوان چەندین ھەرێمی جیاوازدا کە ھەر یەکێکیان بەنێویکەوە نێونرابوون بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە لە پۆلێنکردنەکانی ئەو ڕۆژگارەدا ئاماژەیان پێکرابوو، ئەمەو جگە لەو گۆڕانکاریانەی بەسەر نێوەکانیاندا ھاتبوو ھەریەك بەپێی ئەو ئیمپراتۆریەت و دەوڵەتانەی کە لە نێوچەکەدا فەرمانڕەوا بوون، بۆ نموونە سەرچاوە یۆنانی و رۆمانیەکان، ئەو نێوچانەی دەکەوتنە باکووری وڵاتی نێوان ھەردوو ڕووبار- بلاد مابين النهرين- بە میسۆ-پۆتامیا mesopotami[٢٦٠] نێویان دەبرد، لەکاتێکدا سەرچاوە سریانیەکان بەھەرێمی (ئاثور- إقليم آثور)[٢٦١] نێویان دەبرد، بەڵام سەرچاوە

---

(٢٥٩) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: زرار صديق توفيق: كردستان في القرن الثامن الهجري، مؤسسة موكريان للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١،٣٧-٤٠؛ نيشتمان بشير محمد: الكرد و السلاجقة، ١٣-١٤.

(٢٦٠) مينورسكي: الأكراد ملاحظات وانطباعات، تر: معروف خزندار، دار الكتاب، بيروت،١٩٨٧، ١٣٥؛ ليرخ،ب: دراسات حول الأكراد، تر: عبدي حاجي، منشورات مكتبة خاني، حلب، ١٩٩٤،ص١٤- ١٥؛ درايفر، ج آر: الكرد في المصادر القديمة، تر: فؤاد حمه خورشيد، مطبعة الديواني، بغداد،١٩٨٦، ٢٣-٢٤؛ موريس كروريه: تأريخ الحضارات العام الشرق واليونان القديم، باريس منشورات عويدات، ١٢٣/١.

(٢٦١) ابن العبري: تأريخ مختصر، ١١، ولنفسه: تاريخ الزمان، تر: اسحق ارملة، بيروت، دار المشرق،١٩٩١،٣٧،٣٤١، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: فرست مرعي: الأمارات الكردية في العصر العباسي الثاني، دار سپيريز للطباعة والنشر، ٢٠٠٥ ، ص٣٣.

ئیسلامیەکان ئەو هەرێمەیان خستەژێر نێوی جەزیرە و هەندێ جاریش بە هەرێمی ئاقور* نێویان دەبرد.(٢٦٢)

بەڵام ئێمە پێمان باشتربوو نێوی وڵاتی کورد (بلاد الكرد) لەبری کوردستان بەکاربێنین، بەتایبەت نێوی کوردستان لەو ماوەیەدا لە سەرچاوە مێژووییەکاندا بەرچاو نەدەکەوت، بۆیە پێویستە وەك ئەمانەتێکی زانستی نێوەکان وەك لە سەرچاوەکاندا چۆن هاتوون لەو سەردەمەدا بەهەمان شێوە بەکاریان بێنین.

هەروەها ئەو ویلایەت و هەرێمانەی کە کوردی لێ نیشتەجێ بوون بەیەك ناوی گشتگیر بۆ هەموو بەشەکانی ناونەدەبرا، بەڵکو هەر نێوچە و هەرێمێك بەناوی هەرێمە ئیدارییەکەوە ناودەبرا کە لە دابەشکردنەکاندا بەر ئەو هەرێمە دەکەوت.(٢٦٣)

سریانەکان و کۆمەڵی کریستیانەکانی (الجماعات المسيحية) دیکە کە لە ئاسیای بچووك و نێوچەی جەزیرەی فوراتدا نیشتەجێ بوون، هەر لەزۆر کۆنەوە وڵاتی کوردانیان بەزمانی سریانی ناوبردووە کە واتای هەمان وشەی کوردستانی دەگرتەوە، وەك لە هەندێ سەرچاوە سریانیەکاندا هاتووە کە لە سەردەمی سەدەکانی نێوەڕاستدا نووسراونەتەوە، بۆ نموونە، وشەی"ئەرعاد قردوای"(٢٦٤) ناوبراوە، واتاکەی"خاکی

---

*ئاقور: دەکەوێتە نێوان دیجلە و فورات بەتەك شامەوەیە، پێك هاتووە لە (دیار مضرودیار ربیعة)، شاری ڕێك و قەڵاو بنکەی زۆری تێدایە، لە بەناوبانگترین شارەکانی (حەڕان، ڕوها، ڕەقە، راس العين، نەسیبین، سنجار، خابوور، ماردین، ئامەد، میافارقین، موسل..هتد) (یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٢/١٣٤-١٣٦).

(٢٦٢) ابن حوقل: صورة الأرض، ١٨٧؛ المقدسي: احسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، دار احياء التراث العربي، بيروت، ١٩٨٧، ١٢١.

(٢٦٣) محمد امين زكي: خلاصة تأريخ الكرد و كردستان من اقدم العصور التأريخية حتى الآن، تر، محمد علي عوني، بغداد،١٩٦١، ص٥.

(٢٦٤) يعقوب الرهاوي: تواريخ سريانية من القرن (٧-٩م)، تحـ و تر: يوسف حبي، بغداد،١٩٨٢،ص١٨٠؛ زرار صديق توفيق: كردستان، ص٣٧.

کورد" دەگرێتەوە، هەروەها لە سەرچاوە مێژووییەکانی دیکەی سریانیدا گەلێ ناو و زاراوەی چونیەك هاتووە کە سەرجەمیان هەمان واتا دەگرنەوە.[٢٦٥]

شایەنی باسە بەکارهێنانی زاراوەی (کوردستان) لەسەرچاوە مێژووییەکاندا بۆ نیوەی دووەمی سەدەی (٧ك/١٣ز) دەگەڕێتەوە، کە مەبەستی لەیەکێك لە کەرتە ئیداریەکان بووە، کە شارەکانی هەرێمی چیاکانی خۆرئاوا دەگرێتەوە و ژمارەیان (١٦) شار و شارۆچکە بووە و قەڵای بەهار کە دەکەوێتە باکووری شاری هەمەدان،[٢٦٦] یەکێك بووە لە شارستانەکانی ئەو هەرێمە. واتە زاراوەی (کوردستان) سەرجەم هەرێم و نێوچەکانی خاك و نیشتمانی کوردانی نەگرتۆتەوە.[٢٦٧]

پێشتر باوەڕ وابو کە (حمدالله المستوفی القزوینی)[٢٦٨] (م٧٥٠ك/١٣٤٩ز) یەکەم کەس بووە ناوی کوردستانی لەکتێبەکەیدا (نزهە القلوب) ساڵی(٧٤٠ك/١٣٣٩ز) هێنابێت، بەڵام لە ڕاستیدا گەلێ نووسەری دیکە پێش ئەو زاراوەی کوردستانیان لە نووسینەکانی خۆیاندا بەکار هێناوە، بۆنموونە، دەبینین گەڕیدەی ئیتالی (مارکۆپۆلۆ marcopolo)، (م٧٢٣ك/١٣٢٣ز)[٢٦٩] لە گەڕانەکەیدا بەنێوچەکانی خۆرهەڵات ساڵی (٦٧٠ك/١٢٧١ز) ناوی کوردستانی لە گەشتنامەکەیدا نووسیوە، هەروەها

---

(٢٦٥) الرهاوي المجهول: تاريخ الرهاوي المجهول، بغداد،١٩٨٦، ص٤٠؛ ابن العبري: س. پ، ٢٧، ٣٥، ٧٢، ٣٢١.

(٢٦٦) زرار صديق، كردستان، ٤٦- ٤٩.

(٢٦٧) سعيد خضري: جغرافياى طبيعي كردستان موكريان، تهران،١٢، ١٣٧٩؛ حكيم احمد مام بكر، الكرد و بلادهم عند البلدانيين و الرحالة المسلمين، رسالة دكتوراه، مقدمة الى كلية الأداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٣، ص٧٨.

(٢٦٨) نزهة القلوب، تهران، ١٣٣٦، ص١٢٧.

(٢٦٩) رحلة ماركوبولو، تر: عبدالعزيز جاويد، مصر،١٩٩٥، ص٣٤-٣٥؛ باسيل نيكيتين: الأكراد اصلهم و تاريخهم، بيروت، ١٩٥٨،ص٢٥؛ جميل رۆژ بەیانی: سوڵتانی سەنجەری سەڵجوقی کوردستان سلیمان شاە بەبوە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٨) بغداد،١٩٨٨،ل٢٢-٢٦.

مێژوونووسی مەغۆل (رشید الدین فضل الله الهمداني)[٢٧٠] (٧١٨ك/١٣١٨ز) پتر لەجارێك ناوی كوردستانی لە كتێبەكەیدا سەبارەت بەمێژووی مەغۆل بردووە، و لە رووداوەكانی ساڵی (٦٨٥ك/١٢٨٦ز)دا برگەی "چیای هەكاری كوردستان- جبل هكار بكردستان"[٢٧١] باسكراوە، بەڵام هاوسەردەمی (شهاب الدین عبدالله الشیرازی) (٧٢٨ك/١٣٢٨ز) ئەویش ناوی كوردستانی بردووە.[٢٧٢] ئەگەر ناوبردنی كوردستان چەمكێكی ئیداری وەرگرتبێت لە هەر چەمێكی دیكە لەلای هەریەك لە (حمدالله المستوفي و ماركۆپۆلۆ و الشیرازي)، ئەوا لەلای (رشید الدین فضل الله) چەمكێكی نەتەوەیی وەرگرتووە، لەلای ئەو زاراوەی كوردستان ئەو رووبەرە جوگرافیە دەگرێتەوە كە كورد لێی نیشتەجێیە كە گەلێ نێوچەی تریش دەگرێتەوە لە دەرەوەی سنووری ئیداری ویلایەتی هەرێمی كوردستانی تازە ناوبراو كە (حمدالله المستوفي) سنوورەكەی دیاریكردووە، هەروەك لە كتێبەكەی خۆی (حمدالله المستوفي)دا هاتووە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە كە دانەری كتێبەكە جیاوازی لە نێوان كوردستان وەك یەكێك لە ویلایەتەكانی حكومەتی مەغۆلی كە بەشێك لەوڵاتی كورد دەگرێتەوە و لە نێوان كوردستان وەك پێناسەیەكی نەتەوەیی كردووە، كە مەبەستی كورد بووە و ئەو نێوچانەی پێ ناسراوە كە زۆربەی دانیشتوانەكەی كورد بوون، لەسەرەتای باسەكەیدا سەبارەت بەئێران، دەڵێ: "تمامت كردستان-واتە سەرجەم كوردستان"[٢٧٣] و لەكاتی باسكردنیدا ئاشكرایە كە شاری سەلماس و چیاكانی دەوروبەری لەڕووی ئیداریەوە سەر بە هەرێمی كوردستان نەبووە، بەڵكو سەر بە هەرێمی ئازەربیجان بووە.[٢٧٤]

لەو سەرچاوە كەمانەی كە بە زمانی عەرەبی نوسراوون و ناوی كوردستانیان وەك

---

(٢٧٠) جامع التواريخ، الترجمة العربية، القاهرة، د-ت،٢/١/٢٦١-٢٦٢.

(٢٧١) جامع التواريخ،٢/٢/١٣٥.

(٢٧٢) تجزية الأمصار و تزجية الأعصار (تاريخ وصاف)، تهران،١٣٤٦هـ،٢٢٤.

(٢٧٣) نزهة القلوب، ٢٣.

(٢٧٤) هـ_س،٩٧.

چەمکێکی نەتەوەیی تێدا هاتووە، (عبدالله بن فتح الله البغدادي) (دوای ٨٩١ك ١٤٨٦/ز مردووە) بووە،[٢٧٥] لەبەرئەوەی وشەی کوردستان وشەیەکی (أعجمي- غیر عربي) بووە، لەلای مێژوونووسانی عەرەب تەواو پێی ئاشنا نەبوون، یاخود ئەوانەی کە کلتورەکەیان عەرەبی بووە، ئەم وشەی کوردستانە بەلایانەوە نامۆ بووە لەبەرئەوە نە بەکاریان هێناوە و نە لەنووسینەکانیاندا ناویشیان بردووە، هەرچەندە لە سەرچاوە فارسیەکانی هەمان سەردەمی ئەوان- واتە مێژوونووسە عەرەبەکان- بەزۆری بەکارهێنراوە، ئەگەرچی زاراوەی "چیاکانی کورد- جبال الکرد" لە سەرچاوە مەملوکیەکاندا،[٢٧٦] هاوزمان بووە لەگەڵ سەرهەڵدانی زاراوەی کوردستان بە چەمکە نەتەوەییەکەی، (إبن فضل الله العمري) (م٧٤٩ك/١٣٤٨ز) زۆر بەڕاشکاوی ئاماژە بەوە دەکات و هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە کە مەبەست لە (جبال الأکراد)[٢٧٧] خودی کوردستانە، و لەبەرامبەردا بە زمانی فارسی "کهستان کردان" بەکارهێنراوە، کە لەکتێبێکی دیکەی (رشید الدین فضل الله)دا[٢٧٨] هاتووە، و لەپاڵ چیاکانی کوردان زاراوەی (بلاد الأکراد)[٢٧٩] لە سەرچاوە مەملوکیەکانی تردا هاتووە، کە وەرگێڕاوی حەرفی وشەی کوردستانە، کە لەزمانی فارسیدا بەرامبەرەکەی "ویلایت أکراد" کە لەکتێبێکدا هاتووە و لەسەرەتاکانی سەردەمی مەغۆلی (٦٥٨ك/١٢٦٠ز)دا نووسراوە.[٢٨٠]

---

(٢٧٥) تاريخ الغياثي، تح: طارق نافع الحمداني، بغداد، ١٩٧٥،١٨٣،٣٣٦.

(٢٧٦) شيخ الربوة الأنصاري: نخبة الدهر، لايبزك، ١٩٢٣، ١١٥: ابن خلدون: المقدمة، بيروت، ١٩٧٨، ٦٣: القلقشندي، صبح الأعشى، ٤/ ٣٥٣: المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، ٥٣٣/٢/٢: زرار صديق: كردستان، ص٣٩.

(٢٧٧) القلقشندي: صبح الأعشى، ٢٧٣/٤-٢٧٩.

(٢٧٨) تأريخ مبارك غازاني، التأريخ الغازاني، هرتفورد، ١٩٤٠، ص١٤٣.

(٢٧٩) السخاوي: الضوء اللامع لاهل القرن التاسع، بيروت، د-ت، ٢١٩/٧: ابن اياس: بدائع الزهور، مصر، ١٩٦٠،٢٦٠.

(٢٨٠) تاريخ گونشاى: بريل ليدن،١٩٣٧،مج١١٣/٣.

لەسەر ئەو پێودانگەو بە گوێرەی گوتە و ئاماژەی مێژوونووس و گەڕیدەکان دەتوانین بڵێین وشەی کوردستان لە نێو خودی کورداندا و لەو کاتانەدا بەکارهێنراوە. هەروەها دەتوانین بڵێین ئەو دەستەواژەیە لەسەدەی شەشەمی کۆچیدا بەکارهێنراوە. بە گوێرەی گوتەی ڕۆژهەڵاتناس (کی لسترنج) سنووری جوگرافی کوردستان بە شێوەیەکی تەواو ورد و جێگیر دیاری نەکراوە ئەویش بەهۆی دابەشبوونی ئەو وڵاتە لە نێوان چەندین ناوچەی جیاوازدا و ئەو ناوچانەش چەندین ناویان هەبووە بە گوێرەی ئەو سەرچاوانەی ئاماژە بەوە دەکەن. کورد بەسەر ئەو ناوچانەشدا کە دابەشبوون بەسەریدا لەگەڵ گەلان و نەتەوەکانی تردا وەکو فارس و تورك و ئەرمەن و سریان و عەرەب ژیاون[٢٨١].

لەڕاستیدا نەبوونی قەوارەیەکی سەربەخۆ کە هەموو بەشەکانی کوردستان بگرێتە خۆ بەتایبەت لەمێژووی ئیسلامیدا بۆتە هۆی ئەوەی کە بەزەحمەت سنووری هەرێمەکان دەستنیشان بکرێت کە خرابوونە سەر ئەو دەوڵەت یاخود ئەو دەوڵەتانەی دیکە چ لەکۆندا یاخود لەتازەدا. وێڕای ئەم بارودۆخە و لە گەلێ ماوەدا سنووری کوردستان دووچاری بچوك بوونەوە و لێکدابڕان بووە لە هەموو لایەکانیەوە. لێرەوە توێژەرەوان هاوڕا نەبوون لەسەر دیاریکردنی سنووری کوردستان لە هەر چوار لاکەوە و بەتایبەتی لە بەشە بچووکەکانیدا،[٢٨٢] ئەو نێوچەیەی کە زۆربەی دانیشتوانی کورد بوون و لە نێو نێوچەکانی میرنشینە کوردیەکاندا بوون لەو ماوەیەدا بە نێوچەیەکی شاخاوی سەخت جیاکراوەتەوە.[٢٨٣] تەنانەت لەسەر کورد گوتراوە کە جگە لە چیاکان

---

(٢٨١) بلدان الخلافة الشرقية، نقله الى العربية بشير فرنسيس و كوركيس عواد، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥٤، ٢٢٢.

(٢٨٢) ئەولیا چەولیا چەلەپی: کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، و.سەعید ئاکام، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد،١٩٧٩، ل٩٠؛ شریف پاشا: یاداشتنامە لەبارەی داخوازییەکانی گەلی کوردەوە: و.فەرهاد پیربال، گۆڤاری ڕابوون، ژمارە (٢)، ستوکهولم،١٩٩١:عەبدوڵڵا غەفور: جوگرافیای کوردستان،، هەولێر،٢٠٠٠،ل٢٥٤-٢٦٨.

(٢٨٣) ابن حوقل: صورة الأرض،٣١٥ ؛ الحميري: الروض المعطار في خبر الأقطار، ص٤٤٧؛ فؤاد حمه خورشيد، الأكراد، بغداد، ١٩٧١،ص١٠.

هیچ شوێنێکی دیکە دالّدەیان نادات،[٢٨٤] و لـەلای هەنـدێکی دیکـە بـە هـاودەمی چیاکان ناوبراون.[٢٨٥] دەبینین دوای ئەوەی (البدلیـسی) دەربـارەی سروشـتی شـاخاوی سەختی ولاّتی کورد چەردەیەکی باشی نووسی، ئیتر نەیانتوانی داگیری بکـەن، چـونکە ئەگەر دەسەلاّتدارێك بیویستایە پرکێشی بکـات بـۆ ولاّتـی کـوردان ئـەوا رووبـەرووی تەنگانە و زەحمەتێکی زۆر دەبۆوە و هەوڵەکانی بێ سـوود دەبـوو.[٢٨٦] ئـەوەش بـەهۆی گرفتی هاتوچۆ لە نێوچەکەدا چونکە سروشـتی کوردسـتان و تۆپـۆگرافی خاکەکـەی رێگەی بەجوڵەی سەربازی نەدەدا، بەجۆرێك هێزی هێرش بەر توانای مـانەوەی نـەدەبوو لە نێوچەکەدا ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە، ئەو سروشتە سەختەی کوردستان رۆڵی لەسەر سروشت و هەڵکەوتەی کورد هەبوو کە توانای خۆڕاگریان زۆر بوو بەرِووی هـەر دەستدرێژییەك گەر بکرایاتە سەریان، هەروەها نێوچەکەیان جۆرێك لـە دوورە دەسـتی و کەنارگیری سـەپابوو بەسـەریدا کـە بـەو هۆیـەوە ئـازادی هاتووچـۆ و جوڵـەی خێڵـە کوردەکان لەسەرجەم نێوچەکەدا بەئاسانی بۆیان مەیسەر نەبووبوو.

کورد لەمیانەی چاخەکانی ئیسلامیدا "نەتەوەیەکی بەناوبانگ بـوون"[٢٨٧] ئـەوان "خەڵکێکن لە ژمـار نایـەن و نەتـەوە گـەلێکن بـێ شـومار"[٢٨٨] منداڵـەکانیان و نەوەکانیان بە "حیکمەتی خودا- الحكمة الألهية"[٢٨٩] لە زۆربووندان، ئەگەر"شـمشێری فیتنە و ئاشوب لە نێوانیانـدا نەبایـە، بێـداریان درووینـەیان لەکوشـتاردا دەکـرد و خەوتوەکانیان بێـدار دەکـردەوە"[٢٩٠] خـۆ ئەگـەر بهاتایـە و "کوشـتار و پێکـدادانی

(٢٨٤) الأنصاري: نخبة الدهر في عجائب البر و البحر، ص٢٥٥.

(٢٨٥) الجاحظ: البيان و التبين، قدم لها وبوبها و شرحها. على ابو ملحم، بيروت،١، ١٩٨٨/ ١٣٠؛ اليعقوبي: كتاب البلدان، ٢٣٦.

(٢٨٦) الشرفنامه، ٢٨.

(٢٨٧) ابن منظور: لسان العرب، ٣/٢٣٩ : القلقشندي: صبح الأعشى، ٤/ ١٤٩.

(٢٨٨) العمري: التعريف بالمصطلح الشريف. بيروت، ١٩٨٨، ٥٨.

(٢٨٩) البدليسي: س-پ، ٢٧-٢٨.

(٢٩٠) العمري: س- پ، ٥٨.

بەردەوام لە نێوانیاندا نەبایە"،[٢٩١] "هەموو وڵاتیان داگیردەکرد"[٢٩٢] بەجۆرێك "وڵاتی دنیا بەشی نەدەکردن"،[٢٩٣] بێگومان ئەو خێڵ و تیرە کوردیانە بەو زۆریەوە پێگەیەکی گەورەیان لەخۆرهەڵاتی ئیسلامدا داگیرکردبوو، هەندێکیان لە نێوچە و هەرێمەکانی دەرەوەی سنووری نیشتمانی رەسەنی خۆیان بڵاوببوونەوە.[٢٩٤] جێی ئاماژەیە دەرکەوتنی بوەیهییەکان وەك هێزێکی نوێ لە نێوچەکەدا، نەیتوانی رێ لە گەشەکردن و سەرهەڵدانی ئەو میرنشینە کوردیانە بگرێت، تەنانەت دەبینین هەوڵ و تەقەلاکانی هەندێ لە میر و سەرکردەکانی بوەیهییەکان بۆئەوەی هەردوو میرنشینی (حەسنەوەیهی ومەروانی) بکەنە دوو نێوچەی سەربەخۆیان، سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا و شکستی خوارد لەرووی جێگیربوونی هێزی بوەیهییەکان لە نێوچەکەدا تا ملکەچی دەسەڵاتی خۆیانی بکەن.[٢٩٥]

بەهۆی بەرگریکردنی سەرکردە کوردەکان و سەختی نێوچەکەیان، بوەیهییەکان نەیانتوانی چنگیان لە نێوچە شاخاویەکانیان گیرکەن، هەروەها پێگەی جوگرافی وڵاتەکە فاکتەرێکی کاریگەر بوو لەدرووست بوون و سەرهەڵدانی میرنشینەکان لەو ماوە مێژووییەی کە ئێمە ئیستە گەرەکمانە قسەی لەسەر بکەین، ئەویش لە هەردوو لایەنی دوور و نزیکی لە کاریگەریەکانی دەسەڵاتی نێوەندی، هەندێ لەو میرنشینانە لە نێوچە زۆر سەختەکانی (الثغور) وەك (الروادیة) لەئازەربیجان[٢٩٦] و لەسیەکانی

---

(٢٩١) البدليسي: س-پ،ل٢٧-٢٨.

(٢٩٢) العمري: س- پ،ل٥٨.

(٢٩٣) العمري: هـ-س، ل١٤٩.

(٢٩٤) المسعودي: التنبيه والأشراف، ص٧٨.

(٢٩٥) مسكويه: تجارب الأمم، ٢/٢٧٠-٢٧٤: الروذراوري: ذيل تجارب الامم، ٩/١٠: ابن خلدون: المقدمة، ٣/٤/٩٠٢: البدليسي: الشرفنامة، ٣٥ ؛ قادر محمد حسن: الأمارات الكردية، ص٥٦.

(٢٩٦) لە سەردەمی لێکۆڵینەوەکەمان (ئازەربایجان)، بەو هەرێمە وتراوە کە ئازەربایجانی سەر بە ئیرانی ئێستا دەگرێتەوە، کە دەکەوێتە باشووری رووباری ئاراسەوە، ئازەربایجانی ئیران دوو

سەدەی چوارەمی کۆچی (٣٣٧- ٤٦٣ك) واتــە چــلەکانی ســەدەی دەی زاینــی ســەری هەڵدا و گەشەی کرد، و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان سەرجەم نێوچەی ئازەربیجــانی گرتــەوە کە فەرمانڕەواییان ماوەی (٩٠) ساڵ کێشا،[٢٩٧] زۆربەی ڕووبــەری خــاکی ئازەربیجــان لەڕووی سەختی چیاکانیەوە وەك خاکی کوردستان وایە،[٢٩٨] و لە چیا بەناوبانگــەکانی چیای سولان (سبلان) و (سهند) کە بە درێــژایی ســاڵ بــەفری لــە لوتکــەکانی ڕەش نابێتەوە،[٢٩٩] هەروەها چیای (نجقان) کە دەکەوێتە نزیــك (مراغــە) و سەرچــاوەیەکی ئاوی سازگاری هەیە، جگە لەمانەش چەندین زنجیرە چیای دیکەی سەخت و سەرکەشی لێیــە، لەوانــە زنجــیرە چــیای (شــاە بایزیــد) کــە نێوچــەی ســەلماس لــە ئورمــێ جیادەکاتەوە،[٣٠٠] ئەمانە و جگە لەگەڵێ زنجیرە چیای گرنگی تر.[٣٠١]

هەروەها میرنشینی (الشدادیة) لەهــەرێمی أران (٣٤٠-٥٩٥ك/٩٥١- ١١٩٨ز)، لەرۆژانی هێرشەکانی ڕۆمانیەکان بۆ سەر خۆرهەڵاتی ئاسیای بچوك، هاتە ئاراوە، کــە سنوورەکەی ئەو زەویە نزمانەی دەگرتەوە کە دەکەوتنە شیو و دۆڵەکانی نێوان هــەردوو ڕووباری (الكر)* و (أراس) لە نێوان وڵاتی (کەرەج) دەریای قەزوین (خزر)دا.[٣٠٢]

---

بەشە، ئازەربایجانی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی. بڕوانە: حسام الدين على غالب: اذربيجان، ص٣٤-٣٧.

(٢٩٧) minorky، studies in Caucasian history p.p. ١٦٨-١٦٩.

(٢٩٨) ابـن حوقـل: صـورة الأرض، ٢٠٥؛ ابتهـال مـال الله حـسين: اذربيجـان في صـدر الأسـلام، ص٢٥.

(٢٩٩) ابو الفدا: تقويم البلدان، ٣٧٦؛القزويني، اثار البلاد واخبار العباد، ١٨٩.

(٣٠٠) مينورسكي: دائرة المعارف الأسلامية، مادة ارمية،١٩/٣.

(٣٠١) بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی اذربيجان بڕوانە (حسام الدين على غالب:اذربيجان).

* الكر:- ڕووبــارێکی گەورەیــە لــە نێوچــە چیاکانی ئاران دەردەچێت لــە سەرسنوری (جترە و شمکور) جیاکەرەوەی نێوان ئاران و ئاذربیجانە. (المقدسي: احسن التقاسيم،٣٧٩؛ السمعاني: الانساب، حقق نـصوصه وعلـق عليـه، عبـدالرحمن بـن يحـى المعلمـي اليمـاني، بيروت،١٩٨٠، ١٣٩/٢).

سەبارەت بەمیرنشینی مەڕوانی لە دیاربەکر و جەزیرە (٣٧٢ك-٤٨٩ك/٩٨٣ز-١٠٩٦ز)،[٣٠٣] بە ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی ئەو سەردەمە، دەبینین ئەو نێوچانەی لەژێر دەسەڵاتی ئەو میرنشینەدا بوون سنوورێكی جێگیریان نەبووە، ئەمەش بەهۆی ئەو شەڕ و شۆڕانەی كە بەردەوام لە نێوان ئەو میرنشینە و میرنشینەكانی دیكەی نێوچەی جەزیرەدا بەرپادەبوون، وەك (الحمدانیین والعقیلیین)، ئەمەو سەرەڕای بوەیهییەكان و خیلافەتی عەبباسی و فاطمی كە كاریگەیان لەسەر سیاسەتی ئەو میرنشینە هەبوو، هەموو كاریگەریان لەسەر ڕووبەری ئەو ناوچانەش هەبوو كە لەژێر سایەی دەسەڵاتی هەمان میرنشینەدا بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ناجێگیری سنووری ئەو میرنشینە، مانای ئەوەنیە كە هەرێمێكی دیاریكراوی ژێر دەسەڵاتی خۆیان نەبووبێت، بەڵكو وڵاتێكیان هەبوو كە كردبویانە نێوەندی میرنشینەكەیان و دەسەڵاتی تەواویان بەسەردا هەبوو، بەڵام دیاریكردنی سنووری جوگرافیەكەی كە بەگوێرەی ڕووداوەكانی پێشوو لە فراوانبوون و بەرتەسك بوونەوەدا بوو، زەحمەتە بەوردی دەستنیشان بكرێت. لە ساڵی (٣٧٢ك/٩٨٣ز)دا بۆ نموونە، قەڵەمڕەوی ئەو میرنشینە تا باكووری (موصل)یشی دەگرتەوە، لەكاتێكدا میر (باز الكردی) دامەزرێنەری میرنشینەكە پەلاماریدا، بەڵام هەر زوو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئەو میرنشینە بچووك بۆوە، كاتێك میر (باز الكردی) لە بەردەم سوپای (صمصام الدولة)* ی بوەیهیدا ساڵی (٣٧٤ك/٩٧٥ز)

---

(٣٠٢) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (اسماعیل شكر: الأمارة الشدادیة)؛ هەروەها پاشكۆی ژمارە (١).

(٣٠٣) بڕوانە: محمود یاسین التكریتي: الأمارة المروانیة في دیار بكر والجزیرة، ٥٦، ١٠٨.

* صمصام الدولة: ناوی (المرزبان فناخسرو بن عضد الدولة)یە، چوارەم میری بومەیهییەكان بوو كە فەرمانڕەوای بەغدادیان گرتە دەست لە پاش مردنی باوكی ساڵی (٣٧٢ك/٩٨٢ن)، لە ساڵی (٣٧٦ك/٩٨٦ن) لەسەر حوكم لابرا لەلایەن (شرف الدولة)ی برای، لە ساڵی (٣٨٨ك/٩٩٨ن) كوژرا. (الصفدی: نكت الهمیان في نكت العمیان،مصر،١٩١١،ص ص ٢٨٨-٢٩٠).

شکستی خوارد،[٣٠٤] دوای ئەوەی توانی لە ساڵی (٣٨٠ک/٩٩٠ز)دا[٣٠٥] جارێکی دیکە بیخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەهەمان شێوە شاری (نصیبین)یش ئەو حاڵەتەی بەخۆوە بینی، کاتێك (بنو مروان) خستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. لەسەردەمی میر (باز الکردی)دا ناکۆکی مەروانییەکان لەگەڵ عوقەیلیەکاندا بوو بەهۆی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی (بنی مروان) لە نێوچەی جەزیرە، لە ئەنجامدا شاری (نصیبین) لەژێر دەسەڵاتی ئەوان دەرچوو، دوای ئەوەی (قریش بن بدران العقیلی)** لەمیر (نصر الدولة)ی وەرگرت لەبەرامبەر مارەیی پوری ژنەکەی میری ناوبراو، بەم شێوەیە دەسەڵاتیان لەو شارەدا لە ساڵی (٤٢١ک/١٠٣٠ز) کۆتایی پێهات.[٣٠٦]

بەڵام لەخۆرئاواوە دەسەڵاتی (بنی مروان) تا (دیار مضر)* درێژ بۆوە، و لە ساڵی (٤١٦ک/١٠٢٥ز)دا شاری (الرها)**یان خستە سەر قەڵەمڕەوی میرنشینەکەیان کە میر (نصرالدولة بن مروان) لە (بنی نمیر)ی سەندەوە، دوای ئەوەی کە ماوەیەك بوو

---

(٣٠٤) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٨٦/٣.

(٣٠٥) ابن الأثير: الكامل، ٢٦/٩؛ ابن شداد: الأعلاق الخطيرة،٧٨ ؛ الغساني: العسجد المسبوك والجوهر المحكوك في طبقات الخلفاء والملوك، تحـ: محمود عبد المنعم، دار الجيل، بغداد، ١٩٧٥، ١٢.

** قريش بن بدران العقيلي: ناوی (معتمد الدولة ابو المنيع)ە لەپاش مردنی باوکی ساڵی (٣٩١ك/١٠٠٠ز) دەسەڵاتی میرنشینی عقیلیەکانی گرتە دەست، لە ساڵی (٤٥٣ك/١٠٦١ز) لە لایەن برازاکەی (ابو المعالی قریش) کوژرا. (ابن خلكان: وفيات الاعيان، ٣٦٣/٥-٣٦٧).

(٣٠٦) ابن الأثير: الكامل، ١٢٩/٩.

* دیار مضر- دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات، ئەو زەویانەی کەوا دەکەوتە نێوان (حران و الرقة وشمشاط) یەکێکیان دەخاتەوە و ناوەندەکەی (الرقة)یە کە لە شوێنی ئەو شارە یۆنانیە کۆنەیە بە ناوی (کلینکس_Call inicas) بووە کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت نقفور. (البلاذري: فتوح البلدان،١٧٨؛ ابن الفقيه: كتاب البلدان،١٣٢؛ كي لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ١٣٢).

** الرها: (ئورفە) ئەم شارە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی ڕووباری فورات، لە دەڤەری جەزیرەیە، نزیکەی (٢٤کم) لە شاری بەهاران (حەڕان) دوورە. (ابو الفداء: تقويم البلدان،٢٧٧؛ قدامة بن جعفر: الخراج و صناعة الكتابة، ١١٣).

لەژێر فەرمانی پیاوێکی سەربەخۆیان بوو کەناوی (عطیر) بوو، پاش ئـەوە بەماوەیـەك (عطیر) توانی بیگێڕێتەوە ژێـر دەسـەڵاتی خـۆی و لـەمیر (أبـی نـصر بـن مـروان)ی بسێنێتەوە دوای ئەوەی (صالح بن مرداس)[307] شفاعەتی بۆکرد. ئیتر (الرها) بەدەست (بنو نمیر)ەوە بوو تـا لـە سـاڵی (٤٢٢ك-١٠٣٠ز)دا[308] ڕۆمـەکان داگیریـان کـردوو خستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

بەڵام لە باشوور لە ویلایەتی دیاربەکر، جەزیرەی (إبن عمر) بەشێك بوو لە مڵکـی ئەوان، هەر لەوکاتەوە لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو لەسەردەمی مـیر (نـصر الدولـة) و کوڕەکەی خۆی (أبو حرب سلیمان) لـە سـاڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز)ی[309] کـردە حـاکم لەسەری، و لەژێر چنگی ئەواندا بوو، تا (فخر الدولة بن جهـیر) لـە سـاڵی (٤٧٨ك-١٠٨٥ز) لێی سەندنەوە.[310]

لەوەوە ڕوون دەبێتەوە کە میرنشینی مەروانیـەکان سـنوورێکی جـوگرافی جـێگیری نەبووە، چونکە ئەو میرنشینە بەدرێژایی دەسەڵاتی میرەکانی بـەزەبری هێـزی سـەربازی خۆی ڕاگرتبوو، سەرباری ئەوەش ئەو میرنـشینە ڕیـشەیەکی کۆمەڵایـەتی و مرۆیـی و پێوەندی قوڵی بەدانیشتوانەکەیەوە هەبوو، باشترین نموونەش بۆ هێـزی سـەربازی ئـەو میرنشینە، سەردەمی میر (باز الکردی) و میر (نصر الدولـة بـن مـروان) بـوو، بـەڵام سەردەمی لاوازی و نابوتبوونی لە ڕۆژانی دەسەڵاتداریتی میر (الدولة أبـو منـصور)دا بوو.

ئاشکرایە کە نێوچەکانی (الثغور) هەمیشە لەژێر کاریگەری مەترسی بیانیدا بـوو لەلایەن وڵاتانی دوژمنانەوە، ئەمەش وایکردبـوو ئـەو نێوچـانە هەمیـشە بـەئاگابن و هەردەم لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بن بۆ وەڵامدانەوەی هەر هەڕەشەیەك کە ڕووبـەڕوویان

---

(٣٠٧) ان الأثير: الكامل،١٣٠/٩؛أبو الفداء: المختصر، ٥٧/٣-٥٨.

(٣٠٨) ابن الأثير: الكامل،١٥٥/٩؛ابن العبري: مختصر تاريخ الدول،٣١٨.

(٣٠٩) ابن الأثير: الكامل،٢٢٦/٩.

(٣١٠) ابن شداد: الاعلاق الخطيرة،٥٨.

دەبۆوە. بەمەش ئەو نێوچانە دەکەوتنە بەردەم کۆمەڵێك بەرپرسیارێتی تایبەتیەوە، و ئەو ئەرك و فەرمانانەبوون کە لە نێوچەکانی (الثغور)دا دەوڵەتیان لێ دەکەوتەوە.[311] بەواتایەکی دیکە ئەو نێوچانە دووربوون لە کاریگەریەکانی دەسەڵاتی نێوەندیەوە و هەمیشە لە بەردەم مەترسی پەلاماردان و هێرشی وڵاتانی دوژمندا بوون کە پێویستیان بەهێزی سەربازی و تواناکانی هەبوو، بەواتایەکی دیکە سروشتی پێگە جوگرافیەکەی و ئەرکەکانی پێویستی بە بوونی دەسەڵاتێکی سیاسی هەبوو، ئەمەش هەندێ لە سەرکردەکانی کوردی هاندا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان بخەنەگەڕ دوواجار هەستان بە ئەنجامدانی هەندێ پەلامار و هێرش لە نێوچەکانی (الثغور)دا لەوانەش وەك، میر (باز الکردي) دامەزرێنەری میرنشینی مەروانی.[312]

هەروەها میر (محمد بن أبي الهیجاء الروادي) هەستا چەند هێرش و پەلاماردانێکی لە نێوچەکەدا دەست پێکرد.[313] ئەمە لەکاتێکدا بوو کە نەریتێکی نوێ لە مێژووی ئیسلامدا سەری هەڵدابوو، ئەویش ئەوەبوو کە میرەکانی نێوچەی (الثغور) هەڵدەستان بەرۆڵی سەرەکی لە هەڵمەت و پەلاماردانەکانی نێوچەکانی خۆیاندا، دوای ئەوەی کە رۆڵی خەلیفە لەو لایەنەوە هیچ کاریگەریەکی نەبوو.[314] ئەمەش بوو بەهۆی زیادبوونی دەسەڵاتی میرەکان و بەهێزبوونی پێگەی سیاسیان، هەندێکیان دەرفەتیان لەو بۆشاییە سیاسیەی نێوچەکەیان وەرگرت بەهۆی دووریان لەدەسەڵاتی نێوەندیەوە. هەروەك دەبینین دوای بەدیلگرتنی (سالاری مەرزەبان) (محمد بن شداد)یش توانی شاری دوین بخاتە ژێر دەستی خۆی، چونکە دانیشتوانەکەی بۆئەوەی ماڵ و ژن و حەڵاڵیان

---

(٣١١) حسن احمد محمود: العالم الأسلام في العصر العباسي، ٢٩٤-٢٩٥.

(٣١٢) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم، ٨٤/٣ ؛ابن الأثير: الكامل، ١٢١/٧ ؛سهيل زكار: في التأريخ العباسي والأندلسي، ١٧٣.

(٣١٣) احمد كسروي: شهر ياران گمنام، ١٦٨/٢-١٧٢ ؛حسين حزني: كوردستاني موكريان، ٢٤٤-٢٥٠؛ حسام الدين علي غالب: آذربيجان، ص١٤٢.

(٣١٤) علاء عبدالعزيز ابو زيد: الدولة العباسية من التخلي عن سياسات الفتح الى السقوط، ص٦٩.

پارێزراو بێت و بەدوورین لە ئاشوب و شەڕ و کوشتار شارەکەیان دا بەدەستەوە.[٣١٥]

بەڵام لە ڕووکاری خۆرئاواوە ئەو نێوچانەی کە هاوسنوور بوون لەگەڵ بوەیهییەکاندا و هەردوو میرنشینی حەسنەوەیە و عەننازی لە خۆرئاوای هەرێمی چیاکاندا دەرکەوتن و گەشەیانکرد، دەسەڵاتی میرنشینی حەسنەوەیە (٣٤٨-٤٠٦ك/٩٥٩-١٠١٥ز) پەلی بۆ نێوچەیەکی فراوان هاویشت، بەتایبەت لەو ماوەیەی کە هێزی میرنشینەکە لە ئاستێکی باڵادا بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی (٤ك/١٠ز)دا. لەو شارانەی لەژێر سایەی میرنشینەکەیاندا بوو: "الدینور، همدان، شهرزور، شاپورخواست، بروجرد،* نهاوند، وأسد آباد)"** وە لە باشووریشەوە قەڵەمڕەوی فەرمانڕەواییان بە نێوچەکانی ئەهواز (خۆزستان)*** درێژ ببۆوە،[٣١٦] هەرچی قەڵا و قوڵلەیەك کە دەکەوتنە ئەو نێوچانەوە هەموویان لە چوارچێوەی دەسەڵاتی میرنشینی حەسنەویەدا بوون.[٣١٧] بەڵام میرنشینی (العنازیة)- (٣٨١- ٥١١ك/٩٩١-١١١٧ز)[٣١٨] لە نێوچەی حولوان[٣١٩]

---

(٣١٥) منجم باشي: جامع الدول، باب في الشدادية، ص٢.

* بروجرد (بروگرد): ئەم شارە دەکەوێتە ناوچەی لورستان، و سەر بەهەرێمی چیاکانە، پێتەختی دووەمی (ماهی بەسرایە)، دەکەوێتە نزیك هەمەدان. (قدامة بن جعفر: الخراج و صناعة الكتابة،١٧٢؛ ابن عبد الحق: مراصد الاطلاع،١٨٩/١).

** أسد آباد: دەکەوێتە نێوان کەنگاور و همدان، شارێکی ئاوەدانە و ڕێژەی دانیشتوان و هەروا بەرهەمی زۆرە، (٥٤كم) لە همدانەوە دوورە.( الأصطخري: المسالك و الممالك، ص١١٥؛ ابن حوقل: صورة الأرض، ص٣٠٦).

*** خوزستان: ولایەتێکی بەرباڵوە لە ڕۆژئاواوە سنوری دەگاتە عێراق و لە باکورەوە بە ناوچە کوردیەکان و لە ڕۆژهەڵاتەوە بە ناوچەی فارس. (امین احمد رازي: هفت اقليم، تصحيح وتعليق جواد فاضل (كتاب فروش على علمي)، د-ت،ج١/ص٢٥٩).

(٣١٦) بڕوانە: (حسام الدين علي غالب: الكرد، ص ص١٣٠، ١٩٥).

(٣١٧) ابن الجوزي: المنتظم،٢٧/٧؛ ابن الأثير: الكامل،٢٧٤/٧ ؛ سبط ابن الجوزي:مرآة الزمان،٣٨٨ ؛ابن كثير: البداية والنهاية،٣٧٧/١١/٦ ؛ البدليسي: الشرفنامه، ٣٨.

(٣١٨) بڕوانە (حسام الدين علي غالب: الكرد، ١٣٠، ١٩٥).

(٣١٩) الحميري: الروض المعطار في خبر الاقطار، تح: احسان عباس، دار القلم للطباعة، ١٩٥.

سەری هەڵدا لەناو خێڵێکی شاژنجانی کوردیەوە، سنووری دەسەڵاتی ئەو میرنشینە لە ڕۆژگاری بوژانەوەی سیاسیاندا، نێوچەیەکی فراوانی لە خۆرئاوای هەرێمی چیاکان گرتبۆوە، بەتایبەت دوای کەوتنی میرنشینی حەسنەویە (٤٠٦ك/ ١٠١٦ز)، بەجۆرێك قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان درێژبۆوە تا گەیشتە هەندێ نێوچەی سەر بە حەسنەویەکانیش لە شارە گرنگەکانی ئەو میرنشینە، "حولوان، الدینور، قرماسین، أسد آباد، شهرزور، الصیمرة،* الصامغان، داقوقا، خانیجار، خانقین، بندنیجین، الدسکرة"** و ئەو نێوچانەش کە دەکەونە نێوانیان لە قەلا و یەکەئیداریەکان (الوحدات الأداریة)(٣٢٠) ئەم پێگە جوگرافیەیان هەردوو میرنشینەکەی ناچارکرد کە جۆرێك پێوەندی و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بوەیهییەکاندا ببێت کە زۆربەی جار ئەو پێوەندیانە شەقڵێکی دیبلۆماسییان لەخۆ گرتبوو، بەهۆی چاکی پێوەندی سەرکردە کوردەکان لەگەڵ بوەیهییەکاندا لەو هەرێمانە و لەسەرەتادا کە چەند بەرژەوەندیەکی هاوبەش پێکەوەی گرێدابوون، ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو تاڕادەیەك لە مەترسی دەستتێوەردانی بوەیهییەکان لە کاروباری میرنشینەکانیاندا نەبوون، بەمەش بوارێکی باشیان بۆ ڕەخسا تا گرنگی بدەن بە نێوچەکەیان و دەسەڵاتیان گەشە پێبدەن.(٣٢١)

---

* الصیمرة: ئەم شارە دوو قەڵای هەیە، نزیکەی (٧٠کم) لە شاری سیروانەوە دوورە، خانووەکانی لە گەچ و بەرد دروستکراون. (ابن مهلهل: الرسالة الثانیة، تح. بطرس بولغاکوف وانس خالدوف، دار النشر والاداب الشرقیة، موسکو،١٩٦٠،ص٢٣؛ الأصطخري: المسالك و الممالك، ص١١٦).

** الدسکرة:- لە هەرێمی ڕەشە خاکە (ارض السواد)، شارێکی زۆر کۆنە و دەگەڕێتەوە سەردەمی کیسرای یەکەم، ناوچەیەکی ئاوەدان و شورایەکی هەبووە، کە بە بەهێزترین شورای ئاسیای خۆرئاوا دادەنرێت. (الیعقوبي: کتاب البلدان،٣٦ ابن خرداذبة: المسالك و الممالك، ٢٢٦).

(٣٢٠) حسام الدین علی: الکرد، ١٩٥؛ k.m. ahmad annazids (encra) (London:١٩٨٥) p.٩.

(٣٢١) مسکویه: تجارب الأمم،١٣٩/٢-١٤٠؛ ابن الأثیر: الکامل،٢٣٥/٦؛ ابن خلدون: العبر،١٠٩٤/٥/٤.

بەڵام دەسەڵاتی میرنشینە کوردیەکان بەرتەسك بۆوە، بەرە بەرە لە ڕووکاری خۆرهەڵات و خۆرهەڵاتی باشوورەوە کە بەدرێژایی پێنج سەدە فەرمانڕەواییان درێژەی هەبوو هەر لە سەدەی (٥ك/١١ز)یەوە، ئەویش لە ئەنجامی هێرش و پەلامارەکانی خێڵە کۆچەریە شاخاویەکان و خۆرهەڵاتیە یەك بەدوای یەکەکاندا وەك، بوەیهییەکان و سەلجوقیەکان و مەغۆلەکان و...هتد.

لەلایەکی ترەوە، ئەوەی لێرەدا جێگەی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کە سەرجەم سەرچاوە پێوەندارەکان زانیاری تەواویان سەبارەت بە دیاریکردنی سنووری کوردستانی ئیتنی (عرقي- قومي) تێدانیە، چونکە ڕووبەری خاکی کوردستان و شوێنی نیشتەجێبوونی کورد گەلێك لەوە بەرفراوانترە کە لەو سەرچاوانەدا باسکراوە.

پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین، کورد بە حوکمی پێگەی جوگرافی وڵاتەکەیان و سەرهەڵدانی دەیلەمیەکان و گەمارۆدانی لە هەرچوارلاوە کە ئەمە تەنها دوایین هۆکارنەبوو بۆ ڕابوون و بوژانەوەیان، بەڵکو وای لێکردن بیرێك لە حاڵی خۆیان بکەنەوە، بەئاسانی دەرك بکەن بە نەبوونی جیاوازیەکی ئەوتۆ لە نێوان خۆیان و بوەیهی دا کە توانیان بوونی خۆیان لە نێوچەکەدا بەباشی بچەسپێنن، بەم جۆرە ئەو فاکتەرانە مەیسەربوون کە پاڵ بەکوردەوە بنێن بۆئەوەی دەست بگرن بەسەر نێوچەکانی خۆیان و بەشارەزاییەکی وردەوە بەرە بەرە و لەژێر سەرکردایەتی چەندین سەرکردەی لێهاتوودا دەستیان کرد بە دامەزراندنی دەسەڵاتی خۆیان لەسەر زێدی ڕەسەنی خۆیان.[٣٢٢] لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین سروشت و پێگەی جوگرافی ئەو نێوچانەی میرنشین و دەسەڵاتە کوردیەکانی لێ پەیدابووە ڕۆڵی کاریگەری هەبووە لە سازکردنی زەمینەیەکی لەبار بۆ دەرکەوتن و سەرهەڵدانی میرنشینە کوردیەکان بەجۆرێك لە سەردەمی بوەیهییەکان وڵاتی کورد چەندین میرنشین و دەسەڵات و

---

(٣٢٢) M.A.(Shaban)، Islamic History (Cambridge:١٩٧٦) Vol،٢،PP.١٧٣-١٧٤.

سەرکردایەتی خێڵەکی سەربەخۆی لەخۆ گرتبوو، هەندێکیان گەیشتبوونە قۆناغی پێگەیشتن و هەنگاوی بوێرانەیان بەرەو سەربەخۆیی نا تارادەی لێدانی سکە (پارە)ی تایبەت بەخۆیان و راگەیاندنی وتارەکان، ئەم دوو هەنگاوە، دوو دیاردە بوون لە سەربەخۆبوونی دەوڵەتان و میرنشینەکان لە سەردەمی ئیسلامیدا.[٣٢٣]

بێگومان ئەو سیاسەتە لامەرکەزیەی کە بوەیهییەکان گرتیانەبەر رۆڵێکی بەرچاوی لەو بارەیەوە هەبوو. بەتایبەت لە ولاتی کورددا کە کۆنترۆڵکردنی بەشێوەیەکی راستەوخۆ زۆر زەحمەت بوو یاخود بەرێوەبردنی بەشێوەیەکی مەرکەزی کارێکی ئەوتۆ بوو کە بۆیان مەیسەر نەدەبوو.[٣٢٤] ولاتێك بوو کەنە "سولتانە مەزنەکان و خاقانە بەرێزەکان"، وەك شەرەفخانی بەدلیسی تەئکید دەکاتەوە، جورئەتی ئەوەیان نەبوو "دەستی داگیرکردن درێژ بکەن بۆی، بەڵکو تەنها بە وەرگرتنی دیاری و سەرانە لە دانشتوانەکەی رازی دەبوون، بۆیە بە سەربەخۆیی و دوور لە ژێردەستەیی هیچ دەوڵەتێك لە دەوڵەتان مایەوە".[٣٢٥] لاوازی خیلافەتی عەبباسی و سیاسەتی لامەرکەزی بوەیهییەکان، فاکتەر بوون بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێك لە میرنشینی سەربەخۆ و نیمچە سەربەخۆدا،[٣٢٦]هەندێك لەو میرنشینانە بەپێی پێگەی جوگرافیان بەهێزبوون و لە نێوچەکانی دەسەلاتیان خۆیان سیاسەت و ئەرکی میرنشینەکەیان رادەپەڕاند، لەپاڵ بلاوکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لە قەلاو سەنگەر و قوللە و گوندی چیایی و رێوشوێنی سەربازی لە تەواوی نێوچەکانی ولاتی کوردا.

تۆپۆگرافی (ولاتی کورد) کوردستان وای لە شێواز و هۆکانی سەنگەربەندی (التحصین) کردەوە کە جیاوازیان هەبێت بەگوێرەی جیاوازی هەڵکەوتەی جوگرافی

---

(٣٢٣) بڕوانە بەشی دووەمی ئەم توێژینەوە لە وتار و سکە لێدان.

(٣٢٤) محمد جمال الدين سرور: تاريخ الحضارة الأسلامية في الشرق،٨٦-٨٧.

(٣٢٥) الشرفنامة،٢٨.

(٣٢٦) المسعودي: مروج الذهب،١٣٥/٢ ؛المقريزي: السلوك،١٠١/١.

شارەکان،[٣٢٧] بەگوێرەی گرنگی شارەکە و رادەی مەترسیەکانی رووبەڕووی دەبێتەوە و گرنگی پێدانی دەسەڵاتداران و سروشتی شوێن و پێگەکەی.[٣٢٨] ئەمانە و سەرەڕای گەشەکردنی ئابووری و بازرگانی شارەکە لەگەڵ سەقامگیری ئیداری، ئەمانەش لە فاکتەرە هاندەرەکان بوون لە پرۆسەی سەنگەربەندیدا وەك:- درووستکردنی قەڵا و سەربازگەکان و سەنگەر و بەربەستی ناوخۆ.[٣٢٩] موسڵمانەکان لە سەرەتای هێرشەکانی فەتحی ئیسلامیدا بایەخیان بەجەنگاوەران دەدا، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا،[٣٣٠] و زیادبوونی هێرشەکانی رۆمی بیزەنتی، خیلافەتی ئیسلامی بەتایبەت عەبباسی دەستی کرد بە چاکردنەوە و تۆکمەکردنیان بۆ بەرگرتن لەو هێرشانە، بەتایبەت لە نێوچەکانی (الثغور) کە هەندێ لەتوێژەرەوان بەزاراوەی (سەنگەرەکانی پێشەوەی ئیسلام) ناویان دەبرد.[٣٣١] لەگەڵ ئەوەشدا ئەم مەسەلەیە ئەوە ناگەێنێت کە قەڵا و شارە کوردیەکان هەموو کاتێك لە هەموو سەردەمەکانی ئیسلامدا بەهێز بووبن، بەڵکو ئەوانیش و سەنگەربەندیەکانیش بەگوێرەی رەوشی سیاسی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بەتایبەتی لە جەنگە ناوخۆیی و دەرەکیەکاندا کە روویان دەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێگەی جوگرافیان ئاسانکاری بۆ کردن لە دامەزراندنی میرنشینەکانیاندا، هەروەها لاوازی خیلافەتی عەبباسی و جیابوونەوەی هەرێمەکان لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا لە مەرکەز، ئەویش فاکتەرێکی دیکە بوو لە سەرهەڵدان و گەشەکردنی دەوڵەت و میرنشینە کوردیەکان. کە نیشانەی جیابوونەوەیان لە جەستەی خیلافەتی عەبباسی، بەشێوەیەکی ئاشکرا لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی (٤ك/١٠ز) دەستی پێکرد، هەندێ لەوانەی کە ئارەزووی جیابوونەوەیان هەبوو لە هەوڵی

---

(٣٢٧) جمال حمدان: جغرافية المدن،١٧٩.

(٣٢٨) عبدالرزاق عباس حسين: نشأة مدن العراق و تطورها،٦٢.

(٣٢٩) محمد جاسم حمادي: الجزيرة الفراتية والموصل،٣٨١-٣٨٢.

(٣٣٠) الأزدي: تاريخ الموصل، تحـ: علي حبية، القاهرة، ١٩٧١، ٢٥/٢.

(٣٣١) بلەج شيركو: القضية الكردية (ماضي الكرد و حاضرهم)، ٣٥-٣٦.

کارکردندابوون بۆ دامەزراندنی چەند کیانێکی سەربەخۆ لەسەر شێوەی ئەوانەی لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئیسلامی لەجەستەی خیلافەت جیاببوونەوە.[٣٣٢]

لەناو کوردیشدا هەوڵدان لەپێناو بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا سەری هەڵدا، ئەوەبوو چەندین میرنشینی میراتگیری کوردی درووست بوون. و یەکەم میرنشینی کوردی لە سەردەمی عەبباسی بە نێوی (العیشانیة) لە نێوچەی شهرزور لە نێو ساڵانی (٣٠٠-٣٥٠ك/٩١٢-٩٦١ز) دامەزرا.[٣٣٣] ئەو میرنشینە کوردیانەی باسمانکردن لەچوارچێوەی پێگەی جوگرافی هەرێمە کوردیەکاندا دەشێ بەگیانی سەربەخۆ دابنرێن کە لەسەر بنچینەیەکی بەهێز لە دەسەلات دامەزرابوون لە نێوچەکانیاندا و چەندین هێزی سیاسی گەورە لە هەردووك سەردەمی بوەیهی و سەلجوقی لە جیهانی ئیسلامیدا درووست بوون کە هاوکات بوون لەگەڵیاندا و گەلێ پێوەندی فرەلایەن لە نێوانیاندا درووست ببوو، بەتایبەت پێوەندیە دیبلۆماسییەکان کە ئێمە ئەو بابەتەمان گەرەکە قسەی لەسەر بکەین. سەرباری ئەو میرنشیانە، لەولاتی کورد و قەلا و سەنگەرە زۆرەکانی چەندین سەرکردایەتی خێڵەکی نیمچە سەربەخۆ بلاوبوونەوە کە نەگەیشتبوونە ئەو رادەیەی بتوانن میرنشینی سەربەخۆ بەدەست بێنن، و لەدیاریترینی ئەو قەوارە و سەرکردایەتیە خێڵەکیانەدا، جاوانی[٣٣٤] و هەکاری و حمیدی و بشنوی بوون، لە کۆتایی سەدەی چوارەمی کۆچی دەیەمی زایینی پەیدابوون و توانیان میرنشین بۆ خۆیان درووست بکەن، و سەرکردەکانیان بە نازناوی میر (الأمیر) ناودار بوون.

---

(٣٣٢) جرجي زيدان: تاريخ التمدن الأسلامي، ج٣/ص٤٤٦-٤٤٧.

(٣٣٣) ابن مهلهل: الرسالة الثانية، ص٥٨؛ مسكويه: تجارب الأمم،ج٢/ص١٩٨؛ ياقوت الحموي: معجم البلدان،٣/٣٧٥-٣٧٦.

(٣٣٤) المسعودي: مروج الذهب،١٣٥/٢؛ مصطفى جواد: جاوان القبيلة الكردية المنسية، ص٧-١٠؛ آواز محمد علي عبدالكريم: الكرد- الجاوانية، رسالة ماجستير، مقدمة الى كلية الآداب، جامعة دهوك، ٢٠٠٢.

# ناكۆكی و ململانێی نێوان میرنشینه كوردیه‌كان و كاریگه‌ری له‌سه‌ر پێوه‌ندییه دیبلۆماسییه‌كان

ئه‌و كێشانه‌ی كه له نێوان فه‌رمانڕه‌وایانی میرنشینه كوردیه‌كاندا، هه‌بوون وایكرد كه له‌لایه‌ن ئاشتیخوازانه‌وه كۆمه‌ڵێك چاره‌سه‌ری ئاشتیانه بگیرێته‌به‌ر به مه‌به‌ستی دووركه‌وتنه‌وه له ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌یه‌كی چه‌كدارای و وه‌لانانی هه‌موو ناكۆكیه‌كان و چاره‌سه‌ركردنی كێشه‌كان به‌شێوه‌یه‌كی ئاشتیانه و دپلۆماسیانه، له‌ڕێگه‌ی ئه‌و پێوه‌ندییه دیبلۆماسییانه‌ی كه له نێوانیاندا هه‌بوو.

له‌به‌ر ڕۆشنایی ئه‌و سنووره جوگرافیاییه‌ی كه‌وتبووه ژێر ڕكێفی ده‌سه‌لاتی كورده‌وه له‌و سه‌رده‌مه‌دا كه هه‌ندێكیان له‌شێوه‌ی میرنشیندا بوون له نێوچه‌كانی كوردستاندا و سه‌ره‌ڕای سروشتی ڕێكخستنی سیاسی پێكهاته‌ی سیستمی ده‌ره‌به‌گێتی زه‌وی و زاره‌كان و كۆنه‌بوونه‌وه‌ی هێزه‌كانیان بۆ به‌ره‌نگاربوونه‌وه‌ی هه‌موو ده‌ستدرێژییه‌كی ده‌ره‌كی كه ده‌كرایه سه‌ریان، ده‌توانین بڵێین كورد چه‌ند پێویستی به دروستبوونی ولاتێكی یه‌كگرتوو هه‌بوو بۆ پاراستنی خۆی كه ئه‌مه‌ش خه‌ونێكی له مێژینه‌و به‌رده‌وامی كورده تا ئێسته، به‌لام چه‌ندین هۆكار دروست بوون بۆ یه‌ك نه‌گرتنی ئه‌م ولاته، له‌وانه‌ش ناكۆكی نێوان ده‌سه‌لاتدارانی كورد و جیاوازی له به‌رژه‌وه‌ندییاندا كه به‌درێژایی مێژوو هه‌بوو، ئه‌مه‌ش وایكرد كه هه‌ریه‌كه‌یان له‌دژی ئه‌وی دیكه په‌یوه‌ندی دیبلۆماسی له‌گه‌ڵ ولاتانی دیكه‌دا ببه‌ستێت.

هه‌ڵبه‌ت ئه‌مه‌ش كاریگه‌ری زۆری كردبووه سه‌ر هه‌ڵوێستی هێزه‌كانی ده‌روبه‌ر و ده‌سه‌لاتی سیاسی خیلافه‌تی ئه‌و كاته، بۆ زانینی ئه‌و ناكۆكیانه پێویسته تێبگه‌ین كه سروشتی ئه‌و گۆڕانكارییانه‌ی به‌سه‌ر پێوه‌ندی نێوان كوردا هاتووه چییه. لێره‌وه ده‌توانین ئاماژه به‌و بارودۆخه بده‌ین كه وایكردبوو ئه‌و ناكۆكیانه له نێوان

دەسەڵاتدارانی کـوردا درووسـت ببـێ. حکومـەتی شـەدادی بـەپێی ئـەو هەلکەوتـە جوگرافیەی تیا دامەزرا، و بەو پێیەی لە نێوچەیەکی دووردەستی دەوڵەتی عەبباسی و لەبارودۆخی لاوازی دەوڵەتەکـە و لەبەرامبـەر سـنووری چـەندین هێـز و دەوڵـەتی دژ بەدەوڵەتی عەبباسی دامەزرا، بارودۆخێکی جیاواز لەسەرجەم حکومـەت و میرنـشینە کوردییەکانی دیکەی هەبوو، لەلایەکەوە خودی دامەزراندنی حکومەتەکە لەسەردەمی لاوازی فەرمانڕەوای ئازەربایجان و بـەدیلگیرانی فەرمانڕەواکـەیان (سـالاری مـەرزبان) دەکەوت و سەری هەڵدا،[335] هەروەك پێشتر ئاماژەی پێـدرا، پاشـان ئـەو شـەڕەی لـە نێوان (سالاری مەرزبان) پاش ئازادبوونی لە زیندان و (محمـد بـن شـداد) لـە سـاڵی (٣٤٢ك/٩٥٧ز) ڕوویدا[336] بەجۆرێك لە پێوەندی شەڕی نێوان دوو دەسەڵاتی کـوردی و دوو هاوسێیەك دەژمێردرێت، بەڵام ئەو جۆرە پێوەندیـەش پـاش چـەند سـاڵێك لـەو

(٣٣٥) سالاریەکان یاخود (بنو مسافر) دەیلەمی بوون، واتە کورد نەبوون کە محمد ئەمین زەکی دەیانکات بە کورد. ئەمین زەکی بە هەڵە چووە، کە دەڵێت حکومەتی سالاری لە نێو ساڵانی ٣٣٠-٤٩٠ك فەرمانڕەوای ئازەربایجانی کردووە، راستیەکەی خاوەنی ئازەربایجان (السالار مرزبان بن مسافر) لە نێوان ساڵانی ٣٣٠-٣٤٦ك /٩٤٢-٩٥٧ز فەرمانڕەوایی کردووە، (ابن حوقل: صوره الارض، ص٢٩٠، ٣٠٣) لە ساڵی ٣٢٧ك (السالار مرزبان) بە دیل گیرا و لە قەڵای سمیرم زیندانی کرا (احمد کسروی: شهریاران، ج٢/ص١٦٢-١٦٣)، لە ساڵی ٣٤٢ك/ ٩٥٧ز ئازادکرا، دوای ئەو فەرمانڕەوای ئازەربایجان کەوتە دەست (ابراهیم بن مرزبان) کە ئەویش ساڵی ٣٧٠ك یاخود ٣٧١ك لە لایەن (ابوالهیجاء الحسین بن محمد الروادی)ەوە بەدیل گیرا. کە توانی زۆربەی ناوچەکانی ئازەربایجان بخاتە ژێر فەرمانڕەوای خۆیەوە.(احمد کسروی: شهریاران،١٦٣/٢) ابراهیم بن مرزبان ساڵی (٣٧٣ك/٩٨٣ز) کۆچی دوایی کرد. هەندێ ناوچەی ئازەربایجان لەژێر فەرمانڕەوایی (مرزبان بن اسماعیل بن وهسوزان)مایەوە کە سەر بە (بنو مسافر) بوو، کە (ابو الهیجاء الروادی) ساڵی ٣٧٤ك/٩٨٤ز بە دیلی گرت. بەم گرتنە ابوالهیجاء توانی پارچەکانی دیکەی ئازەربایجان بخاتە ژێر فەرمانڕەوایی ئەو. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە حوکمڕانی سالاری یاخود بنو مسافر لە ساڵی ٣٣٠ك دەست پێدەکات و ساڵی ٣٧٤ك کۆتایی پێدێت.( احمد کسروی: شهریاران،١٦٤/٢)، بۆ زیاتر زانیاری بروانە (حسام الدین علي غالب: اذربیجان، ص١٣٧-١٣٨).

(٣٣٦) منجم باشی: جامع الدول،٦.

ڕووداوانە ڕووی لە باشی کرد، سالاریەکان متمانەیان بە (فضلون بن شداد) کرد و وەك فەرمانڕەوای شاری گەنجە ناسیان[٣٣٧] کە دواتر کرایە پێتەختی دووەمی حکومەتی شەدادی، لەمەوە دەگەینە ئەوەی کە پێوەندی نێوان (شەدادی و سالاری) لە دووڕیانی شەڕ و ئاشتیدا درێژەیی کێشاو بەپێی ئەوەی هەردوولا هەوڵی یەکخستنی تواناکانیان بۆ لێدانی هێزەکانی بەرامبەریان و دوژمنانیان بدەن تا یەك لەدوای یەك تێکشکان.

خیلافەتی عەبباسیش کە لە نێوان سالانی (٣٣٤-٤٤٧ك/٩٤٥-١٠٥٥ز) کەوتبووە ژێر کاریگەر و دەسەلاتی (بوەیهییەکان). بوەیهییەکان دەستیان کرد بە دەستێوەردانی کاروباری هەردوو میرنشینی بەنو حەسنەویە و بەنو عەنناز، ئەم دەستێوەردانەش لە سالی (٣٥٩ك/ ٩٦٩ز)دا دەردەکەوێت کاتێك (رکن الدولة) هەلمەتێکی کردە سەر (حسنویە) بەسەرکردایەتی (ابن العمید) بۆ تۆلەسەندنەوەی ئەو هەلسوکەوتە خراپەی نواندی بەرامبەر (سهلان بن مسافر الکوردی)ی فەرمانڕەوای نەهاوەند کە سەر بە بوەیهییەکان بوو، هەروەها بەهۆی هەولەکانیەوە بۆ فراوانکردنی سنووری مەملەکەتەکەی و ڕێگرتن بە کاروانەکان و سەندنی باج لێیان،[٣٣٨] (عضد الدولة)ش مردنی (حسنویە)و ناکۆکیەکانی نێوان کوڕەکانی بەهەل زانی و دەستی گرت بەسەر مال و گەنجینە زۆرەکانی (حسنویە)دا، لەهەمان کاتیشدا دەستی کرد بە کوشتنی هەموو کوڕەکانی جگە لە (بدر)، کە جل و بەرگی دەسەلاتی پێ بەخشی و کردی بەسەرکردەی کوردەکانی بەرزیکانی،[٣٣٩] بەم شێوەیە جارێکی دیکە (عضد الدولة) دەستێوەردان و دەسەلاتی خۆی دەرخست بۆ بەڕەواکردنی میرنشینەکە و دواتر بۆ جاری دووەم لەسەردەمی (بهاء الدولة)دا بڕیاریدا بەدانانی (بدر بن حسنویە) بۆ بەڕێوەبردنی

---

(٣٣٧) منجم باشی: هـ. س، ٧-٨؛ احمد کسروی: شهریاران، ٢٧٦/٣.

(٣٣٨) حسام الدین علي غالب: الکرد، ٢٦٢.

(٣٣٩) مسکویة: تجارب الأمم، ٢/ ٤١٦؛ الروذراوري: ذیل، ٣/ ١٠؛ حسام الدین علي غالب: الکرد، ص١٤٣-١٤٤، ٢٦٢-٢٦٣.

مولّکەکانی، و لە سالّی (٣٨٨ك/ ٩٩٨ز)دا جل و بەرگێکی دەسەلاّتی جوانی بۆ نێرراو نازناوی (ناصر الدين الدولة)ی لێنرا.[٣٤٠]

ئەو پێوەندییەی کە لە نێوان (بدر بن حسنويه)و میر (بهاء الدولة)دا زۆر باش و دیپلۆماسی بوو و یەکەم هەولّدانی ئەم پەیوەندییە رزگارکردنی بدر بۆ (بهاء الدولة) و سوپاکەی بوو لە مردن کاتێك کە لەلایەن (أبو الفتح بن العميد) سالّی (٣٨٧ك/٩٩٧ز)ەوە گەمارۆدران.[٣٤١]

میر (بدر بن حسنويه) هەردەم هەولّی دەدا بیر لەوە نەکاتەوە پێوەندییەکانی لەگەلّ (بها و الدولة)دا بپچرێنێ. بەلاّم کاتێ کە وەزیرەکەی (بها و الدولة) (علی بن أبو جعفر الديلمي) (أستاذ هرمز) کە بەپێشەوای سوپا ناسرا بوو، هەستا بەدانانی (ابو الفتح محمد بن عناز) کە سەرۆك عەشیرەتی شاژنجانی کوردبوو بۆ پاراستنی رێگای خوراسان،[٣٤٢] کە بەغداد دەبەستێتەوە بەهەمەدان، و دوای مردنی پارێزەری رێگە (قلج). میر (بدر بن حسنويه) وای هەستدەکرد کە ئەم کارە دژی ئەو کراوە، چونکە دوژمنایەتیەکی زۆر هەبوو لە نێوان ئەو و عنازی کوڕی دا، بەهۆی ئەو ڕکابەرییەی کە لە نێوانیاندا هەبوو لەسەر هەندێ نێوچەکە تێکەلّی نێوان دەسەلاّتی هەردوو میر دەبووەوە، هەربۆیە لەو ڕووەوە دەستی بەچەند کارێك کرد، یەکەمیان یارمەتیدانی (أبو العباس بن واصل)[٣٤٣] خاوەنی (البطيحة)*کە لەفەرمانی (بهاء الدولة) دەرچووبوو،

---

(٣٤٠) ابن الأثير: الكامل،٥٢/٩ ؛ ابن خلدون: العبر،٤/ ٩٩٦.

(٣٤١) الروذراوري: ذيل تجارب الامم، ٢٩١/٣؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ص١٥٦.

(٣٤٢) ابن الأثير: الكامل، ٢٦٧/٥؛ ابن خلدون: العبر، ٥/٤/٤.

(٣٤٣) ابن الجوزي: المنتظم، ٥/ ٥٧؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ١١/ ٣٣٨.

* البطيحة: زەویەکی فراوانە لە نێوان (واسط و البصرة)، پەنداوگەی دیجلەو فوراتە، (نێوچەی زۆنگاوی ئێستەی عێراق دەگرێتەوە)، (الزمخشري: الجبال والامكنة والمياه، تحـ/ ابراهيم السامرائي، بغداد، ١٩٦٨، ٢٦).

(٣) هەزار سواری دایە و سوپاكەی پێ بەهێزكرد و بەرەو (بهاء الدولة) كشا بۆ بەرەنگاربوونەوەی.[٣٤٤]

دووەم بانگكردنی (أبو جعفر الحجاج بن هرمز) كە لای قلج دابەزیبوو لەلایەن پارێزەری ڕێگای خوراسان بوو و ئەوانەی كە لە ناكۆكیدا بوون لەگەڵ پێشەوای سوپا،[٣٤٥] و سوپایەكی بۆ ڕێكخست و هەندێ سەركردەی كوردیشی خستە نێو سوپاكەی لەوانە (هندی بن سعدی، أبو عیسی شاژی بن محمد، وّرام بن محمد الجاوانی)و داوای لێكردن بەرەو بەغدا بكشێن و گەمارۆی بدەن و كاتێ ئەم سوپایە نزیك بەغدا بووەوە میری هۆزی عەرەب (أبو الحسن علی بن مزید الاسدی)یش پێوەندی پێوە كردن كە ئەمیش پێوەندییەكانی لەگەڵ (بهاء الدولة) لە خۆزستان تێك چوو بوو. ئەمەش وایكرد كە ژمارەی ئەو سوپایەی گەمارۆی بەغدادی دا زیاد بكات و گەیشتە (١٠) دە هەزار سوار،[٣٤٦] بە (٦)كم لە بەغدا نزیك بوونەوە و بۆ ماوەی یەك مانگ گەمارۆی بەغدایاندا و خەریك بوو بەغدا بڕوخێ، بەڵام میر (أبو الفتح بن عناز) كە میرێكی كورد بوو بە پەلە فریای كەوت بەمەبەستی پارێزگاری لەبەغدا شان بەشانی پێشەوای سوپا كەوتە بەرگری كە پارێزگاری لەبەغدا دەكرد،[٣٤٧] وشكی و ئاولێبڕان پشتی حوشترەكانی شكاند، شكاندنی (أبو العباس بن واصل) لە ئەهواز لەشەڕێكدا لەگەڵ (بهاء الدولة) بووە هۆی بەهێزبوونەوەی (بهاء الدولة) و بەرزبوونەوەی وورەی سوپاكەی، و شكاندنی گەمارۆی بەغداد و كشانەوە لێی. و لە ئەنجامدا (ابو جعفر أبو عیسی) گەڕایەوە بۆ حولوان، و مزیدیش گەڕایەوە وڵاتی خۆی،[٣٤٨] لەلایەكی ترەوە میر (بدر

---

(٣٤٤) ابن الأثیر: ٥/٥٦٠؛ ابن كثیر: البدایة والنهایة، ٣٣٨/١١.

(٣٤٥) ابن الأثیر: الكامل: ٥٦٧/٥.

(٣٤٦) ابن الأثیر: الكامل: ٥٦٧/٥؛ ابن خلدون، العبر، ٥١٥/٤.

(٣٤٧) ابن خلدون، العبر، ٥١٤/٤.

(٣٤٨) ابن الأثیر: الكامل، ٥٦٧/٥؛ ابن خلدون، ٥١٥/٤، حسام الدین علي غالب: الكرد،١٥٨-١٦٠.

بن حسنويه) نەیدەتوانی دوژمن کارییەکانی (ابو الفتح بن عناز)و ڕکەبەری لەبیر بچێتەوە، وەك پەلاماردانی ماڵی یەکێك لە لایەنگرانی کە ناوی (جعفر بن عوام) بوو و گرتنی (ابو العباس بن واصل) کە لە ڕێگەیدا بوو پێوەندی لەگەڵدا پێوە بکات، و دایانە دەست (بهاء الدولة) و ئەویش بڕیاریدا کە بیکوژن،[349] یان بینێرن بۆ بەغداد بۆ پێشەوای سوپا بەو مەبەستەی نەکەوێتە دەست لایەنگرانی. ئەم کارانەش بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە بوو لە (ابو الفتح بن عناز) کە توانی دەست بەسەر موڵك و ماڵیدا بگری لە حولوان و کرماشان (قرماسین)،[350] بەڵام (أبو الفتح بن عناز) ڕای کرد بۆ موصل و پەنای بردەبەر (رافع بن محمد بن مقن) کە یەکێك بوو لەسەرۆك هۆزەکانی (بنو عەقیل)ی عەرەبی و نامەیەکی بۆ (رافع) نارد کە تیایدا باسی پەیوەندییە دیپلۆماسییەکانی دەکات لەگەڵ باوکیدا و گلەیی ئەوەی لێدەکات کە نەیارەکەی لەخۆی گرتووە و داوای لێدەکات کە دەری بکات تا پێوەندیەکانیان بگەڕێتەوە، بەڵام (رافع) وەك کارێکی مرۆڤایەتی و بنەمایەکی عەشایرانە ئەم کارەی ڕەتکردەوە. ئەمەش وای لە بدر کرد لە ساڵی (٣٩٧ك/١٠٠٦ز)دا سوپایەك بنێرێتە سەر (رافع) و موڵك و ماڵی (رافع) تاڵان بکات کە دەکەوتە دیوی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەوە دەستی بەسەر ماڵەکەیدا گرت،[351] و ماڵەکەی کە دەکەوتە (المطيرة)و قەڵای (البردان) کە سەر بە (رافع) بوو. هەمووی سوتاند و بیرەکانی پڕکردەوە بۆ ئەوەی کەس تیایدا نیشتەجێ نەبێ، و کاتێ ئەم هەواڵە ناخۆشە گەیشتە (رافع)، (أبو الفتح) درکی بەوەکرد کە ئەم بۆتە هۆی ئەم هەموو ناخۆشیە و دەستبەجێ موسڵی بەجێ هێشت و پێوەندی کرد بە پێشەوای سوپا لەبەغدا و داوای پارێزگاری لێکردن و ئەویش

---

(٣٤٩) ابن الأثير: الكامل، ٥٦٨/٥؛ ابن خلدون: العبر، ٥١٥/٤.

(٣٥٠) ابن الأثير: الكامل، ٥٦٨/٥؛ ابن خلدون: العبر، ٥١٥/٤.

(٣٥١) ابن الاثير: الكامل، ٥/ ٥٧٨؛ ابن خلدون: العبر، ٥١٥/٤، حسام الدين علي غالب: الكرد، ١٦٠-١٦١.

ڕێزی لێگرت و بەڵێنی سەرکەوتنی پێدا،[٣٥٢] بەڵام ئەوەی (بهاء الدولة) دوای ئەوەی کە رزگاری بوو (ابو العباس بن واصل) دوژمنە سەر سەختەکەی بوو ئەوەی لەبیر نەچوو بوو کە میر بەدر یارمەتی بۆ (ابن واصل)ی نارد بوو سوپایەکی بۆ داگیرکردنی بەغداد لەلایەن (ابو الفتح)ەوە ناردبوو داوای لە وەزیرەکەی خۆی کرد کە پێشەوای سوپا یارمەتی بدات بۆ سەرکەوتنی گێڕانەوەی موڵك و ماڵەکەی کە لەژێردەستی میر بەدردا بوو،[٣٥٣] لە ساڵی (٣٩٧ك/١٠٠٦ز)دا پێشەوای سوپا بڕیاریدا هەڵمەتێك رێك بخات و بیبات بەرەو وڵاتی (بدر بن حسنویه) و پارەیەکی زۆری خستە ژێر دەستی بۆ خەرجی سوپاکەی. لەکاتی گەیشتنی سوپاکە بۆ ناوچەی (جندیساپور) میر بدر نامەیەکی بۆ نارد و تیایدا هاتبوو "تۆ ناتوانی ئەوەی (بنو عقیل) دەستی بەسەردا گرتووە لەیەکە کارگێڕییەکان، لە نێوان ئەوان و بەغداد فەرسەخێکە و (واتا ٦کم) رێك کەوتن لەگەڵیان (ئاشت بوومەوە) ئەی تۆ چۆن دەتوانی وڵاتەکەم داگیربکەی و ئەوەی من هەمە لە موڵك و ماڵ تۆ نیتە".[٣٥٤] بەڵام میر (بدر بن حسنویه) دوو ڕێگە چارەی خستە بەردەمی بۆئەوەی یەکێکیان هەڵبژێرێ، یەکەم جەنگ (جەنگ و کەس نازانێ ئەنجامی بۆ کێیە، ئەگەر دۆڕام هیچ قازانجێکی بۆ تۆ نییە، چونکە من خۆم لە وڵات و شورای خۆم قایم کردووە و لەپارەی خۆم خەرج دەکەم)،[٣٥٥] بەڵام ڕێگەی دووەم باشترە (کە ئەویش ئەوەیە بڕێك پارەی بدەمێ کە تۆ و سەرکردەکەت پێی ڕازی بن و ئاشت ببنەوە)[٣٥٦] پێشەوای سوپا لەسەر ئاشتبوونەوە ڕازی بوو بەرامبەر بڕێك پارە کە میر بدر بیداتێ بۆ خەرجی سوپاکەی بەم شێوەیە میر توانی توانای

---

(٣٥٢) ابن الاثير: هـ. س، ٥/ ٥٧٨؛ ابن خلدون: هـ. س، ٤/ ٥١٥، حسام الدين علي غالب: الكرد، ١٦١.

(٣٥٣) ابن الأثير: الكامل، ٥٦٨/٥- ٥٦٩؛ ابن خلدون: ٥/ ٥١٤- ٥١٥.

(٣٥٤) ابن الأثير: الكامل، ٥٦٩/٥.

(٣٥٥) ابن الأثير: الكامل، ٥٦٩/٥.

(٣٥٦) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٧٠؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ص١٦١-١٦٢.

سیاسی و دیبلۆماسی خۆی دەربخات و میرنشینەکەی لە مالۆیرانی و کارەساتی جەنگ ڕزگار بکات، میر (هلال بن بدر) لەدایکێك بوو لەهۆزی (الشاذنجان) کە(أبـو الفـتح محمد بن عناز) سەرکردایەتی دەکرد و کـاتی خـۆی مـیر بـدر خواسـتبووی، سـەرەڕای پێوەندی ژن و ژنخوازی لە نێـوان ئـەم دوو هـۆزەدا، بـەلام کێبڕکێیـەکی عەشـایەری و کێشمە کێشمێك لە نێوانیاندا هەبوو لەسەر ئەو نێوچانەی لەژێر دەستیاندا بـوو،[٣٥٧] سەرەڕای بەکارهێنانی یاسای دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە لەلایەن میرەکـانی هـەردوو هۆزەکەوە، ئەمـەش بووە هۆی ئەوەی کە لەدوای لەدایك بوونی میر (هلال) دایکی دوور بخاتەوە و لەسەر وتەی ابن الأثیر (دووری و پەراگەندەی دڵ)[٣٥٨] کەوتـە نێوانیانـەوە و کوڕەکەی دیکە کە ناوی (ابو عیسی) بـوو بـەرێزتر بـوو لای و ئـەم دوورخـستنەوە و پشتگوێخستنە کاری کردە سەر میر (هلال) لەدواییدا و بووە گرێیەك لە پێوەندیەکانی لەگەڵ باوکیدا، ئەمـەش لەیەکێك لە گەشتەڕاوبیەکانیدا کە هاوڕێیەتی باوکی کـرد، دەرکەوت. ئەویش ئەوەبوو کە (هلال) شێرێکی بەبێ پرسـی بـاوکی بینـی و کوشـتی لەکاتێکدا کە (بدر شێرێکی بدیایە بەدەستی خـۆی دەیکوشـت)،[٣٥٩] ئەمـەش بـووە هۆی توڕەبوونی باوکی و پێی وت: "تۆ وادەزانی فەتحت کردووە، چی جیاوازی لە نێـوان شێرو سەگدا هەیە؟"[٣٦٠] میر بدر ئەم قسەیەی دا بەڕووی کوڕەکەیدا لەترسدا بوو لـە تووڕەبوونی، وەك ئەوەی (ابن الأثیر) باسی لێوە دەکات،[٣٦١] لەلایەکی ترەوە کاری کردە سەر دەروونی (هلال) و وای چاوەڕوان دەکرد کە باوکی دەست خۆشی لێ بکات، بەلام بە

---

(٣٥٧) الکامل، ٥/٥٦٧؛ ابن خلدون، ٥/٥١٤.

(٣٥٨) ابن الأثیر: الکامل، ٥/ ٥٨٠؛ پێ دەچێت میر بدر ژنێکی دیکەی هێنا کەوا بەلایەوە خۆشەویست و لەپێشتر بوو و کوڕێکی بۆ هێنا بەناوی (ابو عیسی) و هیچ سەرچاوەیەکی مێژووی بەتەواوی باسی ناویان نەکردووە.

(٣٥٩) ابن الأثیر: الکامل، ٥/٥٨٠.

(٣٦٠) ابن الأثیر: ٥/ ٥٨١.

(٣٦١) الکامل: ٥/ ٥٨١.

پێچەوانەوە کاری کردە سەر ئەوەی لە باوکی دوور بکەوێتەوە، لەگەڵ دەردەسەری بدر بۆ دایکی (هلال) هەر لەکاتی لەدایکبوونی (هلال)ەوە، ئیدی (بدر) گۆڕا و کەوتە کێبڕکێ و ڕق لێبوون و بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت لە کوڕەکەی، (الصامغان)ی پێ بەخشی و ئاگاداری کردەوە لەوەی کە خراپە نەکات بەرامبەر (أبن الماضي) کە حاکمی شارەزوور بوو و لەلایەن میر (بدر بن حسنویە)ەوە دانرابوو.[٣٦٢] بەڵام (هلال) زانی کە (الصامغان) نێوچەیەکی هەژار و بێ دەرامەتە لەچاو نێوچەکانی تردا وەك شارەزوور، و لە ترسی ئەوەی کە نەوەکو (أبو عیسی)ی برای دەست بگرێ بەسەر موڵك و ماڵی میرنشینەکەیاندا دوای مردنی باوکی و بۆ تۆڵەسەندنەوەی لە باوکی بەخۆی ئەو دوورەپەرێزییەی تووشی هات لەدوای لەدایك بوونیەوە و گەورەبوونی دوور لە باوکی و بەهۆیەوە زۆر هەوڵیدا زەفەر بە (ابن الماضي) بهێنێ و هەڕەشەی لێکرد کە خۆی تۆڵەی لێ بکاتەوە، بۆیە هەوڵی دەدا کەوا لە (گولاوپرژێن= القمقم) ڕزگاری بێت کە باوکی تێی خستبوو، سەرەڕای ئەوەی کە دوژمنەکانی میر (بدر) درکیان بەو دوورەپەرێزییەی نێوان (هلال و بدر)ی باوکیدا کردبوو.[٣٦٣] بە تێپەڕبوونی کات ئەم دوورەپەرێزییەوە بووە دوژمنکاری و هانی هلالیان دژی باوکی دەدا. وەزیر (الخطیر أبو علي) کە پێشتر ڕۆڵێکی باڵای گێڕا لەو کێشەیە و لە سەرەتای ساڵی (٣٩٢ك/١٠٠٢ز)دا هەوڵی دەدا پێوەندی بە (هلال) و میرەکانی دیکەی دەوروبەرەوە بکات بە مەبەستی درووستکردنی کێشە لە نێوان ئەوان و میر (بدر)دا،[٣٦٤] لە ڕاستیدا ئەمەش گەورەترین هۆ بوو وای کرد میر (هلال) دژی باوکی بوەستێ.[٣٦٥]

بەم شێوەیە هەوڵەکانی میر (بدر) بێ سوود بوو لەوەی وا لەکوڕەکەی بکات دەست

---

(٣٦٢) ابن الأثیر: الکامل، ٥/ ٥٨١؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٥.

(٣٦٣) هـ. س، ٥/٥٨٠– ٥٨١؛ هـ. س، ٤/ ٥١٥.

(٣٦٤) هلال الصابي: تاریخة، ٤/ ٤٥٣.

(٣٦٥) خواندمیر: تاریخ حبیب السیر في اخبار افراد بشر، ٢/ ٤٣٨؛ حسام الدین علي غالب: الکرد، ص١٧٢–١٧٣.

بەسەر شارەزووردا نەگرێ، سەرەڕای ئەوەی (ابـن الماضـي) ئامـادەبوو سـاڵانە (١٠٠) هەزار درهەم بدات بەو مەرجەی پەلاماری شارەزوور نەدات، بەڵام (هـلال) سـوپایەکی کۆکردەوە و ڕووی کردە شارەزوور و گەمارۆیـدا و تـوانی بـچێتە نێـو شـارەکە و (أبـن الماضي) کەسوکاری بکوژێ و دەستی گرت بەسەر موڵك و ماڵەکەیدا.[٣٦٦] ئەم کارەی (هلال) باوکی نیگەران کـرد و زۆر تووشـی دڵـەڕاوکێی کـرد و بڕیاریـدا ڕووبـەڕووی کوڕەکەی بوەستێتەوە و لەشوێنی خۆی رایگرێ، بەڵام (هلال) لەڕێی دابەشکردنی پـوڵ و پارەوە بەسەر سەرکردە و سوپاکەیدا توانی وردە وردە بەلای خۆیدا ڕایان بکێشێ، کـە ئەمەش بە پێچەوانەی میر (بەدر)ی باوکییەوە بوو کە مرۆڤێکی قرچۆك و دەسـتنوقاو بوو، و هیچ جۆرە یارمەتییەکی سەربازەکانی نەدەدا، تەنانـەت (أبـن خلـدون) وەسـفی دەکات دەڵێ "بِدر رەزیل و پیسکە بوو"[٣٦٧]، لەکاتێکدا وا پێویست بـوو پـارە خـەرج بکات تا خەڵکی بۆلای خۆی ڕابکێشێ، بەڵام خەڵك پشتی تێکرد و ڕوویان کردە (مـیر هلالی) کوڕی. وادیارە میر (بدر) لەڕووی داراییەوە لە (أبو جعفر) دەچێ لەلایەك پـارە بۆ کاری خێر و چاکە خەرج دەکات و لەلایەکی ترەوە دەیگێڕێتـەوە بەشـێوەیەکی کـەم کەم خەرجی دەکات. لە ساڵی (٤٠٠ك/١٠١٠ز)دا میر بـدر سـوپایەکی ڕێکخـست و کەوتەرێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگـەڵ مـیر (هـلال) لـە دەرگـای شـاری دینـەوەر.[٣٦٨] لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا بەشێکی زۆر لە سوپای (بدر) کە لە عەشیرەتی بـەرزیکانی بوون ڕایانکێشایە لای هیلال و تەرازووی هێز بەلای (هلال)دا کەوتەوە و سـەربازەکانی توانیان میر (بدر) بەدیل بگرن و بردیـان بـۆ لای (هـلال)،[٣٦٩] هەنـدێك لـە کەسـە نزیکەکانی (هلال) پێیان وت بیکوژێ بەرامبەر بەو کارانەی کە پێیان هەستاوە، بەڵام

---

(٣٦٦) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٨١؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٥.

(٣٦٧) العبر، ٤/ ٥١٥.

(٣٦٨) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٨١؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٥؛ البدليسي: الشرفنامة، ٣٨.

(٣٦٩) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٨١.

(هلال) چووه لای باوکی و پێی وت "تۆ میریت و من ڕێکخەری سوپاکەتم..".[٣٧٠] بە هەرحاڵ ئەو نەرم و نیانیەی کە (هلال) پیشانیدا بەرامبەر بە باوکی، بەڵام باوکی بە فڕوفێڵ و تەڵەکەبازی بەرەو ڕووی بووەوە ئەمەش لای (أبن الأثیر)[٣٧١] دەردەکەوێ کە دەڵێ: "باوکی فێڵی لێکرد و پێی وت: با کەس ئەمەت لێ نەبیستێ و هەموومان لەناو بچین، ئەم قەڵایە بۆ تۆیە و هێمای وەرگرتنی بەوشێوانەیە، و پارێزگاری ئەم موڵك و ماڵە بکە کە تیایدایە و تۆ میری، چونکە خەڵکی وا بەمانەوەی دەزانن..."، و دەمەوێ یەکێك لە قەڵاکانم بۆ جێبهێڵی و واباشە لای درازینە بێت، بۆئەوەی تیایدا خۆم تەرخان بکەم بۆ خواپەرستی، بەم شێوەیە (هلال) بڕێك پارەی پێدا بۆ خەرجکردنی و تێرکردنی پێداویستیەکانی.

کاتێ کە (بدر بن حسنویە) لە قەڵاکە جێگیر بوو دەستی کرد بە ئاوەدانکردنەوە و تۆکمەکردنی و دەستیکرد بە پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی و دەستوبردانە پێوەندی بە نەیارە کۆنەکەیەوە کرد کە ناوی (ابو الفتح محمد بن عناز) بوو کە گەورەی شاژنجان بوو و داوای ئاشتبوونەوە و هاوکاریکردنی لێکرد بۆ لەناوبردنی (هلال) بەرامبەر بەوەی دەست بەسەر موڵکەکەیدا بگرێ، لەهەمان کاتدا پێوەندی بە (أبو عیسی بن شاذی بن محمد) کرد کە لە (اسد آباد) دادەنیشت،[٣٧٢] و هەمان پێشنیاری پێشووی پێشکەش کرد و هەواڵی بۆ هۆزی الجورقان(گۆران)ی نارد کە هاوکاری بکەن، دوای ئەوەی کە خەڵکی هۆزی برزیکانی بەلای هیلالدا شکاندەوە.[٣٧٣]

---

(٣٧٠) ابن الأثیر: الکامل، ٥/ ٥٨١.

(٣٧١) الکامل، ٥/ ٥٨١.

(٣٧٢) ابن الأثیر: الکامل، ٥/ ٥٨١.

(٣٧٣) حسام الدین علي غالب: الکرد: ١٧٦.

بەڕاستی (أبو الفتح بن عناز) هێرشی کردە سەر قرمسین و دەستی بەسەردا گرت (أبو عیسی شاذی بن محمد) بەرەو شاپور خواست کشا بەمەبەستی بە تالانبردنی موڵك و ماڵی (هلال) و بەوتەی (ابن الأثیر) دەستی بەسەردا گرت.[٣٧٤]

لەگەڵ هۆزی (الجورقان)یدا قەڵای (شاپورخواست)ی بەتالان برد کە بە (دزبز) ناسراوبوو بەخێراییەکی زۆر سوپاکەی لە دینەوەرەوە بۆ (شاپورخواست) کەوتە ڕێ بەو هیوایەی ڕووبەڕووی (ابو عیسی) ببێتەوە و موڵك و ماڵەکەی لێ بسێنێتەوە، بەڵام کە (ابو عیسی) بەم کارەی (هلال)ی زانی دەست و برد نێوچەکەی بەجێ هێشت و ڕووی کردە (نهاوەند) کە ئەوکات لەژێر دەستی (أبو بکر بن رافع)دا بوو،[٣٧٥] (هلال) بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو دوای (أبو عیسی) کەوت و توانی چوارسەدکەس لە دەیلەمیەکانی بکوژێ کە لە نێوانیاندا (٩٠) میری تێدابوو، لەوانە (عبدالملك ماکان، اسماعیل الصعلوك، أبو العباس الحاجب)، هەر لەوکاتەدا (هلال) پێوەندی بە (أبن الرافع) کرد ئەمانەتی پێدا بەرامبەر بەوەی (أبو عیسی)ی بداتە دەستیەوە و دواتر توانرا (أبو عیسی) دەستگیر بکرێ، بەڵام (هلال) لێی بورد و کردی بە یەکێك لە نزیکەکانی خۆی،[٣٧٦] کە ئەمەش بەڵگەی دووربینی و سیاسەتمەداری (هلال) پیشان دەدات.

کاتێ (بدر بن حسنویە) هەواڵی ئەم سەرکەوتنانەی (هلال)ی کوڕی پێگەیشت دەستەبەجێ داوای یارمەتی لە میر بوەیهی (بهاء الدولة) کرد،[٣٧٧] و ئەمیش هەرزوو داواکەی جێبەجێ کرد. لەڕاستیدا بە پەرۆشەوە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەی دەکرد دەست بەسەر نێوچەکانی میرنشینی حسنویەدا بگرێت و هەموو موڵك و ماڵ و گەوهەرەکانی قەڵای

---

(٣٧٤) الکامل، ٥/٥٨١.

(٣٧٥) ابن الأثیر: الکامل، ٥/ ٥٨١.

(٣٧٦) ابن الأثیر: الکامل، ٥/ ٥٨١؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٥، حسام الدین علي غالب: الکرد،١٧٦.

(٣٧٧) ابن الأثیر: الکامل، ٥/ ٥٨٢؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٦.

شاپورخواست بگرێ و خێرا بریارِی بە (فخر الدولة)ی وەزیریدا کە سوپایەك ئامادەبکات و بەزووترین کات پێوەندی بە میر (بدر) لە شاپورخواست بکات.[٣٧٨]

کاتێ کە ئەم سوپایە گەیشتە شاپورخواست سەیریان کرد کەوتۆتە ژێر دەسەلاتی هلال و (هلال) بە (ابو عیسی)ی وت سوپای (بهاء الدولة) هاتووە و رِای تۆ چییە ئەویش ئاگاداری کرد کە رِای من ئەوەیە بەرەو رِوویان نەبیتەوە و گوێرِایەلّی بۆ (بهاء الدولة) پیشان بدەیت و هەولّبدەیت رِازییان بکەیت خۆ ئەگەر ئەم هەولّەش سەری نەگرت ئەوا بیان جەنگێنە و تەنگاویان بکە و لێیان دوورکەوەرەوە و ئەم کارەش چەند جارێك دووبارە بکەرەوە، چونکە ئەمان ناتوانن بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەگەلّتا لە جەنگا بن. چاکترە بیرت بەلای ئەوەدا نەچێت کە ئەم سوپایە وەك ئەو سوپایە نییە کە لە دەروازەی (نهاوەند) پێی گەیشتی و توانیت بەسەریاندا سەربکەوی "ئەو سوپایە چەندین جار لەلایەن باوکتەوە شکێنراوە".[٣٧٩]

بەلاّم (هلال) لە وەرگرتنی ئەم ئامۆژگارییانە کەوتە گومانەوە وتی "فێلّت لێکردم و ئامۆژگاریت نەکردم و ویستت درێژەی پێبدەیت بۆ ئەوەی باوکم بەهێز بێت و من لاوازبم و کوشتی"،[٣٨٠] و سوپاکەی خستەرِێ بۆ لەناوبردنی سوپاکەی (فخر الملك). و کاتێ کە سوپاکەی نزیك بووەوە و دنیا شەو بوو بەرەو رِووبوونەوەی (هلال) بووەوە (فخر الملك) تیپێکی بەجێ هێشت بۆ پارێزگاریکردن لەپشتەوە کە زەخیرە و خواردنی سوپاکەی تیابوو، و کە هلال چاوی بەو سوپایە گەورەیەی (فخر الملك) کەوت، لە کوشتنی (أبو عیسی) پەشیمان بووە و هەستی کرد کە ئامۆژگاریەکانی لەجێی خۆیدا بووە، بەلاّم کاتی پەشیمان بوونەوە نەمابوو.[٣٨١] کاتێ کە هەستی کرد ناتوانی بەرەو

---

(٣٧٨) ابن الأثیر: الكامل، ٥/ ٥٨٢؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٦؛ حسام الدین علي غالب: الكرد، ص١٧٧.

(٣٧٩) ابن الأثیر: الكامل، ٥/ ٥٨١.

(٣٨٠) ابن الأثیر: الكامل، ٥/ ٥٨٢؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٥.

(٣٨١) ابن الأثیر: الكامل، ٥/ ٥٨٢.

ڕووی ئەو سوپایە بوەستێتەوە یەکێکی ناردەلای (فخر الدولة) و پێی وت "من نەهاتووم بۆ شەڕ، بەڵکو هاتووم لێت نزیك ببمەوە و لەژێر فەرمانڕەوایی تۆدا بم".[٣٨٢]

(فخر الملك) پێی باش بوو ئەم پێشنیارەی قبوڵ بکات و یەکێکی ناردە لای (بدر بن حسنویه) تا پێشنیاری (هلال)ی پێ بگەیەنێ، بەلام (بدر) زۆر بەناشیرینی هەڵسوکەوتی لەگەڵ پەیامبەرەکەدا کرد و دەریکرد و ناردی بۆ (فخر الملك) و پێی وت کە "ئەمە فیلێکی هلالە، کاتێ بەلاوازی زانی و واباشە دەست لە گەردنی هەڵنەگریّ"،[٣٨٣] ئەو کاتە (فخر الملك) هەستی کرد کە چەندە دوژمنایەتی هەیە لە نێوان (بدر بن حسنویە) و (هلال)ی کوڕی و بڕیاری بۆ سوپاکەی دەرکرد کە هێرش بکەنە سەر سوپاکەی (هلال) کە نەیدەتوانی بەرەنگاری سوپاکەی (فخر الملك) ببێتەوە و خێرا بەدیل گیراو داوای لە (فخر الملك) کرد کە نەیداتە دەستی باوکیەوە. (فخر الملك) بەوە ڕازی بوو و هلالیش قەلاکەی شاپورخواستی، دایەدەست (فخر الملك) کە بەهۆیەوە دەتوانێ قەلاکە بکاتەوە،[٣٨٤] بەلام دایك و ئەو کەسانەی لە دەوروبەری بوون ڕەفزیان کرد کە قەلاکە بدەنە دەستەوە تا ئەمانەتیان لێ وەرنەگرن و (فخر الملك)یش ئەمانی پێدان و خۆی و هاوڕێکانی سەرکەوتنە سەر قەلاکە و دوای تالانکردنی و بردنی هەموو گەوهەر و ئەو شتە گران بەهانەی کە تیایدابوو "چل هەزار (بەدرە)* دەرهەم و چوارسەد (بەدرە) لیرە ئالتون و چەندین گەوهەر و جل و بەرگ و چەکی تێدابوو"،[٣٨٥] قەلاکە درایە دەست (بدر) بەپێی گێڕانەوەی (أبن كثير)، (بدر)

---

(٣٨٢) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٨٢.

(٣٨٣) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٨٢؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٥.

(٣٨٤) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٨٢.

* بەدرە کیسەیەکە لە پێستی بەرخۆلە درووست دەکرێت بۆ پاراستنی پارە. (الكرملي: النقود العربية و علم النميات، المطبعة العصرية، القاهرة، ١٩٣٩، ص١٤٤).

(٣٨٥) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٨٢؛ سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، ٢٩٦.

ده هەزار درهەم یاخود ده هەزار دینار لەخۆ دەگرێت، بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە قەڵاکە نزیەکەی (٤) ملیون دینار ئاڵتونی تیابووە کە پارەیەکی ئێجگار زۆر بووە بۆ ئەو سەردەمە.[٣٨٦] ئەگەر توانای کڕینی ئەو پارەیە بەهەند وەربگرین کە لەو سەردەمەدا هەبووە.[٣٨٧] (فخر الملك) ئەم پارەیەی برد و ڕووی کردە بەغدا و دوای ئەوەی کە (٧) هەزار (بەدرە)ی درهەمی دا بە (بدر بن حسنویە) نزیکەی چوار ملیۆن و حەوتسەد دینار و زیاتر لە سێ ملیۆن دیناری بۆ خۆی هەڵگرت[٣٨٨]، ئەوەی ماوەتەوە کە دەکاتە بیست و شەش ملیۆن دینار لای نزیکەکانی خۆی داینراوە. بەناوی خواستراوەوە تۆماری کرد و سەرەڕای ئەو پارەیەی کە لای هەریەکەیان بووە. گێڕانەوە هەیە دەربارەی چۆنیەتی دەرخستنی ئەم پارانە کە دەڵێ "دەرکردنی پارە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بووە، (أبو علي الرخجي) کە وەزیر بووە ئەم پارەیەی کە ئەمانەت بووە لای خەڵکی و (فخر الملك) لە قەڵاکەی (بدر بن حسنویە) زیاتر لە هەزار کیسە دیناری بۆ خۆی داگیرکردووە...هتد".[٣٨٩]

زۆری شتەگران بەها و گەوهەرەکانی شاپورخواست وای کرد کە میرەکان و وەزیرەکان هەڵەیان هەبێت بۆ دەستبەسەراگرتنی و زۆربەیان فریودا و بەشێوەی ئەفسانەیەك دەردەکەوێ، بۆیە شاعیرەکان زۆر بە (فخر الملك)یان هەڵدا کاتێ کە توانی دەست بەسەر ئەو قەڵایە بگرێ و بەشێوەیەك وەسفیان دەکرد کە ئەو قەڵایە ئەوەندە بەرزە نزیك ئاسمان بۆتەوە.

لە زستانی (٤٠٥ك/١٠١٥ز)دا ە (طاهر بن هلال بن بدر) کە بە کوشتنی باپیری زانی، هەوڵیدا هەموو ئەو موڵکانەی بارکی دەست کەوێتەوە کە لەو کاتەدا (شمس الدولة) دەستی بەسەردا گرتبوو. بەم شێوەیە شەڕێك درووست بوو لە نێوان میر (طاهر

---

(٣٨٦) البداية والنهاية، ٣٥٤/١١.

(٣٨٧) ابن العماد: شذرات الذهب، ١٧٤/٣/٢.

(٣٨٨) سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، ٣٠٣؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ص١٧٩- ١٨٠.

(٣٨٩) سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، ٣٠٣؛ ابن الوردي: تأريخه، ٣١٦/١.

بن هـلال بـن بـدر) و مـیر (شمـس الدولـة بـن فخـر الدولـة البـویهی) بەمەبەسـتی وەدەستهێنانەوەی ئەو میراتە شەرعیەی باوکی، بەڵام ئەنجامی ئەم شەڕەش لـە قـازانجی میر (شمس الدولة)ی بوەیهی شکایەوە، میر طاهریش هاوشێوەی باوکی بەدیل گیرا،[390] و ناردیان بۆ همدان بۆ ئەوەی زیندانی بکرێ، ئەو هۆزە کوردیانەی کە سەر بە (طاهر) بوون (أبو سیأ)، هۆزی لورِ و شاژنجان پێوەندییان کرد بە (أبو الشوك بـن أبـو الفـتح العنازی) میری میرنشینی عەنازیەوە کـە ئەمـەش نـەیاری بـوو و هـۆزی جورقـانیش پێوەندی بە (شمس الدولة البویهي)یـان کـرد،[391] ئەمـەش ئـەوە دەردەخـات لەگـەڵ دەرکـەوتنی بـچووکترین نـاکۆکی لـە نێـوان خۆیانـدا پەیوەنـدییان دەکـرد بـە دوژمنەکانیانەوە کە ئەمەش زیـانێکی زۆری گەیاندۆتـە رێـڕەوی مێـژووی کـورد لـە هـەموو بوارەکانـدا وەك بـواری دیبلۆماسـی و سیاسـی و ئـابووری، کۆمەڵایـەتی و رۆشنبیری و تەنانەت شارستانیش.

دوای ئەوەی سوێندی خوارد کە گوێڕایەڵی (شمس الدولة البویهي) بێت، میر (طاهر بن هلال) تا ساڵی (٤٠٦ك/١٠١٥ز) لەزینداندا بوو، دواتر ئازادکرا و کرا بە حاکمی کوردەکان لە نێوچەی شارەزوور و دینەوەر و چەند کۆمەڵێکی کوردی تریش پێوەنـدیان پێوە کرد کە بووە هۆی بەهێزبوونی پلەوپایەی. ئەمەش بووە هۆی بێزارکردنی دوژمن و نەیاری بنەماڵەکەی (أبو الشوك بن أبـو الفـتح العنـازی) کـە هـەردەم هـەوڵی دەدا دەسەڵاتی کەم بکاتەوە و لەئەنجامدا کێشەیەکی گەورە کەوتە نێوان هەردوو میرنـشینە کوردییەکەوە کە ئەنجامەکەشی بەشکستهاتنی (أبو الشوك) و کوشتنی (سـعدی أبـن أبو الشوك) کۆتای هات. (أبو الشوك) هەوڵی دەدا پەنابباتە بەر میری عـەرەبی (ابـو الحسن بن مزید الأسدی) و داوای یارمەتی لێکرد و ئەمیش هەرزوو داواکەی جێبـەجێ کرد، بەڵام (ابو الـشوك) دەسـتی نـەکردەوە بەشـەڕ،[392] بـەڵکو داوای ئاشـتبوونەوەی

---

(٣٩٠) ابن الأثیر: الكامل، ٥/ ٥٨٢، ٦٠٤.

(٣٩١) هـ. س، ٦٠٤/٥.

(٣٩٢) هـ. س، ٦١٢/٥؛ حسام الدین علي غالب: الكرد، ص١٨٧.

لەگەڵ میر (طاهر)دا کرد. دوایی گرێبەستی ئاشتی لە نێوان هەردوولادا مۆرکرا و بۆ توندوتۆڵکردنی ئەم ڕێکەوتنەش میر (طاهر) خوشکی (أبو الشوك)ی خواست و (أبو الشوك) وا سەیری ئەم ژن و ژنخوازیەی دەکرد کە خزمایەتێکی سیاسی بێت و واله میر (طاهر) بکات کە دڵنیابێت، پاش ئەوەی ئەم دەرفەتەی بۆ دەستەبەردار بوو، لە ساڵی (٤٠٦ك/١٠١٥- ١٠١٦ز)دا لەنەهاوەند هێرشی کردە سەر میر طاهر و کوشتی و هاوڕێکانی هەڵیان گرت و بردیان بۆ بەغدا و لە گۆڕستانی (باب التین)[٣٩٣] ناشتیان. ئەم ئاماژانە ئەوە دەردەخەن کە کێشە و ناکۆکی لە نێوان هێز و میرنشینە کوردیەکاندا بۆتە هۆی لاوازبوونیان و ڕووخاندنیان، بەپێچەوانەشەوە دەبینین کە بەهێزبوونیان لە یەکگرتنیاندا بووە و بۆتە هۆی گەشەسەندن و بوژانەوەیان، بۆیە دەبینین کە بوونی ناکۆکی لە نێوان ئەندامانی میرنشینی (حسنوی) و بەتایبەت کاتێك پەنادەبرێتە بەر میرنشینی (عنازی) لەکێشەی نێوان میر (بدر و هلال)ی کوردیدا ئەوە دەردەخات کە ئەم میرنشینە چەند لاواز و بێهێز بووە کە پەنای بردۆتەبەر هێزێکی دەرەکی کە ئەمەش لەڕاستیدا لەلایەکەوە هەڕەشە بووە بۆیان،[٣٩٤] هەروەها پەنابردنەبەر بوەیهییەکان لەلایەکی ترەوە کاتێك میر (بدر بن حسنویە) کێشەی لەگەڵ کوڕەکەیدا بووە، کە ئەمەش لاوازی ئەم میرنشینەی دەرخست لەبەرچاوی بوەیهییەکان و زەنگێك بوو دای بەگوێی سوڵتانەکاندا بۆ دەستبەسەراگرتنی ئەو موڵك و ماڵ و سەروەتەی ئەم میرنشینە هەیبوو تا بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە[٣٩٥] و میرەکانیان بکوژن و تا کورد نەتوانێ هیچ ڕۆڵێکی سیاسی بگێڕێ و بێتە هەڕەشەیەك بۆ

---

(٣٩٣) ابن الاثیر: الكامل، ٦١٢/٥؛ (الخطيب البغدادي) ئاماژەی بەجێگای ئەو قەبرستانە داوە لە ئەوسەری باکوری بەغدا، و لە ساڵی (٣٦٧ك/٩٧٧ز) ژێر ئاو کەوت. بڕوانە (تاريخ بغداد، ١٢١/١).

(٣٩٤) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٨١؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٥.

(٣٩٥) سبط ابن الجوزي/ مراة الزمان، ٢٩٦؛ ابن الاثير: الكامل، ٥٨٢/٥؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ٣٥٤/١١؛ ابن خلدون: العبر، ٥١٥/٤- ٥١٦.

دەسەڵاتی بوەیهییەکان، بەڵام کاتێـك تـەبایی لـە نێوانیانـدا هـەبێت تەنانـەت گـەر ئیدارەیەکی بچوکی کوردیش گەر لەسـەر ئاسـتی هـۆزیش بێـت ئـەوا دەتـوانرێ لـە پاشەرۆژدا یەك بخرێت و قەوارەیەکی سیاسـی درووسـت بکـات کـە هـەموو هەرێمـە کوردییەکان بگرێتە خۆی وەك لەدواییدا لەلای ئەیوبیەکان ڕوویدا، بەڵام لە خـاکێکی ناکورددا.

کاتێ کە (السلار مرزبان محمد بن مـسافر)ی حـاکمی ئازەربیجـان لەلایـەن (رکـن الدولة البویهي)یەوە بەدیلی گیرا ئەوجا ڕێگە بۆ (محمد بن شداد الکردی) ئاسـان بـوو بۆ دامەزراندنی میرنشینی شەدادی کە ئەو بارودۆخەی ئەم میرنشینەی تیا درووسـتکرا پڕبوو لە کێشمەکێشم و بڵاوبوونەوەی بەرەڵایی. ئەمەش وای کرد بارودۆخەکە بگونجێ و یارمەتی ئەو کەسانە بدات کە لە توانایدا هەبوو بەشێك لـە موڵکـەکانی (الـسلار) زەوت بکەن، کە بەڕاستی ئەمەش بۆ (شداد الکردی) رەخسابوو بۆ ئەوەی میرنشینێکی کوردی لە ساڵی (٣٤٠ك/٩٥١ز)دا لە دبیل (دوین) پێکەوە بنـێ و لەگـەڵ کـەس و کـاری هێزەکەیـدا نیـشتەجێ بـوو، و لـە فـەرمانڕەوایی بـەردەوام بـوو تـا سـاڵی (٤٦٨ك/١٠٧٥ز)[٣٩٦]، بەڵام نێوچەکانی دیکە هەروا لـەژێر دەسـەڵاتی (الـسلار)دا کاتێك باوکی لە زیندابوو لای (رکن الدولة) مایەوە. کاتێ (رکن الدولة) باوکی ئـازاد کرد قۆناغێکی نوێ دەستی پێکرد لەکێشەی نێوان (سـلاریەکان و شـدادیەکان)، لـە ساڵانی (٣٤٠-٣٤٤ك/ ٩٥١-٩٥٥ز)دا سلاریەکان چەندین هێرشیان کردە سەر دبیل و شەدادیەکان، بەڵام لەماوەی یەکەمدا نەیانتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنن، چـونکە بەرەنگارییەکی زۆر گـەورە لـە دبیـل دەکـرا و لـەباری دووەمیـشدا هـەروەها، بـەڵام لەهێرشی کۆتاییدا ڕق و کینەی سلاریەکان زیادی کرد و بۆ شاردنەوەی شکستەکانیان سوپایەکی زۆر گەورەیان پێکەوەنا و ڕوویان کردە قەڵای دبیـل و گەمارۆیانـدا، کاتێـك کە خاوەنی قەڵاکە هەستی کرد نـاتوانی بـەرەنگاری دوژمنـەکانی بێتـەوە، ڕایکـرد و

(٣٩٦) مسکویه: تجارب الأمم، ٢/ ١١٥.

پەنای بردە بەر پاشای ڕۆم بۆ بەدەستهێنانەوەی قەڵای دبیل، بەڵام هەوڵەکانی سەری نەگرت و ماوەیەك مایەوە تا لە ساڵی (٣٤٤ك/٩٥٥ز)دا مرد و دوای خۆشی کوڕەکانی جێگەیان گرتەوە کە ناویان (لشکری، مرزبان و الفضل) بوو.[٣٩٧]

(أبو الحسن علي بن محمد بن شداد الکردي)ی برا گەورەیان لە ساڵی (٣٤٤ك/٩٥٥ز)دا[٣٩٨] سەرکردایەتی گرتە دەست، هەر لەو ساڵەدا (الفضل)ی برای لێی جیابووەوە و چوو بۆ لای والی دیاربکر کە ناوی (غلام سیف الدولە الحمداني) بوو و ماوەیەك لای ئەم ژیا، بەڵام ماوەیەکی زۆری نەخایاند تا بارودۆخەکە گۆڕا، چونکە (سیف الدولة الحمداني) هەڵوێستی بەرامبەر بە (غلام) گۆڕی، ساڵی (٣٥٤ك/٩٦٥ز) کەناری خست ئەمەش کاری کردەسەر (الفضل بن محمد الشدادي)، چونکە پەنای بردبووەبەر (غلام) و غلامیش کاروباری خۆی لای (سیف الدولة الحمداني) ڕێکخست و (١) ناچاربوو بگەڕێتەوە بۆلای براکانی و ماوەیەك لایان مایەوە.

جارێکی دیکە بیری لەوە کردەوە کە لێیان جیابێتەوە و لای دراوسێکانیان بژی، بەڵام براکانی بەم هەڵسوکەوتە ڕازی نەبوون و لەوێ نیشتەجێ بوو[٣٩٩].

ئەمانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هۆکارەکان دەگەڕێتەوە بۆ ناکۆکی نێوان خۆیان و بیریان لەوە دەکردەوە دوای هێرشە زۆرەکانی سلاریەکان بۆ سەر (شداد)یەکان پەناببەنە بەر ڕۆم و خۆیان لەپاڵیدا بپارێزن، بەڵام لەسەر ئەم مەسەلەیە ناکۆکی کەوتە نێوانیان و ڕازی نەبوون لەسەر ڕێرەوی باوکیان بڕۆن.

سەرەڕای ئەو هەموو شەڕ و جەنگەی لەگەڵ هێزە دەرەکیەکان کردیان و بەتایبەت لەگەڵ (أرمن و گرج و ڕۆم و روس) کە هەمیشە هەوڵیان دەدا لەناویان ببەن، بەڵام هاتنی چەند میرێك کە بەرژەوەندی میرنشینەکەیان دەدا بەدیواردا وەك (مرزبان بن

---

(٣٩٧) منجم باشي: باب في الشدادية، ٨، روس: دائرة المعارف الأسلامية، مادة بنو شداد، ١٨٤/٣.

(٣٩٨) منجم باشي: ٥. س، ٢؛ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (اسماعيل شكر: الشداديون، ٧٤- ٧٥).

(٣٩٩) منجم باشي: س. پ، ٧.

صمد بن شداد) و (محمد بن شاوری دووەم) کە دەسەڵاتی میرنشینەکەی دوای (فضلونی دووەمی) برای لە ساڵی (٥٢٥ك/١١٣٠ز)دا گرتەدەست کاروباری میرنشینەکەی جێ هیشت و چووە ناو ئایینی مەسیحی و لە یەکێك لە کەنیسەکانی لەشاری (ئانی) وەك راهیبێك دانیشت، ئەمە و سەرەڕای حوکمی میراتگری کە ئەمەش لەو هۆکارانە کەمتر نیە کە بوونە هۆی لە نێوچوونی میرنشینەکە، ئەمانە بوونە هۆی ڕوودانی ئاژاوە و شەڕ لە نێوان بنەماڵەی دەسەڵاتداردا بەهۆی ئارەزوویان بۆ مانەوە لەسەر دەسەڵات، وەك ئەوەی کە لە نێوان (مرزبان بن محمد بن شداد)ی و (فضلونی یەکەمی) برایدا ڕوویدا. دەست بەسەراگرتنی نێوچەکە لەو هۆکارانە بوون کە بووە هۆی درووستبوونی ناکۆکی و دوژمنایەتی نێوان میر (ابوالفتح العنازی و بدر بن حسنویه)و ئارەزووی بردنی موڵك و ماڵ و ئەمەش وای لە (ابن خلدون) کرد کە بە (أبو الفتح محمد بن عناز) بڵێ "دوژمنی بدر بن حسنویه ڕێزی کوردان ناگرێ لە کاروباردا"[٤٠٠].

بەم شێوەیە میر (أبو الفتح) بەهەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا پەنا بباتە بەر بوەیهییەکان و بەئارەزووی ئەوان بجوڵێتەوە تابتوانی بەرەورووی دوژمنەکەی بوەستێتەوە کە لەتوانا و ژمارەدا لەم بەهێزتر بوون. لەلایەکی ترەوە (بدر بن حسنویه) هەردەم هەوڵی دەدا ڕووبەڕوو نەبێتەوە لەگەڵ گەورەی بوەیهییەکان (بهاء الدين بن عضد الدولة)دا، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو هێمنی نێوچەکە بپارێزی و تانەتوانێ دەسەڵاتی زیاد بکات.

لەلایەکی دیکەوە ئەنجامی کێشەی نێوان (أبو جعفر الحجاج بن هرمز) (سەرکردەی سوپای بوەیهییەکان) و (أبو علي بن استاذ هرمز) ناسراو بە پێشەوای سوپا ئەوەبوو کە وای لە (أبو جعفر) کرد پەنا بباتە بەر (قلج) کە لێپرسراوی پارێزگاریکردنی ڕێگەی خوراسان بوو و دوژمنی پێشەوای سوپا بەو هۆیەوە کۆبوونەوەیەکیان

(٤٠٠) ابن الاثير: الكامل، ٥/٥٦٧؛ ابن خلدون: العبر، ٤/٥١٤.

گرت[٤٠١]. وەك باسمان کرد دوای مردنی (أبو الفتح محمد بن عناز) لە ساڵی (٤٠١ك/١٠١١ز)دا کوڕەکەی بەناوی (أبو الشوك) سەرکردایەتی میرنشینەکەی گرتەدەست[٤٠٢] و شاری حولوانی کرد بە بنکەی حوکمی و ماوەی حوکمی کە (٣٦) ساڵ بوو پڕ بوو لە شەڕ و کێشە لە نێوان خۆی و هێزەکانی دەوروبەری میرنشینەکەیدا وەك بوەیهییەکان و مەزیدیەکان و حەسنەویەکان لەلایەك و لەلایەکی ترەوە لەگەڵ (سرخاب و مهلهلی) برای[٤٠٣].

لە ساڵی (٤٠٤ك/١٠١٣ز)دا (أبو الحسن بن علی بن مزيد الأسدی) کە میری (مزید) بوو ڕووی کردە (أبو الشوك) بەمەبەستی بەشەڕهاتن لەگەڵیدا[٤٠٤]، (أبن الأثیر) کە باسی ئەم ڕووداوە دەکات هۆکارەکانی دەرنەخستووە، بەڵام وادیارە (أبو الحسن علی) ئەوەی لەبیر نەچووبووەوە کە باوکی (أبو الشوك) (أبو الفتح بن عناز) لەپاڵ سوپای بوەیهییەکاندا بەسەرکردایەتی (أبو جعفر الحجاج) لە ساڵی (٣٩٢ك/١٠٠١ز)دا هێرشیان کردبووە سەر میرنشینەکەیان بە مەبەستی بەتاڵانبردنی بۆیە هەوڵی دەدا تۆڵە بکاتەوە،[٤٠٥] بەڵام هەردووکیان بەبێ شەڕ ئاشتبوونەوە و خۆشی لە نێوانیاندا درووست بوو کە ئەمەش بووەهۆی ئەوەی کە (ابن أبو الحسن) کە ناوی (ابو الاغر دبیس) بوو لە ساڵی (٣٩٤-٤٤٧ك/١٠٠٣-١٠٥٥ز)دا خوشکی (ابو الشوك) بخوازێ کە ئەم زاواو خەزوورەییە ئەنجامێکی دیبلۆماسی دووری هەبوو لە نێوان هەردووکیاندا، لە ساڵی (٤٠٥ك/ ١٠١٤ز)دا سوار و سەربازانی هەردوو هۆزی (شاژنجان و جاوان) و چەند هۆزێکی دیکەی کوردی چوونە پاڵ مەزیدییەکان لە شەڕەکەیاندا دژی (ابو الاغر دبیس)، و ئەنجامەکەی ئەوەبوو کە (بنی دبیس) شکا و

---

(٤٠١) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٥٦٧.

(٤٠٢) ابن الاثير: هـ. س، ٥٨٩؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ١٢/ ٥٤.

(٤٠٣) ابن الأثير: الكامل، ٦/ ٩٠- ٩١؛ البدليسي: الشرفنامة، ٤٠.

(٤٠٤) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٦٠٢.

(٤٠٥) هلال الصابي: تاريخه، ٤٢٢/٤- ٤٢٤؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢٠٨- ٢٠٩.

(أبو الحسن علی بن مزید الأسدی) دەستی گرت بەسەر موڵك و ماڵەکەیان[٤٠٦].

کوردەکانی هەردوو هۆزی (لورِ و شاژنجان) و هۆزی (بنو عناز) لە پاڵ (طاهر بن بدر)ی میری بەنو حسنەویەدا دەجەنگان دژی (شمس الدولة البویهی) و دوای بەدیلگرتنی طاهر لەلایەن (شمس الدولة) لە ساڵی (٤٠٥ك/١٠١٤ز)دا گواستیانەوە بۆ هەمەدان بۆتەوەی لەوێ زیندان بێت و ئەمەش وای لە (لورِ و شاژنجان) و هەوادارەکانی کرد بچنە پاڵ میر (أبو الشوك العنازی) و گوێڕایەڵی بن.[٤٠٧]

کاتێ کە (شمس الدولة) دەستی گرت بەسەر موڵك و ماڵی میر (بدر بن حسنویه)دا هەرچی موڵك و ماڵی هەبوو لە قەڵاکانیان هەموویان برد[٤٠٨]، بەمەش پایەی بەرزبووەوە و هەوڵیدا دەست بەسەر موڵك و ماڵی (دایکی و مجد الدولة)ی برایدا بگرێ لە نێوچەی ڕەی کە (دایکی و مجد الدولة)ی برای لەترسدا جێیان هێشت و ڕوویان کردە (دەماوەند)[٤٠٩]، بەڵام سوپای ڕەی چوونە ژێر دەسەڵاتی (شمس الدولة) و چوونە ناو ڕەی و لەوێ دەرچوو بەمەبەستی دواکەوتنی دایك و براکەی، بەڵام سەربازەکان لێی هەڵگەڕانەوە و داوای کۆمەڵێ شتیان لێکرد کە نەیدەتوانی جێبەجێیان بکات،[٤١٠] و بەدەستی پەتی گەڕایەوە بۆ همدان و ناردی بەدوای دایکی و براکەیدا کە بگەڕێنەوە بۆ موڵکی ڕەی و میر (أبو الشوك) ئەوەی قۆستەوە کە (شمس الدولة) سەرقاڵی ڕەی بووە توانی لە ساڵی (٤٠٥ك/١٠١٤ز)دا قرمسین داگیر بکات[٤١١] کە کاتی خۆی یەکێك بووە لە موڵکی بنەماڵەکەی،[٤١٢] و (شمس الدولة) سوپایەکی ئامادەکرد و کەوتەڕێ

---

(٤٠٦) ابن الأثير: الكامل، ٥/ ٦٠٥؛ ابن خلدون: العبر، ٤٧١/٤؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢٠٨- ٢٠٩.

(٤٠٧) ابن الأثير: الكامل، ٦٠٤/٥؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥١٦- ٥١٧.

(٤٠٨) ابن الأثير: الكامل، ٦٠٥/٥.

(٤٠٩) ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٤٧٥- ٤٧٦.

(٤١٠) ابن الأثير: الكامل، ٦٠٥/٥؛ ابن خلدون: العبر، ٤٧١/٤.

(٤١١) ابن ابي اصبيعة: عيون الأنباء في طبقات الأطباء، ٨/١/٣.

(٤١٢) الروذراوري: ذيل، ١٣٩/٣، ١٥٥؛ ابن الاثير: الكامل، ٥٦٧/٥.

بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی (أبو الشوك) و شەڕێکی خوێناوی و زۆر گەورە لە نێوانیاندا ڕوویدا کە ئەم شەڕە زانای گەورە (أبن سینا)شی تێدابوو و شەڕەکە بەشکستی (شمس الدولة) هات و خۆی و (أبن سینا) ڕایان کرد و گەڕانەوە بۆ همدان.[٤١٣] کە ئەمەش بەڵگەیە بۆئەوەی کە میر (أبو الشوك) هێزێکی زۆر بەهێزی هەبووە و توانیویتی شکست بەمیری بوەیهی بهێنێت. بۆئەوەی (شمس الدولة) لەو تەنگی و شکستیەی ڕزگاری بێت کە لەسەردەستی (أبو الشوك)دا پێی گەیشت، لە ساڵی (٤٠٦ك/١٠١٥ز)دا دەستپێشخەری لە بەردانی میری حەسنەویەکان (طاهر بن بدر)دا کرد. ئەمەش دوای ئەوەهات کە پەیمانی لێ وەرگرت گوێڕایەڵ و وەفاداربێت بۆی.[٤١٤] لە هەمان کاتیشدا کردی بەسەرکردەی کوردەکان و وردە وردە هۆزە کوردەکان پێوەندییان پێوەکرد و ئەمەش بووە هۆی بەهێزبوونی، وادیارە میری بوەیهییەکان ئەوەندە وریابوون و توانییان دوژمنە کوردەکانیان لە کورد بناڵێنێتە یەکتری و لەلایەکی ترەوە توانیان پاڵ بەمیر (طاهر بن هلال)ی حسنەویەوە بنێن کە ڕووبەڕووی (أبو الشوك)ی عنازی ببێتەوە تا شاری قرمسین لەژێر دەستیان بسێنێتەوە کە لەوەوبەر لەژێر دەستی خۆیاندا بوو.[٤١٥]

کێشەی نێوان بنەماڵەی فەرمانڕەوا و ئەم دیاردەیە زۆرتر لە میرنشینی عەنازیدا دەرکەوتووە، کێشەی نێوان میرەکان ماوەیەکی زۆری خایاند و هەوڵێکی زۆر لەم بەینەدا فەوتا کە ئەگەر بقۆسترایەتەوە دەبووە هۆی پێشکەوتنی میرنشینەکەی و گەشەکردنی. کێشەکە بە کێبڕکێ لەسەر سنووری دەسەڵاتی هەردوو میر (أبو الفتح بن أبو الشوك) و براکانی (مهلهل و سرخاب) دەستی پێکرد، دواتریش لە نێوان (سعدی کوڕی و مهلهل و سرخابی برای) بەردەوام بوو کە ئەمەش بووە هۆی وێرانی و

(٤١٣) الشهرزوري: نزهة الأرواح مخطوطة، ٢٧٠– ٢٧١؛ البيهقي: تاريخ الحكماء، ٦١؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢٠٩.

(٤١٤) ابن الأثير: الكامل، ٦١٢/٥؛ ابن خلدون: العبر، ٥١٦/٤– ٥١٧.

(٤١٥) البيهقي: تاريخ الحكماء، ٦١؛ الخزرجي، س. پ، ٨/١/٢.

کاولکاری بۆ کورد لـه هەرێمـه شـاخاویەکانی (ڕۆژهـەڵات)دا و نێوچـەکەیان کـردە شوێنی تاگرباران،[٤١٦] دواتر هەریەکەیان پەنایان دەبردەبـەر هێـزی دەرەکـی، لەوانـە (مهلهل) لەلایەك و (سعدی) برازای لەلایەکی ترەوە پەنایان دەبردەبـەر سـەلجوقیەکان کە ئەمانیش زۆر چاویان بڕیبووە ئەم میرنشینە، کـاتێکیش ئـەمان هاتنـە نێوچـەکە ئیـدی مـاڵوێرانی و کاولکارییـەکی زۆریـان بەسـەر زۆربـەی نێوچـەی هەرێمـە شاخاویەکاندا هێنا ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە چەندین زەرەری گیانی و ماڵی لێکەوتەوە و زۆربەی هەرە زۆریشی لەئەستۆی میرە بەشـەڕهاتووەکانی (بنـو عـەنناز) بـوو.[٤١٧] ئەمـە جگـە لـە کێـشەی نێـوان میرنـشینی عـەنازی و میرنـشینەکان و کۆمەڵـە کوردییەکانی دیکـە وەك (گاوانیـەکان و لـوڕ) کـە هەنـدێکیان پـەنایان دەبردەبـەر سەلجوقیەکان لەسەر حسابی ئەوانی دیکە ئەمەش بووە هۆی لە نێوچوونی زۆر شت و زۆربوونی ناکۆکی لە نێوچەکە و کردنی خەڵکی بە (مرتزقـە) کـە تـەنها ئامانجیـان بەرژەوەندی خۆیان بـووە دوور لەبەرژەوەنـدی نەتەوەکـەیان، کێـشەو ململانێـی نێـوان (حسام الدولة ابو الشوك) و هەردوو براکەی (مهلهل و سرخاب) هەردەم زیـاتر ئـاڵۆز دەبوو، هۆکارەکەشی ئەو پێشبڕکێیەی نێوانیان بوو بۆ زیـاتر بەدەسـتهێنانی موڵـك و فراوانکردنی دەسەڵات، ئەم کێشەیەش گەورە بوو تا بووە هۆی هەڵگیرساندنی چـەندین شەڕی خوێناوی لە نێوانیاندا، کە بووە مایەی کارەسات و ناخۆشی بۆ ئـەو نێوچـانەی بووبوونە شانۆی کوشـتار و وێرانـی و سـوتانی کێڵگـە و گونـدو شـارەکان، هـەروەها تالآنکردنی موڵك و ماڵ و ناموسی خەڵك، و کوژرانی هەزارەها لە دانیـشتوانی ئـەو نێوچانە و کۆچکردن زیادی کرد بەرەو ئەو نێوچانەی ئـارامن و دوورن لـە نێوچـەکانی کوشتارەوە، ئەمـەش ڕێی خۆشکرد بۆ تورکە سەلجوقیەکان بـۆ داگیرکردنـی و کۆتـایی هێنان بەسەربەخۆیی میرنشینەکە و خستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و لەسەر دەسـتی

---

(٤١٦) ابن الأثير: الكامل، ٦/ ١٣٠- ١٣١؛ ابن خلدون: العبر، ٥١٩/٤.

(٤١٧) ابن الأثير: الكامل، ٦/ ١٢٨- ١٢٩؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ٤٥/١٢؛ ابن خلدون: العبر، ٥١٨/٤- ٥١٩.

ئەوانیش ناوچەکە دووچاری چەندین کارەسات و ناخۆشی دیکە هات، توندوتیـژتر لـەو ناخۆشیانەی لەسەر دەستی میرەکانی بەنو عـەننازی برایـان (کـە دژ بەیـەکتر بـوون) عەننازی دووچاری هاتن.

(ابو الفتح کـوڕی أبـو الـشوك) دوای سـەرکەوتنی بەسـەر غـوزدا لـە دینـەوەر و دەوروبەری ساڵی (٤٣٠ك/ ١٠٣٩ز) و داگیرکردنی چەند قەڵایەك و ناچارکردنی غـوز بەکشانەوەی لەخۆی بابی بوو، و لەژێر فەرمانڕەوایی باوکی دەرچـوو، و لـە شـەعبانی ساڵی (٤٣١ك/ ١٧ی نیسان- ١٦ مایـسی سـاڵی ١٠٤٠ز)دا ڕۆیـشت بـەرەو قـەڵای (بلوار)[٤١٨] بۆ داگیرکردنی، کە ئەویش هی کوردێك بـوو ژنەکـەی تیایـدا بـەجێگری خۆی حوکمڕانی دەکرد، و کاتێك زانی ناتوانێت پارێزگاری لە قەڵاکە بکات لەکاتێکدا کە دەیزانی چ دژایەتی و پێشبڕکێیەك هەیە لە نێوان (مهلهل)و (ابو الشوك)ی برای و (ابو الفتح)ی برازای، نێردراوێکی نارد بۆ لای (مهلهل) ئەویش کە لەشوێنی خۆی بوو لەدەروبەری زەمکان (الـصامغان)، پێـی ڕاگەیانـد کـە قەڵاکـەی دەداتـە دەسـت تـا بپارێزرێت، نێراوەکە ئەوەشی بـە (مهلـهل) ڕاگەیانـد کـە (ابـو الفـتح) لـە قەڵاکـە کشاوەتەوە و تەنها سوپاکە ماوە کە گەمارۆی قەڵاکـەی داوە، ئەوکاتـە (مهلـهل)یـش ڕۆیشت بەرەو قەڵاکە و کاتێك گەیشت زانی کە (ابو الفـتح) گەڕاوەتـەوە بـۆ قەڵاکـە، (مهلهل)یش ڕێڕەوی خۆی گۆڕی تا (ابو الفتح) وا تێبگات کـە ئامـانجی ئـەم قەڵاکـە نییە و گەڕایەوە بۆ دواوە و (أبو الفتح)یش دوای کـەوت، بـەم شـێوەیە (مهلـهل) وای لێکرد کە سوپاکە ببێت بە دوو بەشەوە، بەشێکیان بۆ ئابڵوقەدانی قەڵاکە و بەشەکەی تریشیان دوای سوپاکەی (مهلهل) دەکـەوێت بـۆ شـەڕکردن، بـەم شـێوەیە دەتوانێـت سەرکەوتن بەسەریدا بەدەست بهێنێ، و کوشتار لە نێوانیانـدا دەسـتی پێکـرد، بـەڵام (ابو الفتح) بینی کە گۆڕانێك لە هەڵوێستی هاوەڵەکانیدا ڕوویـداوە و لێیـان کەوتـە گومانــەوە، لەبەرئــەوە ڕایکــرد و هاوەڵەکانیــشی دوای کــەوتن و شــکان، ســوپاکەی

(٤١٨) حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢١٧.

(مهلهل)یش هەرچی پیادەی سوپاکەی (ابو الفتح) بوو کوشتیان و دوای هەڵهاتووەکان کەوتن و ژمارەیەکیان لێ کوشتن و ژمارەیەکیش بەدیل کران و ئەسپەکەی (ابو الفتح)یش وەستا و سوارەکەی (ابو الفتح) یان برد بۆ لای (مهلهل)ی مامی ئەویش بەقامچی لێیداو بەزنجیر بەستیەوە و لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە بۆ شارەزوور لەوێ بەندی کرد.[٤١٩]

کاتێك (ابو الشوك) باوکی (ابو الفتح) ئەم هەواڵەی زانی، سوپایەکی سازدا و لە ساڵی (٤٣٢ك/ ١٠٤٠- ١٠٤١ز)دا ڕۆیشت بەرەو شارەزوور کە شوێنی دانیشتنی (مهلهل) بوو، تا کورەکەی لە دیلی ڕزگار بکات و ماوەیەکی زۆر شارەزووری تاڵانکردا، (مهلهل)یش داوای یارمەتی کرد لە (علاء الدولة بن کاکویە)، ئەویش ڕۆیشت، دینەوەر و قرمیسینی داگیرکرد کە لەژێر دەسەڵاتی (ابو الشوك)دا بوون، هەڵوێستی خراپ و توندی بەرامبەر دانیشتوانەکەی نواند و دواتریش خستنیە سەر موڵکەکانی خۆی،[٤٢٠] کاتێکیش (ابو الشوك) ئەم داگیرکردنەی بیست، تاڵانکەی سەر شارەزووری هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ حولوان، بەڵام (علاء الدولة) دوای کەوت بۆ ئەوێ و کاتێك (ابو الشوك) گەیشتە (مرج کرند) وای بەچاك زانی کە ڕێککەوتن لەگەڵ (علاء الدولة)دا ببەستێت لەبەرئەوەی توانای بەرەنگاربوونەوەی نەمابوو، و کەسێکی نارد تا پێی ڕابگەیەنێت کە (ابو الشوك) بەرەنگاری نابێتەوە بۆ ڕێزلێنان و بەرزڕاگرتنی پلەو پایەی ئەو، بەڵام ئەگەر ناچاری بکات ئەوا گلەیی لە سوری نەما و ئەگەر سەرکەوتنیش بەدەست بهێنێت ئەوا دوژمنان چاو دەبڕنە موڵکەکانی (علاء الدولة)، ئەگەر ئەمیش بەسەریدا سەربکەوێت ئەوا قەڵاکانی وڵاتەکە دەداتە دەست شاه (جلال الدولة).

---

(٤١٩) ابن الأثیر: الكامل، ٩/ ٤٧٠؛ ابن خلدون: العبر، ١١٠٣/٤.

(٤٢٠) ابن الأثیر: الكامل، ٩/ ٤٧١؛ حسام الدین علی غالب: الكرد، ٢١٨.

(علاء الدولة) له گەڕانەوەیدا له ڕێگا له (محرمی ساڵی ٤٣٣ك/ ئەیلولی ساڵی ١٠٤١ز)دا کۆچی دوایی کرد، بەڵام (ابو کالیجار کرشاسف)ی کوڕی هەستا بەداگیرکردنی نەهاوەند و تیایدا مایەوە و دەستی گرت بەسەر ناوچەکانی چیاداو (ظهیر الدین ابو منصور فرامرز)ی برای، دەستی گرت بەسەر هەمەدان و بروجەرددا، بەڵام هەمەدانی بەشکرد بۆ (ابو کالیجار).[٤٢١]

له ساڵی (٤٣٤ك/ ١٠٤٢- ١٠٤٣ز)دا جارێکی دیکه (ابو الشوك) هێرشی کرده سەر شارەزوور و ئابڵوقەی داو ئەم جارەیان توانی داگیری بکات و زۆر بەداخ بوو له خەڵکی شارەکە کە بەڕووی ئەو و براکەی (ابو الماجد مهلهل) وەستان، لەبەرئەوە سوپاکەی شارەکەیان تاڵانکرد و دواتریش سوتاندیان و گوند و کێڵگەکانیان وێرانکرد و دوای ئەوە ڕۆشت بەرەو قەڵای (تیرانشاه)ی نزیك ئەو شارە و ئابڵوقەی ئەوێشی دا، بەڵام ابو القاسم بن عیاض الکردی)ی خاوەنی قەڵاکە نامەی نارد بۆ (ابو الشوك)و پەیمانی پێدا هەوڵبدات بۆ ئازادکردنی (ابو الفتح)ی کوڕی لەلایەن (مهلهل)ی برایەوە، برای (ابو الشوك) و ڕێکیان بخاتەوە، ئەگەر واز له داگیرکردنی قەڵاکە بهێنێت، ئەویش داواکەی پەسەند کرد و بەم شێوەیە توانی دووری بخاتەوە، (مهلهل) شارەزووری بەجێهێشتبوو کاتێك (ابو الشوك) ڕووی کردە شارەکە و ڕۆیشت بۆ دەوروبەری (سەندە)* و ویلایەتەکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتی (ابو الشوك) و فەرمانی کرد بە تاڵانکردن و سووتاندنی و وێرانکردنی کێڵگەکانی، بەم شێوەیەش ناوچەکانی شارەزوور زۆرترین ناخۆشیان بینی له ئەنجامی دژایەتی نێوان ئەو دوو برایە و بەتەواوی وێران بوون دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر له دانیشتوانەکانیان کوژران، کاتێکیش (ابو القاسم بن عیاض) بە (ابو الشوك)ی ڕاگەیاند کە (مهلهل) ڕازی نەبوو بە ئازادکردنی

---

(٤٢١) ابن الأثیر: الکامل، ٩/ ٤٩٣؛ حسام الدین علي غالب: الکرد، ص٢١٨- ٢١٩.

* سەندە: قەڵایەکی شوراینە له چیا، له چیاکانی همذان و دەوروبەری، (یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ١٦٧- ١٦٨).

(ابو الفتح)ی کوڕی ڕۆیشت بەرەو زەمکانی ژێر دەسەڵاتی (مهلهل) و سەرجەم ویلایەتەکەی تاڵان کرد.[٤٢٢]

پێشتریش لە ساڵی (٤٣٢ک/ ١٠٤٠ز)دا، (سعدی بن ابو الشوك)ی کوڕی نارد بۆ داقوقای ژێر دەسەڵاتی (مهلهل) و ئابلۆقەیدا، بەڵام دانیشتوانەکەی بەرەنگاری هێرشبەران بوونەوە و نەیانتوانی داگیری بکەن، دوای ئەوەی (سعدی) شکستی هێنا، (حسام الدولة ابو الشوك) خۆی ڕۆیشت بەرەو داقوقاو ئابلۆقەی داو ئەویش نەیتوانی داگیری بکات تا دوای ئەوەی کەلێنێکی کردە شورای شارەکە و دوای کوشتارێکی توندوتیژ چووە شارەکە و سوپاکەی شارەکەیان تاڵان کردو چەك و جلوبەرگیان لە کوردەکانی ناو شار سەند، بەڵام هەر زوو کشایەوە لە ترسی ئەوەی بەندەنیجین (مەندەلی)و حولوان بکەونە بەر هێرشی براکەی دیکەی (سرخاب)، کە هێرشی کردبووە سەر چەند نێوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی (ابو الشوك)، و (سرخاب)یش لەگەڵ هۆزی جاوانی (گاوانی)ی کوردی و (ابو الفتح بن ورام)ی سەرکردەیاندا هاوپەیمانی بەستبوو، کاتێکیش (ابو الشوك) بەمەی زانی، ڕووی کردە (جلال الدولة)و داوای یارمەتی لێکرد، ئەویش سوپایەکی بۆ ڕەوانە کرد بۆ پاراستنی موڵکەکانی (ابو الشوك) لە دوژمنەکانی.[٤٢٣]

(ابو الشوك) یەکێك بوو لەوانەی چوونە پاڵ (ابو کالیجار بن سلطان الدولة) دژی (الملك العزیز المنصور) کاتێك (ابو کالیجار) دەستی گرت بەسەر بەغداد و (خوطبە) بۆی خوێنرا، (واتا پەسەندی پێدرا بۆ فەرمانڕەوایەتی بەغداد)، دوای مردنی (جلال الدولة)ی مامی باوکی (الملك العزیز) لە ساڵی (٤٣٥ک/ ١٠٤٣- ١٠٤٤ز)دا، (الملك العزیز) لەسەر ئەوە کەوتە ململانێ لەگەڵ ئامۆزاکەیدا و هەوڵیدا دەسەڵاتی باوکی بگێڕێتەوە و ڕووی کردە میرەکانی بەنو مزیەد و بەنو عوقەیل، داوای یارمەتی

---

(٤٢٢) ابن الأثير: الكامل، ٩/ ٥١٢؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ١١٠٤؛ حسام الدين علی غالب: الكرد، ٢١٩.

(٤٢٣) ابن الأثير: الكامل، ٩/ ٤٩١؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ص٢١٩- ٢٢٠.

لێکردن، بەڵام داواکەیان بەجێنەهێنا، دوای ئەوە ڕووی کردە (ابو الشوك)ی خەزووری، بەڵام (ابو الشوك) لەجیاتی ئەوەی یارمەتی زاواکەی بدات و سۆزی هەبێت بەرامبەری، خیانەتی لێکردو ناچاری کرد دەست لە کچەکەی هەڵبگرێت و دەستبەرداری بوو، بەم شێوەیە ئەم ڕووداوەش خراپەیەکی دیکە لە خراپەکانی میر (ابو الشوك) دەگێڕێتەوە کە بەغەدر و ستەمکار ناودار بوو، ڕەنگە ئەم هەڵوێستەش لەگەڵ (الملك العزيز)دا بۆ ئەوە بووبێت کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ (ابو کالیجار)دا بەباشی بهێنێتەوە، دوای ئەوەی کە بینی دەسەڵاتی زۆر فراوان بووەو زانیشی کە هیچ سوودێك لە یارمەتیدانی (الملك العزيز)دا نابینێت، بەم شێوەیەش (الملك العزيز) لە ئەملا دەچوو بۆ ئەو لا بەبێ ئەوەی کەس یارمەتی بدا، تا لە کۆتاییدا لە (میا فارقین) لای (نصر بن مروان)ی[424] کوردی مایەوە تا لەوێ کۆچی دوایی کرد.[425]

لە ساڵی (٤٣٦ك/ ١٠٤٤ز)یشدا (ابو الشوك)و میرەکانی بەنو (مزید) بەنو مەروان و هۆزەکانی تریش، دانیان نا بەدەسەڵاتی شاە (ابو کالیجار) و وتاریان بەناوی ئەوەوە دەخوێندەوە، کە ئەمەش فراوانی دەسەڵاتی دەگەیەنێت.[426]

ئاماژە بەوە دەدرێ کە سەلجوقیەکان دژی میرنشینی مەروانیەکان دەجەنگان بەو هیوایەی دەست بەسەر توانا و موڵك و ماڵیاندا بگرێ ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی سەرنجیان ڕابکێشێ و میر (نظام الدين) توانی خۆی بەدوور بگرێ لەڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سەلجوقیەکاندا لەسەردەمی (سلطان طغرل بەگ)دا، بەڵام کاتێ ناکۆکی کەوتە نێوان میر (نظام الدين و سعيد)ی برای ئەوجا داوای لە سەلجوقیەکان کرد یارمەتی بدەن لە کێشەکەی لەگەڵ براکەی، هەرچەندە (نظام الدين) هەوڵی دەدا ڕووبەڕووی

---

(٤٢٤) الفارقي: تاريخه، ٥٩- ٦٠.

(٤٢٥) ابن الأثير: الكامل، ٥١٦/٩- ٥١٧؛ الفارقي: تاريخه، ١٤٥؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ص٢٢٠.

(٤٢٦) ابن الأثير: الكامل، ٩/ ٥٢٥؛ ابو الفداء: المختصر، ٤/ ٦٩؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢٢١.

سەلجوقیەکان نەبێتەوە و لەو پێناوەدا بڕێ پارەی زۆری خەرج کرد بۆ ئاشتبوونەوەی براکەی و لەگەڵیدا بۆ ماوەی چەند ساڵ ڕێکەوت. بەڵام دواتر ئەم کێشەیە سەری هەڵدایەوە و (سعید) داوای دەسەڵاتی میرنشینەکەی دەکرد و لەسەردەمی (سلطان الب ارسلان)دا پەنای بردە بەر سەلجوقیەکان، ئەم جارەش (نظام الدین) توانی بەهاوکاری وەزیر (سلطان الب أرسلان- نظام الملك) باروودۆخەکە بۆلای خۆی بقۆزێتەوە و ئەویش بە دانانی (سعید)ی برای وەك فەرمانڕەوای ئامەد کارەکەی مەیسەر کرد.[٤٢٧]

بەهۆی هاوسێیەوە (گاوانیەکان) پێوەندییان بە میرنشینە کوردییەکانەوە هەبووە لەوانە شاژنجان لە دەوروبەری ساڵی (٣٨١ك/٩٩١ز)دا دەرکەوت و لەلایەن سەرکردەکانی هۆزی شاژنجانەوە درووست بوو. ئەم میرنشینە درێژدەبووەوە بۆ حولوان و شارەزوور بەشێك لە هەرێمی چیاو لە سەردەمی دەسەڵاتی میر (أبو الفتح محمد بن عناز) لە ساڵانی (٣٨١-٤٠١ك/٩٩١-١٠١٠ز)دا دەسەڵاتیان گەیشتە نێوچەکانی هۆزی گاوانی.[٤٢٨]

پەیوەندی نێوان گاوانی و شاژنجان هەندێ جار نالەبار و هەندێك جار لەبار بووە و هیچ کاتێك لەسەر یەك شێوە نەبووە ئەویش بەهۆی دەرکەوتنی دوو میرنشین لە هەرێمی چیاو هەولّی هەریەکەیان بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی و فراوانکردنی نێوچەکەی وای لێکردن کە ناکۆکی بکەوێتە نێوانیان و هاوپەیمانی جیاواز ببەستن.

ئەگەر بزانین بنەماڵەی (بنو زهمان) سەرەتای ناکۆکیەکان دەگەڕێتەوە بۆ کاتێکی پێش (٣٨٩ك/٩٩٩ز)، (زهمان بن هندی) مولکی خانەقینی بەدەست بوو و (أبو الفتح محمد بن عناز شاژنجانی) پارێزگاری ڕێگەی خۆراسانی لەلایەن بوەیهییەکانەوە پێسپێردرا، وەك پێشتر لێی دواین، ئەمانەش بوونە هۆی درووستبوونی ناکۆکی لە نێوان (زهمان و أبو الفتح)دا.[٤٢٩]

---

(٤٢٧) الفارقي: تاريخه، ١٨٦- ١٩٠.

(٤٢٨) حسام الدين علي غالب: الكرد، ١٣٥- ٢٠٥.

(٤٢٩) الصابي: تاريخة، ٣٣٨- ٣٣٩؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢٠٤- ٢٠٥.

کۆتاییەکانی دەسەڵاتی میر (أبو الشوك فارس بن محمد بن عناز) لە (٤٠١-٤٣٧ك/١٠١٠-١٠٤٦ز)دا کێشەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی لە نێوان میر خۆی و هەردوو براکەی (سرخاب ومهلهل)دا و چاوانیەکانیش لەو ناکۆکیانە بەدوور نەبوون کە لە نێو خۆی شاژنجانیەکاندا ڕووی دەدا، کەوای لە میر (أبو الفتح بن ورامی) جاوانی کرد ڕای خۆی ڕوون بکاتەوە و بەم جۆرە دەبینین کە لە ساڵی (٤٣٢ك/١٠٤٠ز)دا لایەنگری سرخابی کرد و لەگەڵیدا ڕووی کردە زەوی وزارەکانی میر (ابو الشوك فارس الشاذنجانی) کە ئەمیش هەستا بەناردنی (سعدی) کوڕی بۆئەوەی داقوقا لەژێر دەستی (أبو الماجد مهلهل)ی برای بسێنێتەوە، بەڵام بەخت یاوەری نەبوو، چونکە (أبو الشوك) خۆی لەشەڕێکی قورسدا توانی لەژێر دەستیان بسێنێتەوە و خێرا لەترسی ئەوەی نەوەك سرخابی برای و (أبو الفتح)ی هاوپەیمانی هێرشی بکەنە سەریان گەڕایەوە بۆ بندنجین و حولوان و داوای یارمەتی لە (جلال الدولة البویهی) کرد و بەو هۆیە توانی پارێزگاری لە موڵك و ماڵەکەی بکات.[٤٣٠]

بەهۆی شەڕو بەیەکدادانی بەردەوامەوە بارودۆخی ناوخۆی میرنشینی شاژنجان زۆر تێکچوو، بەتایبەتی دوای مردنی (أبو الشوك فارس) لە ساڵی (٤٣٧ك/١٠٤٦ز)دا و میر (أبو الماجد مهلهل بن محمد الشاذنجان) دەسەڵاتی میرنشینەکەی گرتەدەست و بانگەشەی (سعدی أبو الشوك) بەوەی ئەو لەپێشترە بۆ وەرگرتنی سەرۆکی میرنشینەکە و لەژێر فەرمانی مامی دەرچوو و چووە ژێر فەرمانی (ابراهیم ینال).[٤٣١] (أبن الأثیر) پێی وایە کە هەڵوێستی سعدی بەرامبەر بە مامی و هاوکاریکردنی لەگەڵ سەلجوقیەکاندا دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ڕقی لەمامی بووە، چونکە مامی دایکی هێناوە و ئەمی پشتگوێ خستووە و ڕقی لێی بووە و هەروەها کەمتەرخەمی کردووە لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کوردە شاژنجانیەکان، سەرەڕای ئەوەش ابراهیم ینال پەیمانی

---

(٤٣٠) ابن الأثیر: الكامل، ٨/ ٢٨-٢٩؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢١٩- ٢٢٠.

(٤٣١) الحسيني: اخبار الملوك والامراء السلجوقية، ٦٠- ٦١.

پێدابوون کە ئەوەی لە دەستی باوکیدا بووە بۆی بگەڕێنێتەوە،[٤٣٢] هاوپەیمانێتی ئەمجارەی میر (أبو الفتح) لەگەڵ (سعدی أبو الشوك)دا لەسەر ناکۆکی لە نێوان (مهلهلی مامی و سرخابی) هاوپەیمانیدا بوو، سعدی و سوپاکەی کە لە شاژنجانی غوزەکان پێك هاتبوو چوونە نێو چەندین شەڕەوە لەگەڵ مهلهلی مامیدا، و سعدی وازی نەهێنا، بەڵکو موڵك وماڵی مامەکەی تریشی برد کە ناوی سرخاب بوو و دەستی گرت بەسەر بندنیجین و (اقطاعی) کرد بۆ (أبو الفتح بن ورام)ی هاوپەیمانی کە ئەمیش هاوکاری کرد بۆ جەنگاندنی سرخابی مامی لە ساڵی (٤٢٨ك/ ١٠٣٦ز)دا و شەڕێکی گەورە ڕوویدا لە نێوان سوپاکەی سعدی کە پێك هاتبوو لە شاژنجان و چاوانی و غز و سوپای سرخاب و شەڕەکە بەسەرکەوتنی سرخاب کۆتایی هات و میر (أبی الفتح)ی جاوانی و (سعدی) شاژنجانی بەدیل گیران و کورد و غز هەموویان بەجێیان کە پێشتر دەستیان بەسەردا گرتبوو.[٤٣٣]

هەر لەو لایەنەشەوە نێوچەکانی شارۆچکە کوردیەکانی نێوچەی هەرێمی چیا تووشی هێرشی غز هاتوون کە زۆر بەهێز و توندوتیژ بوون و ئەمەش بووە هۆی کوشتنی خەڵکێکی زۆر و بەتاڵانبردنی موڵك و ماڵیان و سەرەڕای ئەوەش (طغرل بەگ)ی سلجوقی لە ساڵی (٤٤٤ك/١٠٥٢ز)دا سەرکردایەتی هێرشەکانی سپاردە میر (سعدی بن أبو الشوك) بۆ هێرش کردنە سەر چەندین نێوچە و نێوچەکانی جاوانیەکان بەشێکی ئەو هێرشانەی بەرکەوت و زەوی و زارەکانیان لە نێوچەی (بلدروز) و ڕووباری سلیل تووشی هێرشی غوز هاتن بەسەرکردایەتی میر (سعدی) شازنجانی، و میر (أبو دلف القاسم بن محمد گاوانی) ڕای کرد و (سعدی و غوز) دوای کەوتن و موڵك و

---

(٤٣٢) الكامل، ٨/ ٤٣؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ص٢٢٦.

(٤٣٣) ابن الجوزي: المنتظم، ٨/١٣٠؛ ابن الأثير: الكامل، ٨/٤٣– ٤٤؛ حسام الدين غالب: الكرد، ٢٢٨– ٢٢٩.

ماڵەکەیان بەتاڵان برد، [٤٣٤] دوای ئـەم ڕووداوە پێوەنـدی نێـوان میرنـشینی چـاوانی و میرنشینی شاژنجانی پچڕا و سەرچاوە مێژووییەکان ئامـاژە بـەهیچ جـۆرە پێوەندییـەك ناکەن لە نێوان ئەم دوو میرنشینە و بەتایبەتی دوای ڕووخـانی بوەیهییـەکان و هـاتنی سەلجوقیەکان بۆ بەغداد لە ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز)دا.

لە کۆتاییدا ئەم میرنشین و دەسەڵاتە کوردییانە لە ڕەخنـە بـەدوور نـەبوون ئـەویش بەهۆی یەك نەگرتنیان بوو لە دەوڵـەتێکی کـوردی گـەورەدا، ئەگـەر ئـەو دەوڵەتانـە یەکیان بگرتایە دەیانتوانی سەربەخۆی خۆیان بۆ ماوەیەکی زیاتر بپاراستایە و پـەلیان بۆ دەرەوەی کوردستان بهاویشتایە، گـەلی کـورد هێزێکـە کـە یـەکبگرێ حـسابی بـۆ دەکرێ، بەڵام دووبەرەکی و ناکۆکی وای لێکرد هەر لەو دۆزەخەدا بمێنێتـەوە و هـەردەم ببێتە نێچیری هێزە گەورە و دەرەکیەکان.

---

(٤٣٤) ابن الأثير: الكامل، ١٣٠/٨؛ ابن خلدون: العبر، ٦٩٨/٤؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢٣٦.

## تەوەری دووەم

# پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی کورد بە خیلافەتی عەبباسیەوە

پاش کۆچی دوای (هارون الرشید) پشێوی کەوتە خیلافەتی عەبباسییەوە، چونکە ململانێ لە نێوان کوڕەکانیدا (ئەمین و مأمون) پەیدا بوو، لەو ململانێیەشدا بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات پشتیان بەبیانیەکان دەبەست بەتایبەتی فارسەکان، ئەمەش بووە هۆی لاوازبوونی خیلافەتی عەبباسی و دەوڵەتیش بۆ خۆی پاڵنەرێك بوو بۆ (یەکە کارگێڕییەکان) کە هەرەشەی جیابوونەوە بکەن.[435]

ئەو ماوەیەی کە بوەیهییەکان لە بەغدا باڵا دەست بوون (٣٣٤-٤٤٧ك/٩٤٥-١٠٥٥ز) دیارترین ماوەی لاوازبوونی خیلافەتی عەبباسییە، چونکە لەو ماوەیەدا خەلیفە هیچ دەسەڵاتێکی بەدەستەوە نەمابوو. مانەوەی پلەی خیلافەت تەنها لە بەر هەندێ مەبەستی سیاسی بوو کە بوەیهییەکان لە ڕێیەوە ئامانجەکانی خۆیان بەدی دەهێنا. بەم شێوەیە خیلافەت و دەسەڵاتی خیلافەت بەڕادەیەك کورتکرایەوە کە تایبەت بوو بە کاروباری ئایینی. موڵکەکانی دەوڵەتی عەبباسی لە چەند ولایەتێك پێك هاتبوون کە هەر یەکەیان لە لایەن میرێکەوە بەڕێوە دەچوو کە خەلیفە دایدەنا. ئەویش وەك جێگیری خەلیفە بوو لە فەرمانڕەوایکردنی ئەو وڵاتەدا. هەروەها خەلیفە هەڵدەستا بە دامەزراندنی پلەوپایە بەرزەکانی وڵات وەك (صاحب الشرطة والمحتسب)و پێوەندی ئەوانەش ڕاستەوخۆ بە دەسەڵاتی مەرکەزییەوە بوو.[436] هەر لە

---

(٤٣٥) جرجي زيدان: تاريخ التمدن الاسلامي، ٤ / ٤٦٧.

(٤٣٦) علي محمد راضي: عصر الاسلام الذهبي، القاهرة، د-ت، ص ١٤٧.

ساڵی یەکەمی چوونە بەغداوە بوەیهییەکان خەلیفە (المستكفی باللە)یان* لابرد و خەلیفە (المطیع للە)یان** لە شوێنی دانا.(٤٣٧) لە بارەی لاوازی خیلافەتی عەبباسییەوە هەر ئەوەندە بەسە کە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لە نێوان (بەختیار عز الدولة)* و خەلیفە (المطیع للە)دا لە ساڵی (٣٦١ك/٩٧١ز) ڕوویدا. لە پاش هێرشی ڕۆمییەکان بۆ سەر جەزیرە و نصیبین، کە بەختیار داوای پارەی لە (المطیع للە) کرد بۆ خۆسازدان دژی بیزەنتینییەکان، خەلیفە بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: "پێویستم بە هێرشکردن دەبوو گەر ماڵ و دونیام بە دەستەوە بایە، بەڵام ئێستە کە تەنها بەشی بژی و مەمرەم هەیە و ئەویش بە دەستی ئێوەوەیە هیچ پێویستیم بە جەنگ نییە ئەم ئێوەشم کە لە پارەکان ئەیهێنن و مەبەستان تەنها بێدەنگ کردنی خەڵکییە ئەوا پێشکەشتانی دەکەم. گەر دەتانەوێت، گەر داوای وازهێنانیش بکەن وازدەهێنم لەو بڕەش کە

---

* المستكفی باللە:- ناوی (ابو القاسم عبدالله بن المکتفی باللە)ە لە ساڵی (٢٩٦ك/٩٠٨ن) لەدایك بووە، لە نێو ساڵانی (٣٣٣-٣٣٤ك/٩٤٤-٩٤٥ن) خەلیفەی عەبباسی بوو، لەسەردەمی ئەودا بوەیهییەکان خیلافەتی عەبباسییان داگیرکرد، خەلیفە دەستگیر کراو چاوی دەرهێنرا بەدەستی (معز الدولة بن بویة)، لە ساڵی (٣٣٨ك/٩٤٩ن) کۆچی دوایی کرد. (ابن الكازروني: مختصر التأريخ،١٨٦؛السیوطي، تأريخ الخلفاء، ٢٩٧).

** المطیع للە:- ناوی (ابو القاسم الفضل بن المقتدر بن المعتضد)ە، لە ساڵی (٣٠١ك/٩١٣ن لەدایك بووە، لە نێو ساڵانی (٣٣٤-٣٦٣ك/٩٤٥-٩٧٣ن) خەلیفەی خیلافەتی عەبباسی بووە، لەسەردەمی ئەمدا (بەردە ڕەشەکە-الحجر الأسود) گێڕدرایەوە شوێنی خۆی پاش (٢٢)ساڵ، لە ساڵی (٣٦٣ك/٩٧٣ن) کۆچی دوایی کرد. (الطبري: تاریخه،٣٥٥/١١؛ ابن العبري: تاريخ مختصر الدول،١٦٧؛ السيوطي: تأريخ الخلفاء، ٣٩٨).

(٤٣٧) ابن الكازروني: مختصر التاريخ، ١٨٧؛ محمد جواد مشكور: تأريخ ايران زمين، انتشارات الشرقي، د-ت،١٧٦.

* بختیار عز الدولة: ناوی (ابو منصور عز الدولة بن معز الدولة) دووەم میری بوەیهییەکان بوو، لە ساڵی (٣٥٦ك/ ٩٦٧ن) دەسەڵاتی لە بەغدا وەرگرت لە ساڵی (٣٦٧ك/٩٧٨ن) کوژرا. (الصفدي: الوافي بالوفيات،٨٤/١٠-٨٥؛سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، ٢٥٣-٢٥٤).

بەدەستمەوەیە و هەموو شتێ بەجێ دەهێڵم". [٤٣٨] زۆری پێنەچوو (المطیع لله) لابـرا و کوڕەکەی (الطائع لله)** لە ساڵی (٣٦٣ك/٩٧٣ز)دا لە جێی دانرا. [٤٣٩] هەندێ لـە ولایەتەکان نیمچە سەربەخۆییەکیان بەدەستهێنابوو، بەڵام هەر بەردەوام بـوون لەسـەر گوێڕایـەڵی خەلیفـەی عەبباسـی وەك سـەرکردەیەکی ڕۆحـی، بـۆ نموونـە هەرچـەندە دەوروبەری دەوڵەتی عەبباسی جیابووبوونـەوە، بـەڵام فـەرمانڕەوایی هـیچ یـەکێ لـەو ویلایەتانە شەرعی نەدەبوو گەر خەلیفە دانی پێدا نەنابایە. [٤٤٠]

ئەو ویلایەتانە لە ناوەوە سەربەخۆبوو بوون و میرەکانیـان بـە ئازادییـەکی تـەواوەوە فەرمانڕەواییان دەکرد و دارایـی تایبـەتیان هـەبوو، بـەڵام بڕێکـی دیاریکراویـان لـە داهاتەکانیان دەنـارد بـۆ خیلافـەت وەك هێمایـەك بـۆ هـەبوونی پێوەنـدی، هـەموو والییەکیش زۆر چاوی لەوە بوو کە ڕاستەوخۆ لـە لایـەن خەلیفـەوە تەقلیـد بکرێـت و هەروەها هەموو ویلایەتێك سوپای تایبەتی خۆی هـەبوو، واتـە ویلایەتـەکان هـەموو شێوەیەکی سەربەخۆییان هەبوو، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا وازیـان لـە سـەرداری ڕۆحـی خەلیفە نەدەهێنا. [٤٤١] هەرچەندە خیلافەتی عەبباسی هێزی خـۆی لـە دەسـت دابـوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك هێمایەك بۆ سەرکردایەتی ئیسلامی مابووەوە. لەبەر شوێن و پلەوپایەی خەلیفە لە جیهانی ئیسلامییدا، ڕەزامەندی و دانانی بە هـەر دەسـەڵاتێکدا بەلای میرەکانی دەوروبەرەوە زۆر گرنگ بوو، بۆ نموونە میرەکانی کورد لـەو سـەردەمەدا

---

(٤٣٨) مسكويه: تجارب الامم، ٢/٣٠٧.

** الطـائع لله:- نـاوی (عبـدالكريم بـن المفـضل بـن جعفـر المقتـدر بـن المعتـضد)ە لـە سـاڵی (٣١٧ك/٩٢٩ن)، لە نێو ساڵانی (٣٦٢-٣٨١ك/٩٧٣-٩٩١ن)، لەدوا ساتەکانی ژیانی دەستبەسـەر بـوو، لـە سـاڵی (٣٩٣ك/١٠٠٢ن) کۆچـی دوایـی کـرد. (مـسكويه: تجـارب الأمـم،٢/٣٢٧؛ ابـن الكازوروني:مختصر التاريخ،١٩١؛ السيوطي: تاريخ الخلفاء، ٤٠٦).

(٤٣٩) ابن القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، مطبعة الاباء اليسوعيين، بيروت، ١١،١٩٠٨.

(٤٤٠) جمال الدين الشيال: تـاريخ الدولـة العباسية، دار الكتـب الجامعية، القاهرة، ١٩٦٧، ٤٢-٤٣.

(٤٤١) احمد ابراهيم الشريف: العالم الاسلامي، ص ٤٩٧.

ڕێژێکــی زۆری خەلیفــەیان گرتــووە و هــەوڵیان داوە شــێوە پێوەندییــەکییان لەگــەڵ خەلیفەکاندا هەبێت تا سیفەتێکی شەرعی بدەن بە دەسەڵاتەکەیان، پێویستە ئەوەشمان لە یاد بێت کە میرنشینە کوردیەکان لە سەردەمی بوەیهییەکانــدا میرنــشینی دەســت بەسەراگرتوو بوون بەپێی چەمکی ئەو سەردەمە کە (المــاوردی) باســی لێــوە کــردووە، واتە میر بە زۆر دەست بەسەر ئەو وڵاتەدا دەگرێت (إمارة أستیلاء) و دواتر خەلیفە بــە ناچاری وەك میر لەو میرنشینەدا دایدەنێت. ئینجا میر کاروبار و سیاسەتی میرنشینەکە بەپێی ئەحکامی ئاین و بە روخسەتی خەلیفە بەڕێوە دەبــات.[٤٤٢] لــەو حاڵەتانەشــدا ڕەزامەندی خەلیفە زۆر پێویست بوو لەبەر ڕای گشتی یان ڕوونەدانی بەرهەڵــستکاری. لە دیارترین سیماکانی بوونی ڕۆڵی خەلیفە، ناوهێنانی لە مینبەر و ناو نووسینی لــە سەر پارە و سکە و ناردنی دیاری و پارە بووە بۆ بەغدا.[٤٤٣] لەو ئەرکانەی کە پێویست بوو لە سەر خەڵك بەرانبەر بە خەلیفە گوێڕایەڵی بــوو، بــەلای خەڵکــەوە گوێڕایــەڵی فەرمانڕەوایانی وڵاتان بۆ خەلیفە پێویست بوو.[٤٤٤] واتە بڕوای خەڵکی و گوێڕایەڵییان بۆ خەلیفە لە گوێڕایەڵی پێغەمبــەرەوە (د.خ) وەرگــیراوە کــە ئــەمری بــە مــسوڵمانان کردبوو گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکانیان بن، بەم شێوەیە بیرۆکەی گوێڕایەڵی خەلیفە هاتە کایــەوە و گوێڕایــەڵی فــەرمانڕەواکان بــوو بــە ئــەرك گــەر فەرمانڕەوایــەتی زۆردار و ستەمکار بێت. ئــەم تێڕوانینــە نازنــاوی (ســێبەری خــوای ســەرزەوی)ی بــە خەلیفــە بەخشی.[٤٤٥] بۆیە ئــەو میرانــەی هــەوڵی جیابوونــەوەیان دەدا لــە ترســی دەوروبــەر و دەسەڵاتی خۆیان نەیاندەتوانی ئەم بیرۆکانــە لــە بــیری خەڵکیــدا بــسڕنەوە. خیلافــەتی

---

(٤٤٢) الاحكام السلطانية و الولايات الدينية، ص ٥٥.

(٤٤٣) محمد الخضري بگ: محاضرات – الدولة العباسية، ٤٩٤، حسام الدين علي غالب: الكرد، ص٢٥١–٢٦٥.

(٤٤٤) الماوردي: الاحكام السلطانية، ص١٧.

(٤٤٥) توماس آرنولد: الخلافة، تر، حسن حيدر اللبناني، مطبعة دار التضامن، بغداد، ١٩٦١،ص ٣٧–٣٨.

عەبباسی پێوەندی دیبلۆماسی و سیاسی لەگەڵ هەرێمەکاندا هەبوو ئەم پێوەندییانەش لایەنی باش و خراپیشی هەبوو، بەپێی سیاسەتی دەوڵەت و سەردەمەکان هەندێ لە دەوڵەت و میرنشینەکان پێوەندی باشیان بە خیلافەتەوە هەبوو، بەڵام هەندێکیشیان پێوەندیان لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا باش نەبوو، ئینجا ئەم پێوەندیەش زۆرجار بەیەك شێوە نەدەمایەوە، بەڵکو هەندێ جار پێوەندییەکە پێچەوانە دەبووەوە، واتە ئەوەی پێوەندی باشی لەگەڵ خیلافەتدا هەبوو تێك دەچوون و ئەوانەی کە پێوەندی خراپیان هەبوو لەگەڵ خەلیفەدا پێوەندییەکەیان باش دەبوو.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە پێوەندی میرنشینە کوردیەکان لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەلیفە (القادر بالله)،* (٣٨١-٤٢٢ك/٩٩١-١٠٣١ز)و کوڕەکەی (القائم بأمر الله)** (٤٢٢-٤٦٧ك/١٠٣١-١٠٧٥ز)، چونکە میرنشینە کوردیەکان لەو سەردەمانەدا لە لوتکەی گەشەکردنیاندا بوون. ئینجا لەو سەردەمانەشدا خیلافەتی عەبباسی ناو شۆرەتی لە دابەزیندا بوو، بەتایبەتی لە سەردەمی هەردوو ئەو خەلیفەیەدا، بۆیە تێدەکۆشان لەپێناو بەدەستهێنانەوەی دەسەڵاتی سیاسی و هەروەها دەستگرتن بەسەر کارە ئاینیەکانیشدا.[٤٤٦]

---

*القادر بالله: ناوی (ابو العباس احمد بن اسحاق بن المقتدر بن المعتضد)ە، لە نێو ساڵانی (٣٨١-٤٢٢ك/٩٩١-١١٣١ز) خیلافەتی عەبباسی گرتە دەست بۆ ماوەی (٤١)ساڵ، خەلیفەیەکی زاهد وهاوڕێ زاناکان بوو، لەسەردەمی ئەو شاری (السند) لە وڵاتی ئەو دیوی ڕووبار فەتحی کرد.( ابن العبري: مختصر،١٩٦ ؛ابن الأثير: الكامل،١٨٦/٨).

** القائم بأمر الله- ناوی (ابو جعفر عبدالله بن القادر بن المقتدر)ە، لە ساڵی (٣٩١ك/١٠٠٠ز) لەدایك بووە، لە نێو ساڵانی (٤٢٢-٤٦٧ك/١١٣١-١٠٧٤ز) خیلافەتی عەبباسی گرتە دەست، لەسەردەمی ئەودا سەلجوقیەکان کۆتاییان بەدەسەڵاتی بویهییەکان هێنا و خۆیان دەسەڵاتی بەغدایان گرتە دەست، نزیکەی (٤٥) ساڵ لە حوکمڕانی خیلافەتدا بوو. (الذهبي: العبر في خبر من غبر، ٣٢٢/٢؛ الحنبلي: شذرات الذهب، ٣٢٦/٣ السيوطي: تاريخ الخلفاء، ٤١٨).

(٤٤٦) ابن العبري: تاريخ مختصر الدول، ١٨١؛ ابن الطقطقي:الفخري،٢٣٣.

شایانی باسه که پێوەندی باش لەگەڵ خیلافەتدا جیاوازە لەبوونی پێوەندی لەگەڵ هێزەکانی تردا، بەمەرجێك ئەو پێوەندییە باشە لە ئەنجامی کاریگەری سیاسی یان ئاسایش و ئارامی نەبووبێت. ئەوەشی کە تێبینی دەکرێت ئەوەیە سروشتی پێوەندی لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا پەیوەستە بە پێوەندی لەگەڵ بوەیهییەکان، چونکە پێوەندی باش و دیبلۆماسی هەندێ لە میرەکانی کورد لەگەڵ بوەیهییەکاندا ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە بەدەستهێنانی دانپێدانان و تەقلیدی خیلافەت. لە دیارترین ئەو پێوەندییە دیبلۆماسییانە:

## ١- بەخشینی پلەو پایە و نازناو

ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا لە (قلّد) بەمانای بەخشین دێت.[٤٤٧] هەروەها بەمانای ناچارکردنیش دێت.[٤٤٨] بۆ بەخشینی ویلایەت و نووسینی پەیمان و بەڵێن ڕێگەیەکیان هەبوو بەم شێوەیە دەستی پێدەکرد "ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە عبدالله والییەکەی فلان لە فلان ئیمامیان وەرگرتووە و بەوەش ناسراوە". ئینجا هەندێ لە سیفاتەکانی باس دەکات، لەوانەیشە لەلایەن سوڵتانەوە ستایش کرابێت پاشان دەوترێت: "ئەمە و ئەمەی پێی بەخشی"، ئینجا چەند ئامۆژگارییەکی دەکات دواتر دەوترێت "ئەوە و ئەوەی پێی بەخشی" دەوترێت "ئەمە عەهد و پەیمانی ڕابەری ئیماندارانە بۆ تۆ بەڵگەیە لەسەر تۆ...هتد".[٤٤٩] کاتێ کە هەرێمەکان نیازی جیابوونەوەیان دەبوو نەیاندەتوانی بەتەواوەتی لە خیلافەت وازبهێنن، چونکە پێویستیان بە پشتگیری خیلافەت هەبوو، چونکە ئەو دەوڵەتانە فەرمانڕەوای خۆیان بەشەرعی نەدەزانی گەر لەلایەن خەلیفەوە پێی نەبەخشرایە وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، نەشیان دەتوانی فەرمانڕەوا دانێن بەپێی خیلافەت گەر بەناریش بێت، خیلافەتیش زۆرجار پەیمانی

---

(٤٤٧) ابراهيم مصطفى وآخرون: المعجم الوسيط، دار احياء التراث العربي، بيروت، ٤٧٦/٢.

(٤٤٨) ابن منظور:لسان العرب، ٤ /٣٦٩.

(٤٤٩) القلقشندي: صبح الاعشى،٢٤٢/١٠-٢٤٣.

دەسـەڵات بەخـشینی بـۆ دەنـاردن، چـونکە نەیـدەتوانی ڕووبـەڕووی دەوڵەتـە تـازە دروستبووەکان بێتەوە. بەم شێوەیە بڕیاری پەیمانی دەسەڵات بەخشین لەلایەن خەلیفەوە دەردەچوو بـۆ (مـیر) بەرانبـەر بـە پابەنـدبوون بـە هەنـدێ ئەرکـەوە بـۆ خیلافـەتی عەبباسی.[450] خیلافـەتی عەبباسـی دەیزانـی کـە ئـەو دەوڵەتانـە بوونەتـە خـاوەنی هێزێکی گەورە. ناردنی پەیمانی دەسەڵات بەخشین تەنها شتێکی ڕەمزییـە، بـەڵام لـەو سەردەمانەدا خیلافەت لەژێر باری کێشە و نائارامییـدا دەینالاّنـد تـەنها لـە ڕێگـەی پیلانگێڕییەوە دەیتوانی ڕووبەڕووی ئەو بارودۆخە ببێتەوە. لەبەرئەوە خەلیفە لاوازەکانی دەوڵەتی عەبباسی لەو دەوڵەت و میرنشینانە دەترسان بۆیە بۆ ئەوەی مانەوەیان لـەژێر دەسەڵاتی خیلافەتدا مسۆگەر بکـەن پـەیمانی ویلایـەت بەخـشینی بـۆ دەنـاردن.[451] هەرچەند لەو ماوەیەدا ویلایەتێکی زۆر بەخشرا بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا بـە شـێوەیەکی هەڕەمەکی نـەبوو. بـۆ نموونـە دەبـوو ئـەو کەسـەی دەسـەڵاتی پێدەبەخشرێ خـاوەنی کەسایەتییەك و دەور و دایرەیەکی باش بێت،[452] هەروەها دەبوو ڕێککەوتێك هـەبێت لە بەخشیندا زۆرجـار بـە ناسـراوی و زانیـاری کەسـێك دەبەخـشرا، بـۆ نموونـە لـەو سەردەمەدا بەخشین زۆر بوو، چونکە بوەیهییەکان کاریان بۆ ئەوە دەکـرد کـە موڵـك و ماڵیان دەست کەوێت ئەم سیفەتەشیان لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە حەز و ئارەزوویـان لە گەورەبوون و پلەوپایەدا هەبوو.[453] بەخشینی ویلایەت بـە هەنـدێ لـە میرەکـانی کورد لەو سەردەمـەدا سیمایەکە لە سیماکانی پێوەندی دیپلۆماسـی نێـوان میرەکـانی کورد و خیلافەتی عەبباسی و شێوەیەکە لـە دانـانی خیلافـەتی عەبباسـی بـە ڕووی میرەکانی کورد لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا، جگە لـە ویلایـەت بەخـشین دەبیـنین

(٤٥٠) احمد ابراهيم الشريف: العالم الاسلامي، ٤٥١-٤٥٢.

(٤٥١) ارمانوس فامبيري: تاريخ بخارى، تر: احمد محمود الساعاتي، شركة الإعلانات الشرقية، القاهرة، ١٩٦٥، ص٩٨-٩٩.

(٤٥٢) حسن الباشا: الألقاب الأسلامية في التاريخ والوثائق والآثار، القاهرة،١٩٥٧، ١٠٤.

(٤٥٣) عباس برويز: تاريخ ديالمة و غزنويان، ١٣٣٦هـ، ١٤٤.

میرەکانی کورد لەو سەردەمانەدا ڕەزامەندی خیلافەتیان بەدەستهێنا بۆ فەرمانڕەواییکردنی نێوچەکانی خۆیان.[٤٥٤]

لە ساڵی (٣٨٨ك/٩٩٧ز)دا لەبەرئەوەی میر (بدر بن حسنویه)[٤٥٥] گەلێ کاری چاکی ئەنجامدا وەك (ابن کثیر) باسی دەکات و دەڵێت: "ئەو میرە یەکێ بوو لە باشترین پاشاکانی نێوچەی دینەوەر و هەمەدان و خاوەنی سیاسەتێکی چاك و زۆر بەخشندە بوو"،[٤٥٦] هەروەها یارمەتی (بهاء الدولة) کوڕی (عضد الدولة) لە جەنگەکانیدا لە نێوچەی (قنطرة البیضاء)* (ابو علی بن استاذ بن هرمزدا) کە دواتر بە پێشەوای سوپا ناسرا، چونکە خەلیفە داوای لە میر بدر کرد یارمەتی بدات بە ئازوخە و تەقەمەنی کە سوپاکەی خەریك بوو لە نێودەچوو، میر بدریش هەموو پێویستییەکی بۆ دابین کرد تا لە ئەنجامدا شەڕەکە لە بەرژەوەندی ئەو واتە خەلیفە کۆتایی پێهات.[٤٥٧] لەبەرئەوە لەلایەن خەلیفەوە پاداشتی درایە و خەڵاتکرا و ناوی (ابو النجم)ی لێنرا و فەرمانڕەوایی ئەو نێوچانەی هەرێمی چیای پێ بەخشرا کە لە ژێر دەسەڵاتیدا بوو. (شکۆو دەسەڵات و جلوبەرگی درەوشاوەی پێ بەخشی).[٤٥٨] و نازناوی (نصرة الدولة)ی پێ بەخشرا، بەڵام ئارەزووی لەم ناوە نەبوو (حەزی دەکرد ناوی (ناصر الدولة)ی لێبنرێت).[٤٥٩] خەلیفەش ئارەزووەکەی بۆ بەجێ هێنا و نازناوی

---

(٤٥٤) برتولد اشبولر: تاریخ ایران در قرون نخستین إسلامی، تر: مریم میر احمدی، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، چاپ دوم، تهران، ١٣٧٣ – ١٩٩٤، ١٠٩/٢–١١٠.

(٤٥٥) الکتبي: عیون التواریخ، تح: فیصل السامر ونبیلة عبدالمنعم داود، دار الحریة للطباعة، بغداد،١٩٧٧، ١١٦/١٣.

(٤٥٦) البدایة والنهایة:٣٤٦/١١.

* (القنطرة البیضاء) شارێکی گەورەیە لەسەر خاکی فارس، خاوەن بەروبوومێکی زۆر و ئاوێکی سازگار و خاکێکی بەپیتو بەرەکەتە، (القزویني: آثار البلاد،١٦٤–١٦٥).

(٤٥٧) الروذراوري: ذیل،٣١٠/٣.

(٤٥٨) ه س،٣١١/٣،ابن الجوزي المنتظم،٢٠٢/٧.

(٤٥٩) الروذراوري: ذیل،٣١١/٣ ؛ ستانلي لینبول: الدول الأسلامیة،٢٨١/١.

(ناصر الدين والدولة)ی، له سالّی (٣٨٨ك/٩٩٨ز)دا پیّ بەخشرا،[٤٦٠] وادیاره وەك (الروذراوري) دەگێڕێتەوە: ئەم ڕێزلێنانە بەهۆی ((داواکاری (بهاء الدولة) و نووسراوەکەیەوە بووە)).[٤٦١] بەم شێوەیە دەبینین (بدر بن حسنويه) داوای ئەو نازناوەی کردووە و بۆ ئەم مەبەستەش کەسێکی ناردووە بۆ لای خەلیفە. پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە ئەم دیاردەیە کاتێ پەیدابوو کە خیلافەتی عەبباسی تووشی لاوازی و شکست بوو بوو، چونکە لەو ماوەیەدا والییەکان دەستیان بە داواکردنی ناو و نازناو کرد بۆ دەرخستنی شوێن و پلەوپایەیان و خستنەڕووی چاکەیان بەسەر خیلافەتەوە، بەو پێیەی خیلافەت پێویستی بە هاوکاری و یارمەتیی و پشتگیریيان هەیە.[٤٦٢] نازناو (اللقب) وا دائەنرێت کە لەگەڵ ڕەوشت و چالاکی و توانای بەخشێنەر بگونجێت، هەروەها نادرێت بە هەموو کەسێك لەبەرئەوە میر (بدر بن حسنويه) میرێکی لێهاتوو بوو، و دەسەڵاتی زۆر بوو، نازناوی (الأمير الأجل)یشی پێ بەخشرا، هەروەها (أبو النجم) دەگونجێت لەگەڵ (بدر)، و دەسەڵاتی تەواوی هەبووە، لەبەرئەوە نازناوی پێ بەخشرا کە سەلماندنە لە توانای بدر چی لەڕووی ئایینەوەو چی لەڕووی دونیاییەوە (ناصرالدين والدولة)، بەڵام هەموو ئەو ناو نازناو و مەرجانە کە خیلافەتی عەبباسی دەیبەخشی بە میرە بوەیهییەکان یان وەزیرەکانیان هیچ مۆرکێك و سیفەتێکی دینی نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت کە بە (بدر بن حسنويه) بەخشرا.[٤٦٣] ئەو بەخشینە گرنگییەکی زۆری هەبوو بۆ ئەوەی سیفەتێکی شەرعی بەفەرمانڕەوایی (بدر) ببەخشێ

---

(٤٦٠) ابن الاثير: الكامل، ١٩٣/٧.

(٤٦١) ذيل تجارب الأمم:٣١١/٣.

(٤٦٢) (بدر بن حسنويه) نازناوەکەی بەم جۆرە بووە -:(ناصرالدين والدولة، الأمير الأجل ابو النجم مولى امير المؤمنين بدر بن حسنويه) ئەم نازناوە دەرکەوتووە، لەسەر کورسیەکەی (بدر بن حسنويه) کە لە موزەخانەی عێراقی لە بەغدا پارێزراوە، هەروەها لەسەر بەردێکی تەنیشت (قنطرة كاشكان) لە لورستانی ایران نوسراوە) بڕوانە: (حسام الدين علي غالب: الكرد في الدينور وشهرزور، ص ص١٥٦، ١٥٧).

(٤٦٣) الكتبي:عيون التواريخ، ١١٦/١٣.

لە نێوچەی هەرێمی چیادا ئەم داننانە بە دەسەڵاتەکەیدا شوێن و پلەوپایەی بدر دەستنیشان دەکات لەناو میرەکانی سەردەمی خۆیدا. چونکە (بدر) یەکێ بوو لەو میرانەی کە ژمارەیان کەم بوو بووەیهیی، نەبوون و دانپێدانانی خەلیفەیان بەدەستهێنابوو لە فەرمانڕەوایکردنیاندا لەو سەردەمەدا. دەوڵەت و میرنشینەکان زۆر هەوڵیان دەدا کە پەیمانی دەسەڵات بەخشینیان لە خیلافەتەوە پێ ببەخشرێ بۆ ئەم مەبەستەش دیاری و بەخشینێکی زۆریان بۆ خیلافەت دەنارد،[٤٦٤] چونکە بەخشینی ڕەزامەندی و پەیمان لە لایەن خیلافەتەوە بە والی ڕۆڵێکی زۆری هەبوو لە نێو چینی تایبەت و گشتی و بازرگانەکاندا. چونکە ئەوە پشتگیری دەسەڵات و بەرژەوەندییەکانیانی دەکرد. هەروەها ئاڵا بەخشین واتا و مەبەستی تایبەتی هەبوو، بۆ نموونە هەندێ سەرچاوە باسی ئاڵا و ئەوەی لەسەری نووسراوە بۆ دەکەن، بۆ نموونە ((ئاڵا پێویستە لە ئاورێشمی سپی بێت و بەمرەکەب لەسەر لایەکی بنووسرێت "لااله الا الله وحده لاشريك له، ليس كمثله شئ هو خالق كل شئ هو اللطيف الخبير". شوێنی بەستنەکە (عقد) لە نێوەندە و بە سپێتی دەمێنێتەوە لە لاکەی دیکەی ئاڵاکە دەنووسرێت. "محمد رسول الله ارسله بالهدى ودين الحق ليظهره على الدين كله ولو كره المشركون".[٤٦٥]

خیلافەتی عەبباسی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەروانییەکاندا لە دیاربەکر زۆر لاواز بوو ڕووبەڕووی گرفت و کێشەی زۆر بووە، ئەمەش لە ئەنجامی فەرمانڕەوایی بوەیهییەکان و سەلجوقییەکان و ململانێی نێوانیانەوە سەرچاوەی گرتبوو. هەروەها ململانێیان لەگەڵ فاتمییەکاندا لە موسڵ و شام و جەزیرەدا هەبوو و لاوازی خیلافەتی عەبباسی یارمەتیدەر بوو بۆ دامەزراندنی میرنشین لە نێوچەکەدا، لەوانەش میرنشینی مەروانییەکان لە دیاربەکر و جەزیرە. بوەیهییەکان لە سەدەی (٤ك/١٠ز)دا دەستیان

---

(٤٦٤) حسام الدين علي غالب: الكرد،٢٥٤؛ قادر محمد حسن:الأمارات،٦٣.

(٤٦٥) سورة التوبة،٣٣؛ هلال الصابي: رسوم دار الخلافة، تح: ميخائيل عواد، مطبعة العاني، بغداد،١٩٦٤،ص٩٥.

بەسەر بەغدادا گرتبوو و هەندێ جاریش لەگەڵ خەلیفەدا بەشداری خوتبە و ناوی سەرسکەشیان دەکرد.[٤٦٦] هەروەها ناو و نازناویشیان بەدەستدەهێنا[٤٦٧]. بوەیهییەکان بەدرێژایی سەردەمی (باذ الکردی) (٣٦٩ك/٩٨٠ز) بە بەردەوامی لە ململانێی مەروانییەکاندا بوون.[٤٦٨] دوای سەردمی (باذ) ماوەیەك پێوەندی نێوان مەروانییەکان و عەبباسییەکان باش بوو بە تایبەتی لەسەردەمی میر (ممهد الدولة)دا ئەمەش لە گوێڕایەڵی میرەوە بۆ خیلافەت و بەخیلافەتی شەرعی دانانی بەوە سەرچاوەی گرتبوو. لەلایەن خیلافەتیشەوە پێشتر نازناوی (ممهد) بە (ابو منصور) بەخشرابوو.[٤٦٩] کە خەلیفە (القادر بالله) پێی بەخشیبوو. جگە لە ڕێزلێنان کە پێی بەخشرابوو و هەروەها ڕێزلێنانی پادشای بوەیهییەکان (بهاء الدولة) و وەزیرەکەیش (فخر الدولة)[٤٧٠]

ئەوەی کە سەرچاوەکان بۆیان پاراستووین لەم بارەیەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی میر(احمد بن مروان) (٤٠٢- ٤٥٣ك/ ١٠١٢- ١٠١٦ز) کە پێوەندییەکی دیبلۆماسی پتەوی لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا هەبوو بەڕادەیەك کە خۆی هەندێ لەوانەی دوای ئەو هاتن دانپێدانان و دەسەڵات و نازناویان لەلایەن خیلافەتەوە پێبەخشرا. دوای ئەوەی بارودۆخەکە بۆ میر (أبو نصر) ڕێکەوت وە دەستی گرت بەسەر هەموو نێوچەی دیاربەکردا تەنها (ئامد) نەبێت. لەساڵی (٤٠٣ك/١٠١٣ز) نێردراوی خەلیفەی عەبباسی (القادر بالله) پیاوانی پادشای بوەیهی (الملك شاهنشاه سلطان الدولة بن بهاء الدولة)ی کوڕی (عضد الدولة)، لەگەڵ خۆشیاندا خەڵات و ڕێزلێنان و فەرمانی میرایەتی هەموو نێوچەی دیاربەکریان لەلایەن خەلیفە و

---

(٤٦٦) مسكويه: تجارب الامم، ج٢/ص٨٥.

(٤٦٧) حسن الباشا: الالقاب الاسلامية، ص٦٢.

(٤٦٨) الروذراوري:ذيل،ج٣/ ص٨٤.

(٤٦٩) القلقشندي: صبح الاعشى، ج٦/ص٣٠؛حسن الباشا: الالقاب الاسلامية،ص٥٠٩.

(٤٧٠) الفارقي: تاريخ الفارقي، ص٨٦؛ ابن شداد:الاعلاق الخطيرة، ٣٢٤/٣/١.

سولّتانەوە پێبوو.[٤٧١] بە میر (نصر الدولة احمد بن مروان)یان بەخشی جگە لە نازناوی (نصر الدولة و عمادها ذي الصرامتين)[٤٧٢] خەلاّتەکەش لە حەوت بەش پێک هاتبوو (کەوا، فرجیە، جبە (پۆشاکی سەرتاپێ) عمامە کلاوێکە، دوو بازنگی زێڕ، گەوهەر پەندێك و ئەسپێك بەزینی زێڕەوە).[٤٧٣] ئەمەش گرنگی زۆری هەبوو بۆ بەخشینی سیفەتی شەرعی بە فەرمانڕەوایی مەروانییەکان لە نێوچەکەدا، هەروەها واتای بەخشینی تەواو دەگەیەنێ بەمیر (نصر الدولة احمد بن مروان) لە فەرمانڕەوایی ولاّتدا.[٤٧٤] شایانی باسە کە پەیامبەری خەلیفە (الفاطمي) ئێوارەی ڕۆژێك گەیشتە ئەوێ و پۆشاك و دیاری و بەخششەکانی لەگەلّ خۆیدا بردبوو، لە هەمانکاتدا نازناوی (عزالدولة و مجدها ذي الصرامتين)ی[٤٧٥] لە میر (نصرالدولة أحمد بن مروان) نا، بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر پەیامبەری نێرراوی پادشای بیزەنتی (بسیلوس دووەم)* گەیشتە هەمان شوێن و دیاری و خەلاّتێکی وەك (الفارقی) وەسفی دەکات بێ وێنەی پێشکەش بە میر (نصر الدولة أحمد بن مروان) کرد. بۆ ڕۆژی دواتر میر (نصر الدولة أحمد بن مروان) لەسەر کورسی پادشایی دانیشت و پێشوازی لەو میوانانە دەکرد کە بۆ پیرۆزباییکردن سەردانیان دەکرد و لەلایەن ڕاستییەوە نێرراوی خەلیفەی عەبباسی و سولّتانی بوەیهی دانیشتبوون لە لایەن چەپیشییەوە نێرراوی خیلافەتی فاتمی و دەولّەتی بیزەنتی دانیشتبوون. ئەو بڕیار و نووسراوانە خوێنرایەوە کە خەلیفە و پادشاکان ناردبوویان. ئەم مەراسیمە بەئامادەبوونی میران و سەرکردە سەربازییەکان

---

(٤٧١) الفارقي: تاريخه،١٠٢؛ ابن شداد: الأعلاق الخطيرة، ٣٤٩/٣/١.

(٤٧٢) الفارقي، هـ. س،١٠٨؛ ابن شداد، هـ-س، ٣٥١/١/٣.

(٤٧٣) الفارقي: س. پ،١٠٨.

(٤٧٤) محمود ياسين التكريتي: الامارة المروانية، ١٢٥.

(٤٧٥) الفارقي: س. پ،١٠٩.

* بسیلون دووەم: لە سالّی (٣٦٥ك/٩٧٦ز) دەسەلاّتی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی گرتە دەست و لەماوەی فەرمانڕەوای دووروودرێژی توانی هێز و دەسەلاّت و شکۆمەندی بگرێتەوە بۆ ئەو ئیمپراتۆریەتە. (نعيم فرح: تاريخ بيزنطة السياسي، دمشق،١٩٩١-١٩٩٢،ص٢٤١).

بەڕێوەچوو، ئینجا میر پۆشاکەکەی لەبەر کرد و دواتریش میر پۆشاکێکی وای بەخشییە نێرراوەکان کە باسی نرخ و بەهای ناکرێت ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە (الفارقی) ستایشی (نصر الدولة أحمد بن مروان) بکات، ستایشی ڕێزلێنانی بکات لەلایەن هەرسێ دەوڵەتی ئەو ڕۆژگارە و کە دەڵێت: "ناوی لە خەلیفە و پادشاکانەوە پێ بەخشرا و کەسیش لەو دڵخۆشتر نەبوو"،[٤٧٦] لە لایەکی تریشەوە ڕێزلێنانی میر (نصر الدولة أحمد بن مروان) لە لایەن خەلیفەی عەبباسییەوە بەشێك بوو لە کێشە و ململانێی نێوان خیلافەتی عەبباسی لە بەغدا و فاتمی لە قاهیرە و هەوڵدانی هەریەکێ لەو خەلیفانەبوو بۆ ئەوەی میر نصر بۆلای خۆی ڕابکێشێ، یان هەر هیچ نەبێت پشتگیری خیلافەتەکەیان بکات. بەڵام میر (نصر الدولة أحمد بن مروان) ئەو نازناوەی بە باشزانی و هەڵبژارد - کە خەلیفەی عەبباسی (القادر باللە) پێی بەخشی.[٤٧٧] نەك ئەوەی کە خەلیفەی فاتمی پێی بەخشی. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو ڕێز و نازناوانەی کە خەلیفەی عەبباسی بەمیر مەروانی بەخشی ڕۆڵێکی چاکی هەبوو لە پتەوکردن و تۆکمەکردنی دەسەڵاتی لە نێوچەکەدا و شان و شکۆی سامی زیاتر کرد لە نێوەوە و لە دەرەوەدا. هەروەها خیلافەتی عەبباسی و بوەیهییەکانیش بەهۆی ئەم کارە دیبلۆماسییانەوە توانیان زیاتر هەست و سۆزی میر بۆلای خۆیان ڕابکێشن، دوای ئەوەش کە توانی دەسەڵاتی خۆی بەتەواوەتی لە ئامەد و میافارقینیش بچەسپێنێت بە شێوەیەك کە بوو بەجێ سەرنجی دەوڵەتانی دەوروبەری، ئەمەش بەهۆی شوێنی جوگرافی و ستراتیژی وڵاتەکەیەوە بوو کە درێژ دەبووە و لە نێوان سێ زلهێزی ململانێکەر لە نێوچەکەدا ئەوانەش: خیلافەتی عەبباسی و بوەیهییەکان لە باشوورەوە و خیلافەتی فاتمی لە باشوری ڕۆژئاواوە و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لە باکوورەوە. پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە ئەو هەنگاوە دیبلۆماسییەی خیلافەتی عەبباسی

---

(٤٧٦) تاريخ الفارقي١١٠، ١٧٦-١٧٧.

(٤٧٧) هـ. س، ١١٠.

و بوەیهییەکان بۆ نزیکبوونەوە لە میرنشینی مەروانییەکان مەبەستی سیاسی تریشی بە دواوە بوو ئەوەش دوورخستنەوەی ئەم میرنشینە بوو لە پێوەندی درووستکردن لەگەڵ خیلافەتی فاتمی و دەوڵەتی بیزەنتیدا لە ترسی ئەوەی نەك پێوەندییان باش بێت بە تایبەتی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی میر (نصر الدولة)دا.[٤٧٨] ئەوەش کە ئەو نزیکبوونەوەیە دەسەلمێنێ گەیشتنی نێرراوی خیلافەتی فاتمی و دەوڵەتی بیزەنتی بوو لە هەمان ڕۆژدا کە نێرراوی خیلافەتی عەبباسی گەیشتە ئەوێ وەك پێشتر باسمانکرد.
لە ڕاستیدا بەدەستهێنانی ویلایەت لە لایەن خیلافەتەوە کارێك بوو گرنگی دیاری هەبوو بۆ هەموو چین و توێژێکی ئەو کۆمەڵە، چونکە پشتگیری دەس و دایەرە و بەرژەوەندییەکانیانی دەکرد. جگە لەوەش پیاوانی ئایین و شارەزایان زنجیرەی بەیەك گەیشتن بوون لە نێوان والی و میللەتدا، بۆیە گەر ئەو نووسراوانە بخرێتە بەر دەستی ئەوانە، ڕۆی ئەوان گەیاندنە بەخەڵکی و خەڵکی تێگەیاندنە لە نێوەڕۆکی ئەو بابەتانە. والی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی لە لایەن خودی خەلیفەوە پێی بەخشراوە، ئەمەش پشتگیری والییە کە بەرژەوەندی بازرگان و هەموو لایەکی تێدایە، چونکە بەخشینی دەسەڵات و پاراستنی ئاسایش و ئارامی ویلایەت کاریگەری باشی بۆ سەر بازرگانیش دەبێت. بەم شێوەیە ئەم دەوڵەتانە بەچاوی بایەخ و باوەڕپێکردنەوە دەیانڕوانیە ئەم دەوڵەتە کوردیە، چونکە هەموو بنەماکانی دەوڵەت و سیما شارستانیەتەکانی لەخۆگرتبوو کە دەتوانێت ڕۆڵی بەرچاو بگێڕێت لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتی بە شێوەیەك کە ناتوانرێت فەراموش بکرێت بەهۆی پێگە ستراتیجیەکەیەوە، بۆیە ناچار بوون سەرلەنوێ دان بە دەسەڵاتیدا بنێن و پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی لەگەڵدا نوێ بکەنەوە و جێگیری بکەن.
لەوانەیە ئەم دەوڵەتانە هەستیان بە گرنگی ئارامی و ئاسایش و ئاسوودەیی و ئازادی و دادپەروەری و خۆشگوزەرانی ئەم دەوڵەتە کردبێت.

---

(٤٧٨) الفارقي: تاريخه،٦١، ٨٤.

بێگومان ئەو پلان و بەرنامەیەی کە دەوڵەتی مەروانی بۆ خۆی دارِشتبوو لە پێڕەوکردنی سیاسەتی بێلایەنی و دەست تێوەرنەدان لە ململانێ و کێشەو ئاژاوەی نێوچەکە لە نێوان دەوڵەت و میرنشینەکان و خۆپاراستن لە شەڕ و کاولکاری و نەهامەتیەکان و خۆتەرخانکردن بۆ چاککردنی کاروباری نێوخۆی دەوڵەتەکەیان و شەونخۆنیکردن لە پێناو بەرژەوەندی میللەتەکەیان بەشێوەیەك ببوون بە خۆشگوزەرانترین گەل لە نێوچەکەدا کە جێگەی ڕێز و سەرسوڕمان بوون لەلایەن ئەو دەوڵەتانە، هەروەها ڕەخساندنی ئەو ئازادیە بۆ هاوڵاتیە مەسیحیەکانی ڕێزگرتن و بەشداری پێکردنیان لە دامودەزگا هەستیارەکاندا لە کاتێکدا مەسیحیەکان توشی ستەم و چەوساندنەوە بوو بوون لە نێوچەکانی دیکەی جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی لەوڵاتی میسردا، ئەمەش کاریگەری چاکی هەبوو لەلای بیزەنتیەکان کە ببووە هۆکاری پاراستنی هاوسنووری لەگەڵ ئەم دەوڵەتە کوردیە، هەرچەندە کێشەو ململانێی لابەلا هەبوو لە نێوانیاندا، بەڵام لە هەموو بنەماو بنچینەیەکدا شاز هەیە.[٤٧٩]

هەروەها میرنشینی عەنازییەکان پێوەندی دیبلۆماسییان بە خیلافەتی عەبباسییەوە هەبوو گەر تەنها بەو شێوەش بێت کە داننان بێت بەدەسەڵاتی ئایینی ئەم خیلافەتەدا. لە سەرچاوەکاندا هاتووە کە دووەم میری ئەو میرنشینە بە (حسام الدولة)[٤٨٠] ناو نرابوو و ئەو نازناوانەش وەك (حسام الدولة) و (سیف الدولة)* زیاتر لە سەرکردە و میر و جێگرەکانیان دەنرا. (ناصر خسرو)ی گەڕۆك نازنێوەکانی میر (أبو منصور وهسوذان بن محمد الروادي) باسی کردووە کە سەردانی ئەو میرەی کردووە لە

---

(٤٧٩) ابن الجوزي: المنتظم،٢٦٢/٧؛ الفارقي: تاريخه، ١٠٨ – ١١٠ ؛ محمد امين زكي: تاريخ الدول والامارات،١١٠.

(٤٨٠) ابن الاثير: الكامل، ٨ /١٩.

* سيف الدولة: ناوی (ابو الحسن علي ابن عبدالله) میری حمدانیەکان بوو لە شاری حەلەب، لە ساڵی (٣٥٦ك/٩٦٦ز) کۆچی دوایی کرد.(ابن خلكان: وفيات،ج٣/ص٤٠١-٤٠٦).

سالّی (٤٣٨ك/١٠٤٧ز) بەم شێوەیە: (سیف الدولة)، و (شرف الله)، (ابو منصور)، (وهسوذان بن محمد) (مولی أمیر المؤمنین).[٤٨١] ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەسەڵاتێکی فراوانی هەبوو لە ئازەربایجان و پێوەندی دیبلۆماسی باش لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا هەبوو، نازناوی (سیف الدولة)ش لە نازنێوەکانی میر و سەرکردەکانی سوپایە، لەگەڵ نازناوی (شرف الله) و پلەوپایە و شوێنی میر و هسوژاندا دەگونجێ، چونکە ئەو میرە ولاتی ئیسلامی لە هێرشەکانی روم و ئەرمەن و روسی پاراست ئەو ولاتەی دەکەوێتە نێوچەی شەڕی ئەو ولاتانەوە.[٤٨٢]

وەرگرتن و بەخشینی دەسەڵات بەلای والییەکانەوە دەسکەوتێکی زۆر گەورەبوو. بوەیهییەکانیش وەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە، کە چۆن هەوالّی (شجاع الدولة) لە خزمەتکردنی پادشاکانی عەجەمدا بلاوبووە و هەتا (عماد الدولة) گەیشتە کەرەج. ئینجا بەردەوام بوو تا گەیشتە فارس، دوای فراوانبوونی ولات و دەسەلاتی داوای لە خەلیفە (الراضي) کرد کە کاروباری (فارس)ی پێ بسپێرێت و پەیمانی ویلایەت بەخشینی بۆ بنێرێت بەرانبەر بە بڕێك پارە کە سالانە دەیدات بە خیلافەت، خەلیفەش پۆشاك و نووسراوی بۆ نارد و ئەویش لە پێش ئامادەبوواندا نووسراوەکەی خوێندەوە و پۆشاکەکەی لەبەرکرد و بەمەش خۆی زیاتر بەهێزکرد.[٤٨٣] لە سالّی (٣٦٩ك/٩٧٩ز) دا (عضد الدولة) داوای لە خەلیفە کرد کە پەیمانی ویلایەت بەخشینی بۆ نوێ بکاتەوە و پۆشاکی نوێی بۆ بنێرێت، خەلیفەش کردی بە والی موسلّمانان لە هەموو ولاتانی ئیسلامدا.[٤٨٤]

لە ڕاستیدا هەموو دەولّەت و میرنشینەکان هەولّیان دەدا کە پەیمانی ویلایەت و دەسەلات بەخشینیان لەلایەن خیلافەتەوە پێ ببەخشرێ و بۆ ئەم مەبەستەش کە

---

(٤٨١) سفرنامه، نقلها الى العربية- يحيى الخشاب، ط٢، مطبعة دار العلم، بيروت، ١٩٧٠،ص ٥.

(٤٨٢) حسام الدين علي غالب: اذربيجان،ص ٢٧٨.

(٤٨٣) ابن الطقطقى: الفخري، ٢٧٨-٢٧٩؛ المقريزي: السلوك،٢٦/١.

(٤٨٤) ابن كثير: البداية و النهاية، ٢٩٥/١٢.

لەگەڵ داواکردنەکانیاندا دیاری و خەڵاتیان بۆ خیلافەت دەنارد و لەم بارەیشەوە نموونە زۆرە کە لێرەدا جێی باسکردن نییە.

### ٢- پێــدان = بەخشینی نازناو

کاتێك خیلافەت کەوتە دەستی عەبباسیەکان نازناو گرنگی خۆی هەبوو لە دەوڵەتدا بە جۆرێك کە نازناو هێندە زۆربوو پێویستی بەوە کرد کە پۆلین و رێك بخرێت.[٤٨٥] نازناو شەرعیەتی وەرنەدەگرت گەر بێتو لە لایەن خەلیفەوە نەبوایە، ئەمەش بە واتای دەسەڵاتی سێنترالی خەلیفە و جەختکردن بوو لە رێکخستنی بەردەوامی کارەکاندا، بەڵام کاتێك نازناو زۆر بوو ئەمە بووە هۆی کاریگەری نەگەتیف لە سەر دەوڵەتی عەبباسی. لەم ڕووەوە (البیروني) دەگێڕێتەوە "کاتێك عەبباسیەکان نازناوی زۆر وردیان بەخشیە دەستە و تاقمەکانیان و یەکسانیان کرد لە نێوان دۆست و دوژمن و ڕەچەڵەکیان گێڕاوە سەر خۆیان دەوڵەتەکەیان لە دەست چوو".[٤٨٦] نازناوی ڕاست واتە خەلیفەوە پشت بە خاوەنی ئەو نازناوە دەبەستێت هەروەك چۆن پشت بە ڕاستی خۆی دەبەستێت و ڕەنگە ئەم نازناوە ئاماژەکردنێك بێت بۆ پایەی سوڵتان بە نسبەت پلەوپایەی خەلیفە لە بەغدا کە دەشێ ئەم مەسەلەیە لە ڕووی شوێنەوە وابێت.[٤٨٧] جێی ئاماژە بۆکردنە کە دیاردەی نازناو لە جیهانی ئیسلامیدا لە پاش لاوازی و بێ هێزی خیلافەتەوە دەستی پێکردبێت کە والیەکان کەوتنە ئەوەی داوای نازناوی فەخری بکەن بۆ دەرخستنی پلەوپایەیان و فەزڵیان هەبێت بەسەر خیلافەتدا بەو پێیەی کە خیلافەت پێویستی بە پشتگیری و پاڵپشتی ئەوان هەیە، ئەمەش لەوە تێبینی دەکرێت کە (بدر بن حسنویە) داوای لە خەلیفە کرد نازناوی پێببەخشێت و

---

(٤٨٥) حسن الباشا: الالقاب الأسلامية، ص٥٩.

(٤٨٦) الآثار الباقية من القرون الخالية، دار احياء العلوم، بيروت، د.ت، ص١٣٢.

(٤٨٧) حسن الباشا: س. پ، ل٥٤٤.

نوێنەری خۆی ڕەوانە کرد بۆ ئەو مەبەستە.[488] لە ساڵی (٣٨٥ك/٩٩٥ز)دا میر (بدر بن حسنویه) بڕی (٩) هەزار دیناری دانا وەك دیاریەك (منحه) بۆ پێشکەشکردن بە میری عەرەب (الاصیفر الاعرابی) وەك قەرەبووکردنەوە لەوەی لە حاجیەکانی عیراقی وەردەگرت تا ڕێگەیان بدات بچنە شوێنە پیرۆزەکان بۆ حەج کردن.[489] بەڵام (الروذراوري) بە جۆرێکی دیکە باسەکە دەگێڕێتەوە جیاواز لەوەی پێشوو چ لەکاتی پارەدانەکەدا و چ لە بڕەکەی و دەڵێت: "(بدر بن حسنويه) (٥) پێنج هەزار دیناری هەڵگرت لەگەڵ سەردار و کەسە ناسراوەکانی کاروانی خوراسانیەکان بە مەبەستی پاراستنی ڕێگەی حاجیەکان لە جیاتی ئەو باجەی کە هەموو ساڵێك لێیان وەردەگیرا و ببووە باجێك پاشتر گەیشتە (٩) نۆ هەزار دینار".[490]

جگە لە دۆزینەوەی نازناوێکی دیکەی (بدر بن حسنويه) کە لە سەر (قنطرة کاشکان)* هەڵکەندراوە. کە بە یەکێك لە شوێنەوارە مێژوویەکانی میرنشینی حەسنەویە ئەژمار دەکرێت کە لەسەری هەڵکۆڵراوە "بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان ئەمە بوو میر فەرمانی دا بە بنیادنانی بۆ (ابو النجم بدر بن حسنويه) خوا تەمەن درێژی کات".[491] نازناوی میر (الاجل) لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامدا لە خاوەن دەسەڵاتی پیاوانی وڵات دەنرا کە خاوەن دەسەڵاتێکی فراوان بوو.[492] سەبارەت بە میرەکانی میرنشینی مەروانی پێوەندی دیبلۆماسییان هەبوو لەگەڵ خیلافەتی عەبباسی و هەندێکیان نازناویان لە خیلافەتەوە وەرگرت (الفارقي) دەگێڕێتەوە کە

---

(٤٨٨) کلود کاهن: س. پ، ل٢٨٧.

(٤٨٩) ابن الجوزي: س. پ، ١٤/٢٧٠؛ الذهبي: تاريخ الاسلام، ٣٨١.

(٤٩٠) ذيل، ٢٨٧/٣.

* قنطرة کاشکان: دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئێران لە نێوان خورەم ئاباد و ئەندیمشك، میر (بدر بن حسنويه) درووستی کرد، بەرزیەکی ٢٠م دەبوو. (عزيز الله بيات: كليات جغرافیای طبیعی وتاریخ ایران، ص٣٩٦).

(٤٩١) (Stein) Aurel Old routes of Western Iran (London) (١٩٤٠) P.،٢٧١.

(٤٩٢) حسن الباشا: الالقاب الأسلامية، ١٢٦.

میر مەروانی هەندێ جار بە نازناوی وەزیر یان (حاجب – دەرگاوان) لە لایەن خەلیفەوە بانگ دەکرا وەك میر (أحمد بن مروان بن كەك) كە خەلیفەی عەبباسی (القادر باللـه) لە ساڵی (٤٠٣ك/١٠٣١ز)دا نازنـاوی (نـصر الدولـة)ی لـێ نـا، هـەروەها خەلیفـە نازناوی (مهد الدولة)ی نا لە (حاجب) میر (سعيد بن مروان)، (الفارقي) دەڵێت:-

"میر سعید یەكەم میرە لە بنەماڵەی مەروان نازناوی پێبدرێ".[٤٩٣] جێی ئاماژەیـە هەر یەكێك لە مەروانیەكان كە دەسەڵاتی گرتە دەست بە (مـیر) بـانگ دەكـرا چ لـە سەرچاوە مێژوویاكەكاندا یان لە دۆكیۆمێنتەكاندا، وەك ئەوەی لە نوسـراوەكانی سـەر شوێنەوارەكاندا هاتووە وەك شورای دیاربەكر و پردی دیجلە لە دیاربەكر.[٤٩٤] بەڵام ئـەو نازناوانەی كە دەسەڵاتدارانی هەژبانیەكان بە دەستیان هێنا بەهۆی سوود وەرگرتن لـەو بارودۆخە سیاسیی چوار دەوریان بوو؛ تەنانەت نـاوی میریـان لـە دەسـەڵاتدارانیان لـە هەولێر و نێوچەكانی دەوروبەری دەناو ئەم نازنێوەیـان وەك میراتـی بـەكاردەهێنا، ئـەم نازنێوە نرا كە دەسەڵاتدارانی (بني رواد) و لە (أحمدیل) دامەزرێنەری نـەوەی (الاحمـد یلیـە)* لـە (مراغـە)**.[٤٩٥] شـەدادیەكانیش بـە هـەمان شـێوە نازناریـان بـۆ دەسەڵاتدارانیان بەكارهێنا،[٤٩٦] ئەمەش بە نازناوێكی كارگێڕی و سەربازی دادەنرێت،

---

(٤٩٣) تاریخە، ص٧٧.

(٤٩٤) عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية، ٧٦/٢.

* الاحمد يليه: دەگەڕێتەوە سەر (احمديل بن ابراهيم بن وهسوذان الروادي) كە خاوەن (مراغە واذربيجان) بوون، ئەم بنەماڵەیە ڕەچەڵەكیان دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی ڕەوادی كوردی هـەذبانی كەوا حوكمی اذربيجانی كرد و تبريز پێتەختیان بوو. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (حسام الدين علي غالب: اذربيجان،١٨٢).

** مراغە:- دەكەوێتە باشووری خۆرئاوای شاری تـەورێز بە دووری (١١٢كم) هەروەها نزیكەی (١٨٠كـم) لـە شـاری ورمـێ دوورە لـە گـەورەی لـەدوای ئـەردەوێل دێـت.(ابـن حوقـل: صـورة الأرض،٢٨٨ ؛ شوان عوسمان مستەفا: كوردستان، ل٧٩).

(٤٩٥) ابن الاثير: الكامل،٤٨٥/١٠ ؛ ابن خلدون: تاريخ،٤١/٥-٤٢.

(٤٩٦) روس: دائرة المعارف الاسلامية، مادة (بنوشداد)، ١٨١/١٣-١٨٣.

گـەر نازنـاوی مـیر لای عەبباسـی و بـوەیهی بـاوبوبێ و دانـی پێـدا نرابـێ لـەڕووی کارگێڕییەوە ئەوا لەلای (هذبانییە)کـان هـەمان مـۆرکی فـەرمی وەرگـرت، چـونکە دەسەڵاتی سەرەکی لە فەرمانڕەواییدا بەدەست میری هەژبانییەوە بوو، کە خاوەن هەمان توانا و دەسەڵات بوو کە سوڵتان و پادشا و میرەکانی ئەو سـەردەمە هـەیان بـوو.[٤٩٧] سەبارەت بە میرنشینی عەنازی کە پێوەندی دیبلۆماسی دەیبەستنەوە بـە خیلافەتـەوە، دووەم میریان نازناوی (حسام الدولة ابوالشوك)ی پێ بەخشرا[٤٩٨] و نازناوەکـانی زیـاد کرا بۆ دەولە وەك (سیف الدولة) و (حسام الدولة) ئەمانـە دەچـوونە خانـەی نازنـاوی سەرۆکی سوپاو میر و جێگیرەکانەوە.[٤٩٩] خالێ وەرچەرخان لە بـەهێزکردنی پێوەندیـە دیبلۆماسییەکان لە نێوان خیلافەت و میرنشینە کوردیەکاندا ئەویش بەخشینی نازناو بوو لە لایەن عەبباسیەکانەوە بۆ میرە کوردەکان لە میرنشینەکاندا، کە ئەمـە وایکـرد ئەو میرنشینانە ببنە پاشکۆی خیلافـەت و دژی نـەبن، خەلیفـەی عەبباسـی (القـادر بالله) نازناوی (ناصر الدین و الدولة)ی بەخشیە میر (بدر بن حسنویه).[٥٠٠] هـەروەك پێشتر باسمان کرد، و نازناوی (نصر الدولة و عمادها ذي الـصرامتین) بەخـشیە مـیری مەڕوانیەکان (أحمد بن مروان).[٥٠١] لەگەڵ ئەو نازنێوەشدا هەروەها خەلیفەی فـاطمي (الحاکم بأمر الله) نازناوی (عزالدولـة و مجـدها ذي الـصرامتین) پێبەخـشی،[٥٠٢] وەك لەپێشدا باسمان کرد.

---

(٤٩٧) ابن شاهين الظاهري: زبدة كشف الممالك،١١١؛ عماد الدين خليل: عمادالدين زنكي، ١٩٦؛ حسن ابراهيم حسن: تاريخ الأسلام، ٣١٦.

(٤٩٨) ابـن الاثـير: الكامـل، ١٩/٨؛ ابـن الفـوطي: تلخـيص مجمـع الاداب في معجـم الالقـاب، تـح: مصطفى جواد، المطبعة الهاشمية، دمشق، ١٩٦٤ ٤/٢/١١٣٦-١١٣٧.

(٤٩٩) نظـام الملـك: گزيـده سياسـت نامـه، (سـير الملـوك) انتخـاب وشـرح، جعفـر شـعار، تهـران، ١٩٩٨، ص٢٢٥.

(٥٠٠) الروذراوري: ذيل،٢٩١/٣.

(٥٠١) الفارقي: تاريخه، ١٠٨ ؛ ابن شداد: الاعلاق الخطيرة، ٣٥١/١/٣.

(٥٠٢) الفارقي: س. پ، ١٠٩.

# وتاری ئایینی

خوتبەدان بە نـاوی هـەر لایەنێکـەوە بەڵگـەی بـەهێزی پێوەنـدی نێـوان ئـەو دوو لایەنەیە، یـان سـومبولێکە لـە سـومبولەکانی سـەروەری، هـەروەها (الخطابـة) بـە پۆستێکی ئایینی گرنگ دانرا، و خاوەنەکـەی وتـار دەخوێنێتـەوە لـە نـاو خەڵکـدا و ڕۆژانی هەینی و یاد و بۆنەکانیان و بیر دەهێنێتەوە.[٥٠٣] لەسەر وتـارخوێن (الخطیـب) بوو کە ناوی میر بهێنێت.[٥٠٤] چونکە ناو هێنانی میر لە لایەن وتارخوێنەوە لـە ڕۆژی هەینیدا مافێك بوو لە مافەکانی خەلیفەکان بەو پێیەی ئەوان لـە لایـەنی ئایینیـەوە لێپرسراوی موسڵمانانن، ناوهێنانی خەلیفـە لـە وتارەکـانی هەینیـدا لـە دەوڵـەت و میرنشینە کوردیەکاندا شتێکی باو بووَ وەك باسمان کرد خاوەنی پێوەنـدی دیبلۆماسـی بوون لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا، ئەگەر چی ناوهێنانی میر لە پاڵ ناوی خەلیفەدا لە وتارەکاندا کارێکی ئاسایی بوو بۆ دەرخستنی ڕێزی میر بـۆ خەلیفـە و پاشـکۆیی بـۆ میری موسڵمانان. لێرەدا (الصابي) ڕێوڕەسمی وتارەکانمان بـۆ دەگێڕێتـەوە لـە سـەکۆی خەلیفەکانەوە، لە وتاری دووەمی پاش (دانیشتن)دا دەڵێن "خودایە، هیدایەتی بەنـدەو جێگرەکەت (عبدالله) و نازنێوەکـەی دەهێنێـت ئیمـام مـیری بـاوەڕداران، وەك چـۆن هیدایەتی خەلیفەکانی ڕاشیدی و گەورەپیاوانی ئایینیـت دا هتـد...".[٥٠٥] پێدەچێت ئەم فۆڕمە لە سەکۆکانی بەغداد لە وتاردا دەخوێندرایەوە و فۆڕمی هاوشێوە لە وتاری میرەکانی نێوچەکانی دەوروبەر دەخوێندرایەوە، هەرچەندە چی سەرچـاوەکانی بەردەسـت هیچ فۆرمێکی تەواوی ئەو وتارانـەیان بـۆ نەپاراسـتوین. میرنـشینە کوردیـەکان لـە میانەی فەرمانڕەواییاندا گرنگیان دابوو بە وتار، وتار خوێنەکان پێگەیـەکی بـەرزیان

(٥٠٣) ابن منظور: لسان العرب، ٨٥٥/١.

(٥٠٤) هوایتهد: دائرة المعارف الاسلامية – مادة الخطبة، ٣٧٠/٨.

(٥٠٥) رسوم دار الخلافة، ١٣٣.

هەبوو لە لایان، دەڵێن نازناوی میر (بدر بن حسنویه) بەم جۆرە بووە: "ناصـر الـدین و الدولة ابو النجم مولی* امیر المؤمنین"،[506] هەروەها دەڵێن میر (وهسوذان بـن محمـد) (مولی امیر المؤمنین).[507] دەستەواژەی (مـولی امـیر المـؤمنین) لـە لایـەن میرەکـانی دەوروبەرەوە بەکاردەهێنرا، نەریتی گەڕانـەوە بـۆ ڕەچـەڵەك بـۆ مـیری موسـڵمانان لـە سەردەمی (بهاء الدولة)ی بوەیهی دەگەڕێتەوە سـاڵی (۳۷۹-۴۰۳ك/۹۸۹-۱۰۱۳ز)، داواکاریش لەسـەری لەلایەن سەروکار بەدەست و دارودەستەکانەوە، زیادی کرد، چونکە پێیان وابوو پایەیان بەرز دەبێت و نزیك دەبنەوە لە نازناو.[508] سەبارەت بەوەی (ناصـر خسرو) لە بارەی وتاری هەینیـەوە دەیگێڕێتـەوە لـە نێوچـەی میافـارقین دەسـتەواژەی (مولی امیر المـؤمنین)، هـەروەها هـیچ دەسـتەواژەیەکی دیکـە کـە ئامـاژە بێت بـۆ خەلیفە.[509] ئەمە واتای ئەوە نیە کە میرەکانی مەروانی پاشکۆیەتی خۆیان لە وتـاری هەینیدا بۆ خەلیفە بەکارنەهێناوە ، بەهۆی باشی پێوەندیانـەوە لەگـەڵ خەلیفـەکانی دەوڵەتی عەبباسیدا،[510] هەروەها سیاسەتی مەروانیەکان بەنـدبور لەسـەر ئاشـتی و پێوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ هەموو هێزەکاندا بە تایبەتی لـە سـەردەمی مـیر (نـصر الدولة بن مروان)دا کە دەبوو لە وتارەکانیدا نـاوی خەلیفـەکانی دەوڵـەتی عەبباسـی بهێنێت، کاتێك (ابن الاثیر) باس دەکات کە (نصر الدولة بن مروان) توانی قەناعـەت

---

* مولی: لێرە بـەمانای لایـەنگری خەلیفـە دێـت، یـاخود پـشتگیری خەلیفەیـە یـاخود سەر بە خەلیفەیە (یوالی+یناصر).

(٥٠٦) مؤلف مجهول: مجمل التواریخ و القصص، ٤٠١.

(٥٠٧) ناصر خسرو: سفر نامە، ٥.

(٥٠٨) الصابي: س. پ،١٢٢.

(٥٠٩) سفر نامە، ٨.

(٥١٠) ابن الجوزي: س. پ، ٢٦٢/٧؛ بروانة الفارقي: س. پ، ٨٦، ١٠٤، ١٠٨، ١٥٣، ١٥٤؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ٣٧٢/١١/٦.

به (شبیب بن وثاب النمیری).[511] بکات به ناونەهێنانی فاتمیەکان و دووبارە گێڕانەوەی ناوی خەلیفە (القائم بأمر الله)ی عەبباسی (٤٣٠ك/١٠٣٨ز) [512] لە وتارەکانیدا. ئەمەش مانای وایە (نصر الدولة) ناوی عەبباسیەکانی دەهێنا.

---

(٥١١) شبيب بن وثاب النميري: خاوەنی (رەقەو سروج وحران) بووە، ماوەیەك چووە ژێر ركێفی فاتمیەکان، هەروەها ماوەیەك باجی دا بە رۆمەکان، و مەترسی بۆ سەر میرنشینی مەروانی دروستکرد و دواتر پێوەندی لەگەڵ میر (نصر الدولة) چاکرد، لە ساڵی (٤٣١ك/١٠٣٩ن کۆچی دوایی کرد. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:- (ابن الأثير: الكامل،٣٥٣/٧؛ ٩/٨، ١١، ١٦، ٢٠)

(٥١٢) ابن الاثير: الكامل، ١٨/٨؛ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: قادر محمد حسن: الأمارات الكوردية، ص١٢٤.

# پارە و لێدانی سکە

پارەو سکەلێدان لایەنێکی دیکەی گرنگ بوو کە پێوەندیە دیپلۆماسییەکانی میرنشینە کوردیەکانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، پارە، یان سکە بریتیە لە (خەتم-مۆر) لەسەر پارەکان کە ئالوگۆڕی پێدەکرێت لە نێوان خەلکدا بە ئاسن نەخشی وێنەیان چەند وشەیەکی پێچەوانە دەخنە سەر پارەکە و دواجار ئەو نەخشە لە پارەکاندا دەردەکەوێت پاشان کاری پێدەکرێت.[٥١٣] بێگومان پارە لە گرنگترین سمبولەکانی دەولەتە، چونکە پێوەندی توندی هەیە بە ئابووری و سەروەری و تیایدا دیاردە سیاسیەکان دەردەکەوێت و شێوازی بەڕێوەبردنی دەولەتی تیا ڕەنگ دەداتەوە و هەندێك پێیان وایە کۆنترۆلکردنی ئەوانی دیکەیە لەگەڵ وتارخوێندنەوە و پارەلێدان.[٥١٤] عەبباسیەکان چەند شوێنێکی سکەلێدانیان لە ویلایەتەکانیاندا هەبوو.[٥١٥] هەروەها خەلیفە عەبباسیەکان ڕێگەیاندا بەوەی ناوی میرە پاشکۆکانیان لە تەنیشت ناوی خۆیانەوە بخرێتە سەر پارە بۆیە میرەکانی پاشکۆیان کەوتنە لێدانی سکە کە لە پێشەوە ناوی خەلیفە بوو پاشان ناوی میری سەربەخۆ، بەلام بە نووسینێکی جیاواز.[٥١٦] مافی خەلیفە بوو کە ناوی لەسەر پارە هەبێت بۆ ئەوەی دەسەلاتەکەیان شەرعی بێت، هەروەها نکۆلیان لە نێوی خەلیفە نەدەکرد تەنانەت لە کاتی لاوازی خیلافەتیشدا.[٥١٧] هەولی هەندێ لە نیمچە دەولەتەکان بۆ سەربەخۆبوون لە دەسەلاتی خیلافەت و جیابوونەوە ڕەنگدانەوەی پێشووی خیلافەتە، و ئارەزوویەکە بۆ سەربەخۆیی لە دەسەلاتی نێوەند. سەرەڕای پابەندبوونی میرەکان و خەلیفە بە نەریتی سکە لێدان

(٥١٣) ابن خلدون: المقدمة،٢٦١.

(٥١٤) عباس العزاوي: تاريخ النقود العراقية لما بعد العهود العباسية، بغداد، ١٩٥٨،٥-٧.

(٥١٥) خولة الدجيلي: بيت المال نشأته و تطوره، مطبعة وزارة الاوقاف، بغداد، ١٩٧٦، ١٧٥.

(٥١٦) الكرملي: النقود العربية وعلم النميات، القاهرة،١٩٨٧، ١٢٢.

(٥١٧) محمد باقر الحسيني: العملة الاسلامية في العهد الاتابكي،٤٨.

بە ناوی خەلیفەوە، بەلام ئەمە مانایەکی گەورەی نیە لە لای خیلافەت بە پێچەوانەوە ئەمە پالپشتیە بۆ نیمچە دەولەتەکە، و وای لێدەکات جێگەی ڕەزامەندی خەلك بێت کە ڕاهاتوون بە ملکەچی بۆ خەلیفەی عەبباسی.[٥١٨] سەبارەت بە سکەلێدان لای میرنشینە کوردیەکان لەو سەردەمەدا بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان میرە کوردیەکان ناوی خۆیان و خەلیفە و نازناو و شوێن و ڕۆژی لێدانی سکەیان لە سەر پارەکە دەنەخشاند وەك گوزارشتێك بۆ پابەندبوونیان بە خیلافەتی عەبباسی و بۆ دەستکەوتنی پالپشتێکی شەرعی و میللی بۆ فەرمانڕەواییان، لەو پارانە کە دەگەڕێتەوە بۆ میر (بدر بن حسنويه) ناوی خەلیفەی تێدا نووسراوە، هەروەها میری بوەیهی (مجد الدولة) لە پشتی پارەکە، ئینجا ناوی (بدر بن حسنويه)، لە ژێر ناوی خەلیفەدا نووسراوە، هەروەها جگە لە وتار خوێندنەوە، کە ئاماژەمان پێدا، ناوی خەلیفە لەسەر پارەکان لە هەندێ لە میرنشینەکان دەنەخشێنرا کە دەتوانن لە میانەیەوە واقیعی پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی خیلافەت و میرنشینە کوردیەکان بزانن لەبەرئەوەی پارە لەگەڵ وتار خوێندنەوە بەڕووی ڕاگەیاندن دادەنرێت کە زیاتر پێوەندی دارە بەخەلك بۆ گوزارشت لەو پێوەندیە دیبلۆماسیانە، کە ڕۆلی تەنها لە ئالوگۆڕی بازرگانیدا نابینێتەوە، بەلکو ڕۆلی ڕاگەیاندن دەبینێت وەك ڕۆلی ماس میدیای ئەمڕۆ.[٥١٩] بە واتایەکی دیکە بوونی نازناوی خەلیفە لە سەرووی ناوی میری میرنشینەکەوە ئەگەر چی هەنگاوێکە لە لایەن میرەوە بە مەبەستی دەرخستنی پاشکۆیەتی بۆ خەلیفە، بەلام لەوە گرنگتر ئەوەیە ئەو پاشکۆیەتیە بە خەلك ڕابگەیەنێت بۆ دۆزینەوەی پالپشتێکی شەرعی بۆ فەرمانڕەوایی بەو پێیەی ئەو دەسەلاتەی لە دەسەلاتی خیلافەتەوە شەرعیەت وەردەگرێت وەك ڕێزێك و پێزانینێك بۆ خەلیفە. لەسەر (درهم)ێکی زیوی کە دەگەڕێتەوە بۆ میر (ابو علي الحسن بن مروان)

---

(٥١٨) يوسف العش: س. پ، ١٢٧.

(٥١٩) محمد باقر الحسيني: النقود العربية الاسلامية ودورها الحضاري والاعلامي، ٨.

سالّی (٣٨٥ك/٩٩٥ز) میرنشینی مەروانی و لە شاری جەزیرە ئەو پارەیە لیّدراوە لە رووەکەیدا "الله و محمد رسول الله (ص)، (القادر بالله). و لە ژێری (( الامیر ابوعلی الحسن بن مروان"[٥٢٠] نەخشێنراوە و نەخشی (القادر بالله) لەسەرە و ناوی میر (ابوعلي) هاتووە کە بەڵگەیە بۆ ئەو دانپیانانەی میری ناوبراو بە پاشکۆیەتی بۆ خیلافەت، هەروەها تێبینی دیبلۆماسییەتی دەکەین لەگەڵ فاتمیەکاندا[٥٢١] و گرنگی نەدان بەدەرخستنی پاشکۆیەتی بۆ خیلافەتی عەبباسی بۆیە ناوی خۆی نەخشاند لەسەر (درهم)ەکە، سەبارەت بە دیناری ئاڵتونی کە (بدر بن حسنویە) لە شاپور خواست سالّی (٣٩٧ك/١٠٠٧ز) دەریکرد ناوی خەلیفە (القادر بالله) لەسەر رووی پارەکە نەخشاند و لەژێریشی ناوی خۆی (بدر بن حسنویە).[٥٢٢] ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە (بدر) رازی بوو بە نەخشاندنی نێوەکەی (ابوالنجم ناصر الدین و الدولة) بە پێی نازناو، پێمان وایە ئەم رەفتارەی لە مەزنی و بەرزنرخاندنی پێگەی خەلیفەوە سەرچاوەی گرتووە ئەمەش لە نووسراوەکانیاندا بەدی دەکرێت. (الصابي) دەگێرێتەوە کە ئەوانەی لە لایەن خیلافەتەوە لە سەردەمی ئەودا نازناویان پێبەخشرا نازناوی خۆیان لادا لە سەر نووسراوەکانیان بۆ خەلیفەکان، تەنها ناوی خۆیان و باوکیان هێشتەوە وەك رێزێك بۆ خەلیفە.[٥٢٣] بەلاّم پێدەچێ ئەم رەفتارە نەبووبێتە بنەما و نەریتێکی گشتی لە هەموو ساتەکاندا پەیرەو کرابێ. هەروەها ناوی خەلیفە (القادر بالله) لەسەر پشتی (درهەم) زیویەکە لە سەردەمی میر (ممهد الدولة ابو

---

(٥٢٠) عبدالرقیب یوسف: الدولة الدوستکیة، ٢/ ١٠٩.

(٥٢١) الروذراوري: س. پ، ١٧٩/٣؛ ابن الاثیر:١٤٢/٧؛ القلقشندي: ماثر الانافة في معالم الخلافة، تح: عبدالستار احمد فرج، بیروت، ١٩٨٠، ٣٢٤/١.

(٥٢٢) Stanly (Lane Pool) Catalogue of the Collcction Arabic Coins Preserved in the Khadival Library at Cairo London، ١٨٩٧) P. ٣٣٥.

(٥٢٣) رسوم دار الخلافة، ١٠٥.

المنـــصور) ســالّی (٣٩٧ك/١٠٠٧ز) لــه شــاری نــصيبين دەنووســرا.[٥٢٤] ئەمــەش دووپاتكردنەوەی بەردەوامی پێوەندی دیبلۆماسییە لـە نێـوان میرنـشینی مـەروانی و خیلافەتی عەبباسـیدا. لـە سـەردەمی (نـصر الدولـة بـن مـروان)دا ئـەو پێوەندیـە بەردەوامی بەخۆوە بینی و نازناوی خەلیفە لەسەر پارەکان دەنووسرا لە میافـارقین لـە سەردەمی (نصر الدولة)دا کە دەگەڕێتەوە بۆ ئـەو لـە پـشتی پارەکـە نـاوی خەلیفـە (القادر بالله) دەنووسرا.[٥٢٥] هەروەها نازناوی خەلیفە لەسەر (درهـەم) زیوێکـە لـە ئامـــەد (دیـــار بکـــر) لـــە ســـالّی (٤١٢ك/١٠٢١ز) لـــە بازنـــەی پـــەراوێزدا دەنووسرا.[٥٢٦]ئەوەی جێی سەرنجە لـە پارەکـانی میرنـشینی مەروانیـدا سـەبارەت بـە نووسینی نازناوی خەلیفە ئەوەیە کـە نـاوی لـە یـەك شـوێنی دیـاریکراوی تایبەتـدا نەدەهات، جارێك لە چەقی پارەکەدا دەنووسرا و جارێك لە بازنەی پەراوێزدا، بـەلاّم لـە هەموو ساتەکاندا ناوی لە پاش ناوی پێغەمبەر (د.خ) و دەنووسرا لە ژێریدا ناوی مـیر بوەیهی دەنووسرا.[٥٢٧] بۆیە دەتوانین بڵێین مـیرە کوردەکـان بـە گـشتی ئـەو پێوەندیـە دیبلۆماسییەیان لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا لە میانەی پاشـکۆیەتی ڕووکەشـی بـۆ خیلافەتی عەبباسیدا، لە ڕێگەی ناوهێنانی خەلیفە لە وتـاری هەینیـدا و نووسـینی ناوی لەسەر سکە پاراست. پارە بە توخمێکی دیکە لە توخمەکانی پێوەندی بوو لە نێوان میرنشین، یان دەوڵەت، یان خیلافەتدا، ئەگـەر چـی ئەمـە بەڵگەیـەکی تەواونیـە بـۆ پاشکۆیەتی میرنشین یان دەوڵەتی بەهێز بۆ خیلافەتی لاواز.

تا ئێرە لە توێژینەوە کە باسمان لە توخمەکانی پێوەندیی دیبلۆماسی نێوان میرنشین

---

(٥٢٤) عبدالرقيب يوسف: س ـپ، ٢/١١٠.

(٥٢٥) Stanly(LanePool), Cataloge of Oriental Coins in the Britisn Maseum, (London، ١٨٨٩), Vol, Ix,.p. ٢٧٢.

(٥٢٦) محمود ياسين التكريتي: الامارة المروانية، ١٧٢.

(٥٢٧) لەسکە پارەی دینارەکەی (بدر بن حسنويه)، ناوی میری بوەیهی و نازناوەکەی لە پشتی دراوەکە نووسراوەبوو. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (حسام الدين علي غالب: الكرد، ل٣٠٧).

و دەوڵەتە کوردیەکان لەگەڵ خیلافەتی عەبباسیدا کرد، کە تیایاندا هەموو هەوڵێکیان بۆ بەدەستهێنانی ڕازی بوونی خیلافەت بوو، و لە لایەکی ترەوە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ڕای گشتی لە جیهانی ئیسلامیدا و لایەنەکانی دیکە لە توخمەکانی پێوەندی، کە لەلای هەندێ لە نیمچە دەوڵەتەکان دەرکەوت و لەلای هەندێکی دی نەما بەپێی هەڵوێستی خیلافەت لەو دەوڵەتە، و بە پێچەوانەوە هەروەها ئەو توخمانە بەڵگەنیە بۆ پابەندبوونی ئەو دەوڵەتە یان میرنشینە بە خیلافەتەوە کە لەو کاتەدا تەنها هەر ناو بوون و خۆیان بالادەست بوون لە کاروباری وڵاتی خۆیاندا و خیلافەت وای لێهات نەهێزی هەبوو نەتوانا، بۆیە سەردەمی دەسەلات و شکۆمەندی و نازناو بەخشین و وتار خوێندن و سکەلێدان...هتد، تەنها فۆرمێك بوو کە لە پشتیەوە چەندین شتی دیکەی حەشار دابوو.

## پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی کورد لەگەڵ دەسەڵاتی بوەیهییەکاندا

دەوڵەتی بوەیهی، دەوڵەتێکی سێنتراڵی خاوەن یەك دەسەڵات نەبوو، بەڵکو دەسەڵات لە نێوان ئەندامانی بنەماڵەکەدا لەو نێوچانەی دەستیان بەسەردا گرتبوو دابەش بووبوو، و میرەکانیان لەڕووی لێهاتوویی سیاسیەوە جیاواز بوون، تەنانەت تا ڕووخانی دەوڵەتەکەشیان پێتەختێکی یەکگرتوویان نەبوو، بەڵام ئەو شارەی کە بەهێزترین میریانی لێبوایە ئەوە دەبووە چەقی دەسەڵاتی دەوڵەت.[٥٢٨] دەرکەوتنی دەوڵەتی بوەیهی وەك هێزێکی دەست ڕۆشتوو بەسەر ناوەندا هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی دروستبوونی میرنشینە کوردیەکاندا، و بەهۆی دراوسێیەتی نێوچەکانی دەسەڵاتی بوەیهی لەگەڵ میرنشینە کوردیەکاندا و لەبەر چەند فاکتەرێکی سیاسی و سەربازی ئەو میرنشینانە، بۆیە شتێکی ئاسایی بوو کە پێوەندی دیبلۆماسی هەبێت لە نێوان کورد و بوەیهییەکاندا کە خۆی لە سیاسەتی نێوان شەڕو ئاشتیدا دەبینێتەوە.*

پێوەندیەکانی نێوان میرنشینە کوردیەکان و بوەیهییەکان لە سەرەتای سەرهەڵدانی بوەیهییەکاندا تاڕادەیەك دیبلۆماسی بوو، کاتێك کە سەرکردایەتی بوەیهییەکان لە نێوچەی (الجبل والری) درا بە میر (رکن الدولة) کە لە سەرچاوەکاندا بەوە ناسرابوو کە نەرم و نیانە بەرامبەر بە کورد. لە یەکەم ئاماژەی (مسکویە) سەبارەت بە باسکردنی میر (حسنویە بن الحسین الکردي) کە وتبووی پاش ئەو یارمەتیانەی (رکن الدولة) لە

---

(٥٢٨) ستانلی لین پول: طبقات سلاطين الأسلام، ١٣٥-١٣٧ ؛ف-بارتولد: تاريخ الحضارة الأسلامية، ١٠٥.

* پێوەندی نێوان شەدادیو بوەیهی زۆر خراپ بوو لە نێوان ساڵانی (٣٢٠ك/ ٩٣٣ز) کۆنترۆڵی ئەم هەرێمەیان کرد، (هەرێمی ئاران) تا هاتنی بوەیهییەکان بۆ بەغدا لە ساڵی (٣٣٤ك/ ٩٤٥ز)و بەرەسمی خیلافەتی عەبباسی ئیعترافی پێ کردن، دامەزراندنی میرنشینی شەدادییەکان مایەی مەترسیو دڵە ڕاوکێی بوەیهییەکان بوو، هاوکات شتێك بەدی ناکرێت لە بوونی پێوەندی دیپلۆماسی نێوان میرنشینی شەدادیو دەسەڵاتی بوەیهی لەو سەردەمەدا.

ململانێی دژ بە خۆراسانیەکان (سامانیەکان و هاوپەیمانیەکانیان) دەست ڕۆشتویم فراوان بوو لەبەر ئەم هۆیەش بووە جێی متمانە و ڕێزی (ركن الدولة) و هەندێ زەوی وزاری پێبەخشی، وەك باسمان کرد، و قسەکانی لەم وتەیەدا کورت کردەوە (ئەگەر شەڕ ڕووی بدایە لە نێوان خۆراسانیەکان و (ركن الدولة)دا توندڕەوی دەیلم دەردەکەوت و دەچووە پاڵیان، و خزمەتێکی وایکرد کە شایەنی پێزانین بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زەویانەی کە دەستی بەسەردا گرت و ئەوانەی کە وا لە چوارچێوە کارگێڕیەکانی، خەڵك ناچار دەکات کە بەقسەی بکەن لە پێدانی باج و سوڵتانیش گفتوگۆی لەگەڵ ناکات.[٥٢٩] (حسنویە) بەردەوام بوو لە سیاسەتی فراوانکردنی دەسەڵاتی و سەپاندنی باج و سەرانەی جۆراوجۆر لەسەر خاوەن زەوی و زارەکان، هەروەها کاروانەکانی بە هەرێمی چیادا تێدەپەڕین، لەگەڵ ئەوەشدا (ركن الدولة) خۆی بێدەنگ کرد لە تاست ئەو کارانەیدا،[٥٣٠] ئەمەش بە ئاشکرا لە وتە بەناوبانگەکەیدا دەردەکەوێت "دەوڵەتەکەم گرێدراوە بە دەوڵەتی کوردانەوە"،[٥٣١] ئەو وتەیە سەرباری ئەوەی پیاهەڵدانێکی ئاشکرایە بە کوردا و دەرخستنی ڕۆڵیان لە جێگیرکردنی دەسەڵاتی بوەیهییەکاندا، هەروەها دانپیانانێکی ناوەکیە بە میرنشینی حسنویە وەك قەوارەیەکی سیاسی کە بنچینەکانی دەوڵەت لە خۆ دەگرێت، کە خزمەتی زۆری بە بوەیهییەکان کردووە، بە جۆرێك کە میری بوەیهی دان بنێت بە چاکەی کورد بەسەر دەوڵەتەکەیەوە هەروەها ئاماژەیە بۆ بوونی پێوەندی باشی دیبلۆماسی کورد و بوەیهی لەو قۆناغە مێژوویەدا.

پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوان کورد و بوەیهییەکان بەردەوام بوو تەنانەت چوونی میر (معز الدولة)ی بوەیهی بۆ ناو بەغداد، کە پێوەندی باشی هەبوو لەگەڵ

---

(٥٢٩) تجارب الأمم، ٢/٢٧٠ ؛ابن الأثير: الكامل،٣٦٧/٥.

(٥٣٠) مسكويه: تجارب الأمم،٢/٢٧٠: ابن الأثير: الكامل، ٣٦٨/٥.

(٥٣١) مسكويه: تجارب الامم،٢/٢٧٠: ابن الأثير: الكامل، ٣٦٨/٥.

(أبو الشوك الكوردي) سەرۆك هۆزی شاژنجان و هەموو کەسە دیارەکانی کورد لە حولوان و هاوکاری سەربازی هەبوو لە نێوانیاندا سالّی (٣٣٩ك/٩٥٠ز)[٥٣٢] پێوەندییەکانی نێوان میر (دیسم بن ابراهیم) و (معز الدولة)ی بوەیهی تا ڕادەیەك باش و دیبلۆماسی بوو لە میانەی ڕووداوەکانی نێوانیان بەتایبەتی لەپاش شکستهێنانی (دیسم) لە بەرامبەر مەرزبان لە سالّی (٣٤٢ك/ ٩٥٣ز) بە پێشوزایکردنی و ڕێزگرتنی و مانەوەی لەلای بۆ ماوەیەك.[٥٣٣] و بەلّگەش بۆ بوونی ئەم جۆرە پێوەندییانە لەچوارچێوەی نامە گۆڕینەوەکانی نێوانیان بەدی دەکرێت، وەك ئەوەی (مسکویه) ئاماژەی بۆ کردووە، کە (معز الدولة)ی بوەیهی لە نامەکانی بە (الأخ أبو سالم)،[٥٣٤] ناوی هێناوە. لێرەدا جێگای ئاماژە بۆ کردنە کە هۆکاری ئەم دۆستایەتیە دەگەڕێتەوە بۆ دژایەتی (دیسم) بۆ (مرزبان)، چونکە دوژمنی میر (رکن الدولة)ی بوەیهی بوو، بە بەلّگەی ئەوەی کاتێك (رکن الدولة) پێوەندییەکانی لەگەلّ (مزربان) لە سالّی (٣٤٣ك/ ٩٥٤ز) چاك ببووە، (معز الدولة) هاوکاری نەکرد.[٥٣٥]

هەروەها (ابو الفتح محمد بن عناز) دامەزرێنەری میرنشینەکە چەندین یارمەتی پێشکەش بە بوەیهییەکان کردووە و لە سالّی (٣٨٩ك/ ٩٩٩ز)دا لەگەلّ (ابو جعفر الحجاج)ی سەرکردەی بوەیهییەکاندا بەشداری کردووە لە جەنگی دژ بە بەنو عوقەیلیەکان.[٥٣٦] هەروەها لە سالّی (٣٩٢ك/ ١٠٠٢ز)دا لەگەلّ هەمان سەرکردەدا بەشداری کردووە لە جەنگی دژ بە (ابو الحسن علی بن مزید) و بەنو عوقەیلدا، کە بەشکاندنی (ابن مزید) و لایەنگرانی کۆتایی پێهات.[٥٣٧] کاتێکیش میر (بدر بن

---

(٥٣٢) مسكويه: هـ. س،١٣٩/٢: ابن الأثير: الكامل،٣٣٥/٦.

(٥٣٣) ابن الأثير: الكامل،٦/ ٣٤٢- ٣٤٣.

(٥٣٤) تجارب الامم، ٢/ ١٤٨.

(٥٣٥) مسكويه: هـ. س،١٥٢/٢: ابن الأثير: الكامل،٣٤٣/٦.

(٥٣٦) هلال الصابي: تاريخه، ٤/ ٣٣٩.

(٥٣٧) هـ. س، ٤/ ٤٢٢.

حسنویه) له ساڵی (٣٩٧ك/ ١٠٠٦ز)دا به هاوکاری ژمارەیەك میری کورد و عەرەبدا هەڕەشەی داگیرکردنی بغدادی کرد، دەبینین (ابو الفتح) خێرا سوپایەکی نارد بۆ پارێزگاری و بەرگریکردن لێی به هاوکاری ئەو تورکانەی لەوێ بوون کە ئەمەش لە گرنگترین هۆکارەکانی پاراستنی بغداد و شکستهێنانی (بدر) و لایەنگرەکانی بوو بۆ داگیرکردنی بەغداد.[٥٣٨]

له ساڵی (٤٢٠ك/ ١٠٢٩ز)یشدا میر (حسام الدولة ابو الشوك فارس بن محمد) لەلای خۆیەوە سوپایەکی نارد بۆ یارمەتی (جلال الدولة) لەسەر داوای خۆی و بەهۆی ئەم یارمەتیەوە (جلال الدولة) توانی ئەهواز لە (كاليجار بن سلطان الدولة) بسێنێت،[٥٣٩] بەڵام (ابو الشوك) لە ساڵی (٤٢٨ك/ ١٠٣٧ز)دا، چووە پاڵ (ابو كاليجار) دژی (جلال الدولة)، دوای ئەوەی (خطبة) بۆ (ابو كاليجار) خوێندرایەوە لەبەری رۆژئاوای بەغداد.[٥٤٠]

دەتوانین بڵێین کە کورد کاری بە میتۆدی دژایەتی نەکردنی بوەیهییەکان کرد، هەروەها بوەیهییەکانیش لەلای خۆیانەوە چاوپۆشیان لە زۆر کاروچالاکی سیاسی کورد کرد،[٥٤١] ئەو پێوەندیە دیبلۆماسییانە پاش سەرهەڵدانی میرنشینەکانیش لەگەڵ هەندێ لە میرەکانی کورد مایەوە، یەکێك لە ڕووەکانی بوونی پێوەندی دیبلۆماسی دانپێدانانی دوو لایەنە بوو بەیەکتردا کە بووە مایەی چەسپاندنی پێوەندیە دۆستانەکەیان و لە ئاکامی ئەو دان پیانانە مەسەلەی پێدانی پلەوپایە کە لایەنی بەهێز دەیبەخشێتە سەرکردە و کەسایەتە دەست ڕۆشتووەکان، و لەبەرئەوەی زۆربەی میرەکانی دەوڵەت و میرنشینە کوردیەکان لە سەرۆك هۆزەکان پێکهاتبوو و بەشێوەیەکی سروشتی دەسەڵاتیان وەك نەریت بۆ مابووەوە لەگەڵ بوونی هەندێ

(٥٣٨)حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢٦١.

(٥٣٩) ابن الاثير: الكامل، ٩/ ٣٧٥؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٥٩٣.

(٥٤٠) ابن الاثير: الكامل، ٩/ ٤٥٤؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢٦١.

(٥٤١) Shaban، Islamic history،Vol،٢،P.١٧٤.

تایبەتمەندی و لێهاتوویی بۆ ئەو سەرکردایەتیکردنە، بۆیە لێرەوە دان پیانانی بوەیهییەکان بە دەسەڵاتی میرە کوردەکاندا بە شێوەی دان پیانان بە لایەنی بەرامبەری وەردەگرت لەبەرئەوەی لەنزیکەی نیوەی سەدەی (٤ك/١٠ز) کە هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی ناوەندی پێوە دیار بوو، کورد توانی لەڕووی سیاسیەوە لە نێوچەکانی خۆیاندا جێ پێی خۆیان بچەسپێنن، بەوەی میر (حسنویە کوردی) پاش ئەوەی توانی دەسەڵاتی خۆی لە نێوچەی هەرێمی چیا فراوان بکات، دەبینن میر (ركن الدولة)ی بوەیهی دەستی وەرنەدا لە کارەکانی و پێوەندی و بەرژەوەندیە هاوبەشەکانی هەردوولای لەبەر چاو دەگرت بە تایبەتی کە کوردەکان پشتیان گرت لە دژی سامانیەکان هەروەك پێشتر باسمان کرد.[٥٤٢] پاش مردنی (حسنويه) ساڵی (٣٦٩ك/٩٨٠ز) میر (عضد الدولة)ی بوەیهی دەستی لە کاروباری مناڵەکانی-میر حسنویە دەدا دوای ئەوەی لەپاش مردنی باوکیان ئاژاوە کەوتە نێوانیان، بۆیە (بدر بن حسنويه) میری کوردە برزیکانیەکان دامەزراند و هەردوو براکەی (عاصم و عبدالملك)ی[٥٤٣] بێ بەشی نەکردووە لە سەرکردایەتی نێوچەکە، بەڵکو دانی نا بە دەسەڵاتی بدرو پێگەی باوکیدا لە سەرکرادیەتیکردنی کورد لە نێوچەکە، بۆیە پێوەندیەکانی نێوان (بدر بن حسنويه) و بوەیهییەکان لە ڕووی پاراستنی پێوەندیە دیبلۆماسییەوە و بەرژەوەندیە هاوبەشەکاندا بەتین بوو بە تایبەتیش لەسەردەمی (عضد الدولة) کە دەستی هەبوو لە هەڵبژاردنی بدر لە نێو هەموو براکانیدا بۆ سەرکردایەتی کردنی کوردە بەرزیکانیەکان و نێوچەی دەوروبەریان، بۆیە یەکێك لە کارە سەرەکیەکانی بدر پاراستنی ئاسایش و دژایەتیکردنی هەر بزوتنەوەیەکی ئۆپۆزسیۆنی کورد و بەدەر لە کورد کە ببێتە مایەی

---

(٥٤٢) مسكويه: تجارب الأمم،٢/٢٧٠ ؛ابن الأثير: الكامل،٥/٣٦٨ ؛ابن خلدون: التاريخ،٤/٤/١٠٩٤.

(٥٤٣) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم، ٣/٩ ؛ابن الأثير: الكامل، ٧/١٠٤.

تێکدانی ئارامی نێوچەی ژێر دەسەڵاتی کەبەسەرپەرشتی (مؤید الدولة)* لە نێوچەی هەرێمی چیا بەڕێوەی دەبرد، بۆیە سیاسەتی (بدر بن حسنویە) پاڵدانەپاڵ بوەیهییەکان بوو لە ناکۆکیان لەگەڵ دوژمنەکانیاندا ئەمەش لەو یارمەتیانەی کە پێشکەشی (عضد الدولة)ی کرد لەشەڕی دژی (قابوس بن وشمکیر) لە ساڵی (٣٧١ك/٩٨١ز) بەئاشکرا دیارە کە بەڕاستی یارمەتی دەری بوو لە بەدەستهێنانی سەرکەوتنی لە کاتێکدا گەر یارمەتی ئەوان نەبوایە شکستی دەهێنا. لەپاش چوونە ناو شەڕ بەلەشکرێکی هاوبەشی کە لە کورد و تورکەکان پێکهاتبوو توانی ڕێگە بگرێت لە سوپای (قابوس) کە دوای سوپا بێ هێزە ماندوەکەی (مؤید الدولة) کەوتبوو.[٥٤٤] بەم هۆیەوە پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوان میر (بدر بن حسنویە) و (عضد الدولة) بەردەوام بوو تا مردنی (عضد الدولة)، بەڵام میر بدر هەر بەئەمەك بوو تەنانەت پاش مردنی (عضد الدولة)ش بەوەی ساڵانە هەزار دیناری بۆ بیست پیاو خەرج دەکرد بەمەبەستی حەج کردن بۆ دایکی و بۆ (عضد الدولة)[٥٤٥] هەروەها میر بدر دەسەڵاتێکی فراوانی هەبوو لە بیلاطی بوەیهییەکاندا بە تایبەتیش لە سەردەمی دەسەڵاتی (أم مجد الدولة)،[٥٤٦] کە بە (گەورەمان)[٥٤٧] بانگ دەکرا ئەمەش بەواتای دان پیانان بوو بەدەسەڵاتی و دەستڕۆشتوویی.

لەئاکامی مردنی (عضد الدولة) لە ساڵی (٣٧٢ك/٩٨٢ز) موڵك و سامانی دابەشکرا لە نێوان کوڕو براکانیدا، (مؤید الدولة)ی برای هەرێمی چیا و جرجانی

---

* مؤید الدولة: ناوی (ابو منصور بویە بن رکن الدولة)یە، جێگری (عضد الدولة)ی برای بوو لە فەرمانڕەوایی هەرێمی چیا، لەو پۆستە مایەوە تا مردنی لە ساڵی (٣٧٣ك/٩٨٣ز) لە هەرێمی گرگان لە تەمەنی (٤٣) ساڵیدا. (ابن الاثیر: الکامل، ٥/٤٥٤،الذهبي: تاریخ الاسلام، ٤٧٥).

(٥٤٤) الروذراوري: ذیل تجارب الأمم، ١٧/٣ ؛ ابن الأثیر: الکامل، ٥/٤٤٥-٤٤٦.

(٥٤٥) ابن الجوزي: المنتظم،٢٧٢/٧ ؛ ابن کثیر: البدایة و النهایة، ٣٧٨/١١.

(٥٤٦) مجهول: مجمل التواریخ والقصص،٣٩٨؛ابن الأثیر: الکامل،١٨٥/٧-١٨٦.

(٥٤٧) الصابي: التاریخ،٤٥٤/٤.

لەژێر دەست مایەوە، و نێوچەی (فارس و کرمان و عمان) کەوتە دەستی (شرف الدولة)ی کوڕی،[٥٤٨] عیراق و دیاربەکریش کەوتە ژێر دەسەڵاتی (صمصام الدولة)ی کوڕی، (تاج الدولة)ی کوڕیشی بەصرە و ئەهوازی کەوتە ژێر دەست،[٥٤٩] هەروەها (بدر) ڕێگری کرد لەو یاخی بوونەی (محمد بن غانم)ی بەرزیەکانی پێی هەستا لە ساڵی (٣٧٣ك/ ٩٨٤ز)دا دژی (فخر الدولة)[٥٥٠] و لە ساڵی (٣٧٩ك/ ٩٨٩ز))یشدا میر (بدر) سوپایەکی کوردیی نارد بۆ یارمەتی (فخر الدولة)، کاتێك (فخر الدولة) ویستی بغداد داگیر بکات و عێراق لەژێر دەسەڵاتی (بهاء الدولة)ی برای دەربهێنێ،[٥٥١] هەروەها دەبینین لە ساڵی (٣٨٧ك/ ٩٩٧ز)دا یارمەتی پێشکەش بە (بهاء الدولة) دەکات لە کاتێکدا سوپایەکی ئازوقە و خواردنی لێ بڕابوو لەو شەڕەی لە نێوان ئەم و (ابو الفتح بن العمید)دا ڕوویدا لە (واسط)، و نەیدەتوانی ئازووقەو خواردن بەدەست بهێنێ، بەمەش میر (بدر) سوپایەکی لەسەر ئەنجامێکی ناخۆش ڕزگار کرد،[٥٥٢] هەروەها لە ساڵی (٣٩٧ك/ ١٠٠٦ز)دا یارمەتی (شمس الدولة بن فخر الدولة)ی داوە بۆ دانیشتن لەسەر عەرشی (الری) لەجیاتی (مجد الدولة)ی برای بەداوایەك لە (السیدة)ی[٥٥٣] دایکیانەوە، لە ساڵی (٤٠٠ك/ ١٠٠٩ز)یشدا (بدر بن حسنویە) بە سوپایەکەوە ڕۆیشت بۆ یارمەتی (شمس الدولة) بۆ گێڕانەوەی عەرشی (الری)، بەڵام نەیتوانی بەهۆی یاخی بوونی (هلال)ی کوڕیەوە و دواتریش (هلال) باوکی دەستگیرکرد و سوپاکەی پەرتەوازە بوو.[٥٥٤]

---

(٥٤٨) ابن الأثير: الكامل،٥/٤٧٧؛ ابن تغرى بردي: النجوم الزاهرة، ٤/١٥٦–١٥٧

(٥٤٩) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٣/٧٩–٨٠.

(٥٥٠) ابن الأثير: الكامل،٩/٣١؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٩٧٦– ٩٧٧؛ حسام الدين على غالب: الكرد، ١٤٦.

(٥٥١) ابن الأثير: الكامل،٩/١٢٨؛ حسام الدين على غالب: الكرد، ١٤٩.

(٥٥٢) ابن الأثير: الكامل،٩/١٤١؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٩٩٦.

(٥٥٣)حسام الدين على غالب: الكرد، ٢٦٠.

(٥٥٤) مجمل التواريخ والقصص، ٣٩٨؛ تاريخ گزيده، ٤٢١.

بۆیە ئەم حاڵەتی شیرازە تێکچوون و ململانێیە بووە هۆی گەڕانـەوەی پەشـێوی بـۆ جەستەی دەوڵەتەکە.[555]

لێرەدا ئەوەی جێگەی ئاماژە بۆکردنە، میر (بدر بـن حـسنویە) خـاوەن پێگەیـەکی تایبەتی بوو لای میر (بهاء الدولة)ی بوەیهی[556] کە دانی بە دەسەڵاتیدا ناو هەوڵیـدا کە لەلایەن دەوڵەتی عەبباسیـشەوە حـسابی بـۆ بکرێـت، و خیلافـەت دانـی نـا بـە دەسـەڵاتی بـدر لـە نێوچـەکانی ڕۆژئـاوای (هـەرێمی چـیا)، ئەمـەش لەسـەر داوا و نووسراوی (بهاء الدولة) بوو،[557] ڕێزگرتنی (شمس الدولة)ی*[558] بـوەیهی بـۆ بـەدر گەشتە ئەو ئاستەی بە گەورەم و برام (ناصر الـدين والدولـة أبـو الـنجم)[559] مـیری موسڵمانان ناوی ببات و بەکارهێنانی وشەی (مولای) واتە بەدر پێگەی بـەرزترە لـەم پاشکۆیەی ئەو.[560]

لە سەردەمی میربادی کوردی بوەیهییەکان لە دژایەتیـەکی بـەردەوام بـوون لەگـەڵ مـەروانیەکاندا، پاش بەهێزبوونی لە نێوچەی (دیار بکر) بە جۆرێك کـە بـووە مایـەی مـەترسی بۆ سەر دەسەڵاتی بوەیهی لە نێوچەی موصل، و لەبەرامبەر شکستی هەوڵـە

---

(٥٥٥) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٣/٧٧-٨٥؛ سبط ابن الجوزي: مراة الزمان،٢٢٠-٢٢١ ؛ابن الأثير: الكامل،٥/٤٤١ ؛ابـن العـبري: تـاريخ الزمـان،٦٩ ؛ابـن العـبري: مختـصر الـدول، ١٧٢. الكامل،٧/١٠٤.

(٥٥٦) ابو الفداء: المختصر،٢/١٤٣؛الذهبي: العبر،٢/٢٠٥

(٥٥٧) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم، ٣/١١؛ابن العبري: المنتظم،٧/٢٠٢.

* شمس الدولة: ناوی (طاهر بن فخر الدولة)یە میری بوەیهییەکان بوو لەسەر (همدان) پاشان دەسەڵاتی (الری) گرتە دەست لە ساڵی (٣٩٧ك/١٠٠٦ز) بۆ ماوەی یەك ساڵ لـە سـەر كار لابرا، پاشان جارێکی تر ساڵی(٤٠٥ك/١٠١٤ز)حوکمی وەرگرت تا ساڵی (٤١٣ك/١٠٢٢ز) (ابن الاثير: الكامل،٧/٢٧٤،٢٣٧، ٣٠٧)

(٥٥٨) ابن الأثير: الكامل،٧/٢٣٧.

(٥٥٩) مجهول: مجمل التواريخ،٤٠١.

(٥٦٠) حسام الدين على غالب: الكرد،١٦٦.

سەربازیەکانی بوەیهی و حەمدانیەکانی هاوپەیمانیان لە شکستهێنان بە باد و میرنشینەکەی، بۆیە ڕێگەی تیرۆرکردنیان گرتەبەر بەوەی (أبن حمدان) پیاوێکی نارد تاکو باد بکوژێت لە خێوەتەکەی خۆیدا، ئەو پیاوە توانی بە نهێنی بچێتە خێوەتەکەی میر باد و بە شمشێرەکەی کە پێی وابوو دەکێشێ بەسەریدا کێشای بە قاچیدا، بۆیە میر باد هاواری کرد و پیاوەکەش ڕای کرد، و باد نەمرد و بۆ ماوەیەك نەخۆش کەوت، بەڵام ئەمە نەبووە ڕێگر لەبەردەمیدا بۆ کۆکردنەوەی سوپایەك بۆ شەڕی داهاتوو،[561] هەرچەندە (سعد الحاجب) هەوڵیدا ئەم هەلە بقۆزێتەوە بۆ لەناوبردنی باد بەڵام هاوەڵاتی بەقسەیان نەکرد.[562]

دۆخەکە بەو جۆرە بەردەوام بوو تا میر (باد بن دوستك) داوای ئاشتی لە (زیار بن شهراکویە) و(سعد الحاجب) کرد، ئەم بیرۆکەیە پەسەند بوو لای زیار بەهۆی شکستی هەموو هەوڵەکانی دژ بە باد، هەروەها درێژەکێشانی شەڕی نێوان هەردوولا، دواجار لە ساڵی (٣٧٤ك/٩٨٤ز) ڕێکەوتن بەوەی نێوچەی دیاربەکر و نیوەی ڕۆژئاوای (گور عابدین) بۆ باد بێت،[563] بەمەش ڕێکەوتنی نصیبین تارادەیەکی زۆر بووە هۆی دیاریکردنی سنووری نێوچەی میرباد کە بریتی بوو لە (دیار بکر و میافارقین و حصن کیفا..هتد) لە شار و قەڵاکان بەهۆی ڕێککەوتننامەی نصیبین پێوەندی نێوان دەوڵەتی بوەیهی کە خۆی لە دەسەڵاتی (سعد الحاجب) و میر بادی کوردی ڕێچکەی خۆی گرتەوە، کاتێك کە گروپێکی کوردی هەکاری هەڵیانکوتایە[564] سەر شاری موصل و تاڵانیان کرد، میرباد کە ئەوکاتە لە (حصن کیفا) نیشتەجێ بوو هێرشی بۆ

(٥٦١) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٨٧/٣ ;ابن الأثير: الكامل،٤٦٢/٥ ;ابن خلدون العبر،٢٥٢/٤.

(٥٦٢) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٨٧/٣.

(٥٦٣) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٨٧/٣.

(٥٦٤) ياقوت الحموي: معجم البلدان،٨٤/٥.

بردن و زۆربەیانی کوشت و موصلی ڕزگار کرد لە شەڕیان.[٥٦٥] بۆیە خەڵکی موصل زۆریان خۆش دەویست.[٥٦٦]

مەبەستی دەوڵەتی بوەیهی لە ڕێکەوتننامەی (نصیبین) پاراستنی سنووری باکووریان بوو بەوەی کە نێوچەی ژێر دەسەڵاتی باد ببێتە بەربەستێك لە نێوان ئەوان و دەوڵەتی بیزەنتیدا.

سەبارەت بە پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوان میرنشینی مەروانی لە سەردەمی میر (ممهد الدولة)ی کوڕی لەگەڵ خیلافەتدا پێوەندیەکی باش بوو ئەمەش بەهۆی ملکەچی و گوێڕایەڵی میر بۆ خیلافەت، سەبارەت بە خیلافەتیش، پێشتر نازناوی (الممهد) بە (أبو المنصور)[٥٦٧] لەلایەن خەلیفە (القادر بالله) ئەمە جگە لە نازناوی دیکە کە پادشای بوەیهییەکان (بهاء الدولة) و(فخر الدولة)ی وەزیری بەخشیان.[٥٦٨]

دانانی (إبن أبو الشوك) وەك پارێزەرێکی ڕێگەی بەغداد-خوراسان و دامەزراندنی حکومەتێك لە حولوان کە سەر بە خیلافەت بوو، وەك نەریتێکی باو (معز الدولة) چەند بارمتەیەکی لە بۆ زامنکردنی بەندەیی (أبن أبو الشوك)ی کوردی وەرگرت[٥٦٩]، و لەترسی ئەوەی نەك ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە بەندەی هێزێکی دیکە ئەمەش بەهۆی شوێنی جوگرافی هۆزی شاذنجان کە کەوتبووە نێوچەیەکی ستراتیژی گرنگەوە کە نێوچەکەی لە نێوچەی (رکن الدولة)ی برای جیا دەکردەوە، بەڵام (أبن أبو الشوك) بە جۆرێکی دیکە دەیڕوانیە مەسەلەکە، چونکە گرنگ نەبوو بەلایەوە وەك پاسەوانێکی نێوچەکە بێنێتەوە، لە هەمان کاتیشدا پێوەندیە دیبلۆماسییەکان لەگەڵ بوەیهییەکاندا بپارێزن کە ئەو کاتە هێزێکی هەژمونکار بوون (مهیمن) لەسەر

---

(٥٦٥) الفارقي: تاريخه،٥٥.

(٥٦٦) الفارقي: هـ-س،٥٦.

(٥٦٧) القلقشندي: صبح الأعشى،٣٠/٦ ؛ الباشا: الألقاب الأسلامية، ٥٠٩-٥١٠.

(٥٦٨) الفارقي: تاريخه،٨٦؛ ابن شداد: الأعلاق الخطيرة، ٣٢٤/٣١١.

(٥٦٩) مسكويه: تجارب الأمم، ١٥٦/٢.

گۆڕەپانەکە، بەڵکو ئەوەی گرنگ بوو بەلای (أبو الشوك)ەوە گەڕاندنـەوەی بارمتـەکان بوو بەهەر شێوەیەك بێت، بەپێی نەریتی باوی هۆزەکـانی یـان بـەهۆی پێوەنـدی بـەو هەرێمە جوگرافیەوە، تەنانەت گەر ئەمە ببێتە هۆی ڕووبەڕووبوونەوە لەگـەڵ دەسـەڵاتی ناوەندا، بۆیە لە ساڵی (٣٤٢ك/٩٥٣ز) دەستدرێژی کردە سەر ئەو شـاندەی خەلیفـە (المطیع لله) ناردبووی بۆ خۆراسان بۆ بەستنی ڕێکەوتنێك لە نێـوان (ركـن الدولـة) و (نوح بن نصر السامانی)،[٥٧٠] کاتێك شاندەکە گەڕایەوە بۆ حولوان لەڕێگەیان بـەرەو بەغداد (أبن أبو الشوك) هەڵی کوتایە سەریان و توانی هەنـدێکیان بـەدیل بگـرن و کاروانەکە تالان بکەن بەم جۆرەش هەلێك ڕەخسا بۆ (أبو الشوك) تا داوای بارمتـەکانی بکاتەوە لە (معز الدولة) بەتایبەتیش کە لەناو دیلەکاندا (أبو مخلد)ی تێدا بـوو.[٥٧١] بەڵام (معز الدولة) ئەم کارەی (أبو الـشوك)ی هـەروا بـە سـانایی لـەبیر نـەکرد کـە ئاسایشی و ئارامی نێوچەکەیان تێکدا، بۆیە هەرزوو داوای لە (سـبكتكين الحاجـب)* کرد کە سوپایەك ئامادە بکات بۆ لەناوبردنی (أبو الشوك) و پیاوەکانی، و ئـەوەی بـۆ چووەسەر و سوپاکە چووە ناو حولوان بڕیاری (أبن أبو الـشوك) و کوردەکانیـدا،[٥٧٢] و تا ملکەچی نەکردن نەگەڕایـەوە.[٥٧٣] لـەم ماوەیەشـدا پێوەندییـەکانی دەرەوەی (بنـو

---

(٥٧٠) مسكويه: تجارب الأمم، ٢/١٥٥؛ابن الأثير: الكامل،٥/٣٠٤ لێرەدا جێی ئاماژە پێدانە کە (ابن ابو الشوك) نەیتوانی حاجبی خەلیفە (ابن ابو عمر و الشرابي) بەدیل بگرێت. بەڵام توانی (ابو مخلد عبدالله بن يحى) هاوڕێی (معز الدولة)ی بوەیهی بەدیلی بگرێت (مسکویە، تجارب الأمم، ٢/١٥٥–١٥٦)؛ هاوکات (ابن الأثير) باسی ئەم وردەکاریانەی نەکرد و گێڕانەوەی کەوا لە (مسکویە) وەرگرت.

(٥٧١) مسكويه: تجارب الأمم،٢/١٥٦.

* سبكتكين الحاجب: بەرچەڵەك تورکی بوو، لە گەورەترین فەرماندەکانی (معز الدولة) و (بختیار عز الدولة)ی کوڕی بوو، لە ساڵی (٣٦٤ك/٩٧٤ز) کۆچی دوایی کرد. (قادر محمد حسن:الامارات الكردية، پەراوێزی (٤)، ل٢١.

(٥٧٢) مسكويه: تجارب الامم،٢/١٥٦.

(٥٧٣) مسكويه:هـ. س،٢/١٥٦؛ابن الأثير: الكامل،٥/٣٠٤.

عەناز) دەم دەم لەگەڵ هەردوو بەشەکەی بوەیهییەکاندا بوو: بەشی بەغداد کە (عضد الدولة) بەڕێوەی دەبرد، و بەشی (الري) کە (رکن الدولة) بەڕێوەی دەبرد، بەڵام لە ڕۆژئاواوە شاژنجانییەکان گیرۆدە بوون بە کێشە و ململانێی هۆزگەری بەردەوامەوە لە نێوان (بنو عوقەيل) و (بنو مزيەد)، و لە خۆرهەڵاتیشەوە نێوچەکانی سەر بە کوردەکانی بەنو حەسنەوەیە جیای کردبوونەوە لە (الري)، لەم سەردەمەشدا تا ڕادەیەك سەربەخۆ بوون و سکەی پارەیان بەناوی خۆیانەوە لێدابوو. (أبن أبو الشوك) و بەندەیی بۆ بوەیهییەکان بووە بەلایەنێك لە ململانێی نێوانیان، لە ڕووداوەکانی ساڵی (٣٨٩ك/٩٩٩ز) و لەکاتی هەوڵی (بهاء الدولة)ی کوڕی (عضد الدولة) بۆ کۆنترۆڵکردنی هەرێمی فارس و خوزستان،[٥٧٤] و تۆڵەسەندنەوە لە کوڕەکانی (بختيار عز الدولة) کە براکەیان کوشت.[٥٧٥] أبو الفتح (١٠٠) سواری لە عەشرەتی شاژنجان بەسەرکردایەتی (مناح الكوردي) نارد [٥٧٦] بۆ یارمەتی (بهاء الدولة) بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوە لە دوژمنەکانی، و (أبو علی) داوای لێکردن وەك هێزێکی إستطلاعی "بن و فەرمانی پێدان کە هەرسێ لە السوس هەڵکەوتەوە بیکوژن یان بیبەن".[٥٧٧]

لەبەر ئەو پێوەندیە دیبلۆماسییانەی نێوان میر (أبو الفتح) و بوەیهییەکان، جێگری دەوڵەت لە عێراق (أبو جعفر الحجاج) داوای لێکرد بەشداری بکات لە شەڕی دژ بە عەرەبە عقیلیەکان لە موصل لە ساڵی (٣٨٦ك/٩٩٦ز)دا،[٥٧٨] ئەویش بەشداربوو هەر لەبەرئەوەش ڕێزی لێنرا بەوەی پاراستنی شاری دسکەرەی خرایە ئەستۆ.[٥٧٩]

سەرباری ئەمانە میر (أبو الفتح محمد بن عناز) پێوەندی دیبلۆماسی توندوتۆڵی

---

(٥٧٤) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٣/٣٠٩-٣١١ : ابن الأثير: الكامل، ٥/٥٣٧-٥٣٨.

(٥٧٥) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٣/٣١٤-٣١٥: ابن الأثير: الكامل،٥/٥٣٢ : ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة،٤/١٩٧-١٩٩ : ابن الوردي: تاريخه،١/٣٠٤.

(٥٧٦) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٣/٣١٥-٣١٦.

(٥٧٧) الروذراوري: ذيل تجارب الامم، ٣/٣١٦.

(٥٧٨) الروذراوري: س. پ، ٣/٢٨٠-٢٨١.

(٥٧٩) ياقوت الحموي: معجم البلدان،٢/٤٥٥.

هەبوو لەگەڵ هەندێ لـە سـەرکردە بوەیهییەکانـدا تـاکو لـە قـەیران و گرفتەکانـدا هاوکاری بکەن لە دیارترین ئەو سەرکردانە (أبو فارس بهستون بن ژریر)،[٥٨٠] کـە یەکێك بوو لە هاورێ نزیکەکانی هەرکاتێ تووشی شەڕ و ئاژاوە ببوایە کە هـەر خێـرا بە فریای دەکەوت، بۆیە کاتێـك لـە سـاڵی (٣٩١ك/١٠٠١ز) ڕووبـەڕووی هێرشـێك بووەوە لە هەرێمی چیا،[٥٨١] ڕاستەوخۆ داوای یارمەتی لە بەغداد کـرد، ئـەوانیش لـە هەڵمەتێکدا (بهستون)یان بە سوپایەکەوە لە لایەنگرانی بۆ نارد تا بچێ بەهانایـەوە، پاش گەڕانەوەیان لەو شەڕە و پشوودان لە (خالدیە)، هۆزی (بنوسیار) هێرشیان کـردە سەر مەڕوماڵاتی ئەو نێوچەیە و تاڵانیان کرد، بۆیە بێستون لەگـەڵ هـەردوو براکـەی (الفارض و الأعرابي) و سێ لە لایەنگرانی لە عەشیرەتی دەیلم هێرشیان کردنە سـەر، بەڵام لەو هێرشەدا بهستون دەکوژرێت و جەنازەکەی دەبەنەوە بـۆ بەغـداد.[٥٨٢] لێـرەدا جێی ئاماژە بۆکردنە کە (أبو الفـتح بـن عنـاز الـشاذنجانی) بـەهۆی بەهێزیـەوە لـە نێوچـەی حولـوان و یارمەتیـدانی بوەیهییـەکان لـەڕووی سـەربازییەوە هـەروەها بوەیهییەکان دانیان بەدەسەڵاتیدا نا و کردیانە پارێزەری نێوچەی دسکەرە. هەروەها میر (بهاء الدولة) کردیە بەرپرسی حولوان ئەمە جگە لەوەی کە کرا بە پـارێزەری ڕێگـەی خۆراسان لە سـاڵی (٣٩٧ك/١٠٠٧ز).[٥٨٣] بەمـەش (أبـو الفـتح) تـوانی نێوچـەی دەسەڵاتی فراوان بکات لە دەرئەنجامی ئەو هۆکارانەی سەرەوە تێدەگەن کە هەڵوێـستی بوەیهییەکان لەمەڕ میر (أبو الفتح) مەبەستدار بووە تاکو بیکەنە کێبڕکێکـاری (بـدر بن حسنویە) کە یەکێك بوو لە دیارترین میرەکانی ئەو سـەردەمە بەڵگـەش بـۆ ئـەوە ئەوەبوو میر بدر بێزار بـوو لـە هەڵوێـستی بوەیهییـەکان و دەستپێـشخەری کـرد لـە ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازیدا.

---

(٥٨٠) هلال الصابي: تاريخه،٤/٤٠٢-٤٠٣.

(٥٨١) هلال الصابي: هـ. س،٤/٤٠٣.

(٥٨٢) هلال الصابي: تاريخه،٤/٤٠٣.

(٥٨٣) ابن الأثير: الكامل،٧/٢٣٢ ؛ ابن خلدون: العبر،٤/٥/٩١٨.

میر (أبو الفتح) پێوەندییەکی دۆستانەی هەبوو لەگەڵ بوەیهییەکانـدا و ئـەمانیش لەکاتی تەنگانەدا پشتیان پێ دەبەست هەر لەبەر ئەمەش بـوو کـە (هـلال الـصابی) نازناوی (النجیب)ی[٥٨٤] پێ بەخشی، بـەڵام دوای ئـەوەی (بهـاء الدولـة) وەك جێگـری (علي بن استاذ هرمز عمید الجیوش) لەبری (أبو جعفر الحجاج)* دانرا نێوان هەردوولا تێکچوو تا گەیشتە ئەو رادەیەی ئاڵۆزی و گرژبوونی نێوانیان بگاتە ئاستی یاخی بوون و هەڵگەڕانەوە.

(الصابی) کە تەنها کەسە ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: ئەو هۆکارە وایکرد (أبو الفتح) هەڵوێستی یاخی بوون هەڵبژێرێ، بەڵام ئەو توندیەی کـە پێـشەوای سـوپاکان بـەکارهێنانی لـە کـاتی هـاتنی بـۆ بەغـداد بـەهیوای لـە نـاوبردنی عیاریـەکان و ئاژاوەگێڕەکان،(٥٨٥) بووە هۆی دەسـتدرێژیکردنە سـەر هەنـدێ لـە لایـەنگرانی (أبـو الفتح)، هەرچۆنێك بێت (أبو الفتح) لە سـاڵی (٣٩٢ك/١٠٠١ز) تـوانی قەناعـەتی پێبکات کە بچێتە ژێر سایەی سوپای (عمید الجیوش)(٥٨٦) و پەیمانیان پێدا کـە کـار بکەن بە دڵی ئەو، بەمەش (أبو الفتح) بەرێکەوتن لەگەڵ سوپای (عمیـد الجیـوش) و بەم جۆرەش پێوەندیە دیبلۆماسییەکان لە نێوانیاندا وەکو جاری جاران گەڕایەوە.(٥٨٧)

جاوانیەکانیش لەگـەڵ دەسـەڵاتی بوەیهیـدا کـە نێوچـەی زۆر فراوانـی ڕۆژهـەڵاتی ئیسلامیان لەژێر دەستدابوو پێوەندی دبلوماسیان هەبوو.

بوەیهییەکان هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیانەوە پێوەندیـەکی باشـیان هـەبوو لەگـەڵ

---

(٥٨٤) تاریخه، ج٤/ص٣٣٨-٣٣٩، ٤٢٢-٤٢٤.

* ابو جعفر الحجاج: کوری هرمزە جێگری (بهاء الدولة) لە عیراق کەسێکی بە ئەزموون بوو لە شـەڕەکاندا، لـە سـاڵی (٤٠٠ك/١٠١٠ز) کۆچـی دوایـی کـرد. (الـصفدي: الـوافي بالوفیـات، ج١١/ص٣١٥، ابن کثیر: البدایة والنهایة، ٣٦٦/١١/٦).

(٥٨٥) ابن الأثیر: الکامل، ٥٥١/٥-٥٥٢؛ ابن کثیر: البدایة و النهایة، ٣٣٠/١١ ؛ ابن تغري بـردي: النجوم الزاهرة،٢٠٦/٤؛ ابن خلدون: العبر، ٤٦٩/٤.

(٥٨٦) هلال الصابي: تأریخه، ٤٤٩/٤.

(٥٨٧) هلال الصابي:تاریخه، ٤٤٩/٤.

کوردا- وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا- کۆنترین تێکستیش کە باس لەو پێوەندیە دیبلۆماسییە بکات لە نێوان جاوانی و بوەیهییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٣٩٢ك/١٠٠٢ز) کاتێك کە (أبو جعفر الحجاج) جێگری دەوڵەتی بوەیهی لە عێراق داوای یارمەتی لێکردن بۆ ڕێگە گرتن لە فراوانبوونی دەسەڵاتی (عقیلی و مزیدیەکان) لە نێوچەکەدا، بۆیە جاوانی و شازنجانیەکانیش بەیەکەوە هاوکاری بوەیهییەکانیان کرد بە ناردنی (٢٠٠) سوارچاك لەو شەڕەشدا توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن،[٥٨٨] لە ساڵی (٤٣١ك/١٠٣٩ز) میر (أبو الفتح) داواکاری (بهاء الدولة)ی پەسەند کرد بۆ لەناوبردنی یاخی بووە تورکەکان لە شاری بەغداد و پاراستنی ئارامی و ئاسایشی شارەکە.[٥٨٩]

(٥٨٨) هلال الصابي: تاريخه، ٤/٤٢٢-٤٢٤، حسام الدين علي غالب: الكرد، ص ٢٠٣-٢٠٤.

(٥٨٩) ابن الجوزي: المنتظم،٨/١٠٤-١٠٥ ؛ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٥/٣١-٣٢.

# پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی کورد لەگەڵ دەوڵەتی فاتمیدا

فاتمیەکان بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوای شیعە پەیڕەوی وڵاتی میسر بوون و لە نێوان ساڵانی (۲۹۷- ٥٦٧ك/ ۹۰۹- ۱۱۷۱ز)دا فەرمانڕەوایەتی وڵاتی میسریان دەکرد،[٥٩٠] لەبەرئەوەی دەسەڵاتەکەیان دژ بە خیلافەتی عەبباسی بوو، هەوڵیاندا پشتگیری حکومەت و میرنشینەکانی بەری ڕۆژهەڵات بە حکومەت و میرنشینە کوردییەکانەوە بەدەست بهێنن، لەم ڕووەوە (الحاكم بأمرالله)ی[٥٩١] فاتیمی لە هەوڵێکی دیبلۆماسییدا نامەی بۆ چەند سەرکردەیەکی بەری ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی عەبباسی نووسی کە لە ناویاندا (ابو الشوك بن ابو الفتح العنازي) یەکێکە لەوان و تیایدا داوای لێکردبوون دان بە مەزهەبی شیعەی فاتیمیدا بنێن و لە خیلافەتی عەبباسی دوور بکەنەوە، بەڵام (ابو الشوك) وەڵامی نامەکەی نەدایەوە،[٥٩٢] بە گەیشتنی فاتمیەکان بۆ وڵاتی شام سەرەتای پێوەندییەکانی نێوان فاتمیەکان و کورد دەستی پێکرد، ئەوە بوو ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان لە سەرەتای سەردەمی ئیسلامی لەو نێوچانە نیشتەجێبوون، بەتایبەتی لە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی هاوسنووری هەرێمی جەزیرەوە،[٥٩٣] هەروەها لەکاتی هاتنی فاتمیەکان بۆ دیمەشق، هەندێك لە پیاوانی هۆزە کوردییەکان چوونە خزمەتی ئەم دەوڵەتە و پلەوپایەی دەوڵەتیان وەرگرت، بۆ نموونە کاتێك فەرمانده (ابراهيم بن جعفر الكتامي) لە مانگی محرم ساڵی

---

(٥٩٠) محمد جمال الدين سرور: الدولة الفاطمية في مصر، القاهرة، ١٩٧٤،ص ٦٧- ٦٨.

(٥٩١) محمد عبدالله عنان: الحاكم بامر الله واسرار الدعوة الفاطمية، القاهرة، د. ت، ص١٦١.

(٥٩٢) حمدالله المستوفي القزويني: تاريخ گزيده،ص ٣٠٥.

(٥٩٣) ابن القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، بيروت، ١٩٠٨، ١- ٣: ابن الاثير: الكامل، ٧/ ١٧٦- ١٨٠.

(٣٦٤ك/ ٩٧٥ز) كۆنترۆڵی شاری دیمەشقی کرد میری کوردەکان بەنێوی (أبو الثريا)*
وەك (صاحب الشرطة) دامەزراند.[٥٩٤]

هاوکات کۆمەڵێك لە فەرمانده و میرە کوردەکان چوونەتە خزمەتی دەوڵەت و سوپای فاتمیەکان لەوانە فەرمانده (ابو الحجر احمد بن الضحاك الكوردي) کە پێوەندی بە سوپای فاتمیەکانەوە کرد و خزمەتێکی گەورەی کرد لە دژی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی پێشکەشکردن،[٥٩٥] ئەوە بوو لە ساڵی (٣٨٧ك/ ٩٩٧ز) تا (أبو الحجر احمد بن الضحاك الكوردي) داستانێکی کەم وێنەی تۆمار کرد بە سوپای فاتمی گەمارۆ دراو لە (حصن افاميه) لە کەنارەکانی وڵاتی شام بەدەرچوونی بەتەنها بۆ لای سەرکردەی بێزەنتیەکان و توانی بیکوژێت، موسڵمانەکان هاواریان کرد وتیان "دوژمنی خوا کوژرا" ئەمەش بووە هۆی شکستهێنانی ڕۆمە بیزەنتیەکان.[٥٩٦]

لە دەوروبەری ساڵی (٤٢٠ك/ ١٠٢٩ز) شاری (حماه) بەدەستی میر (سهم الدولة خليفة بن جيهان الكوردي)[٥٩٧] بوو، پێی دەچێت جێگری فاتمیەکان بێت بەسەر ئەو شارەدا، بەبەڵگەی ئەوەی (حماه) و هەندێك لە شارەکانی باکووری وڵاتی شام لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو.

لەوکاتەی دەوڵەتی فاتمی وڵاتی شامی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی لە سنووری کوردستان نزیك بووە بەتایبەتی لەگەڵ میرنشینی مەروانی، چونکە هاوسنووری یەکتر بوون، ئەوەبوو لەکاتی دامەزراندنی میرنشینی مەروانی خیلافەتی فاتمی پێشوزای لەم

---

* ابو الثريا: زانیاریمان نیە لەسەر (ابو الثريا) بەتایبەتی دەربارەی پێوەندیکردنی بە سوپای فاتمیەکان جگە لەوەی کە خەڵکی (بانیاس)ە.

(٥٩٤) ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج ٢/ ص٢٦٤.

(٥٩٥) زرار صديق توفيق: النفوذ الفاطمي في بلاد الكورد، مجلة جامعة دهوك، عدد خاص (٣)، المجلد (٢)، تموز ١٩٩٩، ص٤٥٤.

(٥٩٦) المقريزي: اتعاظ الحنفا، ١/ ٢١٢.

(٥٩٧) الرذراوري: ذيل تجارب الامم، ٢٢٨؛ القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، ٥١– ٥٢.

هەنگاوە کرد، چونکە ئەو نێوچانە لە دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ خیلافەتی عەبباسی دابڕا.[598]

کارێکی ئاسایی بوو کە خیلافەتی فاتمی هەوڵی ڕاکێشانی ئەم میرنشینەی دەدا بەلای خۆیدا لە دژی خیلافەتی عەبباسی، بۆ نموونە یەکێك لەو پێوەندییە دیبلۆماسییانەی نێوان میرنشینی مەروانی و دەوڵەتی فاتمی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی (بکجور)ی والی فاتمیەکان بەسەر شاری دیمەشق پێوەندی لەگەڵ وەزیری فاتمیەکان (یعقوب بن کلس) تێکچوو و ببوە هۆی دوورخستنەوەی لە دیمەشق، و لە (الرقة) گیرسایەوە (نیشتەجێبوو)، لەوێوە نامەیەکی نووسی بۆ (باد بن دوستك) کە وەڵامی نەبوو، ڕەنگە وەڵام نەدانەوەی باد بۆ (بکجور) پاراستنی پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی بێت لەگەڵ خەلیفەی فاتمی.[599]

پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوان کورد و فاتمیەکان هەنگاوێکی باشتری هاویشت بەتایبەت لەپاش کوشتنی میر (باد بن دوستك) لە ساڵی (٣٨٠ك/ ٩٩٠ز) و هاتنی خوشکەزاکەی (ابو علی الحسن بن مروان) بۆ سەر دەسەڵاتی میرنشینی مەروانی، کە توانی کارێکی دیبلۆماسی گرنگ ئەنجام بدات لە چوارچێوەی کارە چاکەکانی، ئەوەبوو پێوەندی دیبلۆماسی نێوانیان بەرەبەرە ڕووی لە زیادبوون و گەشەکردن بوو بەرەو فراوانی دەچوو بەتایبەتی لەکاتی فەرمانڕەوایی خەلیفەی فاتمی (العزیز باللە المعتز ٣٦٥-٣٦٨ ك)، کە نوێنەری دیبلۆماسی خۆی ناردە دەوڵەتی دۆستەکیی کوردی و لەلایەن کاربەدەستانەوە پێشوازییەکی گەرم و شکۆداری لێکرا، بەشێوەیەکی بەرچاویش لەلایەن خاوەنی دیوانی نامەو دارشتن، کە لەم سەردەمەدا وەزارەتی دەرەوە جێی گرتۆتەوە، نوێنەر دیبلۆماسییەکان هەمیشە بەگەرمی پێشوازییان لێکراوە و ڕێزیان لێگیراوە و بەشێوەیەکی ڕەسمی بەپیریانەوە دەچوون، کە چاویشی بەمیر حەسەن

(٥٩٨) البغدادي: الفرق بين الفرق، بيروت، ١٩٧٧، ٢١٥.

(٥٩٩) القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، ٣١؛ ابن الاثير: الكامل، ٧/ ١٥١؛ عبدالرقيب يوسف: س. پ، ٢/ ٣٣.

کەوتووە بەگەرمی پێشوازی لێکراوە و هەردووکیشیان گفتوگۆی ئاشکراو بێ پێچ و پەنایان دەربارەی کێشەکانیان کردووە، نوێنەرەکە بێ ترس و دوودڵی، ڕای خۆی نیشانداوە و هەڵوێستی وڵاتەکەی دەربڕیوە، لەڕاستیدا کێشەکەشی ئازاد کردنی (ابو عبدالله الحمداني) بوو کە هێزەکانی مەڕوانی، لەکاتی هێرشهێنانا بۆ سەر وڵاتەکەیان، لەگەڵ براکەیدا، (ابو طاهر) دەستبەسەریان کردبوو. لە ئەنجامی ئەم هێرشەدا، دامەزرێنەری دەوڵەتی مەڕوانی میر باد کوژرا. هەر لەئەنجامی ئەو گفتوگۆیەشدا بوو هەردوولا گەیشتنە ئەنجامێك کەوایان پێ باشتر بوو ئاشتی باڵبکێشێتە سەر وڵاتەکانیان و داری دۆستایەتی لە وڵاتەکانیاندا بڕوێ، نەك شەڕ و کوشتن و ماڵوێرانی... هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو میر حەسەن فەرمانی بەرەڵڵاکردنی عەبدوڵڵا حەمدانی دەرکرد.[٦٠٠]

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە دەوڵەتی مەڕوانی چەند ڕێزی لە نوێنەرە دیبلۆماسییەکان و دیبلۆماسییەت وەك پێوەندو ڕەوشت گرتووە و هەروەها گرنگییەکی زۆری پێداوە و لەسنووری دەرنەچووە، تەنانەت لەکاتی گەشتوگوزاریشدا ڕێز لە نوێنەرانی وڵاتانی دیکە گیراوە و ژیانیان پارێزراوە و دیاریشیان پێشکەش کراوە.

وڵاتە گەورەکانی نێوچەکە شاندی خۆیان ڕەوانەی دەوڵەتی مەڕوانی کرد بە مەبەستی پیرۆزباییکردنی نوێ (ممهد الدولة سعيد) ئەوە بوو شاندی ڕەسمی دەوڵەتی عەبباسی لەلایەن خەلیفە (القادر بالله)وە بۆ پیرۆزبایی و دانپیانانی دەسەڵاتی و هەروەها شاندی سوڵتانی بوەیهی (بهاء الدولة) و شاندی ڕەسمی خیلافەتی فاتمیش لەلایەن خەلیفە (الحاكم ابن العزيز) لەگەڵ ناردنی کۆمەڵێك دیاری و شتی بەنرخ بەنامەیەك دانی نا بەدەسەڵاتی حکومەتی کوردیدا، هاوکات دەوڵەتی بیزەنتی دانی بەحکومەتی (ممهد الدولة) کرد، جگە لەمانە کەوا باسمان کردن، شاندی عەشائری

---

(٦٠٠) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (زرار صديق توفيق: النفوذ الفاطمي في بلاد الكورد، ٤٥٣-٤٦٠).

نێوچـەکانی کوردسـتانی نێوەڕاسـت بـۆ مەبەسـتی پێـشکەشکردنی تەعزیەنامـە و هاوکات پیرۆزبایی لە پاشای نوێ و پشتگیریکردن لە دەسەڵاتی نوێی حکومەت دەهاتن بۆ دەوڵەتی مەڕوانی.[٦٠١]

لێرەدا جێگەی ئاماژە بۆکردنە کەوا میرنشینە عەرەبییەکان کەوتنە ژێر کاریگـەری دەوڵەتی فاتمی لە نێوچەکانی (موصڵ، حەلەب، حلله و ترابلوسـی شـام) و بـوون بـە شـیعە وەك (حەمدانییـەکان و عەقیلیـەکان و مەزیدییـەکان)، بـەڵام بەپێـچەوانەوە میرنشینە کوردییەکان وەك (حسنویەو عەنازی و مەروانی و شـەدادی...هتـد) لەسـەر مەزهەبی سوننی مانەوە، جگە لە (نصر الدولة، ٤٠١-٤٥٣ك) کە بۆ ماوەی یەك ساڵ لەسـەر داوای بـساسیری وتـاری بـەنێوی فاتمییـەکان خوێنـدەوە لـە سـاڵی (٤٨٧ك/ ١٠٩٤ز)، لەمەشـەوە دەگەینـە ئـەوەی کـە خەلیفـەکانی فـاتمی هـەوڵی ڕاکێـشانی فەرمانڕەوایانی ئـەم میرنـشینەیان داوە کـە قورسـایی شـەرعیەتی زیـاتر بـۆ پایـەی خیلافەتی لە میسر بۆ درووست ببێت و دژایەتی خیلافەتی عەبباسی لـە بەغـدا پـێ بکەن، لەلایەکی تـرەوە ئەوپـەڕی دیبلۆماسـییەتی فـەرمانڕەوایانی ئـەم میرنیـشنەی دەرخست کە لەیەك کاتدا دۆسـتایەتی دوو خیلافـەتی ئیـسلامی ڕقەبـەری یـەکتریان ڕاگرتبوو.

---

(٦٠١) الفارقي: تاريخه، ٨٦؛ عبدالرقيب يوسف: س. پ، ١/ ١٤٢.

# بەشی سێیەم

# دیبلۆماسییەت و بەرژەوەندیە بازرگانیەکان و جەنگ

## تەوەری یەکەم

- بەرژەوەندییە ئابوورییەکان و کاریگەری لەسەر پێوەندییە دیبلۆماسییەکان
- پێوەندی ئابووری و بازرگانی لە نێوچە کوردییەکاندا
- پێوەندی دیبلۆماسی و بازرگانیەکانی کورد لەگەڵ رژمی بیزەنتەدا
- مامەڵەی بازرگانیکردنی کورد لەگەڵ هێزەکانی دەورووبەردا
- بەڵگانەی فراوانی ڕەهەندی ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەسەلمێنن

## تەوەری دووەم

- دیبلۆماسییەت و جەنگ
- دیبلۆماسییەت و چارەسەرکردنی کێشەکان بەڕێگەی ئاشتی
- ئەمانەت و پەنابەری سیاسی
- دیوانی دارشتن و رۆڵی لە نامەکاری دیبلۆماسییدا
- پرۆژەی ژن و ژنخوازی سیاسی

# تەوەری یەکەم
# بەرژەوەندییە ئابوورییەکان و کاریگەری لەسەر پێوەندییە دیبلۆماسییەکان

بەرژەوەندیە ئابووریەکان لەپاڵ فاکتەرە سیاسیەکاندا کاریگەری بەهێزیان هەبوو، بۆ سازدانی زەمینەیەکی ڕەخساو و لەبار بۆ هەریەك لە موسوڵمانەکان و بیانیەکان لەئەنجامدانی پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوانیان و بەستنی پەیماننامە و ڕێکەوتنەکان لەپێناو بەدیهێنانی بەرژەوەندیە ئابووریەکان کە هەردوولا بە تەنگیەوە بوون و بەتایبەتی ئەو بەرژەوەندیانەی کە پەیوەست بوون بە کاروباری بازرگانیەوە.

گومانی تێدانیە، ئابووری بەهێز بۆ دەوڵەت بڕبڕەی پشتی و نهێنی بەردەوامیەتی و سیاسەتی حکومەتەکە بەو ئاراستەیەدا دەبات، و هۆکاری خۆشگوزەرانی گەل و ڕۆڵەکانیەتی، و فاکتەری هێز و پێشکەوتن و بوژاندنەوەی مادیشیەتی. بوژانەوەی دەوڵەت بۆ سەقامگیری ئابووریەکەی دەگەڕێتەوە، ئەو سەقامگیریەش ڕەنگدانەوەی لەسەر پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی دەبێت کە وەختە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا لەسەر چالاکی و جموجۆڵی بازرگانی پاوان بێت، لەکاتێکدا گەشەکردن و پێشکەوتنی شارەکان و دروستکردنی پێوەندی دیبلۆماسی بەندە بەو چالاکیەوە، وێڕای بڵاوبوونەوەی تۆڕی کەناڵەکانی بازرگانی سەر زەوی و دەریایی کە لە هەمان کاتدا بەندن بە سەقامگیری ئابووریەوە: (إبن خلدون) دەڵێ "خۆش گوزەرانی ڕەعیەت (میللەت) بەپێی حاڵی دارایی دەوڵەتە، و دارایی دەوڵەتیش بەپێی خۆش گوزەرانی

میللەت و گەشەکردنی وڵاتە، و سەرچاوەی هەمووشی ئاوەدانکردنەوەیە"،[٦٠٢] بەر لەو برگەیەش بەتۆزێك، ئاماژە بە پێوەندی نێوان گەشەکردنی شارستانی و کاریگەریە ڕاستەوخۆکانی لەسەر ژیانی دانیشتوان و بوژانەوەی ئابووری دەکات، کاتێك وتی "هەرکاتێك داهات و خەراج زیادی کرد، ژیانی دانیشتوان ئاسودە دەبێت و وڵاتیش گەشە دەکات".[٦٠٣] بازرگانی وڵات لە بەروبوومە کشتوکاڵی و پیشەسازییەکاندا لە نێوان ناوەندی بەرهەمهێنان و نێوچەکانی بەکارهێناندا دەگوێزرایەوە ئەویش بە گوێرەی پێویستی ئەو نێوچانە و بازاڕەکانیان بەروبوومی زیاد لە پێداویستی خودی ناوچەکان لەلادێوە دەگوێزرایەوە بۆ شارە نزیکەکان و لەوێشەوە بۆ شارەکانی تر. ڕۆژهەڵاتناس (ئەلیسیف) دەڵێت: زۆربەی بەروبوومە کشتوکاڵیەکانی نێوچەکانی دەوروبەری دەگوێزنەوە بۆ جەزیرەی ئیبن عومەر و لەوێشەوە بۆ شارەکانی تر.[٦٠٤] بەهەمان شێوەش بەروبوومە پیشەسازییەکان شاری (نصیبین) لە دەفر و قاپ و شمەکە دروستکراوەکان لە شوشەی چاك دەگوێزرانەوە شارەکانی دیکەی جزیرە.[٦٠٥] بەهەمان شێوەش گۆڕینەوەی شمەك لە نێوان شارە کوردیەکان و ناوچەکانی تردا. بەروبوومەکانی شاری (شنۆ)ی ئازەربیجان دەگوێزرێتەوە بۆ شارەکانی هەرێمی جەزیرە.[٦٠٦] ئەو بەرووبوم و شمەکانەی لە دەرەوە دەهێنران برێکیان دەگۆڕدران بۆ بازرگانی نێوخۆیی ئەویش بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی بازاڕەکان، بەو شێوەیە ڕێگەی وشکانی شێوازێکی بنەڕەتی بوو بۆ گواستنەوەی شمەکەکان لە نێوخۆدا.[٦٠٧] هەمان شێواز لەبەروبوومەکانی شەکردا بەکار دەهێنرا و دەگۆڕدرا بۆ بازرگانیەتی نێوخۆیی، چونکە

---

(٦٠٢) المقدمه، ١٠٠٩/٣.

(٦٠٣) هـ_س، ٩٩٦/٣.

(٦٠٤) مادة جزيرة ابن عمر: دائرة المعارف الأسلامية، ٤٤٦/١١.

(٦٠٥) مؤلف مجهول: حدود العالم من المشرق الى المغرب، تحـ: يوسف الهادي، الدار الثقافية للنشر، القاهرة، ١٩٩٩، ١١٨.

(٦٠٦) مينورسكى: مادة اشنه، دائرة المعارف الأسلامية،٢٢٢/٢.

(٦٠٧) ابن كثير: البداية والنهاية،١٨٤/١٣.

بازرگانی نێوخۆی وڵات شێوازی دابەشکردنی بەروبووم و شمەکە هاوردەکان بوو.[٦٠٨] بەو پێودانگە بازرگانی نێوخۆیی پێوەندی توندوتوڵی بەهێزی هەبوو لەگەڵ بازرگانی دەرەکیدا و لەژێر کاریگەری ئەودا بوو. یەکێکی دیکە لە چالاکی و جموجۆڵەکانی بازرگانی نێوخۆی ئەو بەروبوومانە بوون کە تایبەت بوون بە هەندێك لە نێوچەکانی وەك بەروبوومی (دار) لە نێوچە جەنگەڵ و دارستانەکاندا، هەروەها بەروبوومەکانی گوێز و پەنیر و هەنجیر...هتد. هەندێك نێوچەش بەناوبانگ بوو لە بەرهەمهێنانی زۆربەی جۆرەکانی میوەدا: هەندێك نێوچەی دیش ماسی و...هتد. دەرکەوتووترین ئەو شارانەی بە جموجۆڵی بازرگانی ناوخۆوە ناویان دەرکردبوو (میافارقین و هەمەدان و ئامەد) بوو بازرگانی نێوان شارەکانی زۆر بەهێز و رێکخراو بوو بازارەکانیش بەهۆی پێوەندیە بازرگانیە نێوخۆییەکانەوە پتەوتر بوون.[٦٠٩]

ئەو بەرەوپێشچوونەی لە سەردەمی عەباسیەکاندا بەسەر کۆمەڵگەدا هات لە ئەنجامی گەشەکردنی شارستانیەتەوە بوو، کە کۆمەڵگەی لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە گواستەوە، ئەوەبوو ژیانی تازە پێویستی بەکاڵا و پێداویستی نوێ بوو لە زەروریات و لە کەمالیات کە ئەم پێداویستیانەش بوون بەهۆی گەشەکردن و بوژانەوەی بازرگانی نێوان بەغدا و وڵاتانی خۆرهەڵات.[٦١٠]

چینی باڵادەست هێزی کڕین پێکدێنن، بەهۆی داهاتی زۆرەوە توانای کڕینی هەر کاڵایەکیان دەبێت کە دەکەوێتە بازارەکانەوە، ئەمەش وای کردووە ببنە هێزێك یاخود پشتیوانێك بۆ گەشەپێدانی جموجۆڵی ئابووری و دروستکردنی پێوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ هێزەکانی تردا بۆ ئەنجامدانی پرۆسەکانی فرۆشتن و کڕین، ئەمەش بازرگانانی هاندا کە رێوشوێنی گەشتی بازرگانی بگرنە بەر بۆ وڵاتان و شارانی دەووبەر بۆ

---

(٦٠٨) عبدالمجيد حسن ولي وعلاء الدين الريس: احوال العراق الأجتماعية والأقتصادية، مطبعة الرشيد، بغداد، ١٩٤٦، ١٨٦.

(٦٠٩) ابن الأثير: الكامل،١٩/٧.

(٦١٠) حمدان الكبيسي: اسواق بغداد،٨٠.

دابینکردنی پێداویستەکانی ئەو توێژە،[٦١١] بازرگانی کاڵا و کەلوپەلی هەمەجۆر لە نێوان شارە جیاوازەکان و مەرکەزی خیلافەتدا بایەخی خۆی هەبوو لە ڕووی بەکێشکردن و هێنانی بازرگانانی دیکە لە زۆربەی هەرێم و وڵاتانی ترەوە بەهۆی ئەوەی کە دەوڵەمەندان و دەست ڕۆیشتوان و سوڵتان لە مەرکەزی خیلافەتدا کۆبووبوونەوە. لەو بارەیەوە (أبن الفقيە) جەخت دەکاتەوە و دەڵێت: "ئەوەی لە هەمەجۆری و جیاوازی خێروبێری هەرێمەکان دەکەوێتەوە، بوژانەوە و گەشەکردنی بازرگانیە بەهۆی زۆری کاڵا و بابەتی خوازراوەوە لە هەرێمێکی دیاریکراو، نەبوونی ئەو کاڵایانە لە هەرێمێکی دیکە، ئەمەش دەبێتە هۆی درووستبوونی ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوانیان".[٦١٢]

ئاشکرایە ئەو نیمچە دەوڵەتە سەربەخۆیانە، هەوڵیان دەدا هەمان ڕێگەو شوێنی خیلافەتی عەبباسی بگرنە بەر، لەڕووی زیادەڕۆیی لە خەرجی و ڕابواردن و ڕازاندنەوەی کۆشکی خیلافەت و باڵەخانە و تەلاری بنەماڵە و دەستوپێوەندەکانی. بۆیە مەحاڵ بوو دەبوو کاڵای پێویست بهێنێت بۆ ئەو مەبەستە، ئەمەش یەکێك بوو لەو فاکتەرانەی کە بزوتنەوەی بازرگانی لە جیهانی ئیسلامیدا بە ئاراستەیەکی نوێدا برد لەدوای جیابوونەوەی هەرێمەکان لە خیلافەتی عەبباسیدا.[٦١٣]

ئاشکرایە گەر دەوڵەتێك یەکگرتو بوو هیچ جۆرە باج و گومرگێك لەسەر ئەو کاڵایانە دانانرێت کە لە نێوان هەرێمەکانیدا ئاڵوگۆڕ دەکرێن، بەڵام جیابوونەوەی هەرێمەکان وای کرد کە باج و گومرگ لەسەر ئەو کاڵاو کەلوپەلانە دابنرێن کە لە پرۆسەی بازرگانیدا دێنە ناوەوە. کاتێك بوەیهییەکان هاتنە ناو بەغداوە هەوڵیاندا چالاکی بخەنە نێو بزوتنەوەی بازرگانیەوە و ئەو ڕێگر و بەربەستانەش لابەرن کە دەهاتنە بەردەم پرۆسەی بازرگانیەوە، هەندێ لە میرەکانی بوەیهی و وەزیرەکانیان چاودێریەکی وردی پرۆسەی بازرگانیان لە وڵاتەکەیاندا پەیڕەو دەکرد و سنوورێکیان بۆ

---

(٦١١) حمدان الكبيسي: هـ-س، ٧٩.

(٦١٢) مختصر كتاب البلدان، ٢٥١.

(٦١٣) انور الرفاعي: الأسلام في حضارته و نظمه، ٣٠٨.

چاوچنۆکی بازرگانان دانا، ئەو دەستانەشیان بڕی کە یاری بە نرخی کاڵاکان دەکرد، بەتایبەت شاردنەوە و دەستبەسەراگرتنی خۆراك و دانەوێڵە، هەڵسان بە هێنانی کەلوپەل و دانەوێڵە لەسەر حسابی خۆیان و فرۆشتنی بەنرخێکی گونجاو. لەو بارەیەوە (الروذراوری) دەڵێ: "میر أبو منصور - الوزير محمد بن الحسن بن صالحان- ئامادەی دیدارێکی خەڵك بوو لە شاری بەغداو مەدائن، و سکاڵایان لەدەست خراپی حاڵی خۆیان لاکرد، توانی لەسەر دەستی ئەو کاروبارەکان ڕێکبخات، و داوای کرێکاری کرد و ئەرکی دروستکردنی خانوو تەلاری خستنە ئەستۆ، و بینی نرخ بەرزە و ڕۆژی (نان) بەزەحمەت دەست دەکەوێت، پرۆسەی هێنانی دانەوێڵە و دەغڵ ودانی لە وڵاتی فارسەوە لەرێگەی دەریاوە و لە هەموو وڵاتێکەوە دابین کرد". [٦١٤]

ئەو جموجۆڵە بازرگانیانە یارمەتیدەرێك بوو بۆ بوژانەوە و گەشەکردنی بازرگانی و دروستبوونی پێوەندی بازرگانی لە نێوان گەلێ لە شارەکانی نێوچەکە، ئەمەش بەدەوری خۆی بوو بەهۆی دروستبوونی پێوەندی دیبلۆماسی لە نێوانیاندا.

---

(٦١٤) ذيل تجارب الأمم،١٣٧.

## پەیوەندی ئابووری و بازرگانی لە نێوچە کوردییەکاندا

لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژە بەوەکرا کە خەلیفەکانی عەبباسی هەر لە سەرەتاوە توندوتیژییان لە دەسەلاتدارێتی حوکمدا گرتە بەر لە سەرجەم ئەو شوێنانەی کە لەژێر دەستیاندا بوو، بەلام ئەم حوکمە بەشێوەیەکی بەردەوام نەبوو، بەلکو وردە وردە یەکێتی نێوان ولاتەکانی لەدەست دەداو، ئەو ولات و هەرێمانەی لەژێردەستیاندا بوو لەیەکتر جیادەبوونەوە، هەروەها پەیوەندی نێوانیشیان بەرەو گۆڕان دەچوو بەگوێرەی ئەو قۆناغە شلۆقانەی کە خیلافەت پیایا تێپەڕ دەبوو. ئەو میرنشین و دەولەتانەی کە لە خیلافەتی عەبباسی جیابووبوونەوە تەنها پێوەندی دیبلۆماسی لە نێوانیاندا مابووە جگە لەوەش برێك پارەی لە داهاتی بۆ دەنارد، بەلام سەرقالبوونی خەلیفەکان بەو نەهامەتیەی کە تووشی ببوون هەلی بۆ هەندێ لە کاربەدەستان ڕەخساند کە لێی جیاببنەوە و دەولەتی بچووکی نیمچە سەربەخۆ بۆ خۆیان دابمەزرێنن، بەلام سەرەڕای ئەمەش پارەیان بۆ خیلافەت دەنارد لەسەر شێوەی دیاری یان بارمتە.

بەلام هەندێ جاریش پارەیان نەدەنارد و یاخی بوونیان ڕادەگەیان و خەلیفەش سوپای ئامادەکرد بۆ دەست بەسەراگرتنی. کە ئەمەش کاریگەرییەکی زۆر گەورەی دەکردە سەر (بیت المال) و بەشێوەیەك لەشێوەکانیش کاری دەکردە سەر داهاتی دەولەت. لە ئەنجامدا خانەی پارە هەندێ جار زیادی دەکرد و هەندێ جاریش کەمی دەکرد.

لە سەردەمی (هارون الرشید) لە سالی (١٧٠-١٩٣ك/٧٨٦-٨٠٨ز)دا داهات گەیشتە (٥٣٠,٣١٢,١٠٠) درهەم کە ئەمەش لەکاتی دەسەلاتدارێتی دەولەتدا بوو پێش ئەوەی ئەملا و ئەولا لێی جیاببێتەوە،[٦١٥] بەلام لەسەردەمی دەسەلاتدارێتی (مأمون) گەیشتە (٣٩٦,١١٥,١٠٠)[٦١٦] درهەم و لە سالی (٢٥٠ك/٨٦٤ز)دا

---

(٦١٥) الجهشياري: الوزراء والكتاب، ٢٨١- ٢٨٨.

(٦١٦) ابن خلدون: المقدمة، ١٥٠.

گەیشتە (٢٩٩,٢٥٦,٣٤٠) درهەم.[٦١٧]

لێرەدا دەبینین کە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان لیستی یەکەم و کۆتاییدا و هۆکەشی جیابوونەوەی دەوڵەتەکان بوو. لە خیلافەتی عەبباسی و لەدەستدانی داهاتەکانی، شایانی باسە گرنگترین هۆ کە پێوەندی ئابووری و بازرگانی نێوان خیلافەتی عەبباسی و دەوڵەت و میرنشینەکانی نێوچەکە بۆمان دەردەخات بواری (بازرگانی)یە.

بازرگانی گرنگترین بنەمای ئابوورییە کە مرۆڤ لەدێر زەمانەوە پەیڕەوی کردووە، ئیسلامیش گرنگیەکی زۆری پێداوە هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ﴿یاأیها الذین آمنوا لا تأکلوا أموالکم بینکم بالباطل إلاّ أن تکون تجارة عن تراضٍ منکم ولا تقتلوا أنفسکم ان الله کان بکم رحیما﴾،[٦١٨] هەروەها پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ ﴿علیکم بالتجارة فأن فیها تسعة اعشار الرزق﴾ و هەروەها دەفەرمووێ ﴿التاجر الأمین الصدوق یحشر یوم القیامة مع الصدیقین والشهداء﴾[٦١٩] جگە لەوەی کە پێغەمبەر (د.خ) خۆشی لەبواری بازرگانیدا کاری کردووە و لەحسابی خۆی بازرگانی کردووە و چووە بۆ ولاّتی شام.

پێشکەوتنی کۆمەڵگەی کوردی لەم ماوەیەدا پایەیەکی گەورەی هەبوو ئەمیش بەهۆی ئەو پێشکەوتنەوە بوو کە لە کۆمەڵگەدا گۆڕانکاری بەرچاوی بەخۆوە بینی و خەڵکی لە خۆشگوزەرانی و فراوانبوونی نێوچەی جوگرافیای میرنشینە کوردییەکاندا بووە هۆی فراوانبوونی پێداویستیەکانی ژیان کە ئەمەش بووە هۆی زۆربوونی چالاکی بازرگانی. "بازرگانی وریا هیچ شتێك زیادە نابات کە هەموو خەڵك پێویستی پێی نەبێت لە دەوڵەمەند و هەژار و سوڵتان و کڕیار"،[٦٢٠] پێوەندی بازرگانی و ئابووری

---

(٦١٧) ابن خرداذبة: المسالك والممالك، ٢٤٩- ٢٥٢.

(٦١٨) سورة فاطر، الآية رقم ٢٩.

(٦١٩) الغزالي: احياء علوم الدين، ٧٠- ٧١.

(٦٢٠) ابن خلدون: المقدمة، ٣٩٦.

بووه سیمایەك لە سیماكانی میرنشینە كوردییەكان و كاروانە بازرگانییەكانیان بە هەموو دنیادا دەسوڕایەوە و بازرگانی كورد پلەی یەكەمی گرتە دەست لە بازرگانی لە نێوچەكەدا میرنشینە كوردیەكان لەوماوە مێژووییەدا گەشەكردنێكی زۆری لە هەموو بوارەكانی ژیاندا بەخۆیەوە بینی، بۆ ئەمەش پشت بەكتێبی (البلدانیون) و مێژوو نووسە ئیسلامیەكان دەبەستین لەمەڕ پێوەندی ئابووری و بازرگانی و زۆری پارە و داهاتی هەندێ لە میرە كوردەكان و هۆكەشی دەگەڕێتەوە بۆ سەربەخۆیی ئەو میرانە و هەڵسوكەوتكردن بەداهاتی نێوچەكە.

لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی (٤ك/١٠ز)ی چوارەمی كۆچی، دەیەمی زایینی، سەرەڕای ئەو ئارامی سیاسییەی نێوچەكە بەخۆیەوە بینی و دوای دەركەوتنی میرنشینەكان، میرە كوردەكان گرنگیەكی زۆریاندا بەلایەنی ئابووری و كاریان بۆ بوژاندنەوەی سەرچاوەی وڵاتەكەیان دەكرد و شوێنی جوگرافی و گونجاوی كەش و هەوا و بارانی زۆر و بەپیتی زەوی وای كردووە كە كشتوكاڵ و بەروبوومەكانی ببێتە كۆڵەكەی پشتی ئابووری میرنشینە كوردییەكان كە ئەمەش سیمایەكی دیاربووە لە مێژووی ئابووری وڵاتە كوردیەكان لەدێر زەمانەوە،[٦٢١] بەڵام ئێمە سەرچاوەیەكی وردی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییە دەربارەی شێوازی بەرهەمهێنان لەو نێوچەیەدا لەو ماوەیەی كە باسكراوە سەبارەت بەزانینی گرنگی بەرهەمهێنان و چالاكی كاری ئابووری، چونكە ئەو چالاكیانە لەسەر شێوازی بەرهەمهێنان دیاریكراوە و پیادە دەكرا، واتە ئەو ڕێگەیەی كە كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی چالاكی بەرهەم هێنان ڕێك دەخات و كاردەكاتە سەر ژیانی كۆمەڵایەتی و ئابووری.[٦٢٢]

گرنگی میرنشینە كوردییەكان لە بنیاتنانی پێوەندی ئابووری و بازرگانی لەگەڵ دراوسێكانیدا لەچاوچێوەی پێوەندییە دیپلۆماسیەكانە كە لەگەڵ ئەو دراوسێیانە

---

(٦٢١) عبد الستار طاهر شريف: المجتمع الكردي، ص٣٣.

(٦٢٢) Paul Knox and john agnew، the Georgra phy of the world Economy، ١٩٩٤، P.٧ .

هەیەتی و دوورکەوتنەوە لە چوونە نێو کێشەکە لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە و هەڵبژاردنی ئاشتی و هاوڕێیەتی لەگەڵ گەلە موسڵمان و مەسیحیەکانی نێوچەکە کارێکی ستراتیژی بوو لە سیاسەتی دیپلۆماسی وڵاتدا. ئەم پێوەندییە ئابوورییە بووە هۆی هاندان و بەرەوپێشچوونی بازرگانی و دواتر بازرگانە بیانیەکان بەئاسانی دەیانتوانی بێنە نێو ئەم میرنشینە کوردییانە بێ ئەوەی تووشی هیچ گێچەڵێك بن لەلایەن دەوڵەت و بەبێ ئەوەی ترسێکیان هەبێت لەسەر موڵك و ماڵیان لە دزین و ڕاو و ڕووتکردن.

جێی ئاماژەپێکردنە کە هێمن و ئاسایشی وڵات وایکردبوو ئەو ڕێگە بازرگانیانەی کە دەبەسترێنەوە بە وڵاتانی بیانی زۆر هێمن و ئارام بێت لەدەست چەتە و ڕێگرەکان.

بازرگانە موسڵمان و ناموسڵمانەکان هیچ ترسێکی ڕاو و ڕووت کردنەوەیان نەبوو کاتێ کە هاتووچۆیان لە نێو میرنشینە کوردییەکاندا دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا تووشی زۆر کرداری دزی و ڕاو و ڕووت کردنەوە دەبوون لەو وڵاتانەی کە ئاسایشی تێدانەبوو، ئەویش لەڕێگەی چەتەو ڕێگرەوە و هەندێك جار لەلایەن سەربازانی دەوڵەتیشەوە، بۆ نموونە لەکاتی لاوازی و سەرەولێژی خیلافەتی عەبباسی ڕەنگە وەزیرێك بە سەرکردەیەکی سەربازی تەماحی کردبێتە خواردن بۆ سەربازەکانی و سەربازەکان دەچوونە دەرەوە و ڕێگەیان لە هەموو کەسێك دەگرت و پارە و موڵك و ماڵیان دەبرد و دەستیان دەگرت بەسەر کاروانە بازرگانیەکانیاندا.[٦٢٣]

دیپلۆماتانی کورد شەڕنەویستبوون، بۆیە هەموو هەوڵیان لەپێناوی ئاشتیدا بووە بۆ ئەوەی سوود لە ئاشتی وەربگرن و بتوانن لەو کەشوهەوایەدا قەوارەیەك بۆ کورد دابمەزرێنن و لەژێر دەستەیی ڕزگاربن و ئاسوودە بژین و پەرە بەکاری کشتوکاڵ و بازرگانی و ئاوەدانی وڵاتی خۆیان بدەن و بەرەوپێشەوەی ببەن، هەروا لەلایەکی دیکەشەوە پێوەندییە بازرگانییەکانی نێوان دەوڵەتی دۆستەکی و بیزەنتی و عەبباسی

(٦٢٣) جرجي زيدان: تاريخ التمدن الأسلامي، ٤/١٩٠.

و فاتمی زۆر سوود بەخشبوون و بوونەتە هۆی دامەزراندنی ژێرخانی ئابووریی وڵات، پاشان میری کەوتۆتە دارشتنی (دراو)، بێگومان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی ئەو کارە ڕووداوێکی گرنگبووە.

## پێوەندی دیبلۆماسی و بازرگانیەکانی کورد لەگەڵ ڕۆمی بیزەنتەدا

میرنشینە کوردیەکان لە میانەی تۆڕێکی فراوانی ڕێگەوبانی بازرگانی ئارامدا بەستراببوون بە هەرێم و هێزەکانی دەوروبەرەوە، بەهۆی هەڵکەوتە بازرگانییە ستراتیژییەکەیەوە بایەخێکی زۆری هەبوو، چونکە دەکەوتە نێوەڕاستی عێراق و دەوڵەتی بیزەنتەوە و نێوچەی خۆراسان و باکووری ئێران و نێوەڕاستی ئاسیای بە عێراق و شامەوە دەبەستەوە لەلایەکەوە، دەوڵەتی بیزەنتی و مەمالیکە نامسوڵمانەکانیشی لە باکوورەوە بەیەکەوە دەبەستەوە لەلایەکی ترەوە، لەوماوەیەدا بایەخی نێوچەی بازرگانی زیادی کرد بەهۆی سەقامگیری ڕەوشی سیاسی کە تاڕادەیەك نێوچەکە بە خۆیەوە بینی، ئەمەش بوو بەهۆی گەشەکردنی ئابووری و کاریگەریشی لەسەر گرنگیدان بە ڕێگەوبانەکانی بازرگانیەوە هەبوو. هەروەك هەندێ لە میرەکانی کورد بایەخێکی زۆریان بەو ڕێگەوبانە بازرگانیانەدا کە بە وڵاتەکەیاندا تێدەپەڕین. و ئاوەدانیان کردەوە و سنوورێکیان بۆ چەتە و ڕێگرەکان دانا کە گەلێك جار کاروانە بازرگانیەکان ڕووبەڕووی دەبوونەوە، چونکە کاتێك کورد دەسەڵاتیان بەسەر نێوچەکانی خۆیاندا گرت دەستیان کرد بە دامەزراندنی چەندین ناوەندی بازرگانی و بایەخیشیان بەو ڕێگایانەدا کە بەرەو ئەو ناوەندانە دەچن ئەمەش بوو بە هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ جموجۆڵی بازرگانی بوەیهی،[٦٢٤] بەهۆی بوونی ڕێگر و چەتەکان، چونکە بەهێزی و بێ هێزی حکومەتەکان، فاکتەری سەرەکی بوو لە ڕۆڵ و چالاکی ڕێگر و چەتەکان.[٦٢٥]

پێوەندییەکانی دەوڵەتی دۆستەکی و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، لەسەرەتادا زۆر کز و نابووت بووە، چونکە شەڕ پتر ڕەنگیداوەتەوە، ئەوەش لەبەرئەوە بووە کە دەوڵەتی بیزەنتی بەشێکی لە خاکی دۆستەکی داگیرکردووە و دەستی بەسەردا گرتووە، میر (باد)ی دۆستەکیش هەمیشە هەوڵی یەك لەدوای یەکی داوە کە ئەو پارچە خاکە

(٦٢٤) Shaban,Islamic History, Vol,٢,P,١٧٤.

(٦٢٥) D.S.ed(Richards), Islamand the Trade of Asia,(Oxford:١٩٧٠), P,١٦.

ڕزگار بکا و دوژمن وەدەرنێ، بێگومان ئەو ویستەش هۆی هەرەبەهێزی ئەو شەڕ و شۆڕە بووە، شەڕ و شۆڕیش هۆی هەرە بەهێزی بێ هێزیی پێوەندیی دیبلۆماسیی بووە.

ئەو برە پێوەندییەی هەشبووە هەر کاتی و هی تاکە یەك ئارەزوو بووە، ئەویش بۆ گواستنەوەی لاشەکەی کوژراو بریندارەکانی بەرەی شەڕ بووە، بەم پێیە پێوەندییەکە کاتی بووە، نەك هەمیشەیی، ئەمە جۆری پێوەندیی دیبلۆماسییان بوو تاکو ساڵی (٣٧٢ك)، ئیدی لەو ساڵە بەدواوە بەرە بەرە پێوەندییەکان پەرەیان سەند، بەتایبەتی لەدوای گەڕانەوەی میر (باد) لە موسڵ، میر پیاوێکی زاناو عاقڵ بوو، وای بەباش زانی کە ئاشتی پێویستییەکی گرنگە و دەبێ لەو کاتەدا باڵبکێشێتە سەر وڵاتەکەی، بۆ ئەم مەبەستەش ئاگربەستێکی لەگەڵ بەستن، مەبەستیشی وابوو بەم ئاگربەستە ئیش و کارەکانی خۆی هەڵبسوورێنێ، چونکە بوەیهییەکان بەشێکی زۆریان لە وڵاتەکەی داگیر کردبوو.

میر نوێنەری خۆی ڕەوانەی وڵاتی بیزەنتییەکان کرد و دیاری و پارەوپوولی زۆری بۆ ناردن، بۆ ئەوەی ئەو دیاری و پارەوپوولە پاڵپشتی توندوتۆڵیی کارە دیبلۆماسییەکانی بن دەیزانی زار دەخوا، چاو شەرم دەکا، لەگەڵ هەموو کەس و لە هەموو کاتێکدا کاری خۆی دەبێ و لە هەموو پێوەندییەکدا پارسەنگی تەرازووە، لەئەنجامی گفتوگۆیەکی چڕو پڕو دوورو درێژدا گەیشتنە ئەنجامی پێکهاتنێك کە پەیمانێك ببەستن، پەیمانی شەڕ نەکردن و دۆستایەتی، هەروەها پێوەندی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیشیان خستبووە نێو پەیمانەکە بۆ ئەوەی لەو بوارانەدا گەشە بە پێوەندییەکان بدەن و ببنە دوو دۆستی گیانی بەگیانی، چونکە لەڕاستیدا ئەو ڕێککەوتننامەیە زۆرتر بۆ ئەوە بوو کە میری دۆستەکی لایەنی بیزەنتی بپارێزێ و خۆی ئامادە بکات بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ هێزی داگیرکەری بوەیهییەکاندا.

دیاربەکر و جەزیرەی فوراتی کە مەڵبەندەکەی شاری ئامەد بوو، لە هەموو نێوچەکانی دیکەی کوردستان زیاتر دووچاری هێرشەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی و داگیرکاریە بەردەوامەکانی دەبۆوە، ئەمە بوو وای کرد چەندین سەنگەر و

بەربەستی[٦٢٦] نوێ درووست بکەن و سەنگەر و قەڵاو قوله کۆنەکانیش قایم و تۆکمە بکەن که له نێوچەکەدا هەبوون وەك تخوبێك لە نێوان سنووری هەردوو دەوڵەتەکەدا، ساسانی لەلایەك و بیزەنتیش لەلایەکی ترەوە.[٦٢٧]

پێوەندیەکانی نێوان میر (باد بن دوستك) و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، پێوەندیەکی دیپلۆماسی بوو بەدەلیلی ئەوەی که میری کوردی پارەی دەدایه ئەو ئیمپراتۆریەتە، که (أبن شهرام) لەکاتی کۆبوونەوەکانیدا لەگەڵ بیزەنتیەکاندا ئاماژەی پێکردووە که لە قوستەنتنیه بەرێوەدەچوون سەبارەت بەوەی که میر (باد) ئەو پارانە لە میانەی میهرەبانی و رێزەوە دەداتە پاشای رۆم.[٦٢٨] بەڵام ئەو پێشهاتانەی کە لە میرنشینی مەروانی روویاندا و ئەو لاوازی و بێدەسەڵاتیەی میرنشینە ئیسلامیەکانی هاوسنووری دەوڵەتی بیزەنتی گرتەوە، پاشای بیزەنتی (بسیلیوس)ی دنەدا کە لە ساڵی (٣٨٢ك/٩٩٢ز)، هەڵسێت بە ناردنی هێزێکی سەربازی گەورە بۆ داگیرکردنی نێوچەی (ئەرمینیای خارجی)،[٦٢٩] بەتایبەت بۆ سەر بەشی باکوور لە دەریاچەی (خلاط)، و گەمارۆی خستە سەر شارەکانی: (أخلاط، ومنازگرد و أرگیش و برگرد)، بەڵام میر (أبو علی بن مروان) بەرەنگاری بۆوە توانی سوپای رۆمەکان شکست پێ بێنێت،[٦٣٠] بۆ ئەوەی بێ ئومێدیان بکات و وەریان بروخێنێت، بەتایبەتی یەکەم سەرکردە بوو کە بەرەنگاری سوپای رِوم بێتەوە، رایگەیاند و وتی: "بەیانی سەرجەم لەشکر و سوپاکانی موسڵمانان دەگەنە ئێرە...."،[٦٣١] ئەمە وای لە سوپای بیزەنتی

---

(٦٢٦) اليعقوبي: البلدان،٣٦٢.

(٦٢٧) لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية،١٤٣؛طه باقر:تاريخ ايران القديم،٩٣-١٠٢؛اندريه ايمار: تاريخ الحضارات العام- روما وامبراطوريتها،٥٣٠-٥٣١.

(٦٢٨) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٣/٣٩.

(٦٢٩) ابن حوقل: صورة الأرض، ٢٩٥.

(٦٣٠) الفارقي: تأريخه،٦١.

(٦٣١) الفارقي:هـ. س،٦١.

کرد کە ڕازی بن بە گرێدانی ئاگربەست بۆ ماوەی دە ساڵ، ئیتر بەهۆی ئەو ڕێکەوتنەوە سوپای بیزەنتی نێوچەکەی بەجێ هێشت بێ ئەوەی ئامانجەکانی بێنێتە دی[٦٣٢].

سەبارەت بە پێوەندیە دیبلۆماسییەکان لەگەڵ دەوڵەتی بیزەنتیدا، مەروانیەکان لەسەر بەستنی ئاگربەستێك لەگەڵ بیزەنتیەکاندا بۆ ماوەی دە ساڵ لە ساڵی (٣٨٢ك/٩٩٢ز) پێکهاتن،[٦٣٣] و هیچ ڕووداوێکی ئەوتۆ تۆمارنەکراوە لە سەرچاوەکانی ئەو سەردەمەدا کە پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوانیان تێك بدات. (الفارقی) دەڵێ: "لە ساڵی سێسەدو نەوەددا (بسیلیوس)ی پاشای ڕۆم هات بۆ نێوچەکانی ئامەد و میافارقین و لەگەڵ (ممهد الدولة أبو منصور) کۆبۆوە و هاوپەیمانیەك و ئاگربەستێکیان ئیمزا کرد، دوای ئەوە بێ هیچ زیانێك بەرەو دوا گەڕایەوە".[٦٣٤] بەڵام ئەوەی (الفارقی) باسی نەکرد، (یحی بن سعید الآنطاکي) باسیکردووە، کە بەم وتەیەی ئاماژەی بۆ ئەو ڕووداوە کردووە: "مەلیك باسیلی دووەم ناردی بەدوای میری کوردان (ممهد الدولة-أبو منصور سعید بن مروان (٣٨٧-٤٠١ك/٩٧٧-١٠١٠ز)ی خاوەنی دیاربکر، و چووە سەر بەرەکەی و نازناوی مەلیکی ماجستیرس،* ودوقس_(دوقی) خۆرهەلاتی[٦٣٥] پێ بەخشی، ڕێزی لێگرت و خەلاتی

---

(٦٣٢) الفارقي: هـ. س، تاريخه،٦١: ابن العبري: مختصر الدول، ١٧٣؛ عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية/ ج٢، ص٤٢.

(٦٣٣) الفارقي: هـ. س، تاريخه،٦١.

(٦٣٤) الفارقي: هـ. س، تأريخه،٨٤ الانطاكي: تأريخ الأنطاكي، ٢٤٧: المقريزي: اتعاظ الحنفا، ٣٢/٢.

* ماجستیر (Magister):- ئەم وشەیە لەو دەمەدا مانای گەورە یاخود بەرپرس یاخود مامۆستای گەیاندووە، ئەمە زۆر جار لەناو گروپێك یاخود دەستەیەکدا ڕوویدەدا و یەکێکیان کردووە بە گەورەی خۆیان و پێیان وتووە (ماستەر) تەنانەت ((عیسی)) (علیە السلام) دەوروبەرەکەی هەر پێیان دەوت (ماستەر).

(٦٣٥) دەوڵەتی بیزەنتی (١٨) هەژدە نازناوی هەبوو دەیبەخشی بەو کەسانەی کەوا خزمەتێکیان پێشکەش بە دەوڵەت دەکرد، وەك ملوانەکە کە پاشاو سەرۆکی دەوڵەتەکان دەیان

کرد و گێڕایەوە بۆ ولاَتەکەی خۆی". [٦٣٦]

لەو دوو دەقەی سەرەوەدا دەتوانرێ ئەو راستیە بسەلمێنرێ کە، بەخشینی نازناوی شەرەف ماجستیر Magister و دوق Dukeی خۆرهەلاَت، لەلایەن مەلیکی بیزەنتی (باسیل) ی دووەم بەلگەی تۆکمەیی پێوەندیە دپلۆماسیەکان و قولَی و بەهێزی ئەو پێوەندیانەی نێوانیان نیشان دەدات کە بۆ دامەزرێنەری میرنشینەکە میر (بادبن دوستك) [٦٣٧] و جێنشینەکەی میر (ابو علي بن مروان) دەگەڕێتەوە. [٦٣٨] لە سالَی (٣٩٠ك/ ١٠٠٠ز)، (ممهد الدولة) و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی (بسیلیوس) کۆبوونەوە بۆ قسەوباس لەسەر کاروبارە پێوەندیدارەکانی نێوان هەردوولا بەتایبەتی کێشەی سنوور و بازرگانی و درێژکردنەوەی رێککەوتننامەی سالَی (٣٨٢ك/ ٩٩٢ز) نێوان هەردوولا لە نێوچەی (ئامەدو میا فارقین) پاشان ئیمپراتۆر گەڕایەوە بەبێ درووستبوونی هیچ کێشەیەك. [٦٣٩]

ئاشکرایە کە (أبو الهیجاء بن سیف الدولة الحمداني) کچی میر (ممهد الدولة)ی هاوسەری بوو، [٦٤٠] کاتێك (سعید الدولة)ی برای سالَی (٣٩٢ك/١٠٠٢ز) کۆچی دوای کرد لە (الحاجب لۆلۆ) کە یەکێك بوو لە کۆیلەکانی (سیف الدولة) توانی بەناوی هەردوو کوڕە بچوکەکەی (سعد الدولة: أبو الحسن علی) و (أبو المعالی شریف)، کاروباری میرنشینەکە بەڕێوەبەرێ دوای ماوەیەکی کەم هەردوو منالَەکەی بۆ میسر گواستەوە، و فەرمانڕەوایی خۆی لەسەر حەلەب ڕاگەیاند، بەمەش (لۆلۆ) و

---

بەخشی بڕوانە: Ed.Jonam: Ambridge Medieval History. Hussey Cambridge,١٩٦٦-١٩٦٧,Vol.١٧ Part ١١,P.٢٠.

(٦٣٦) تأريخ الأنطاكي،٢٤٧؛ المقريزي: اتعاظ الحنفا،٣٢/٢.

(٦٣٧) الروذرواري: ذيل تجارب،٣٩/٣.

(٦٣٨) الفارقي: تاريخه،٦١.

(٦٣٩) الفارقي: تاريخه، ٨٤؛ عبدالرقيب يوسف: س. پ، ١٤٢/١– ١٤٣.

(٦٤٠) ابن العديم: زبدة الحلب،١٩٩/١؛الأنطاكي: تاريخ الأنطاكي،٣١٥.

کوڕەکەی (منصور) بێ ئەمەکیان بەسەرجەم بنەماڵەی حمدانیدا کرد، تەنانەت (أبو الهیجاء) میرنشینەکەی جێ هێشت و بە هاوکاری بازرگانێکی نصرانی حەلەبی پەنای بۆ خاکی بێزەنتی برد، مەلیکی بێزەنتی باسیل پێشوازی لەو میرە کرد و مافی پەنابەرێتی پێ بەخشی و نازناوی (ماجستیر)ی پێ بەخشی.[٦٤١]

لە کۆتایی ساڵی (٣٩٩ك/١٠٠٨ز)دا (لۆلۆ)ی حاکمی حەلەب مرد و کوڕەکەی (منصور) بوو بە حاکم لەسەر حلب لەبەرئەوە هەوڵیاندا (أبو الهیجاء) لە دەوڵەتی بێزەنتیەوە بێننەوە بۆ حەلەب، ئەوەبوو داوایەکیان پێشکەش بە (مهد الدولة) باوکی ژنەکەی (أبو الهیجاء) کرد، بەو مەزەندەیەی خاوەن پێوەندیەکی دیبلۆماسی بەهێزە لەگەڵ دەوڵەتی بێزەنتیدا،[٦٤٢] بۆ ئەوەی ئەرکی گەڕانەوەی (ابو الهیجاء) بگرێتە ئەستۆی خۆی، (مهد الدولة)ش داوای لە باسیلی دووەم مەلیکی رۆم کرد کە رێگە بدات بە خەزوری (أبو الهیجاء) خاکی بێزەنتی بەجێ بێڵێت، لە پێناو فەرمانڕەوایی نێوچەی حەلەب و بنەماڵەی حمدانی جڵەوی دەسەڵات بگرنەوە دەست. و (مهد الدولة) باسیلی دووەمی ئاگادار کرد کە ئەو هیچ خەرجیەك لە ئەستۆ نەگرێت بەڵکو هەموو خەرجی و ئەرکێك دەگرێتە ئەستۆی خۆی و پارەی پێویستیش دەداتە (أبو الهیجاء).[٦٤٣]

ئیمپراتۆری بێزەنتی بە پێشنیازەکەی (مهد الدولة) ڕازی بور، (أبو الهیجاء) خاکی بێزەنتەی جێهێشت و لە ساڵی (٤٠٠ك/١٠٠٩ز) گەڕایەوە بۆ میافارقین، خەزوری بڕێك پارە و نزیکەی (٢٠٠) سواریشی پێدا، و (أبو الهیجاء) نامەی بۆ شێخەکانی خێڵی (کلاب) نارد بەو هیوایەی کۆمەك و هاوکاری پێشکەش بکەن لەبەرامبەر

(٦٤١) ابن العديم: زبدة الحلب، ١٩٩/١٢؛ الأنطاكي، تاريخ الانطاكى، ٣١٥-٣١٧؛ المقريزي:اتعاظ الحنفا،٣٢/٢.

(٦٤٢) ابن العديم: زبدة الحلب،١٩٩/١-٢٠٠ ؛الأنطاكي: تاريخه، ٢٤٧؛المقريزي: اتعاظ الحنفا، ٣٢/٢؛الفارقي: تاريخه،٨٤.

(٦٤٣) ابن العديم: زبدة الحلب،١٩٨-١٩٩؛ الأنطاكي، تاريخه،٣١٥.

خەلآتی گەورەدا، بەلآم (أبو الهیجاء) لە هەولەکەیدا شکستی هێناو بەتەنگەی بارگیری خۆیدا داو جارێکی دیکە پەنای بۆ دەولەتی بیزەنتی بردەوە.[٦٤٤] لێرەدا ئەو ڕاستییە دەردەکەوێت کە فاکتەری جوگرافی و ململانێی نێوان هەرێمەکان کاریگەری گەورەیان هەبوو لەسەر سیاسەتی هاوسەنگی، کە میر (ممهد الدولة) دەیویست لەبەرامبەر هەرسێ هێزە گەورەکەدا پەیڕەوی بکا کە: دەولەتی عەباسی و فاطمی و بیزەنتی بوون، و ئەم سیاسەتە دیبلۆماسییەی سەرکەوتنی باشی بەدەستهێنا، هەروەها جۆرێك لە پێوەندی لە نێوان میرنشینی ڕەوادی و ڕۆمە بیزەنتیەکان سەری هەلدا، بەوەی سەرەڕای ئەوەی ڕۆمەکان مەسیحی و دوور لە سنووری میرنشینی ڕەوادی بوون ئامادەبوون هاوکاری (وهسوذان بن مملان)ی بکەن بۆ لێدانی هەژبانیەکان،[٦٤٥] بەلآم ئەم دۆستایەتیە لەژێر فشار و کاریگەری خیلافەتی عەبباسی شکستی هێنا و هەردوو میرنشینی هەژبانی و ڕەوادی کەوتنە خۆ بۆ لێدانی سوپای ڕۆمەکان کە بە سەرکردایەتی (نیکو گوس قادا سیلاس) شاری بەرگری یان گەمارۆ دابوو، بەلآم دواجار شارەکە لە سالی (٤٣١ك/ ١٠٣٩ز)دا لەلایەن ڕۆمەکانەوە داگیر کرا،[٦٤٦] هەروەها ڕەوادییەکان هاوکاری (مساور الثانی) شەدادییان کرد تا شالآوی ڕۆمەکان لەسەر هەرێمی ئاران دوور بخاتەوە و ڕزگار بکات، ئەوە بوو (مساور الثاني) بەهاوکاری ڕەوادییەکان ڕۆمەکانیان لە شارەکە دەرکرد.[٦٤٧] بەمەش ئاستی پێوەندی ڕەوادی و ڕۆمەکان لە ئاشتی و هاوپەیمانیەوە بۆ ململانێ و شەڕ گۆڕدرا، دەتوانین بلێین ئەم ڕووداوانە سەرەڕای ئەم بارودۆخانە ئاست و توانای ئەم میرنشینە دەردەخات لەبەرامبەر هێزە نێوخۆیی و نێوچەیی و دەرەکیەکاندا.

جموجۆلی بازرگانی زۆربەی نێوچە جیاجیاکانی ولآتان و هەرێمەکانی گرتبۆوە

---

(٦٤٤) ابن العدیم: هـ. س،١٩٩-٢٠٠ ؛الأنطاكي: هـ. س، ٣١٦-٣١٧.

(٦٤٥) ابن الاثیر: الکامل، ٧/٨.

(٦٤٦) حسام الدین علي غالب: اذربیجان، ١٦٥.

(٦٤٧) موکریانی: کوردستانی موکریان، ٤٤٦- ٤٤٨.

بەهۆی ئەوەی چینێك لە بازرگانەكان سەروەت و سامانەكانیان لە جموجۆڵی بازرگانیدا تـەرخانكردبوو، ئـەو جموجۆڵـە بازرگانیانـە لەڕێگـەی كۆمـەڵێك ڕێگـەو شـێوازەوە ئەنجامدەدرا شێوازی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پێوەنـدی بـە وڵاتـی بێزەنتـەوە لـەكاتی دەركـەوتنی سـەرەتای ئیـسلامدا حاڵـەتێكی نائـارامی لـە خۆگرتبـوو بـەهۆی ئـەو جەنگانەی ڕوویان دەدا، ئەوەش لە ئەنجامی هەڵمەتـەكانی سـوپای ئیـسلام لـە پێنـاو بڵاوكردنەوەی ئیسلام و دەسكەوتەكاندا، ئەوكارەش كاردانەوەیەكی سلبی هەبوو لەسەر پێوەندییە بازرگانیەكانی نێوان وڵاتی كوردان و دەوڵەتی بێزەنتی.

دوای ئەوە پێوەندی نێوان لایەنی ئیسلامی و بێزەنتی پێشكەوتنی گەورەیان بـەخۆوە بینـی و شمەكـە بازرگانیـەكان لـە نێـوان دوو وڵاتـدا دەگوێزرانـەوە و دەگۆڕدرانـەوە بەتایبەتی لەكاتی ئاشتی و ئاسایشدا.[٦٤٨]

(رنـسیمان)ی مێـژوونوس دەڵێـت: كوردسـتان خـاڵی پێوەنـدی بازرگـانی نێـوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوابوو بەشێوەیەك بازرگانی ڕۆژهـەڵات كـە لـە نێوەڕاسـتی ئاسـیاوە دەهات بەڕێگەی شاری (نصیبین)دا دەڕۆیشت و پاشان دەچووە وڵاتـی بێزەنتـەوە. بۆیـە شاری (نصیبین) ببووە ناوەندێكی بازرگانی گرنگ و دەركەوتوو، چونكە كەوتبووە سەر سـنووری بێزەنتـەوە و بازرگانـە ڕۆمـەكان دەهاتنـە ئـەوێ بـۆ گۆڕینـەوەی شمـەكی بازرگانی.[٦٤٩] هـەروەها شـاری (دویـن)یـش ناوەنـدێكی بازرگـانی گـرنگ بـوو بـۆ گۆڕینەوەی شمەكی وڵاتی بێزەنتە و ئەوانەی لە ڕۆژهەڵاتـەوە دەهـاتن (هنـدو فـارس و چین) هەروەها شاری (تارزن)یش هەمان تایبەتمەندی و نێوبانگی هەبوو.

هەمان شتمان یاد دەكەوێتەوە كاتێك باس لە شاری (قـارس) دەكـەین. لەئـەنجامی ئەو پێوەندیە بازرگانیەدا ئەو شارانە بەهۆی شوێنگەی جوگرافیانـەوە كـە كەوتبوونـە نێوەندی بازرگانی نێو دەوڵەتی لە نێوان بێزەنتە و دەریـای ڕەش لەلایەكـەوە و دەریـای

---

(٦٤٨) موفـق سـالم نـوري: العلاقـات العباسـية البيزنطيـة، دار الـشؤون الثقافيـة العامـة، بغداد، ١٩٩٠، ٣٦٤-٣٦٧.

(٦٤٩) الحضارة البيزنطية، تر.عبدالعزيز جاويد، ١٩٦١، ص١٩٦.

قەزوین و فارس لەلایەکی ترەوە ڕووە و بوژانەوە و پێشکەوتن و گەشەکردنی ئابووری چوون.[٦٥٠] بازرگانی نێوان دەوڵەتی بێزەنتە و کوردستان لە هەردوو ڕێگەی وشکانی و دەریاییەوە چالاکانە هەڵدەسوڕا هەر لەو دوو ڕێگەیەشەوە جموجوڵە بازرگانیەکان گەشەیان کرد و بازرگانە کوردەکان دەچوونە نێوەندی بازرگانی بێزەنتەوە. بەتایبەتی شاری (ترابزون)[٦٥١] شاری (سیواس) لە نێوەڕاستی ئاسیای بچوکدا نێوەندێکی بازرگانی گرنگ بوو بۆ ئەو بازرگانانەی لە وڵاتانی ترەوە دەهاتن بەتایبەتی شارەکانی هەرێمی جەزیرە. کە بازاڕەکانی پڕبوون لە پیشەسازیە پاکەکان و بەروبوومە جۆراو جۆرەکان، جموجوڵی بازرگانی چالاك بوو بەهۆی ئەوەی کە ئەو شارە بازاڕێکی گەورە و نێوەندێکی بازرگانی گەورە بکاتەوە بۆ ئەو بازرگانانەی لە وڵاتی کوردانەوە دەهاتن هەندێك لەو بازرگانانەشی لەو شارەدا نیشتەجێبوون وەکو بازرگانی شمەك یان بریکاری هەناردەکان. کاریان دەکرد ئەو شمەکانەی لە عێراق وڵاتی شام و کوردستانەوە دەهاتن بە شاری (سیواس)دا تێدەپەڕین کە بریکارەکانی هەناردەکان چاوەڕوانیان دەکرد کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی ئەو بریکارانە بوونە بەرپرسی ڕێکخستنی ئەو کاروانانەی ڕوویان دەکردە نێوەندی دووەمی بازرگانی کە شاری (ترابزون) بوو. لەوێشەوە بۆ شارەکانی دیکەی بێزەنتە. زۆربەی جارەکان بازرگانەکان دەبوونە هاوەڵی شمەکەکانیان هەتا دوامەنزڵگە لە جیاتی بریکارەکانیان بازرگانەکان ناچار بوون بڕۆنە ترابزون بە تایبەتی ئەگەر (حەریر و لۆکە و...هتد)یان پێبوایە.[٦٥٢]

لە مادەکانی جێگیری سیاسی لە نێوان وڵاتی کوردان و دەوڵەتی بێزەنتەدا کاریگەریەکی ئیجابی هەبوو لەسەر چاککردنی پێوەندیە بازرگانیەکانی نێوان

---

(٦٥٠) عبدالرحمن محمد عبدالغني: ارمينية وعلاقاتها السياسية بكل من البيزنطيين والمسلمين، مؤسسة الكويت للتقدم العلمي، الكويت، ١٩٨٩، ٢٥.

(٦٥١) تامارا رايس: السلاجقة تأريخهم و حضارتهم، تر: لطفي الخوري وابراهيم الداقوقي، مراجعة: عبدالحميد العلوجي، مطبعة الأرشاد، بغداد، ١٩٦٨، ص١٢٦.

(٦٥٢) نيكيتا ايليسيف: الشرق الأسلامي، ٢٩١.

هەردوولا هەرچەندە وڵاتی کوردان لەو کاتەدا بە مومتەلەکاتی خیلافەتی عەبباسی لەقەڵەم دەدرا. بەڵام دەسەڵاتی سیاسی نێوچەیی ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکان و دیاریکردنی ڕێڕەوەکانی، ئەو کارەش کاریگەریەکی گەورەی هەبوو بۆ چاککردنی پێوەندیەکان لەگەڵ دەوڵەتی بیزەنتەدا بە تایبەتی لە بواری ئاڵوگۆڕی بازرگانیدا.[٦٥٣]

زۆربەی جارەکان شاند و باڵوێزخانەکان بەمەبەستی پتەوکردنی پێوەندیە دیبلۆماسی و سیاسی و ئابووریەکان بووە و هاندەری گەشەکردنی پێوەندیە بازرگانیەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت بووە. مێژوونوسی (الفارقی) باسمان لە باڵوێزخانەی پادشای ڕۆم دەکات بۆ دەوڵەتی مەروانی بۆ پیرۆزبایی بەبۆنەی جەژنەوە لە ساڵی (٤٠٣ك/١٠١٣ز)[٦٥٤] ئەو کارەش کاریگەری گەورەی هەبوو بۆ ئاڵوگۆڕی بازرگانی بەتایبەتی قوستەنتینەی پێتەخت بۆ هێنانی شمەکەکان.[٦٥٥]

هەندێك سەرچاوەی مێژوویی باسی لە قوڵی پێوەندی بازرگانی نێوان کوردستان و دەوڵەتی بیزەنتە دەکەن، زۆر لە ڕۆمەکان بەکاڵا و شمەکەکانیانەوە دەهاتنە کوردستان بە هەمان شێوەش بازرگانە کوردەکان، بەو شێوەش جوڵەی هەنارده و هاوردەی نێوان هەردوولا گەشەی دەکرد.[٦٥٦] کاروانە بازرگانیە گەورەکان بەشێوەیەکی فراوانکاری ئاڵوگۆڕی کاڵا و شمەکەکانیان ئەنجام دەدا.[٦٥٧] لە وڵاتی ڕۆمدا بازاڕێکی گەورە و بەشێوەیەکی دەوری لەسەرەتای بەهاری هەموو ساڵێکدا دەکرایەوە و بۆ ماوەی (٤٠) ڕۆژ بەردەوام دەبوو (القزوینی) ئاماژە بەو بازارە دەکات و دەڵێت: "خەڵکان لە وڵاتە دوورەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باشوور و باکوورەوە دەهاتن، خەڵکانی ڕۆژئاوا کاڵاو

---

(٦٥٣) ابن عبدالحق: مراصد الاطلاع، ١٢١٩/٣ ؛عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية، ٢٢٥/٢.

(٦٥٤) تأريخ الفارقي،١١٠.

(٦٥٥) الذهبي: تأريخ الأسلام، ص٤٤٤.

(٦٥٦) ابن حوقل: س–پ،٢٠٢ ؛محمد جاسم حمادي: س–پ،١٣٥.

(٦٥٧) ابن العبري: تأريخ الزمان،٣٣٢.

شمەکـەکانی ڕۆژهـەڵاتیان دەکـڕی و بەپێـچەوانەوە". [٦٥٨] دوای بـازاڕکردنی بازرگانـە کوردەکان کاڵاکانیان دەهێنایەوە هەرێمەکانی جەزیرە و پاشان بەمەبەسـتی فرۆشـتنی دابەشیان دەکرد بەسەر شارەکاندا. [٦٥٩]

دەربارەی پێوەندیە ئابووریەکان و مامەڵەی بازرگانی لە نێوان میرنشینی مەروانی و دەوڵەتی بیزەنتیدا، ئەویش لە ئاستێکی بەرزدا بەڕێوەدەچوو کـاڵا و کەلوپـەلێکی زۆر لە وڵاتـی بیزەنتیـەوە دەگەیـشتە کوردسـتان و بەشـێکی لـە کوردسـتان دەمایـەوە و ئەوەکەی تریشی لەڕێگەی ڕووباری دیجلەوە و بەشێوەیەکی سەرەکی بـەهۆی کەلـەك و بەلەمی ئاوی بچوکەوە دەنێرایە بازاڕەکانی موصل و بەغدا و شوێنەکانی تر. [٦٦٠]

شاری ئامەد کە دەکەوتە سەر ڕووباری دیجلە و بە حـوکمی پێگـە جوگرافیەکـەی و وەك سەنتەرێکی بازرگانیش، وێستگەیەکی گرنگ بوو بۆ گواستنەوەی بەرهـەم و کـاڵا کوردیەکان و خۆرهەڵاتیەکان بۆ ئاسیای بچوك. هەروەها بازاڕێکی سەرەکیش بـوو لـە کوردستاندا بۆ پێشوازیکردن لە بازرگانی بیزەنتی. بازرگانە کوردەکان بەرهـەم و کـاڵا بیزەنتیـەکانیان لـە سـەدەی چـواری کۆچـی/دەی زایینیـدا لـە ئامـەدەوە دەگەیانـدە بازاڕەکانی بەغدا، بە گوێرەی قسەکانی (المقدسی-٣٨٧/٩٩٧ز) کە لە هەمان سەدەی ناوبراودا ژیاوە. دەربارەی ئەو کاڵا بازرگانیانەی کە دەگەیـشتنە بەغـدا وتویـەتی: "... لەئامـەدەوە پۆشاکی خوری و کەتانی ڕۆمی و دەستکردی صقلی دەهات". [٦٦١]

(إبن حوقل- م٣٦٧ك/٩٧٧ز)، کە هاوسەردەمی (المقدسی) بووە، لە ئاماژەیەکیـدا سەبارەت بە بازرگانی بیزەنتی (رومی)، کە دەگەیشتە کوردستان، لە کاتی قسەکانیدا سـەبارەت بـە بایـەخی شارۆچـکەی (جزیـرە إبـن عمـر) وەك ناوەنـدێکی بازرگـانی،

---

(٦٥٨) اثار البلاد،٥٣١.

(٦٥٩) ابن الأثير: رسائل ابن الأثير، حررها وحققها، انيس المقدسي، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٥٩، ص٣.

(٦٦٠) عبد الرقيب يوسف: الدولة الدرووستكية،٤٧/٢.

(٦٦١) احسن التقاسيم،١٤٠.

گوتویەتی: "ئەم شارە کە دەکەوێتە سەر کەناری دیجلە ویستگەیەك بوو بۆ بازرگانی بیزەنتی و ئەرمەنی..."[٦٦٢]، بەڵام شاری (نصبین)، وەك ویستگەیەك بۆ گواستنەوەی کاڵا بازرگانیەکانی خۆرهەڵات بۆ وڵاتانی خۆرئاوا بەر لە زایینەوە ناسرابوو، ناوی (نصیبین) لە پرۆتۆکۆلە بازرگانیەکانی نێوان فارس و رۆمانەکاندا هاتووە".[٦٦٣]

بێگومان بازرگانی سەر زەوی لە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیەوە و بۆ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، لەڕێگەی کوردستانەوە جموجۆڵی بە خۆیەوە بینی ئینجا لەڕێگەی شامەوە، لە سەردەمی میرنشینی مەروانیدا، هۆکارەکەشی ئەوەبوو ئەم ڕێگەیە سەلامەترین ڕێگە بوو بۆ کاروانە بازرگانیەکان بەهۆی بەرقەراربوونی ئاسایش و ئارامی لە میرنشینی مەروانیدا و بەهۆی باشی پێوەندیە دیپلۆماسییەکانیشی لەگەڵ دەوڵەتی بیزەنتیدا. لەکاتێکدا هەمان ئەو دوو فاکتەرە لەو ئاستەدا نەبوون لە (نصیبین و حەلەب و ڕەقە و ئەنادۆڵ)، هەروەك لە مێژووی نێوچەکەدا شتێکی شاراوە نیە لە هەردوو سەدەی (٤-٥ك/١٠-١١ز) واتە بەر لە داگیرکردنی (الرها) لەلایەن دەوڵەتی بیزەنتیەوە، دوای فراوانبوونی قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتە، ڕێگەی (نصیبین- الرها)، نزیکترین و کورترین ڕێگەی بازرگانی بوو، هەروەها ئەم حاڵەتە بەسەر ماوەی فراوانبوونی دەسەڵاتی سەلجوقیەکانیش جێبەجێ دەبێت لە سەردەمی (الب ئەرسەلان)دا* لە وڵاتی شام و داگیرکردنی هەندێ لە خاك و زەوی بیزەنتیەکانی هاوسنووری باکووری شام، چونکە دوای چوونە ناو ئەو نێوچەیەوە، گیروگرفتیان بۆ

---

(٦٦٢) صورة الأرض، ٢٢٤.

(٦٦٣) نورمان بینز: الأمبراطورية البيزنطية، ٢٧٠ستيڤن رنسيمان: الحضارة البيزنطية، ١٩٦.

* الب ارسلان: لە ساڵی (٤٢٠ك/١٠٢٩ز) لەدایك بووە، لە نێو ساڵانی (٤٥٥-٤٦٥ك/١٠٦٣-١٠٧٢ز) لەپاش (طغرل بگ) دەسەڵاتی سەلجوقیەکانی گرتە دەست، سەرەڕای کەمی ماوەی دەسەڵاتی بەڵام شوێن دەستی دیار بوو، گرنگترینیان سەرکەوتنی بوو بەسەر بیزەنتیەکان لە ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧٠ز) لەشەڕی مەلازگرد. (ابن الأثير: الكامل،٤٧٣/٩؛ العماد الاصفهاني: تاريخ دولة آل سلجوق، ٢٦-٢٨).

هاتوچۆ و جموجـوڵی بازرگـانی لەگـەڵ دەوڵـەتی بیزەنتیـدا دروستکرد. سـەرئەنجام مامەڵەکردن بەدیناری بیزەنتی بەشێوەیەکی فراوان لـە کوردسـتاندا و لـە سـەردەمی میرنشینی مەروانیدا، باشترین بەڵگەیە لەسەر بە هێزی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان و پێوەندیە بازرگانی و ئابووریەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی مەروانی و بیزەنتی.[٦٦٤]

بێگومـان قـەبارەی هـەناردەکانی کـوردی (الـصادرات الكردیـة) لـە سـەردەمی میرنشینی مەروانیدا بەرادەیەکی بەرچاو زیادی کرد، هـەروەها قـەبارەی کـاڵای بیـانی هاوردەش چ بۆ بەکارهێنانی لۆکاڵی یاخود وەك ترانزێت (المرور) بۆ وڵاتانی دیکە کـە بە کورستاندا تێ دەپەڕین، بەهەمـان ڕێژە زیادی کرد، سەرەڕای هـاتنی بازرگانـان لـە وڵاتانی دەرەوە و نیشتەجێبوونیان، بەمەبەستی ئەنجامدانی کارە بازرگانیەکانیان بـەبێ ترس و نیگەرانی. شاری ئامەد لە گرنگترین شـارە بازرگانیـەکانی بـوو، کـە چـەندین ڕێگای بازرگانی دەهاتەوە سەری. لەو کاڵایانەی دەگەیشتنە ئەو شارە پۆشاکی خـوری و کەتانی ڕۆمی دەسکاری سـقلی (الـصقلية) بـوو،[٦٦٥] واتـە لەسـەر تـەرزی بـاو لـە دوورگەی صقلية درووست کرابوون، کە بازرگانان بـەرەو عێـراق و نێوچـەکانی دیکـە دەیانبرد. لێرەوە دەتوانین ڕادەی قەبارەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێـوان کوردسـتان و وڵاتـی بیزەنتی بزانین، کە بە دینـاری ئەرمانوسـی بیزەنتـی بـە ڕێژەیـەکی زۆر لـە مامەڵـە بازرگانیەکان و لەسەردەمی میرنشینی مەروانیدا بەکار دەهێنـرا، و مامەڵـەکردن لـە نێوخۆی میرنشینەکەدا بە درهـەم و دینـار بـوو. هـەروەها گۆڕینـەوە (المقايـضة) لـە مامەڵـە نێوخۆییـە بـچوکەکاندا، بەتایبـەت لـە نێـوان دانیـشتوانی گونـدەکان بەڕێوەدەچوو. دراوی درهەم بەشێوەیەکی فـراوان مامەڵـەی پێـدەکرا، (الفـارقي) لـە

---

(٦٦٤) الفارقي: تاريخه،١٥٩،١٦٧.

(٦٦٥) المقدسي: احسن التقاسيم،١٤٥.

نموونەیەکیدا دەڵێ: "میر (أبوعەلی حسن بن مەروان)،* کاتێك (ست النـاس)ی کـچی (سعد الدولة الحمداني) مارە کرد، مارەییەکەی (٢٠٠) هەزار درهەم بوو، و(عبـدالبر) کە دەستی گرت بەسەر ئامەددا و لەگەڵ (ممهد الدولة)دا ڕێکەوتن لەسەر ئـەوەی کـە دەبێ (ممهد الدولة)ساڵانە بڕی (٣٠٠) هەزار درهەم وەك خـەراج بداتـە (عبـدالبر) و سکە و وتاریش بەناوی ئەوەوەبێت، دوایـی ئـەویش (إبـن دمنـە) لەسـەر هـەمان بـڕ دانوستانی لە گەڵدا کرد".[٦٦٦]

بەڵام دیناری زێڕ بۆ بازرگانی و مامەڵە ناوخۆییەکان و دەرەکیەکان بەکار دەهێنـرا، و دیناری بێزەنتی زیاتر بەکاردەهێنرا، (الفارقی) دەڵێ: بڕی ئەو پێنج سەد دینارەی کە (إبن البهات) لەیەك ڕۆژدا قـازانجی کـرد، بـە دینـاری ئەرمانوسـی* بـوو، هـەروەها موچەی ڕۆژانەی دایکی خەلیفەی عەبباسی و کوڕەکەی -واتـە کـوڕی خەلیفـە- کـە (نصر الدولة) بۆی بڕیبوونەوە پەنجا دیناری ئەرمانوسی بوو.[٦٦٧]

ئەمەو لەکاتێکدا هیچ باسی دیناری عەبباسی و فـاطمی نـەکرابوو کـە بـەدیناری مـەغریبی ناسرا بوو، بەڵام باس نەکردنیان ئەگەری بەکارهێنانی ڕەتناکاتـەوە، بـەڵکو ئەگەری بەکارهێنانی زۆر بووە، بەهۆی ئەو پێوەندیە بازرگانیـەی نێـوان کوردسـتان و خیلافەت لەلایەك، و نێوان شام و میسر لەلایـەکی تـرەوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا قـەبارەی

---

* مـیر ابـو علـی حـسن بـن مـروان:- لـەپاش مردنـی خـاڵی میربـاد لـە نێـو سـاڵانی (٣٨٠-٣٨٧ك/٩٩٠-٩٩٧ز) تـوانی دەسـەڵاتی (حـصن کیفـا، میافـارقین، ئامـەد) و دەوروبـەری بگرێتـە دەست. (الفارقی: تاریخە، ٧٢).

(٦٦٦) تاریخة ٧٢-٧٩.

* ارمـانوس (رومـانوس) نـاوی سـێ لـە ئیمپراتۆرەکـانی دەوڵـەتی بێزەنتـی بـوو لـە بنەماڵـەی مەکـدونی: (رومانوسـی یەکـەم ٩١٩-٩٤٤ز) و (رومانوسـی دووەم لـە نێـو سـاڵانی ٩٥٩-٩٦٤ز) فەرمانڕەوا بووە، رومانوسی سێیەم ارجیروس (١٠٢٨-١٠٣٤ز) هاوسەردەمی میر (نصر الدولة) بوو، پـێ دەچێت دینـاری ارمانوسـی بگەڕێنـەوە بـۆ رومانوسـی سـێیەم. بڕوانـە: (نورمـان بینـز: الأمبراطورية البيزنطية،٣٣٨).

(٦٦٧) تاریخە، ١٥٩،١٦٧.

ئاڵوگۆڕی بازرگانی یاخود پێوەندی بازرگانی نێوان میرنشینی مەروانی و دەوڵەتی بێزەنتی، ئەوەبوو مامەڵەی بەدیناری بێزەنتی بەو شێوە فراوانە جێگیر کرد.[٦٦٨]

لەسەردەمی میرنشینی مەروانیدا شاری ئامەد لە ڕووی بازرگانییەوە پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی و بازاڕەکانی بە جۆرێك فراوان بوون کە ژمارەیان گەیشتە زیاتر لە شەست بازاڕی جۆراوجۆر.[٦٦٩] بەڵام شاری جەزیرە، وەك مەڵبەندێکی بازرگانی گرنگ کە دەکەوتە سەر ڕێگەی ئاوی ڕووباری دیجلە لە سەردەمی میرنشینی مەڕوانی و لە سەردەمەکانی پێش ئەویش و دوای ئەویشدا، لەڕووی بازرگانییەوە بایەخێکی گرنگی هەبوو، زۆر لە نووسەرە دێرینەکان و مێژوونووسان ئاماژەیان بە پێگەی بازرگانی ئەو شارە کردووە، لە نێوانیاندا (إبن حوقل) لە باسێکیدا دەڵێ: "بەشێوەیەکی فراوان و بەردەوام بازرگانی تێدابوو ئەگەر سوڵتانەکان وازیان لێ بهێنایە، ئەوا قازانجێکی لە ڕادەبەدەری بەدەست دەهێنا ئەگەر دەسەڵاتی شەیتانەکان و خەوارجەکان نەبوایە".[٦٧٠]

هەروەها دەڵێ: "جەزیرە وێستگەیەکی بازرگانی دەریاوانی بوو بۆ ئەرمینیا و وڵاتی ڕۆم و نێوچەکانی میافارقین و ئەرزەن، کەشتیە بازرگانیەکان لەوێ کاڵاکانیان دادەگرت کە بریتی بوو لە هەنگوین و ڕۆن و گەزۆ و پەنیر و گوێز و بادام و بندق و مێوژ و هەنجیر و گەلێ جۆری دیکە لە بەرهەم و بەروبوومی تر"[٦٧١] (إبن حوقل) بە بایەخەوە لەڕووی بازرگانیەوە باس لە شاری جەزیرە دەکات وەك وێستگەیەکی بازرگانی کە پێشوازی لە کاروانی بازرگانی ئەرمینی و بێزەنتی و هەرێمی دیاربکر دەکات، هەروەها بەبایەخەوە باس لە ئاوەدانی و چڕی دانیشتوان و جوتیارانی و زەوی و زاری

---

(٦٦٨) عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية، ٢/١٠٤.

(٦٦٩) اديب معوض: القضية الكردية بين الأمس واليوم، ٤٣.

(٦٧٠) صورة الأرض،٢٠٢.

(٦٧١) صورة الأرض،٢٠٢-٢٠٣.

بەپیتی نێوچەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوای دەکات، وێڕای سامانی ئاژەڵی و لەوەڕ لەهەردوو شاری میا فارقین و ئەرزنی بە گرنگتر دادەنێت.[٦٧٢]

ئەو بەشەی کوردستان، لەسەردەمی میرنشینی مەروانیدا بەرهەمەکانی خۆی بۆ وڵاتانی دەرەوە دەنارد، پێداویستیەکانی خۆشی لە بەرهەمەکان لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەراست و هەندێ وڵاتی دیکە دەهێنا، بەتایبەت وڵاتی چین و هیند و وڵاتی بێزەنتی و گەلێکی تریش. نموونەی ئەو کاڵایانەش وەك دەفر و ئامانی زێڕ و زیو و داو دەرمان و (دیباج=جۆرە پۆشاکێکی حەریرە) و (بارگیر= وڵاخێکە) بۆ بار بەکاردێت و جاریە (کەنیزەك) و قوفڵ و پۆشاکی خوری و کەتان و گەلێ بەرهەمی دیکەی وڵاتی بێزەنتی دەهێنا، هەروەها لەو پێداویستیانەی لە وڵاتی بێزەنتیەوە دەگەیشتنە وڵاتانی وەك، ئەندازیارانی ئاو و زانایانی بواری کشتوکاڵ و وەستای بیناسازی و کاری بەردی ڕوخام و ئامێری کێڵان.[٦٧٣] جگە لەمانەش کەرەسە و ئامرازی نووسینیش هەر لە وڵاتی بێزەنتی و وڵاتانی ئیسلامی وەك (الرقوق = پێستەی خۆشکراو بۆ نووسین) لە نیوەی یەکەمی سەردەمی میرنشینی مەروانیدا، یوحنای چوارەم (البرنی) قەشەی شاری (طور عابدین) نووسینی ئینجیلی سریانی نوێ کردەوە. بۆ ئەو مەبەستە براکەی خۆی نارد بۆ (ملاطیة) بۆ هێنانی (الرقوق). پێدەچوو ئەو پێستەیەیان پێ لە کاغەز باشتر بووبێت بۆ نووسینی کتێبە پیرۆزەکان و گرنگەکان وەك (ئینجیل و قورئان)، بەڵکو پێستە بۆ نووسینی قورئان لە دوای میرنشینی مەروانی بە نزیکەی دوو سەدە یاخود زیاتر بەکارهێنراوە. ئێستاش چەند دەستنووسێکی قورئان کە لەسەر پێستە نووسراونەتەوە هەر ماون، کە بۆ مێژوویەکی زۆر کۆن دەگەڕێتەوە، هەرچەندە ئەو شارە لەو سەردەمەدا سەر بە وڵاتی بێزەنتیەکان بوو.[٦٧٤]

---

(٦٧٢) هـ_س،٢٠٣.

(٦٧٣) رنسیمان: المدینة البیزنطیة،٩٤.

(٦٧٤) عبدالرقیب یوسف: الدولة الدوستکیة، ٢٢٩/٢.

## مامەڵەی بازرگانیکردنی کوردی لەگەڵ هێزەکانی دەوروبەردا

بازرگانی بنەماو پایەی سیستمی ئابوورییە، ئەمەش بریتییە لە گواستنەوەی کاڵاکان و کەلوپەلەکان لە شوێنێکەوە ئەو کاڵایانەی زۆرییێت بۆ شوێنێکی دیکە کە ئەو کاڵایانەی تێدا دەگمەن بێت یاخود بەپێی پێویستیان، کە پیشەیەکی دێرینە و مرۆڤ لە سەردەمێکی زۆر زووەوە گرنگی بەو پیشەیە داوە، و لە ڕێگەی بازرگانیەوە کاڵاو شمەك لە نێوان شارستانیەتە کۆنەکانەدا ئاڵوگۆڕ کراون.[٦٧٥]

شایەنی باسە قەوارە کوردیەکان کاریگەری زۆر باشیان لەو جۆرە چالاکیانەدا هەبووە، ئەمەش بەهۆی ئەو سیاسەتە نەرم و لەبارەوە بوو کە دەسەڵاتدارانی وڵات پەیڕەویان دەکرد، کاتێك دانیشتوانی وڵاتەکەیان دەستکراوە کرد و ئازادیان کردن لە کاروباری بازرگانیدا بێ ئەوەی هیچ گرفت و لەمپەرێك لەبەردەم هەوڵ و جموجۆڵ و پرۆسەی بازرگانیدا دابنێن، ئەو هەڵوێستەش ڕۆڵی بەرچاوی لە گەشەپێدانی بازرگانی و ئابووریەکانی وڵاتدا هەبوو، بەو نەرمی و دیبلۆماسییەتەش، ئەو دەسەڵاتە کوردیانە تەقەلایەکی ڕوون و ئاشکرایان پێشکەش بە پرۆسەی بازرگانی کرد کە کاردانەوەی باشی لەسەر بوژاندنەوەی ئابووری هەبوو کە ئەمانە ئاماژەی ڕوون و ئاشکران بۆ سیاسەتی نەرم و دیبلۆماسییەتی دەسەڵاتی کورد، کە سوود لە ئەزموون و شارەزایی دوژمن وەردەگرن و بێ دوودڵی جێبەجێی دەکەن و لەهەمان کاتیشدا لە غەمی ڕەعیەتەکەشدا بووە لە ستەمی قەسابەکان کە بازارەکەیان بکاتە دواهەمینی بازاڕ و لەرادەی فرۆخت و مامەڵەی کەم بکەنەوە، ئەمەش دیبلۆماسییەت و فکرێکی بەرز و شارستانیانەیە. بەم جۆرە بینیمان چۆن سیاسەتی نەرم و دیبلۆماسی میرەکانی کورد و پێشکەشکردنی ئەو خزمەتگوزاریە گەورانە، ئابووری وڵاتەکەیانی لە بازرگانیدا

(٦٧٥) حمزة الجميعي الدموهي: عوامل الانتاج في الاقتصاد الاسلامي، دار التوزيع و النشر الاسلامية، ط١، القاهرة، ١٩٨٥، ص٧٣.

گەیاندە ئاستێکی باش، بەجۆرێك ولاتەکەیان بووە جێگەی سەرنج و چاوتێبڕینی هێزەکانی دەوروبەر و بازرگانان لە گشت گۆشە و کەنارێکەوە، خۆیان دەگەیاندە ئەو ولاتە بۆ ئەوەی لە سەرچاوەی پڕ خێروبێری نۆش بکەن و بە شارستانیەت و پێشکەوتنی ئاشنا بن، بێگومان ئەو ڕێوشوێنەش وای لە ئابووری ولاتان و میرنشینانی کورد کرد کاراتر و چالاکتر بن لە بورای بازرگانیدا.

زۆریی هەندێ بەروبوومی ئابووری لە چەند نێوچەیەکی دیاریکراودا، نەبوونی یاخود کەمی لە هەندێکی تردا، پێویست بە بازرگانی پێکردن دەکات لە نێوان ئەو هەرێم و شارانەدا، لەو ڕووەوە (أبن الفقیه الهمداني) بەدەربڕینێکی جوان گوزارشی لەم حاڵەتە کردووە کە دەڵێ: "ئەگەر خوا بەمیهرەبانی خۆی ئاوڕی لەهەر ولاتێك لە ولاتان نەدابایەوە، بەوەی کە هەر هەرێمە و شتێکی پێ بەخشیوە کە لە هەرێمێکی تردا ئەو شتە نیە، ئەگەر نا بازرگانی نەدەبوو پیشەسازیەکانیش تێدا دەچوون و کەس گەشتی خۆرئاوا و ولاتانی نەدەکرد و دەستبەرداری ئاڵوگۆڕی بەرو دیاریەکان دەبوون و کڕین و فرۆشتن و بەخشین و وەرگرتن بوونیان نەدەما، بەلام خوای پەروەردگار، بۆ هەر کەنارێك لەهەر وەرزێکدا جۆرێکی پێ بەخشیوە لە خێروبێر، هێزی سەفەرکردنی داوەتە کەسێك سەفەر بۆ ولاتی کەسێکی دیکە بکات و میللەتێك شاد بکات بەکالای میللەتێکی دیکە بۆ ئەوەی تەرازوەکە هاوتا بێتەوە و ڕاو تەکبیرەکان باشتر بەرێوە بچن". [٦٧٦]

ئەو ماوەیە بوژانەوەیەکی ئابووری بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، بەتایبەت لە بواری جموجۆڵی بازرگانیدا کە گەلێك نێوچەی لە جیهانی ئیسلامی گرتەوە کە خۆی لە دەوڵەتی عەبباسیدا دەبینیەوە سیستمی سیاسی و ئیداری لەو ولاتەدا شەقڵێکی سیاسی و نەرمی لەخۆ گرتبوو، ئەمەش ڕێگەی بۆ چەندین نیمچە دەوڵەت و میرنشین لە خۆرهەلات و خۆرئاوا خۆش کرد کە دابمەزرێن و جۆرێك لە سەربەخۆییان هەبێت، دواتر پێوەندی بازرگانی توندوتۆڵ لە نێوان ئەوان و مەڵبەندی خیلافەتدا درووست

(٦٧٦) مختصر كتاب البلدان، ٢٥١.

بێت،[٦٧٧] هەروەها هەمان پێوەندی لە نێو هەندێ لەو میرنشینانە و هەندێکی تریان درووست ببێت. حاڵی وڵاتی کوردیش وەك حاڵی ئەو میرنشینانە وابوو لە ڕووی جموجۆڵی بازرگانییەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە لەڕووی ئابوورییەوە بایەخی شارنشینان و مێژوونووسانی بەدەست هێنا لەلایەك، وەلەلایەی ترەوە، هەندێکیان مەبەستێکی بازرگانی هەبوو لەو سەفەر و گەشتانەیاندا کە هەرلایەکیان بۆ وڵاتی لایەکەی تریان ئەنجامیان دەدا. میرە کوردەکان لەو ماوەیەدا دەستیان کرد بە چاککردنی ڕەوشی ئابووری، چونکە هیچ کیانێك بێ گرنگیدان بەلایەنی ئابووری ناتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت، لەبەرئەوە دەستیان کرد بە ئەنجامدانی زنجیرەیەك چاکسازی کە بوو بەهۆی گەشەکردن و بەرەوپێشچوونی ڕەوشی ئابووری، و لە ئەنجامەکانی ئەو بوژانەوە ئابوورییەش بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی خەڵك بوو، گرتنەبەری ئەو ڕێوشوێنەش کاردانەوەی باشی لەسەر سومعە و شۆرەتی میرنشینە کوردیەکان هەبوو، جگە لەوەش بوو بەهۆی درووستکردنی پێوەندی و لێکتێگەیشتنی دیبلۆماسی و بازرگانی نێوانیان و نێوان هێزەکانی دەوروبەریان.

ئەو سەقامگیریە سیاسیەی کە میرنشینە کوردیەکان لەماوەی سەرهەڵدانیاندا بە خۆیانەوە بینی کە گەشەکردنێکی باشی بەخۆوە بینی بەتایبەتی لەڕووی ئابوورییەوە، کاریگەری لەسەر ژیانی سیاسی میرنشینەکان هەبوو بەتایبەت لە بوارەکانی دیبلۆماسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی دانیشتوانی نێوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو میرنشینانە، خەڵکی بەجۆرێك گوزەرانیان خۆش بوو کە لەگەڵ سروشت و بارودۆخی ئەو سەردەمەدا دەگونجا.

کاتێك سەرکێشیکردنی خاوەن زەویەکان دەستی پێکرد میر (بدر بن حسنویه) دەستی بە چەند ریفۆرمێکی ئابووری لەگەڵ ئەو خاوەن زەویانەدا کرد،[٦٧٨]

---

(٦٧٧) صلاح الدين نامق: التجارة الدولية، القاهرة، ١٩٦٧، ص١١-١٢.

(٦٧٨) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم،٢٨٨/٣-٢٨٩ ؛ابن الجوزي: المنتظم،٢٧١/٧.

مێژوونووسان بەبایەخەوە ئاماژەیان بەو ئارامی و خۆشگوزەرانیە کردووە کە وڵاتەکە بە خۆیەوە بینیوە لە ماوەی دەسەڵاتی ئەودا.[٦٧٩] هەروەها (الروذراوری)یش لە ئاماژەیەکیدا دەڵێ: "میر بدر، ئەوەندەی لەئازوقە و ماڵ و سامان لە وڵاتانی دیاریکراو و دەوروبەر کۆکردەوە، کە ڕەنگبوو بەو شێوەیە لە مەمالیکە زۆرەکان کۆنەکرایەتەوە..."[٦٨٠] ئیتر بازرگانی لە وڵاتەکەیدا بوژایەوە و خودی خۆی بەشداری گەشەپێدانی بازرگانی کرد، خانێکی لە هەمەدان کڕی بۆ ئەوەی کاڵا و کەلوپەلە هەڵبژاردەکانی وڵاتەکەی تێدا بفرۆشرێت، و دەسکەوتی ئەم کارەشی نزیکەی ملیۆنێك و دووسەد هەزار درهەم بوو،[٦٨١] ئەمەش وەك دەستپێشخەریەك بۆ فراوانکردنی پێوەندیە بازرگانیەکان و دیبلۆماسییەکان بوو لەگەڵ بوەیهییەکاندا.

بوەیهییەکان تەنها لە هەڵمەتە سەربازیەکانیدا داوای یارمەتیان لە میرنشینە کوردیەکان نەکردووە، بەڵکو لەپاراستنی ئاسایش و پاراستنی ڕێگاکانیشدا بەکاریان هێناون، وەك ڕێگەی خۆراسانی مەزن، (طریق خراسان العظیم) کە ئەم ڕێگەیە سەرەڕای ئەوەی ڕێگای حاجیەکان و گەشتیاران و ڕێگایەکی سەربازییە، گرنگیەکەی لەوەدایە کە ڕێگایەکی بازرگانییە و تێکچوونی ئاسایش تیایدا هەڕەشە لە داهاتی ئابووری دەوڵەت دەکات لەبەرئەوە بوەیهییەکان گرنگیان دەدا بە پاراستنی ئاسایشی ئەو ڕێگایە ئەوە بوو لە ساڵی (٣٤٢ك/ ٩٥٣ز)دا (ابن ابو الشوك الكردي)، خاوەنی حولوانی کرد بە (المعاون)* تیایدا، و پارێزەری ڕێگەی خۆراسان،[٦٨٢] هەروەها گرنگی

---

(٦٧٩) ابن الجوزي: المنتظم،٢٧١/٧؛ ابن كثير: البداية والنهاية،٢٥٣/١١.

(٦٨٠) ذيل تجارب الأمم، ٢٨٩/٣.

(٦٨١) الصابي: تأريخه،٤٥٢/٤ ؛ ادم متز: الحضارة الأسلامية، ٢٧٠/٢؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ص٢٨٧.

* المعاون: کۆی (المعونە)یە و خاوەنی مەعونە خۆی میرە بێ حاکم، (الماوردي: الاحكام السلطانية، ص١٩٦)

(٦٨٢) مسكويه: تجارب الامم، ٢/ ١٥٦؛ ابن الاثير: الكامل، ٨/ ٥٠٥.

ئەم ڕێگایەمان لەوەدا بۆ دەردەکەوێت، کە (عمید الجیوش) لە ساڵی (٣٩٧ك/ ١٠٠٧ز)دا دوای مردنی (قلج)ی پارێزەری ڕێگاکە، ئەم کارەی دایە دەست میر (ابو الفتح محمد بن عناز)، و میر (بدر بن حسنویه) کە دوژمنایەتیەکی خەستی هەبوو لەگەڵ (ابو الفتح)دا، ئەم کارەی بە دژایەتیکردنی خۆی لەقەڵەمدا، بەهۆی گرنگی ڕێگاکەوە لە بەستنەوەی وڵاتەکەی بە پێتەختی خیلافەتی عەبباسییەوە،[٦٨٣] بەڵام میرنشینی مەروانی، لەسەردەمی میر (نصر الدولة)دا گەشەکردنێکی بەرچاوی لەڕووی ئابوورییەوە بەخۆوە بینی، و میر خۆی هانی بازرگانی دەداو لەو بوارەدا ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو، تەنانەت سەبارەت بە شاری میافارقین وتراوە: "لە هەموو دەوروبەرەکانەوە بە کۆمەڵ بازرگانان و خەڵك لەسەردەمی حوکمڕانی ئەودا ڕوویان لەو شارە دەکرد، وای لێهاتبوو شارەکە جمەی دەهات لە گەشتیاران و بازرگانان".[٦٨٤]

لە سەردەمی ئەودا نرخی کاڵا و شمەك هەرزان بوو، لە نێو ئەو وڵاتانەی کە پێوەندی بازرگانیان لەگەڵ مەروانیەکاندا هەبوو، عوقەیلیەکان بوون،[٦٨٥] کە پێوەندی سیاسی و دیپلۆماسی توندوتۆڵ لە نێوانیاندا هەبوو جگە لە پێوەندیە ئابووریەکانیش، لەبواری ئابووریدا شاری (موصل) پێتەختی عوقەیلیەکان بوو وەك شاری حەڵەب لە باکووری شام، کە یەکێك بوو لە بازارەکانی میرنشینی مەروانی و کاروانی کاڵا و شمەکی بازرگانی کوردی و ئەرمەنی لەڕێگەی کوردستانەوە دەگەیشتە ئەو بازاڕانە، نەك تەنها لە سەردەمی میرنشینی مەروانیدا بەڵکو لە سەردەمەکانی بەر لەو میرنشینە و دوای ئەو سەردەمانەش ئەو ڕێگە سەرەکییانەی بەیەکیەوە دەبەستنەوە سێ ڕێگا بوون: ڕێگەی دیجلەی ئاوی، ڕێگەی خۆرهەڵاتی دیجلە کە بە جەزیرە و زاخۆ (الحسنیە)دا تێدەپەڕێ، لە ڕێگەی (نصیبین- موصل) ئەمەیان لەلایەکەوە، و لەلایەکی ترەوە شاری موصل سەرچاوەی ئەو کاڵاو کەلوپەلە بازرگانیانە بوو کە

---

(٦٨٣) حسام الدين علي غالب: الكرد، ٢٦٢.

(٦٨٤) الفارقي: تاريخه،١٦٦.

(٦٨٥) ابن الجوزي: المنتظم،٢٢٢/٨.

دەگەیشتنە کوردستان.[٦٨٦] لەبەرئەوە بەشێوەیەکی گشتی پێوەندیەکانی نێوانیان شەقلێکی دیبلۆماسی و دۆستانەی لەخۆ گرتبوو. لەگەڵ ئەوەی هەندێ جار رووبەڕووبوونەوە لە نێوانیاندا رووی دەدا، لەئەنجامی تەماحی عوقیلەکان و چاوبڕینە خاکی مەڕوانیەکان و بەزاندنی سنوورەکانیان. ئەو بنەما بازرگانیانەی کە پێوەندیە ئابووریەکانی نێوان میرنشینە کوردیەکان و هێزەکانی دەرودراوسێکانی لەسەر دامەزرابوو تۆکمە و بەهێزبوون، ئەویش بەهۆی خێروبێر و سامانی زۆر و زەوەندەی نێوچەکەوە بوو، بەتایبەت بەرووبوومی کشتوکاڵی، گەلێ لەو بەرهەم و کاڵایانە لە پێویستی نێوخۆیی زیاد دەبوو، لەبەرئەوە بۆ زۆربەی شارو نێوچەکانی دەوروبەر دەنێرران کە زۆربەی ئەو هەناردانە لەڕێگەی کاروانە بازرگانیەکانەوە بۆ شارو نێوچە نزیکەکان دەنێران، ئەویش بەهۆی ئاسان گەیشتنیان بۆ ئەو شوێنانە، بەڵام هەندێ لەو کاڵاو بەرهەمانەی کە بە خێرایی خراپ نابن و بۆماوەیەکی زۆرتر بەرگە دەگرن، ئەمانە لەڕێگەی بازرگانی ترەوە دەگەیشتنە نێوچە دوورەکان بەم جۆرە هەندێ لە هەناردەکانی میرنشینە کوردیەکان دەگەیشتنە نێوچە دوورەکان وەك وڵاتانی ئەودیو ڕووبار و وڵاتی هیند.

بازرگانانی هەردوو میرنشینی (حسنویە و عنّازی) بەرهەمەکانی وڵاتەکەیان بۆ نێوچەکانی دیکەیش دەنارد کە هەرێمی چیاکان و عێراق و نێوچەکانی دەوروبەری شاری بروگرد بوو، میوە و میوەجاتی خۆی بۆ شاری (کەرەج) دەنارد، وێڕای ئەوەی ئەو شارە بەجۆرە پەنیرێکی دەگمەن بەناوبانگ بوو لەبەرهەمە شیرەمەنیەکانیدا، ئەو پەنیرە بۆ نێوچە هەرە دوورەکان دەگوێزرایەوە،[٦٨٧] هەروەك چۆن لەشاری (الروذراور)ە وە ئەو پەنیرەی لەبەشی پێویستی خۆیان زیاد بوایە، بۆنێوچەکانی دەوروبەر دەنێرا.[٦٨٨] هەندێ لەشارە کوردیەکانی هەرێمەکە بەناردنی میوە ناسراو بوون، وەك شاری

(٦٨٦) عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية،٢/٥٥.

(٦٨٧) الاصطخري: المسالك والممالك، ١١٨ ؛ابن حوقل: صورة الأرض، ٣١٧.

(٦٨٨) المقدسي: س-پ، ١٢٨.

(نهاوەند)، کە بە باشی و زۆری میوەجات ناسراو بوو کەلێی دەنێررا بـۆ عێـراق.[٦٨٩] بەڵام شەربەتی میوەجاتەکەی بۆ شوێنە دوورەکان دەنێرا، کە بە بازرگانیەکی پڕ قازانج و خێر ناسراوبوو،[٦٩٠] هەروەها (الصَوْلجان)* کەلـە داری چـنار درووسـت دەکـرا لـەو شارەدا بەرێژەیەکی زۆر لەو درەختە هەبوو.[٦٩١]

شاری (ئەشنە-شنۆ) بە هەرمێ بەناوبانگ بوو، لەبەر چاکی جۆری هەرمێکەی لە هەرێمەکانی دەوروبەرەوە،[٦٩٢] بەرێژەیەکی بەرچاو ئیستراديان دەکرد، هەروەها هەر لەو شارەوە لە نێوچـەکانی دەوروبـەرەوە مـەڕومالاَت و هـەنگوین و گـوێز و بـادام و مێـو (الشمع) و گەلێ جۆری دیکە لە کالاَ بازرگانیەکان ئیستراد دەکران.[٦٩٣] و لە هـەردوو شاری نەهاوەند و ڕوزراوەریشەوە، زەعفەران کە بەباشی جۆرەکەی ناوبانگی هـەبوو، بـۆ عێراق و نێوچەکانی دیکە دەنێرا.[٦٩٤] بەڵام (الـذريرة) کـە یەکێکـە لـە جۆرەکـانی قامیش وەردەگیرا لە (نەهاوەند)، (أبن الفقيه) بـاس دەکـات دەڵـێ ئـەم (حنـوط)ە-حنوط مادەیەکە وەك سێوی لوبنان وایە بۆ مۆمیاکردنی مرۆڤ و ئاژەڵان بـەکاردێت و ڕێگرە لە بۆگەنکردن و خراپبوون_ئەم بەرهەمە بۆ گەلێ وڵات دەنێرێت،[٦٩٥] لە شاری (هەمەدان) و نێوچەکانیەوە، پۆشاکی لۆکەو کەتان و زعفەران و ئەسبیژروی و ڕێوی و

---

(٦٨٩) الاصطخري: المسالك والممالك، ١١٨؛ابن حوقل: س-پ، ٣٠٩.

(٦٩٠) محمد بن محمود همداني: عجایب نامه، ٤٨٣.

* بریتیە لە داردەستێك سەرەکەی چەماوەتەوە سوار بەکاری دەهێنێ بۆ لێدانی تۆپ لە هەندێ یاریدا. (حسام الدين علي غالب: الكرد، ص٢٩٥).

(٦٩١) القزويني: آثار البلاد، ٤٧٢.

(٦٩٢) ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١٦٤/١.

(٦٩٣) ابن حوقل: صورة الأرض،٢٨٩.

(٦٩٤) الاصـطخري: المـسالك والممالـك،١٩٩-٢٠٠؛ ابـن حوقـل: صـورة الأرض، ٣١٣-٣١٤ ؛ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٧٨/٣.

(٦٩٥) مختصر كتاب البلدان، ٢٥٩،١١٧.

سمۆره و کەوش (پێڵاو) و پەنیر[٦٩٦] بۆ نێوچەکانی دیکە دەنێردرایە دەرەوە. (أبن الفقیە) دەڵێ لە ڕستاق فراهان کەسەر بەهەمەدانە، دەریاچەیەکی بچوك هەبوو، لە وەرزی بەهار و هاویندا خەڵکی ئەو نێوچەیە، ئاوی ئەو دەریاچەیەیان وشك دەکرد و خوێیان لێ بەرهەم دەهێنا و بۆ هەموو نێوچە شاخاویەکانیان دەبرد.[٦٩٧]

لەڕوویەکی دیکەوە چیاکانی وڵاتی کورد خاوەنی گەلێ دارستانی چڕ بوون ئەمەش وای کرد کە بایەخ بەو دارانە بدەن و سوودیان لێ وەرگرن وەك سەرچاوەیەکی سوتەمەنی لەلایەك، بۆ دروستکردنی پێداویستیەکانی ناومال لەلایەکی ترەوە، و گەلێك ئاماژەش هەیە بۆ ناردنی دارو تەختە بۆ نێوچەکانی دەوروبەر، (أبن الفقیە) دەڵێ: "لە چیای باجرمی دارستانی زۆر گەورە هەبوون، داریان لێ دەبڕین و بۆ عێراق بار دەکران"[٦٩٨] و معلبایاش خەڵوزی دەنارده دەرەوە.[٦٩٩]

لە شاری حولوانەوە (هەنجیر وهەنار و کامخ) بۆ شارەکانی دیکە لە هەرێمی چیاکان،[٧٠٠] دەنێردرا، شایەنی باسە هەنجیری حولوان وشك دەکرایەوە و دەنێردرا بۆ شار و نێوچە جیاوازەکان، ئاماژەیەکی مێژوویش هەیە سەبارەت بە بارکردنی پەنیر و گوێز بۆ شاری کوفە،[٧٠١] سەرەڕای ئەوە حولوان نزیکترین شار بووە لە عێراقەوە کە بەفری لێ باریوە، (ابن حوقل) دەڵێ: "بەشێوەیەکی بەردەوام بەفر لە دوو فرسخەوە (١٢کم) لەو شارەوە دوور بووە"،[٧٠٢] لەو بارەیەوە بەڵگەی مێژوویمان لایە کە لە شاری حولوانەوە بەپشتی ئێستر بەفریان گەیاندۆتە شارەکانی عێراق وەك شاری

---

(٦٩٦) المقدس: أحسن التقاسيم، ٣٩٦.

(٦٩٧) مختصر كتاب البلدان،٢٤٥: القزويني: آثار البلاد،٤٣١.

(٦٩٨) مختصر كتاب البلدان،١٢٥، (ابن الفقيه هەڵەی کردووە کە ناوی (چیای باجرمی) هێناوە کە بە چیای (حمرين) دەوترا، ئەمەش نەدار و نەدرەختی لێی نیە).

(٦٩٩) المقدسي: س. پ، ١٢٨.

(٧٠٠) الجاحظ: التبصر بالتجارة،٣٤.

(٧٠١) ابن نديم: الفهرست، ٣٢: ابن خلكان: وفيات،٢/٢١٦.

(٧٠٢) صورة الأرض،٣١٤.

سـامەرا.[٧٠٣] بێجگـە لەوانـەی باسمـان کـردن، لـە نێوچـە شـاخاویەکانەوە هەنـدێ بەروبوومی دیکە دەنێردرانە نێوچەکانی دیکە لەو بەرهەمانـەش (تمکسـود)*ی شـاخ (چیا) بۆ خۆراسان[٧٠٤] دەڕۆیشت، بەم جۆرە دەبینین کـە بەروبوومـە کشتوکاڵییەکان زۆرترین هەناردەکانی هەردوو میرنشینی (حسنویە و عنازی) بوو.

بەڵام میرنشینی مەروانی لە (دیاربکر و جزیرە و نصیبین)، بەروبوومـەکانی خۆیـان دەگەیاندە شارو نێوچە ئیسلامیەکانی دەوروبەر، وەك، عێراق هەرێمی جەزیرە و شوێنە دوورەکانی دیکە، وتراوە کە زۆربەی ئازوقەی عێراق بـە گـشتی لـەو ناوچـانەوە و لـە ولاتی جەزیرەوە دابین کراوە.[٧٠٥] شاری جزیرەی (إبن عمر) بەوە ناسرابوو کـە بـەردەوام جموجۆڵی بازرگانی بەچڕی تێدا بەڕێوەدەچوو، لەوێوە باری کەرەسە و بەرهـەمی بـەنرخ دەگەیشتە (موصل)، وەك هەنگوین ڕۆن و گەزۆ و پەنیر و گوێز و بادام و بندق و مێوژ و هەنجیر و گەلێ جۆری دیکە لە بەروبوومـەکان، (المقدسی) لە ئاماژەیەکیدا سـەبارەت بە صادراتی جەزیرەی (ابن عمر) دەڵێ، گوێز و بـادام و ئەسـپ و خـوێ و ڕەشـەوڵاخ، بەهۆی بەلەمەوە دەگەیشتە عێراق، بەڵام شاری (الحسنیە) زاخـۆ دەکەوێتـە خـوارووی خۆرهەڵاتی جزیرەی (إبن عمر) ئەم بەروبوومـانـەی دەنـاردە دەرەوەی نێوچـەکەی خـۆی وەك، پەنیر و کەرە و ماستی تـۆراخ (پالاوتـە) و باسـوق و سـجوق و مێـوژ و میـوەی وشککراو.[٧٠٦]

بەڵام پۆشاك و جلوبەرگ، (الجـاحظ) ئەمانیـشی خـستۆتە چوارچـێوەی ئـەو کـاڵاو

---

(٧٠٣) الطبري: تاريخ الرسل والملوك،٢٩٤/٩.

* تمکسود: خوێی گۆشتە یاخود شتێکە لەو جۆرە بە خوێ خۆشە کراوە.(حسام الدین علی غالب: الکرد، پەراوێزی (١١)، لاپەڕە (٢٩١).

(٧٠٤) المقدسي: احسن التقاسيم،٣٨٤.

(٧٠٥) المقدسي:ه. س،١٣٦ ؛حمدان عبدالمجيد الكبيسي،١٩٠.

(٧٠٦) قدامة بن جعفر: الخراج وصناعة الكتابة،١٧٦ ؛ عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية، ٣٢٧/٢.

شمەکانەی لە ولاتانەوە دەهێنرێن و دەڵێ، پۆشاك و جلوبەرگی ناومال و دەسماڵ و خاولی و (طیاله -پۆشاکێکی ئاودامانە لە خوری درووست دەکرێت) و شاری ئامەد بەو جۆرە بەرگە بەناوبانگە، ئەمانە بۆ دەرەوە دەنێردران، ڕەنگە نزیکی ئەو شارە لە سنووری ولاتی ڕۆمەوە وای کردبێت کە بەرهەمەکانیان کاریگەری پیشەسازی ڕۆمی لەسەر بووبێت، چونکە هەندێ بەرگ و پۆشاکیان بە (الرومية) دەناسرا، هەروەها ماردینیش پۆشاك و جلوبەرگی بۆ شارەکانی دیکە دەنارد.[٧٠٧]

لەسەر ئاستی کانزاکان هەندێ لە شارەکانی جزیرەی فوراتی بەو مادانە ناسرابوو، لە چیای ماردینەوە شوشەی جۆری نایاب باردەکرا بۆ سەرجەم شارەکانی جزیرە، و تەنانەت بۆ ولاتی ڕۆمیش، و ئاسن لە شاری حانی لە دیاربکرەوە بۆ ولاتە جۆراوجۆرەکان دەهێنرا.[٧٠٨]

سەبارەت بە شاری نصیبین قورقوشم،[٧٠٩] و (شاە بلوط_ کەستانە) و میوەی وشکراوە و تەرازو و داودەرمان و شتی تریشی[٧١٠] دەنارده دەرەوە، لە (دير أحوشب) لە شاری سعرت لە دیاربەکر باشترین جۆری مەی (الخمر) درووست دەکرا، و بۆ هەندێ لە شارەکان دەنێرا لەبەر نایابی نەوعیەتەکەی.[٧١١]

(ناصر خسرو)ی گەڕیدە ئاماژە بەزۆری هەنگوین دەکات لە شاری بەدلیس کە سەر بەشاری میافارقین بوو، تەنها لەو شارەدا سالانە بڕی (٣٠٠-٤٠٠)هیزە هەنگوین بەرهەم دەهێنرا زیادەکەشی بۆ دەرەوە دەنێردرا و ئاماژە بە (قطران) دەکات کە لە دەوروبەری شارەکەدا درووست دەکرا ئەویش بۆ نێوچەکانی دەوروبەر دەنێرا.[٧١٢]

---

(٧٠٧) التبصر بالتجارة، ص٣٨؛ عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية، ٣٢٧/٢.

(٧٠٨) ابن حوقل: صورة الأرض،١٩٤ ؛ياقوت الحموي: معجم البلدان،١١٠/٣.

(٧٠٩) الجاحظ: التبصر بالتجارة،٢٢.

(٧١٠) المقدسي:احسن التقاسيم،١٤٥.

(٧١١) ياقوت الحموي: معجم البلدان،٤٩٧/٢.

(٧١٢) سفرنامە،٧.

جگە لەو کالاّ و پێویستیانە کە باسمان کـردن و لەشـارە کوردیەکانـەوە دەنێردرانـە هەرێمەکانی دەوروبەر، گەلێ بابەتی کەمالیاتیش دەنێرانە دەرەوە، وەك بابەتی عـەتر و بۆن، (المقدسی) دەڵێ لە شاری نصیبینەوە گولاّو_ ماء الـورد[٧١٣] (أسـتیراد) دەکـرا، ئەو شارەی بە جۆرەها گوڵی جوان و بۆن خۆشی ناسرابوو بەتایبەت (گوڵی سـپی، کـە گولاّوی ئەم جۆرە گوڵە لە زۆر شوێنەوە داواکاری لەسەر بوو، و لە هـەموو جۆرەکـانی دیکە باشتربوو).[٧١٤] هەر لە نصیبینەوە (الکواذین[٧١٥]_ دەهێنراو لەشاری (دارا) و دەوروبەریشی (المِحلَبْ) ئەویش بەری درەختێکـە بـۆنێکی زۆر خۆشـی هەیـە عەرەبـە خێڵەکیەکان وەك بۆن بەکاریان دەهێنا. لێرەوە بۆمـان دەردەکەوێت کە کـالاّو کەلوپەلـە بازرگانیـەکانی مەروانیـەکان بەشـی هـەرەزۆری بـۆ نێوچـەکانی عێـراق و شـام و نێوچـەکانی دیکـە دەنێـردرا بەتایبـەت شـارەکانی جـەزیرە، سـەرەڕای ئـەوەی بـۆ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیش دەنێردرا، کە هەندێکیان لە بازاڕەکانی ئەو ئیمپراتۆریەتـەدا دەفرۆشران و هەندێکی تریش بۆ نێوچەکانی دیکە باردەکرا. بەلاّم سەبارەت بە هـەردوو میرنشینی (الروادیة و الشدادیة) لە ئاذربیجان و ئاران، ئاوەدان و پڕ خێروبێـر بـوون و بازرگانان ڕوویان تێ دەکرد و لەوێ کۆدەبوونەوە، و ئەو کالاّو بابەتانەی بازرگانیان پێوە دەکرا، وەك، (قرمز - بۆیاخی سور)[٧١٦] و (الـسراویل-شـرواڵ) و پۆشـاکی خـوری و پەموو- لۆکە -و ماسی و هەنگوین و مێو (الشمع) سەرجەم ئـەم کالاّیانـە لـەو دوو میرنشینەوە باردەکران بۆ نێوچەکانی دیکە، و لەو کالاّ بازرگانیانەی دەگەیشتنە ئـەوێ

---

(٧١٣) احسن التقاسیم، ١٢٨.

(٧١٤) ابن سعید المغربي: بسط الأرض،٨٩.

(٧١٥) المقدسـي:س. پ، ١٢٨: الکواذین:دارێکە وەك داری خورما وایە بەرێك دەگرێ بۆنێکی زۆر خۆشی هەیە).

(٧١٦) ابن حوقل: س. پ،٢٩٤.

به پلەی یەکەم بازرگانی (الرقیق)* واتە کۆیلە و کەنیزەك بۆ هەردوو ڕەگەزی نێرومێ بوو، کە بریتی بوو لە کۆیلە و کەنیزەکی ڕۆمی و ئەرمەنی و بەجناکی و خەزەری و سقلەبی.[717]

پێوەندیە بازرگانیەکانی کورد لەگەڵ هێزەکانی دەوروبەریدا بەو ڕێگایانەدا تێدەپەڕین کە بە میرنشینە کوردیەکانەوە بەسترابوونەوە کە هەندێکیان دەگەیشتنە نێوچەکانی (طبرستان و خۆراسان) و گەلێ شوێنی دیکە لە خۆرهەلات، هەندێ لە هەناردەکانیشیان دەگەیشتنە موسڵ و عێراق و شام و گەلێ نێوچەی دیکە، بەو ڕێگەوبانانەدا کە میرنشینە کوردیەکانی بە سەرجەم نێوچەکانی ترەوە دەبەستەوە، ئەم پێوەندیە بازرگانیانەش لەگەڵ هێزەکانی دراوسێ و دەوروبەری میرنشینە کوردیەکاندا بوو بەهۆی گەشەپێدان و قوڵبوونەوەی پێوەندیە توندوتۆڵەکانی نێوانیان کە خۆی لە سیاسەتی دیبلۆماسیدا دەبینییەوە لەپێناو پاراستنی ئابووریەکانی نێوچەکەدا، کە دیارە پێویستی بەو جۆرە پێوەندیانە هەبووە بۆ درێژەدان بە دیبلۆماسییەتی بازرگانی بۆ کورد لەو ماوەیەدا.

بەڵام سەبارەت بەو کاڵا بازرگانیانەی بۆ نێوچەو هەرێمەکانی کورد هاوردە دەهێندران زۆر کەمتربوو بە بەراورد لەگەڵ ئەو کاڵایانەی کە دەنێردرانە دەرەوە. ئەوەش

---

* کۆیلە (الرقیق- العبید): پەیوەستە بە پرۆسەیەك کە تیایدا مرۆڤێك دەبێتە موڵکی مرۆڤێکی تر، خاوەن کۆیلە دەبێتە خاوەنی هەموو تواناکانی کۆیلەکەی ماددی‌و مەعنەوی‌و کۆیلەش جگە لەهەندێ مافی زۆر سەرەتایی هیچ مافێکی نیە جگە لەو مافەی کە خاوەنەکەی پێی دەدات، هەرچەندە لە شارستانیەتێکەوە بۆ شارستانیەتێکی تر هەندێ جیاوازی دەدات وەك یۆنانی، ڕۆمانی، قیسری، عێراق، ئیسلام، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (عبدالله ناصح علوان: نظام الرق في الاسلام، دار السلام للطباعة والنشر والتوزيع والترجمة، د. ت، ٢٠٠٣؛ عبدالسلام الترمانيني: الرق ماضيه وحاضره، سلسلة عالم المعرفة، الكويت، ١٩٧٩؛ احمد شفيق باشا: الرق في الاسلام، تر: احمد زكي، مطبعة بولاق، مصر، د. ت.

(٧١٧) مؤلف مجهول: س. پ، ١١٩.

جەخت کردنەوەیەکە لەسەر تۆکمەیی و سەلامەتی ئابووری کورد و ولاتەکەیان، چونکە هەناردەکانیان زۆر زیاتر بوو لە هاوردەکانیان.

ئاشکرایە ئەو بازرگانانەی کالاو کەلوپەل و بەرهەمەکانی نێوچەکەی خۆیان بۆ ولاتان و هەرێمەکانی دیکە باردەکرد، هەروا بەدەستی بەتاڵ نەدەگەڕانەوە بۆ نێوچەکانی خۆیان بەبێ کالاو کەلوپەل، بەڵکو جۆرەها کەلوپەلیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا کە لە نێوچەکانی خۆیاندا ئەو بەرهەم و بابەتانە نەبوون ئەمەش جەخت لەسەر پتەویی پێوەندیە بازرگانیەکان و دیبلۆماسییەکانی نێوان میرنشینە کوردیەکان و ولاتان و هێزەکانی دەوروبەریان دەکاتەوە، بوونی چەندین بازاڕی گەورە و چەندین مەڵبەندی ئاڵوگۆڕی کالا بازرگانیەکان جەخت کردنەوەیە لەسەر ڕادەی بالای جموجۆڵ و بزووتنەوەی بازرگانی لەسنووری میرنشینە کوردیەکان و شارو نێوچەکانیدا، لە بەناوبانگترین ئەو بازاڕانەش بازاڕی (الکرکی)[718] بوو، لە نێوچەی (باب الأکراد) لەشاری (برذعة) لە هەرێمی ئاران، کە بازاڕێکی بازرگانی گەورەیە ڕووبەرەکەی فرسەخێك بە فرسەخێکە (واتە ٣٦کم)ە، [719] هەموو ڕۆژانی یەك شەممان خەڵك و بازرگانان لە سەرجەم گۆشە و کەنارێکەوە ڕوویان تێدەکرد تەنانەت لە عێراقیشەوە، تاوای لێهات ڕۆژی یەك شەممە لەو نێوچەیە بە ڕۆژی (الکرکی)[720] دەناسرا، هەروەك چۆن ئەوسا لە زۆربەی بازاڕە هەمیشەییەکانی خۆرهەلات بەو شێوەیە بوو. هەر بازاڕە و ڕۆژێکی دیاریکراوی لە هەفتەدا هەبوو، بۆ نمایشکردن و فرۆشتنی کالاکانیان، کە ئاوریشم و پۆشاك و جلوبەرگی لێ دەفرۆشرا، [721] دیاربوو ئەو بازاڕانە لە ولاتان و

---

(٧١٨) لسترنج: بلدان الخلافة الشرقیة،٢١٢.

(٧١٩) الأصطخري: المسالك والممالك،١١٣ :ابن حوقل: س. پ،٢٩١.

(٧٢٠) نعیم زکي فهمي: طرق التجارة الدولیة..،٢٨١.

(٧٢١) المقدسي:س. پ،٣٨٠.

نێوچە جیاوازەکانەوە داهاتی باشیان دەست دەکەوت، چونکە خەڵك لە هەموو گۆشە و کەنارێکەوە ڕوویان تێ دەکرد.[722]

ئاشکرایە ئەو بازاڕانە لەڕووی پەیوەستبوونی ڕاستەوخۆی بە بازرگانیەوە بایەخێکی گەورەی ئابووریان هەبوو، چونکە شوێنی ساغکردنەوەی کالاو بەرهەمەکان بوون، شارەکان وەك بازاڕێکی گەورە وابوون چەندین گوند بە چواردەوری ئەو شارانە هەبوون، گوندنشینەکان دەهاتنە ئەو شارانە و لە بازاڕەکانیدا هەم بەرهەمەکانی خۆیان تێدا ساغ دەکردەوە و هەمیش پێداویستیەکانی خۆیان لە کالاً و کەلوپەلە پێویستەکان لێ دەکڕی.[723] بازاڕەکانی شاری ورمێ لە زۆربەی کاتەکانی ساڵ چالاك و بەفرۆخت بوون، مامەڵە بازرگانیەکان وەها وەسف کراون کە "ڕوقازان فرۆختی زۆر و دەسکەوتی زۆر و پڕ خێروبێر".[724] و لە بازاڕە بەناوبانگەکانی کە لە هەموو لایەکەوە بازرگانان ڕوویان تێدەکرد، بازاڕی (کورسرە) کە دەکەوتە نێوان ئەردەبیل و مەراغە لە ئازەربیجان، کە بازرگانان لە هەموو مانگێکدا ساڵانە ئامادەی ئەو بازاڕە دەبوون، و جۆرەها کالاو شمەکیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا بۆ فرۆشتن و ساغکردنەوەیان، (إبن حوقل) لەو بازاڕەدا، ئامێری زەرد دروستکردنی (آلة الصفر) بینیوە کە لە عێراقەوە هێنابوویان، ئەمە و جگە لە خشڵی زێڕ و زیو.[725]

لە بازاڕە بەناوبانگەکانی میرنشینی مەروانی، بازاڕی (حەریر -البز) لە میافارقین بوو،[726] جگە لە گەڵێ بازاڕی گەورەی دیکە هەردوو میرنشینی (حسنویە و عنازی)دا هەبوون کە بەروبوومی هەرێمەکانی تێدا ساغ دەکرایەوە.

---

(٧٢٢) القزويني: ثار،٥١٢ ؛ لحميري: الروض المعطار،٨٧.

(٧٢٣) عبدالعزيز الدوري: تأريخ العراق الأقتصادي، ١٣٣.

(٧٢٤) ابن حوقل: صورة الأرض،٢٨٩.

(٧٢٥) ابن حوقل: هـ_س،٣٠١.

(٧٢٦) الفارقي: تأريخه،٦٦.

ئەو بازاڕانەی کە باسمانکرد تەنها بازاڕی لوکاڵی نەبوون و بەس، بەڵکو کاڵا و شمەك و بەروبوومەکانی گەلێ شار و نێوچەکانی دەوروبەریان بۆ دەهات چ لە وڵاتە ئیسلامیەکانەوە و چ لەو نێوچانەی کە ئیسلام نەبوون، ئەمەش وایکردبوو کە ببوونە بازاڕێکی گرنگ کە چالاکیە بازرگانیەکانی بەشێوەیەکی فراوان تێدا ئەنجام دەدرا، تەنانەت مێژوونووسەکانیش بە بایەخەوە باسیان لەو بازاڕانە کردووە. سەرەڕای ئەوانەی باسمانکرد، میر (بدر بن حسنویه) فەرمانیدا بە دروستکردنی بازاڕێك بۆ فرۆشتنی بەروبوومەکان، (الروذراوری) دەڵێ: "بازاڕێکی گشتگیری دروستکرد کە سەرجەم ئەو شتانەی تێدا بفرۆشرێت کە لە وڵاتان دەفرۆشرێت و هەرچی پێویستیەکانی خەڵك هەبوو لەو بازاڕەدا بە هەرزانترین نرخ دەستەبەری کرد...".[٧٢٧]

ڕەنگە یەکەم شتێك کە بەرچاوی (البلدانی) کەوتبێت لە میانەی گەڕانەکانیدا بەناو شارەکاندا بازاڕەکان بووبێت، کە خەڵکێکی زۆر سەرقاڵی کڕینی پێداویستیەکانن، هەرکاتێك بازاڕەکان ئاوەدان بووبن نرخیش گونجاو بوون، ئەوە بەڵگەی بەهێزی ئابووری ئەو شارە و بوژاندنەوەی بازرگانیە تێیدا.

شارنشینەکان و بەتایبەت (المقدسی) دەربارەی سروشتی بازاڕەکان لە شارەکاندا دەڵێن ناوەندێکی زیندووی گرنگە و بەچەندین وتەو زاراوەی جۆراوجۆر ناویان بردووە کە هەر یەکێکیان دەلالەتێکی تایبەتی هەیە، وەك: ((زۆر[٧٢٨]، مەزن[٧٢٩]، جوان[٧٣٠]، باش[٧٣١]، گەورە[٧٣٢]..)).

---

(٧٢٧) ذيل تجارب الأمم،٣/٢٩٠.

(٧٢٨) ياقوت الحموي: معجم البلدان،١٩٤/٧.

(٧٢٩) الاصطخري: المسالك و الممالك،٧٦.

(٧٣٠) ناصر خسرو: سفرنامة،٧.

(٧٣١) ياقوت الحموي: معجم البلدان،٢/٤٥٥.

(٧٣٢) ياقوت الحموي: هـ_س،٢/٢٥٩.

له سەرچاوەکاندا هەندێ ئاماژە هەیە دەربارەی، هاوردەی ولآتان و میرنشینە کوردیەکان بۆ هەندێ کالآو بەروبومەکان لە شاران و نێوچەکانی دەوروبەر، بۆ نمونە هەردوو میرنشینی (الحسنویه و العنازیة) لەخۆرئاوای هەرێمی چیاکانی دەوروبەر شمەك و بەروبوومەکانیان ئیستیراد دەکرد. ئەو کالآو بەرهەمانە لە شاری ئەسفەهانەوە، ئیستیراد دەکران: "عەتابی و ئاوریشم و پۆشاکی حەریر و لۆکە"،[٧٣٣] هەروەها ئاماژەیەکی مێژوویی هەیە بۆ هێنانی (زەیت) لە شاری کوفەوە بۆ شاری حولوان.[٧٣٤] و ئەم نێوچەیە پشتی بە شەکری هەرێمی خۆزستان بەستبوو کە دەکەوێتە باشووریەوە، و لە شاری (جندیشابور)ەوە، شەکریان دەهێنا کە ئەو شارە بە بەرهەمهێنانی شەکر بەناوبانگ بوو.[٧٣٥]

لە نێوچە و هەرێمەکانی ترەوە هەندێ کالآو بەرهەم بۆ هەردوو میرنشینی (الروادیة و الشدادیة) دەهێندران (أستیراد) دەکران، لە نێوچەی ئازەربیجانەوە، لۆکە و پۆشاکی (المنیرە والأبراد والأکسیة) لەشاری (الري).[٧٣٦] ئیستیراد دەکران، وێرای ئەوەی کە ئاوریشم و کوتاڵ لەو میرنشینانە هەبوو، کەچی لۆکە و هەندێ پۆشاك ئیستیراد دەکران، پێدەچوو کە بەشی پێداویستی دانیشتوانەکەی نەکردبێت.

دەتوانین قسەکانی (إبن حوقل) بکەینە بەڵگە، سەبارەت بە بازاڕی (کورسەرە) لە ئازەربیجان، کە هاوردەکانی ئەو نێوچەیە فرەجۆر بوون، هەموو جۆرە کالآو بەرهەمێکی لە نێوچە نزیکەکان و دوورەکانەوە هاوردووە، ئەو دەڵێ واتە (أبن حوقل) ڕووبەری بازاڕەکە نزیکەی سێ فرسەخ دەبێت واتە دەوروبەری (١٨)کم، کە پڕە لە خەڵك و لە بازرگانان و کالآو کەلوپەلی بازرگانی وەك (ئاوریشم و بۆن و مافور و شمەکی سەڕاجی و چەك و تفاقی جەنگی و جۆرەها ولآخ و گەلێ شتی تر)، لەگەڵێ

(٧٣٣) ابن حوقل: صورة الأرض،٣٩.

(٧٣٤) ابن نديم: الفهرست،٣٢ ؛ابن خلكان: وفيات،٢١٦/٢.

(٧٣٥) المقدسي:احسن التقاسيم،٤٠٨.

(٧٣٦) الأصطخري: المسالك والممالك،٢١٠ ؛ابن حوقل: صورة الأرض،٣٢٢.

نێوچە و هەرێمەکانەوە خەڵك و بازرگانان لەو بازارەدا کۆدەبوونەوە، وەك خەڵکی یەمەن و میسر و عێراق و مەغریب و شام و خۆراسان،[٧٣٧] بازرگانانی ئەو نێوچانە بۆ بازرگانی دەهاتنە ئازەربیجان، بێگومان ئەوانیش لەگەڵ خۆیاندا، گەلێ جۆر لە کاڵا و بەرهەمی وڵاتەکانی خۆیان دەهێنا و لەوێ دەیانفرۆشت لە گەڕانەوەشیاندا کاڵای ئەو نێوچەیەیان بۆ وڵاتەکانی خۆیان دەبردەوە.

وادیار بوو لە شاری (باب الأبواب) لە جرجانەوە (القمان) دەهێنرا کە بەهۆی بەلەم و کەشتی بە دەریای خەزەردا دەگەیشتنە ئەو شارە، بەڵام دانیشتوانی (ئاران) خورمایان لە بەسرەوە دەهێناو، لە هیندیشەوە شمشێری جۆری نایابیان ئیستیراد دەکرد جگە لە مۆم و هەنگوین و فەروو.[٧٣٨]

میرنشینی مەروانی هەندێ کاڵا و بەروبوومی لە شام و موصل ئیستیراد دەکرد، ئاماژەیەکی مێژوویی هەیە بۆ ئیستیراد کردنی (خام) بۆ میافارقین لەلایەن یەکێك لە بازرگانانەوە کە قازانجێکی زۆری لێ بەدەست هێنا.[٧٣٩]

(ناصر خسرو)ی گەریدە، دەڵێ، "بازرگانانی دیاربەکر دەچوون بۆ شاری حەڵەب"[٧٤٠] بۆ بازرگانی، ئەو شارە بە بەرهەمهێنانی سابوون بەناوبانگ بوو،[٧٤١] سابوونی بۆ هەرێمی دیاربەکر دەنارد، لەوێشەوە بەرەو بازاڕەکانی بەڕێ دەکرا. بەڵام سەبارەت بەشاری (أربل) بۆ ئەوەی لەوێ بیفرۆشن.[٧٤٢]

بێگومان ئەو بازاڕانەی لە شارە کوردیەکاندا گەشەیانکرد، لە ئەنجامی ئەو پێشکەوتنە بوو کە ژیانی ئابووری لەژێر سایەی فەرمانڕەوایان و میرە کوردەکان

---

(٧٣٧) صورة الأرض،٣٠١.

(٧٣٨) ابن رستە: الأعلاق النفيسة،١٤٣.

(٧٣٩) الفارقي: تاريخه،١٦٦-١٦٧.

(٧٤٠) سفرنامه،١٠.

(٧٤١) Lapiduse: Ira Marvin. Muslim Citics in the later middle ages, Harvad University press, (U. S. A: ١٩٦٧), P.٣٣.

(٧٤٢) ابن المستوفي: تاريخ اربل،٢٧٨.

بەخۆیەوە بینـی، بـۆ نموونـە لەناویانـدا مـیر (بـدر بـن حـسنویە) بـوو، کـە چـەند ڕێوشوێنێکی بازرگانی گرتە بەر، وەك دروستکردنی چەند بازاڕێکی گشتی و هێنانی کاڵاو کەلوپەلی جۆراوجۆر بۆ ئـەو بازاڕانـە، و لـە هـەموویان گـرنگتر ئـەوە بـوو کـە پێشینەی (سـلفە)دا بـە جوتیـار و کەسـانی تـریش، بـۆ ئـەوەی لـە بازاڕەکانـدا بـۆ پێداویستیەکانی خۆیان خەرجی بکەن، کە ئەمەش بە قازانج و داهات دەگەڕێتەوە بـۆ خەزێنەی میرنشینەکە کە دواتر بۆ پڕۆژەکانی ئابووری و ئاوەدانکردنەوە جارێکی دیکە خەرج دەکرێتەوە.(٧٤٣)

ئاشکرایە کە وڵاتی کورد بە زۆری خێروبێر و سەرچاوەکانی داهات ناسراوە کە بۆتـە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی دانیشتوانەکەی و نزمبوونەوەی نرخ لـە بازاڕەکانیـدا. ئەم دیاردەیەش بازرگانانی بەکێش کرد بۆ هەرێم و نێوچە کوردیەکان بـۆ ئەنجامـدانی کاروباری بازرگـانی، کـە ئەمـەش بـە دەوری خـۆی فاکتـەرێك بـوو بـۆ پتـەوکردن و قوڵبوونەوەی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان لـە نێـوان هێزەکـانی دەوروبـەر و میرنـشینە کوردیەکان لە زۆربەی کاتەکاندا.

بـەم شـێوەیە ئـەو وڵاتـە بـوو بـە مەڵبەنـدێکی گـەورەی بازرگـانی، و هـەروەها هەڵکەوتەی شوێنەکەشی کاریگەریەکی گەورەی هەبوو، لـەوەی کـە ببێتـە پردێکـی پێوەندی لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا و ببێتە بازاڕێکیش بـۆ مامەڵـە و ئـاڵوگۆڕی بازرگانی لە نێـوان دەوڵـەتان و میرنـشینە کوردیـەکان لەلایـەك و لـە نێـوان هێـزە سیاسیەکانی نێوچەکە لەلایەکی ترەوە. ئەم بارودۆخە بۆ ماوەی چەندین سـاڵ بـەردەوام بوو تا بزووتنـەوەی دۆزینـەوە جوگرافیـەکان دەسـتی پێکـرد لـە کۆتـایی سـەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەردەمی نوێدا کاتێك مەڵبەندی بازرگانی جیهـانی لـە دەریـای ناوەڕاستەوە گوێزرایەوە بۆ ئوقیانوسی ئەتڵەسی، و کەوتنەوەی دەرئەنجامی مەترسـیدار

---

(٧٤٣) محمد امین زکي: خولاصەیەکی تاریخی، ٢/٦٨-٧٠.

لێی، بە هەرحاڵ تا ئەو کاتەش خۆرهەڵاتی ئیسلامی ناوەندی سەنگی بازرگانی جیهانی بوو.

ئەو جموجوڵە بازرگانییە، جموجوڵێکی گونجاو دەخوازێت لەبواری پێوەندییە دیبلۆماسییەکان بۆ ڕێکخستنی مامەڵە بازرگانییەکان و چارەسەرکردنی هەر گیروگرفتێك کە سەرهەڵدەدات. لەم ڕووەشەوە بوونی نوێنەرایەتی دیبلۆماسی ئاڵوگۆڕی سەفیر و نێردەر و پەیامە فەرمییەکان هەنگاوێکی سروشتی و ئاڕاستەیەکی باشە، بوونی گفتوگۆ و دانوستان لە نێوان لایەنە دیاریکراوەکاندا دووبارە مەسەلەیەکی پێویستە کە ڕەنگە چەندین پەیماننامە و پرۆتۆکۆلی بازرگانی لێ بکەوێتەوە.

## پەیوەندی بازرگانی کورد لەگەڵ وڵاتی شامدا

پەیوەندیە بازرگانیەکان لە سەرەتادا تەنها لەگەڵ شارەکانی کوردستانی باکووردا بوو، بەشێوەیەك بازرگانەکانی شام دەچوونە شارەکانی (نصیبین و ئارزن) و جموجۆڵی بازرگانی لە بازاڕەکانیاندا گەشەی کردبوو و ئاڵوگۆڕی بازرگانی ئەنجامدەدرا. شاری نسەیبین نموونەیەك بوو بۆ ناوەندێکی بازرگانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.[٧٤٤] بەڵام شاری ئارزن بازرگانەکانی وڵاتی شام ڕوویان تێدەکرد و ئەویش ببووە نێوەندێکی بازرگانی گرنگ و پێگەیشتنی بازرگانەکان و گۆڕینەوەی شمەکەکان.[٧٤٥]

پێوەندیە بازرگانیەکان لە شاری حەلەبدا توندوتۆڵ بوو ئەویش بەهۆی شوێنگەکەیەوە کە کەوتبووە سەر شاڕێگەی سەرەکی نێوان وڵاتی شام و هەرێمی جەزیرە هەر ئەو هۆکارەش بوو شاری حەڵەبی کردبووە شارێکی گەورە و ناوەندێکی گرنگ،[٧٤٦] و کاریگەری کاروانە بازرگانیە گەورەکان کە بە ڕۆژهەڵاتەوە دەهاتن. لەو شارانەدا بریکارە بازرگانیەکان هەبوون لە وڵاتی کوردان و هند و فارسدا.[٧٤٧] دەقە مێژووییەکان ئاماژە بەبوونی پێوەندیەکی بازرگانی بەهێز دەکەن لەگەڵ شاری

---

(٧٤٤) ف. هايد: تاريخ التجارة في الشرق الادنى في العصور الوسطى، تر. احمد محمد رضا، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٨٥، ٥٩/١.

(٧٤٥) م-س،٦١/١.

(٧٤٦) ابو الفداء: تقويم البلدان،٢٦٧.

(٧٤٧) محمد كرد على: خطط الشام، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٧٠، ج٤/ ص٢٤٧.

حەڵەبدا.[748] سەرەڕای گرنگی شاری دیمەشق وەکو نێوەندێکی بازرگانی و بازاڕێکی دەوڵەمەند بۆ بازرگانەکانی شارە کوردیەکان، چونکە گرنگترین شارەکانی وڵاتی شام بوو لەو کاتەدا و بازاڕەکان لێوان لێو بوو لە بەرهەمە چاکەکانی ئەو جوڵە پیشەسازیە بوو بەهۆی گۆڕینی شارەکە بۆ ناوەندێکی بازرگانی گرنگ و ناردنەدەرەوەی شمەکەکان.[749] سەرچاوە مێژوویەکان جەخت لەسەر بوونی ئەو پێوەندیە توندوتۆڵەی نێوان وڵاتی کوردان و شاری دیمەشق دەکاتەوە.[750]

ئەو پێوەندیە بازرگانیەی نێوان وڵاتی کورد و وڵاتی شام ئەنجامێکی مەزنی هەبوو سودێکی زۆری بە بوژاندنەوەی بزوتنەوەی بازرگانی دا. ئاماژە مێژووییەکان باس لە گەورەیی ئەو کاروانە بازرگانیانە دەکەن کە قوڵی پێوەندیە بازرگانیەکانی نێوان دوو وڵات دەسەلمێنێت (ابن العبري) مێژوونووس ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە کاروانەکان لە سنجارەوە ڕووە و وڵاتی شام دەڕۆیشتن و پتر لە چوار سەدە و حەفتا بازرگانی تێدا بوو لە نێوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا (١١ز)[751] لە کاتێکدا دەبینین کاروانی لەوە گەورەتر لە شاری (ماردین)ەوە ڕووە و وڵاتی شام بەڕێ دەکەوێ کە (٩٠٠) بازرگانی تێدابووە.[752]

---

(٧٤٨)ناصر خسرو: س. پ، ٥٥؛ ابن الشحنة: الدر المنتخب في تاريخ مملكة حلب، وقف على طبعه و علق حواشيه:يوسف بن الياس سركيس الدمشقي، المطبعة الكاثوليكية، بيروت،١٩٠٩، ٢٥٤.

(٧٤٩) ابن حوقل: صورة الأرض،١٦١ ؛ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣٠٨/٤.

(٧٥٠) الذهبي: العبر،٣١٠/٥؛ القفطي: انباه الرواة على انباه النحاة: تحـ: محمد ابو الفضل ابراهيم، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة،١٩٥٢،٢/٢٨١.

(٧٥١) تاريخ الزمان،٢٨٢.

(٧٥٢) العمري: منهل الأولياء، ١٢٩.

## پێوەندی بازرگانی لەگەڵ (چین)دا

وڵاتی چین وڵاتێکی دەوڵەمەند بوو بە بەروبوومەکان،[٧٥٣] و زۆر لەو شمەك و بەروبوومانەی درووست دەکرد کە داواکاریەکی جیهانی لەسەر بوو بەتایبەتی تاوریشمی چینی کە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا نێوبانگێکی گەورەی هەبوو لەوڵاتی کوردان و عێراق و ئێران و دەوڵەتی بێزەنتە و وڵاتی شام و هەروەها ئەورووپاش.[٧٥٤] بازرگانەکانیش ئەو کاڵایانەیان لە چینەوە دەبردە ئەو وڵاتانە.[٧٥٥]

بەروبووم و شمەکە ڕۆژهەڵاتیەکان جۆراوجۆر بورن و نێوبانگی چاکی و وردەکاری لە درووستکردنیدا هەبوو بەتایبەتی ئەوانەی لە چینەوە دەهاتن و دەگەیەنرانە وڵاتانی خیلافەتی ئیسلامی و هەندێك دەوڵەتانی جیهانی پێشکەوتوو.[٧٥٦] شارە کوردەکانیش ڕۆڵێکی کاریگەر و گرنگیان هەبوو لە تێپەڕبوونی ئەو کاڵایانەی لە چینەوە ڕووە و تەرابزونی بێزەنتە دەڕۆیشتن، ئەو پێوەندیە بازرگانیەش هۆی زۆری هەناردە و هاوردەوە لە سەدەکانی چوارەم و پێنجەمی کۆچیدا (١٠-١١ز) بە هێز کرابە.[٧٥٧]

---

(٧٥٣) عبدالعظيم رضائي: گنجينۀ تاريخ ايران، انتشارات اطلس، تهران، ١٣٧٨، ١١/ ٣٨٧.

(٧٥٤) اليعقوبي: تأريخه،١/١٥٧.

(٧٥٥) عبدالعظيم رضائي: گنجينه،٣٨٧/١١.

(٧٥٦) المسعودي: مروج الذهب،١/١٤٦.

(٧٥٧) شاكر مصطفى:س-پ،٢/٤٣٨.

## پێوەندی بازرگانی لەگەڵ میسردا

پێوەندی بازرگانی نێوان کوردستان و میسر بەهۆی زۆری هەنارده و هاوردەوە لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا و لەڕێگەی بازرگانی ڕاستەوخۆی نێوانیانەوە پتەوبوو.[(٧٥٨)] یاخود لەڕێگەی بەستنی ڕێکەوتننامەی بازرگانیەوە وەك لە نێوان میرنشینی مەروانی و دەوڵەتی فاتمیدا لە میسر دەبینرێت.[(٧٥٩)] لەو ڕێگەیەشەوە بازرگانەکان ببوونە خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆر.[(٧٦٠)] میسر بە خێروبێرێکی زۆر و بەروبوومی چاك و تایبەتمەند ناسرابوو (المقدسی) باس لە بازاڕە گەورەکان و نێوەندە بازرگانیەکانی دەکات.[(٧٦١)]

(٧٥٨) القلقشندي: صبح الأعشى، ٩١/٤ ؛المقريزي: السلوك، ٣٥٤/٣.

(٧٥٩) عبدالرقيب يوسف: س-پ، ٢٢٩/٢.

(٧٦٠) ادم متز:س. پ، ٣١٦/٢.

(٧٦١) احسن التقاسيم، ١٦٧..

## ئەو بەڵگانەی فراوانی ڕەهەندی ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەسەلمێنن

کۆمەڵێك بەڵگە هەن گومانەکان دەڕەوێننەوە لەبەرامبەر بایەخ و گرنگیدانی کورد بە پرۆسەی بازرگانی لەگەڵ هێزەکانی دەوروبەریدا و باشترین بەڵگەش بۆ تێگەیشتنی کورد لە بەرژەوەندیە ئابووریەکان و سوودی بازرگانی کردن لەگەڵ ئەو هێزانەدا و لە کاتێکدا کە دەبور لە گۆڕەپانی جەنگدا ڕووبەڕوویان ببنەوە، ئەو جموجوڵە بازرگانیە بوو کە لە لەسەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچیدا بەغدا بەرێوە دەچوو کە ئەو کاتە ڕووبەڕووی هەندێ گرفت و تەنگژەی دارایی بووبوّوە بۆیە دەوڵەت ناچار بوو بۆ دابینکردنی خەرجی ئازوقەی سوپاکەی، باجی دەرامەت بخاتە سەر بازرگانان و چینەکانی دیکە لە خەڵکی بەغدا، بەمەش خەڵکی دووچاری زیانێکی زۆر بوون و ڕووبەڕووی تەنگژەیەکی دارایی گەورە بوونەوە، ئەمەش وای کرد بازرگانان بەغدا جێبهێڵن و ڕووبکەنە نێوچەکانی دیکە، ئەمەش بەڕادەیەکی زۆر هاتنی کاڵاو کەلوپەلی بازرگانی کەمکردەوە.[762]

بازرگانی دەرەکی گرنگی زۆری هەبور بۆ سەرجەم وڵاتان، بە جیاوازی ڕادەی تەکنیك لەو وڵاتانەدا، بەڵام ئەو گرنگیە لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێت، گرنگیەکەش لە جموجوڵ و چالاکیە ئابوریەکاندا خۆی دەبینێتەوە، ئەویش بە زیادکردنی داهاتی تاك و لەوێشەوە بەرزبوونەوەی بەکارهێنانی گشتی و ڕادەی تەندرووستی و ڕۆشنبیری.

پێشکەوتنی بازرگانی دەرەکی بەکۆمەڵێك هۆکارەوە گرێدران، لەوانەش بەرزبوونەوەی ڕادەی گوزەران و کارئاسانی گواستنەوە و هاتوچۆی دەرەکی هەروەها پێشکەوتنی خێزانی ئابووری.. سەرەڕای ئاشتی و ئاسایش و ئارامی نێوان دەوڵەتان، چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بازرگانی دەرەکی لەژێر کاریگەری گێوگرفت و کێشەو

---

(٧٦٢) مسكويه: تجارب الأمم،٢/٨٣.

ململانێکانی نێوان دەوڵەتان و تەنگژە سیاسیەکاندایە.[٧٦٣] چونکە هەموو دەوڵـەتێك هەرچەندە سیستمی سیاسی چاك و لەباربێت و پلەی گەشەو پێشکەوتنی ئابوورییەکەی چاك بێت ناتوانێت لە گۆشەدیدی ئابووریدا بژیت و دابڕاوبێت لە ولاتانی دی، چـونکە ئەستەمە دەوڵەتێك بتوانێت سەرجەم پێداویستیەکانی خۆی بەرهەم بهێنێت لە شـەك و بەرهەمی خـاو و خۆراکیـەکان لـەڕووی ئـابووری و کـشتوکاڵی و..هتـدەوە، لەبـەر هێندەش دەبینین دەوڵەتان پێوەندی بەیەکـەوە دەبەسـتن ئـەویش لـە ڕێگـەی هـاوردەو هەناردەوە.[٧٦٤] ئەو پێوەندیە بازرگانیەش لە گواستنەوەی شـەك و بەروبوومـە خـاو و سەرەتاییەکان و خواردەمـەنی و کشتوکاڵ و پیشەسازیدا خۆی دەنوێنـێ کەلـە ڕێگـەی سنووری ولاتێکەوە بە ولاتانی ترەوە ئەنجام دەدرێن.

کوردستانیش لەڕێگـەی چـالاکی و جموجـۆڵی دانیـشتوانەکەیەوە و گرنگیـدانیان بەسەرجەم سـەرچاوەکانی بەرهەمهێنان، بەتایبەتی بازرگانی کە خەڵکەکـەی ئـەنجامی داوە پێشکەوتن. گەشەیەکی ئـابووری بەرچـاوی بەخۆیـەوە دیـوە. کۆمـەڵێك فاکتـەر لەپشت ئەو کارەوە هەبووە لە وانـەی شـوێنە جوگرافیەکـەی بـووە کـە دەسـکەوتێکی گەورەی پێبەخشیوە بە تایبەتی لە بازرگانی ترانزێتدا لە نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئـاوادا، هۆکارێکی دیکە بوونی ڕێگەی گواستنەوەی چاك و شێوازەکانی گواستنەوەی هەرزان و بلاوبوونـەوەی ئـارامی و ئاسـایش بـە درێـژایی ڕێگـە بازرگانیـەکان کـە هانـدەری فراوانبوونی بازرگانی بووە لە نێوان ناوەندە بازرگانیەکان لە ناوخۆ و ناوەندە بازرگانیـە دەرەکیەکان. کوردستان بەحوکمی شوێنگەی جوگرافی لـە کۆنـەوە هـەتا ئێـستە لـەو ولاتانەیە کـە گرنگـی زۆری داوە بـە کاروبـارە بازرگانیـەکان کـە لـە دێـر زەمانـەوە ناوەندێکی بازرگانی جیهانی بووە. هەروەها لە سـەدەکانی نێوەڕاستیـشدا گەشـەیەکی گەورەی بازرگانی بە خۆیەوە دیوە. کوردسـتان سـودێکی زۆری لـە بازرگـانی دەرەکـی

---

(٧٦٣) سعدي علي غالب: جغرافية النقل والتجارة، بغداد، ١٩٨٧، ٦٩٢-٦٩٣.

(٧٦٤) احمد حبيب رسول: النقل والتجارة الدولية، ساعدت جامعة بغداد في النشر، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٨١، ١٣٧.

وەرگرتووە، هەروەکو ئـابووری نـاس (سـتیڤان مـاکس) دەڵێـت: "کاتێـك دەوڵـەتێك بازرگانی دەرەکـی ئەنجامـدەدات دوو تایبەتمەنـدی هەیـە، لەلایەکـەوە خۆشـگوزەرانی ئابووری لێدەکەوێتەوە و لەلایەکی تریشەوە دەسکەوتی بەرهـەمهێنانی دەبێـت". [٧٦٥]
ئەو دەسکەوتە ئابوورییانەش لەرێگەی پێوەندیە ئابووریە توندوتۆڵـەکانی نێـوان شـارە کوردیەکان بە هەرێم و وڵاتە دراوسێکانەوە بووە بـە تایبـەتی بـە حـوکمی شـوێنگەی جوگرافی شارەکانی کە دەکەونە نێوان رێگە بازرگانیە گرنگەکانی نێـوان رۆژهـەڵات و رۆژئاواوە.[٧٦٦] ئەمەو سەرەڕای نزیکی شوێنەکەی لە پێتەختی خیلافەتی عەبباسـیەوە کە گرنگترین ناوەندی جوگرافی بووە لەو کاتـەدا و سـەرجەم بەروبوومـەکانی وڵاتـانی نزیك و دووری تێدا کۆدەبووەوە.[٧٦٧] زۆربەی جـار بازرگانـەکان هـەوڵیان دەدا خۆیـان بخەنەژێر چاودێری و پاراستنی دەسەڵاتی سیاسی ئەو وڵاتەی بازرگانیان تێـدا دەکـرد و پێوەندی توندوتۆڵیان لەگەڵیاندا هـەبووە ئـەو پەیوەندیـەش لەسـەر بنـەمای سـودی هاوبەش بووە. دەتوانین ئەو کارەش لەدوای هاتنی بوەیهییەکان ببینین کە هاتنە عێراق و لـە سـاڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز)دا بـە غـدادیان داگـیر کـرد و بازرگانـە کوردەکـان پێوەندیەکی توندوتۆڵیان لەگەڵیاندا هەبوو چونکە هەستیان بەوە کردبوو کە گەشـەی بازرگانی لە ناویەکدا لەرێگەی بەستنی پێوەندی چاك و توندوتۆڵـەوە دەبێـت لەگـەڵ بازرگانـە کوردەکانـدا.[٧٦٨] بەتایبـەتی کاتێـك هەسـت بـەوە دەکـەین کـە بازرگانـە کوردەکـان دەسـەڵات و دەسـتێکی درێـژیان هـەبوو لـە بـەڕێوەبردنی پێوەندیـە بازرگانیەکانی شـارەکانی هـەرێمی جـیاکاندا (سـەدەی چـوارەمی کۆچـی/ دەیـەمی زایینـی) سـەرەڕای تونـدوتۆڵکردنی پێوەندیـە بازرگانیـەکانی نێـوان شـارەکانی

---

(٧٦٥) التجارة الدولية، تر.حسان علي بابكر، مطابع التعليم العالي، (اربيل،١٩٩٠،٣٩.
(٧٦٦) M. A. Shaban. Islamic History, P.١٢٢.
(٧٦٧) Ipid.P.١٧٤.
(٧٦٨) Shaban: op.cit, PP.١٧٤-١٧٥.

عێراق.[٧٦٩] پەیوەندیە بازرگانیەکانیان تەنها لە نێوان بەغدا و کوفەدا قەتیس نەمابوو بەڵکو گەیشتبووە شاری بەسڕەش،[٧٧٠] ئەو شارە بازرگانیە دەرکەوتووە بەناوبانگەی دەکەونە ئەو پەڕی باشوری عێراقەوە و لە دوای بەغداش گرنگترین شاری بازرگانی بوو بەسرە جێگەی پێکگەیشتنی کاروانە بازرگانیەکانی بوو کەلە ڕۆژهەڵاتەوە دەهاتن و شمەك و بەروبوومە بازرگانیەکانیان لە هەموولایەکەوە ڕوویان دەکردە بەسرە.[٧٧١] کوردیش پەیوەندیەکی بازرگانی توندوتۆڵی هەبوو لەگەڵ شاری بەسرەدا کاروانە بازرگانیەکان بارەکانیان لە بەسرە بەتاڵ دەکرد و شمەك و بەروبوومی بازرگانی تریان دەگواستنەوە.[٧٧٢]

لەبەر ئەوەی میر (نصر الدولة) لەلایەن خیلافەتی عەبباسی و دەسەڵاتی بوەیهی و فاطمی و بێزەنتیەوە ڕێز و تەقدیرێکی باشی هەبوو، و سەرەڕای پێوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ هێزەکانی دەرو دراوسێی سنووری میرنشینەکەشی لە ئاستێکی باشدا بوو وەك (بنو عقيل) لە موصل و (بنو مرداس) لە حەلەب،[٧٧٣] بۆیە ئارامی و ئاسایش تەواوی میرنشینیەکەی گرتبۆوە، بێگومان ئەو بارودۆخە ئارامە زەمینەیەکی لەباری بۆ میر ڕەخساند بۆ ئەوەی زنجیرەیەك ڕیفۆرمی ئاوەدانی و ئابووری و دارایی ئەنجام بدات، کە ئەمیش فاکتەرێك بوو بۆ کاراکردنی جموجۆڵی بازرگانی و کشتوکاڵی و هەرزانی و نرخی کاڵاکان و پێداویستیە زەروریەکان، (فارقي وأبن شداد)، ئاماژەیان بە پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوەی میرنشینەکە کردوە، کەمیر (نصر الدولة) ئەنجامی دابوو، ئەویش بەم وتەیەی لای خوارەوە: "نصریەی بینا کردو گرنگی بە ئاوەندانکردنەوەی داو کۆشك و تەلارێکی لەسەر کەناری ڕوبارەکە درووستکرد و چەندین بازارو گەرماو(حمام) و

---

(٧٦٩) Ibid,P.١٧٤.

(٧٧٠) ياقوت الحموي: معجم البلدان،٢/٣٤٠-٣٤٢.

(٧٧١) عبدالعزيز الدوري: تاريخ العراق الأقتصادي،١٣٦.

(٧٧٢) التنوخي: نشوار المحاضرة،١١٦/٨.

(٧٧٣) ابن خلدون: العبر،٢٧٢/٤.

خانوبەرەی تێدا درووست کرد هەروەها خانوی بۆ هەریەك لە کوڕی مامەکەی و منداڵەکانی درووستکرد.. و ئاعورێکی لەسەر ڕوبارەکە دامەزراند بۆ بەسەرخستنی ئاوی ڕوبارەکەو ئاوەدانی ئەو باخ وبێستانانەی کە درووستی کردبوو گلدانەوەی ئاویش لەو ئەستێلك و بەنداوانەی درووستی کردبوون، ئەمانەو جگە لە درووستکردنی پردی (تل بنان) بە جوانترین شێوەی هونەری بیناسازی..."[٧٧٤].

هەروەها لەلایەکی ترەوە سیاسەتێکی دارایی و ژیرانەی پەیڕەو کرد. جارێکیان لە وتەیەکیدا کە ئاراستەی وەزیرەکەی (الخواجا أبی القاسم)ی کرد، وتی: "ئەی فلان.. بۆ ئەوە دامنایت بەوەزیر، تا وڵاتێکی شارستانی و ئاوەدان پێشکەش بە من و هاوەڵەکانم بکەیت و پارەو سامانی وڵاتم پاشەکەوت بێت و گەشەی پێبدەیت..".[٧٧٥] ئەمەش وای کرد لە ڕۆژهەڵاتناس (ئەمەدروز -Amedroz) بەبایەخەوە ئاماژە بەو فەرمانە بکات کە بۆ وەزیرەکەی (أبی القاسم)ی دەرکرد، بە کەمکردنەوەی باج و خەراج لەسەر میللەتەکەی و بەم وتەیە ئاماژەی پێکرد: "ئەو ڕووداوە بەنموونە –أمثولة- دەژمێردرێت".[٧٧٦] ئەوەی لێرەدا جێگەی ئاماژە پێدانە ئەوەیە کە میر (نصر الدولة بن مروان) نزیکەی نیو سەدە فەرمانڕەوایی میرنشینی مەروانی کرد. نیو سەدە لە ئارامی و ئاسایش و ژیانێکی ئاسودە و خۆشگوزەران بۆ دانیشتوانەکەی بە درێژایی ماوەی فەرمانڕەواییەکەی فەراهەم بووبوو، هەروەها بەهۆی بلیمەتی خۆی و سیاسەتە ژیرانەکەی توانی وڵاتەکەی لە شەڕوشۆڕ و کوشتار بەدوور بگرێت لەو قۆناغە هەستیار و ناسکەدا، هەوڵیدا سیاسەتێکی نەرم لەگەڵ دوژمنەکانیدا بەکاربێنێت، تەنانەت هەندێ جار چەندیان ویستبێت لە پارەو سامان پێی بەخشیون تەنها لەبەرئەوەی میرنشینەکەی بەدوور بێت لە وەیشومەی شەڕو کوشتار. سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن، هەرکاتێك دوژمن هێرشی کردبێتە سەری وتویەتی "خەرجی ئەو

---

(٧٧٤) تاریخ الفارقي،١٤١ :الاعلاق الخطيرة،٣/١/٢٥٨-٢٥٩.

(٧٧٥) ابن العديم: بغية الطلب،٦١.

(٧٧٦) The Journal of the Royal Asiatic Society, ١٩٠٢-١٩٠٣,P.١٣١٠.

جەنگە چەندە ئەگەر بیانوتایە پەنجا هەزارە، ئەو برە پارەیەی بۆ دەناردن یان بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی لەسەر پێکدەهاتن ئەو برە پارەیەی دەدایە دوژمن، و دەیوت: بەو پارەیە شەڕو فیتنەی دوژمن لە میرنشین و میللەتەکەم دوور دەخەمەوە..". [777] دەوڵەتی دۆستەکی لە نێو دەوڵەتەکانی ئەو سەردەمەدا لەڕووی سەقامگیری سیاسی و ئاسایشی ناوخۆ و ژیانێکی بەختەوەر و ئارام و سیاسەتێکی دادپەروەرانە لەوانی دیکەی جیادەکردەوە. هەروەها بە دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانی و بەخشندەیی پاشاکەی (نصر الدولة) و دادپەروەی و میهرەبانی لەبەرامبەر هەژاران و خەڵکی بیانی و ئاوارە و خۆشەویستی بۆ ئاوەدانکردنەوە ناسرابوو، لەبەرئەوە میرنشینەکەی ببوە پەناگەیەکی ئارام بۆ ژمارەیەکی ئاڕادەیەك زۆر لە پەنابەرانی سیاسی و ئاوارە و بێ دەرەتانان، کە ڕۆژگاریان لێ وەرچەرخابوو و سەردەم ستەمی لێکردبوون و ڕووی لێ وەرگێڕابوون، لە نێو ئەو ئاوارانەدا میرو وەزیر و مەلیك میر (نصر الدولة) هەردەم پێشوازی لە پەنابەران دەکرد و ڕێزی لێدەگرتن و هەموو هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی بۆ دابین دەکردن، کە شایستەی جێگە و پێگەی کۆمەڵایەتی ئەوان بێت، (فارقی) لەمەڕ پەنابردنی خەڵك بۆ لای (نصر الدولة) ئەو پێشوازیە گەرمە و ڕێزە زۆرەی لێیان دەگیرا بەم وتەیە هەستی خۆی دەربڕیوە:

"... نصر الدولة پێگەی خۆی لە شانشینی و لەموڵك و سامان سەقامگیر بوو بە جۆرێك هاوشێوەی نەبوو. لەنازو نیعمەتێکدا بوو کەس بەڕادەی ئەو پێی شاد نەبو بوو، خەڵکی پەنایان بۆ دەبرد، ئەویش پەنای دەدان و جێگەی حەوانەوەی بۆ دابین دەکردن". [778]

لەپاڵ پەنابەرە سیاسیەکانیشدا گەلێ لە بازرگانان و خاوەن پیشەو جوتیارانیش هاتنە وڵاتی دۆستەکی، هەریەکێکیش لەو پەنابەرانە لەبواری کارەکەی خۆیدا بە

(٧٧٧) الصدفي: الوافي بالوفيات، ٨/١٧٦-١٧٧؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ٨٧/١٢؛ ابن خلدون: العبر، ٣١٩/٤.

(٧٧٨) تاريخه، ١٦٨.

ئارامی و بێ ترس و دڵەڕاوکێ لـە کـاری دزی و تـاڵانکردن و دەسـت بەسـەر مـاڵ و حەڵاڵدا گرتن، یاخود سەپاندنی باج و خەراجی زۆر، بەهۆی پشێوی و نائارامی ڕەوشـی سیاسی و نەبوونی ئاسایشی ناوخۆ، یاخود بەهۆی چاوچـنۆکی مـیر و دەسـەڵاتداران و بەتەنگەوە نەهاتنی بەرژەوەندی گەلانیان، دەستگیربوونی کار لەو هەرێمانەدا بۆ چـین و توێژەکانی گەل بە زەحمەت دەستەبەر دەبوو. شاعر (أبو الحسن التهامي) لە شـعیرێکدا ئاماژە بەو ڕەوشە دەکات کاتێك شیعرەکەی ئاراستەی (نصر الدولة) دەکات و دەڵێ:

" كأنَّ أرضَكَ مغناطيسُ كلّ فمِ

فالطبعُ يُجْذِبها بالطوعِ وَ الرَّغَمِ

لّما عَلَوتَ غَمَرْتَ العَالمِينَ ندى

والمزنُ يَعْلُو فيروي الأرضَ بالدّيَمِ"*

لەگەڵ ئەو سیاسەتەشدا هەوڵی قایمکردن و زیـادکردنی سـەنگەر و دەربەنـدەکان و درووستکردنی سەربازگە و شوێنی حەوانەوە بۆ ئەو موجاهیدانەی دەیانەوێ لە ڕێگـەی خوادا جیهاد لە دژی ڕۆمەکان بکەن، چونکە وڵاتەکەی وڵاتێکی سەخت و پـڕ ئیـشە و دەربەند و مەتەرێز بوو، تەنها لەشاری ئامـەد و لەسـەردەمی ئـەودا، چـواردە خانـەی جەنگاوەران و دەهەزار موجاهیدی هەبوو بە تەواوی چەك و چۆڵیانەوە.[٧٧٩]

میر (نصر الدولة) نموونەی مامەڵە و هەڵسوکەوتی جوان و دادپەروەرانە بوو لەگەڵ ڕەعیەتەکەی، ئـەم ڕاسـتیەش لـەم قـسەیەی (إبـن کـثیر)دا بـەڕوونی دەردەکـەوێت:

---

* زەوی یەك کە تۆی وەك موگناتیسە بۆ هەموو دەمەکان

سروشتی تۆ ڕایان ئەکێشێ بۆ لای خۆی بەخۆشی خۆیو بەزۆر لێکردن

کاتێك بەرزبوویتەوە هەموو جیهانیانت بە بەخشش داپۆشی،

هەور بەرز ئەبێتەوەو زەوی تێر ئاو ئەکات بەباران.

(٧٧٩) ابن العدیم: بغیة الطلب، ٦٣/١.

"ولاته‌كه‌ی ئارامترین وخۆشترین و دادپه‌روه‌رترین ولات بوو.." [٧٨٠] ئه‌م سیاسه‌ته‌ش سه‌رنجی خه‌لكی له‌ هه‌ریمه‌كانی تره‌وه‌ به‌لای خۆیدا راكیشا، و له‌هه‌موو لایه‌كه‌وه‌ خه‌لكی روویان تیده‌كرد چ بۆ بازرگانی چ بۆ زانست، به‌مه‌ش جموجۆلیكی ئابووری و زانستی به‌ خۆیه‌وه‌ بینی، فارقیش جه‌خت له‌سه‌ر ئه‌و حاله‌ته‌ ده‌كاته‌وه‌ به‌م قسه‌یه‌ی: "میافارقین له‌ رۆژانی حوكمرانی (نصر الدولة)دا، جمه‌ی ده‌هات له‌ خه‌لك و بازرگانان له‌ هه‌موو ده‌وروبه‌ریكه‌وه‌، خه‌لكی ده‌وله‌مه‌ند نه‌بوون له‌و رۆژگاره‌دا، خۆشترین رۆژگار بوو و چاكترین ده‌وله‌تیش بوو". [٧٨١] (الذهبي)یش به‌ فاكته‌ریكی یه‌كلاكه‌ره‌وه‌ دادپه‌روه‌ری وه‌سفكردووه‌. [٧٨٢]

(نظام الدین) له‌سه‌ر سیاسه‌تی باوكی ده‌رۆیشت له‌ رووی سیاسه‌تی ناوخۆ و ده‌ره‌وه‌ بێ ئه‌وه‌ی هیچ گۆرانیك به‌سه‌ر سیستمه‌كانی ده‌وله‌ت و سیاسه‌ته‌كه‌ی دابیت، له‌بواری ناوخۆدا گرنگی به‌ هیمنی و ئارامی ولاتدا و بایه‌خی به‌ خۆشگوزه‌رانی گه‌له‌كه‌یدا و له‌ هه‌ولی پاراستنی به‌رژه‌وه‌ندیه‌كانی گه‌له‌كه‌ی و به‌ره‌وپیشبردنی ولاته‌كه‌یدا بوو له‌سه‌ر یه‌ك شیوه‌ له‌سه‌رده‌می (نصر الدولة)وه‌ تا كۆتایی سه‌رده‌می ده‌سه‌لاته‌كه‌ی. [٧٨٣]

له‌به‌رئه‌وه‌ به‌ تیپه‌ربوونی رۆژگار ولات له‌ رووی بازرگانی و كشتوكال و پیشه‌سازی و ئاوه‌دانیه‌وه‌ به‌ره‌و پیش هه‌نگاوی ده‌نا، (نظام الدین) وه‌ك باوكی زۆر به‌ته‌نگ به‌خته‌وه‌ری رۆله‌كانی ولاته‌كه‌یه‌وه‌ بوو له‌ هه‌موو بواره‌كانی ژیاندا. ته‌نانه‌ت خۆی به‌ ناوشار و بازاره‌كانیدا ده‌گه‌را بۆ ئه‌وه‌ی له‌ نزیكه‌وه‌ ئاگاداری ژیانی ئابووری خه‌لك و به‌ریوه‌چوونی كاروباری دانیشتوانی بیت و له‌ پیداویستیه‌كانیانی ده‌پیچایه‌وه‌ و گوێی

---

(٧٨٠) البداية والنهاية، ٨٧/١٢ ؛ الذهبي: العبر، ٣٠٠/٢ ؛ الفارقي: تاريخه، ١٦٨.

(٧٨١) تاريخه، ١٦٦؛ ابن الأثير: الكامل، ٢٥١/٦ ؛ ابن الوردي، تاريخه، ٣٥٥/١.

(٧٨٢) شذرات الذهب، ٢٩٠/٣.

(٧٨٣) الفارقي: تاريخه،١٩٥.

بۆ سکالاّ و داخوازیەکانیان دەگرت و کێشەکانی بۆ چارەسەر دەکردن، تەنها هەر لەو دانیشتوانەی دەپێچایەوە کە موجود بوون، بەڵکو لەوانەشی پرسیار دەکرد کە بزر بوون و ئامادەی شارەکە نەبوون و لە هۆکاری دیارنەمانیانی دەکۆڵیەوە.

لەسایەی دادپەروەری (نظام الدین) و سیاسەتە ژیرانەکەی شاری فارقین لە ڕووی ئابووری و ئاوەدانیەوە گەشەی کرد و دانیشتوانەکەشی لە هەموو سەردەمەکانی پێش ئەو لەڕووی ئابووری و ئاوەدانیەوە گەشەی کرد و دانیشتوانەکەشی لە هەموو سەردەمەکانی پێش ئەو لەڕووی دارایی و خۆشگوزەرانیەوە باشتر بوو. ئەم وتەیەی (فارقیش) دەربڕینێکی ڕاستەقینەی سیاسەتی (نظام الدین)مان بۆ ئاشکرا دەکات، کاتێك دەڵێ: ".. فەرمانڕەوایی (نظام الدین) لە میرنشینەکەدا درێژەی هەبوو، پاشایەکی دادپەروەر بوو فشاری نەدەخستە سەر میللەتەکەی و خێرخواز و چاکەکار بوو لەگەڵ خەڵکدا. لەسەردەمی ئەودا شاری میافارقین چاکترین ئاوەدانی و گەشەکردنی بە خۆوە بینی لەسایەی ئەودا خەڵکەکەش خێروبەرەکەتێکی زۆریان چنیەوە، سەردانی خەڵکەکەی دەکرد و لێی دەپرسین تەنانەت ئەوانەی کە دیاریش نەبوون لە هۆکاری دیارنەبوونەکەیانی دەپرسیەوە، میافارقین لەسەردەمی (نظام الدین)دا زۆرترین ئاوەدانی بەخۆوە بینی، خەڵکەکەش دەوڵەمەنترین خەڵکی ئەو سەردەمە بوون"، [٧٨٤] ئەمەش بەڵگەی دادپەروەری فەرمانڕەوایی (نظام الدین) و بەختیاری گەلی کوردی لەو سەردەمەی ئەودا پشتڕاست دەکردەوە.

(الفارقی) سەبارەت بە سیاسەتی (العالم العمید قوام الدین أبي علی البلخي) کە فەرمانڕەوایی هەرێمی دیاربەکری گرتە ئەستۆ لە دوای لابردنی (إبن جهیر) لەلایەن (مەلیك شاه)وە، دەڵێ: "... خەڵکی لە وێنەی ئەویان نەدیبوو، دادپەروەر و چاکەخواز بوو لەگەڵ خەڵکدا، تەنانەت لە دادپەروەریدا سەردەمی ئەویان بەسەردەمی (نظام الدین) وێکدەچواند لە ڕووی کاری چاکە و ئاسایشی خەڵك و دڵنارامیان لە ئاست

---

(٧٨٤) الفارقي: تاريخه،١٩٩.

سەر و ماڵیان ڕێز و ئیحترامیان".[785] هەروەها لە وەسفێکدا دووبارە دەڵێ: "خاوەن عەقڵ و بیروڕایەکی درووست و ڕەوان بوو بە ڕاو تەکبیریش بوو، بۆیە باوکی کردیە جێنشینی خۆی".[786]

لەسەردەمی (نظام الدین)دا، دەوڵەت بەردەوام بوو لەسەر ئاسایش و ئارامی و لەماوەی دەسەڵاتی حوکمی ئەودا کە نۆزدە ساڵی خایاند، هیچ ڕووداو وکارەساتێك ڕووی نەدا، کە خۆشی و بەختیاری دانیشتوانەکەی تێکبدات یان ڕەوتی پێشکەوتنی وڵات پەکبخات.

بەڵام سیاسەتی دەرەوەی (نظام الدین)، سیاسەتێکی ئیجابی و ئاشتیخوازانە بوو وەك سیاسەتی باوکی وابوو لە ڕووی پێکەوە ژیانێکی ئاشتیانە لەگەڵ سەرجەم دەوڵەتان و میرنشینەکانی سەردەمی خۆی وەك دەوڵەتی (عەبباسی و بیزەنتی و فاطمی ئەرمەنی و ئیسلامی) لە نێوچەکەدا، بەڵگەی ئەو ڕاستیەش ئەوەیە کە لەو ماوەیەدا هیچ کێشە و گرفتێك ڕووی نەدا کە ببێتە هۆی کوشتار و خوێنڕشتن لە نێوان ئەو دەوڵەتە کوردیە و لە نێوان هیچ یەکێك لە دراوسێکانی لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەو پاشایەدا.

---

(٧٨٥) الفارقي: هـ. س،٢٢١.

(٧٨٦) الفارقي: س. پ، ١٧٨.

## تەوەری دووەم

# دیبلۆماسییەت و جەنگ

دەکرێ لێرەدا ئەوە روون بکەینەوە کە شەڕ و دیبلۆماسییەت بە هەردووکیانەوە گرنگترین ئامرازی جێبەجێکردنی بەرژەوەندییەکانی ئابووری دەوڵەت بن، لەهەمانکاتدا گرنگترین سیماکانی سیاسەتی دەرەوەیە لە کۆمەڵگەکانی کۆن و نێوەڕاست و نوێدا وەك یەك، چونکە هەریەك لەوانە ڕێگەی خۆی دەگرێتەبەر و گوزارشت لە بەرژەوەندییەکانی دەکات بە پێی بارودۆخی ئەو کۆمەڵگەیە. بەواتایەکی ڕاستتر بە کۆتاییهاتنی یەکێکیان ئەوەی تریان کارەکانی خۆی دەست پێدەکات، دوای کۆتایی هاتنی شەڕ دیبلۆماسییەت بەردەوام دەبێت و ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت لە پێناو دروستکردنی پێوەندی ئاشتیخوازانە، ڕەنگە بە شێوەیەکی بەهێز و دامەزراوتر وەك لە پێش هەڵگیرسانی شەڕدا.[(٧٨٧)]

گومان لەوەدا نییە کە بە کۆتاییهاتنی شەڕ کاری دیبلۆماسیی دەست پێدەکات.

لە ڕاستیدا ڕۆڵی دیبلۆماسییەت لە گۆڕەپانی پێوەندیە ئاڵوگۆڕەکانی نێوان میللەتان و گەلاندا تەنها پابەند نیە بەو پێوەندیانەی لە کاتی ئاشتیدا ڕوودەدات، بەڵکو پەیڕەو و پیادەکردنی سیاسەتی فشار و هەڕەشەی بەهێز یاخود بەکارهێنانی هێز بەشێوازە جۆرەکانیەوە، چەکێکە بەپێی پێویستیەکانی سەردەم بەکاردەهێنرێت. ڕاستە هەندێ جار دەوڵەت پەنا دەباتە بەر شەڕ لە کاتێکدا کە شێوازە ئاشتیەکان

---

(٧٨٧) علي حسين الشامي: الدبلوماسية، ٣٢٧.

خزمەتی چارەسەرکردنی کێشەکانی ناکات کە لە نێو ئەو شێوازانەدا دیبلۆماسییەتە، بۆیە هەوڵ دەدات بە ڕێگا و شێوازی سەربازی ئامانجەکانی خۆی بپێکێت، چونکە بە ڕێگەی دیبلۆماسیی نەیتوانی کارەکانی یاخود ئامانجەکانی بە ئەنجام بگەیەنێت.[٧٨٨]

بەڵام ئایە دیبلۆماسییەت دەستەوئەژنۆ دەوەستێت بەرامبەر ئەم ڕووداوانە، یاخود وای لێهاتووە کە چالاکیەکانی رابگرێت بۆ سەرهەڵدانی شەڕ، لە ڕاستیدا ڕەنگە دیبلۆماسییەت وەك چۆن لەکاتی ئاشتیدا بەردەوامە لەکاتی شەڕیشدا بۆ گەیاندنی پەیامەکەی بەردەوام بێت. ئەمەش بەڕوون و ئاشکرا دیارە لە سەردەمی شەڕ و بەڕادەیەکی گەورەیش لە ژیانی نێودەوڵەتیدا بۆ ڕاکێشانی ڕێژەیەکی زیاتر لە وڵاتان بۆ پشتگیریکردنی لە خەباتەکەیدا یاخود بەشداریکردن لەو شەڕەدا.

ڕەنگە دیبلۆماسییەت پارێزگاری لە بەرژەوەندی دەوڵەتێك بکات کە پێوەندیەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتێکی دیکەدا پچڕاندووە. دەوڵەتی بێ لایەن دەتوانێت ڕۆڵی باش و ئاشتیخوازانە ببینێت لە کاتی شەڕدا، چونکە کارە دیبلۆماسییەکانی جێگەی ستایشە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی هەردوولایەنی بەشەڕهاتوو. ئەمەو جگە لەوەی، ڕەنگە دانوساندنی دیبلۆماسییەکان واژۆکردنی پەیماننامەی لێ بکەوێتەوە و ئەم دانوستاندنانە چەند مانگێك دەخایەنێت بەبێ ئەوەی شەڕ بوەستێت یاخود هێور ببێتەوە.

هەروەها ڕەنگە دیبلۆماسییەت چالاکتر بێت لە بەکارهێنانی شێوازی تەمێکردن و دژایەتیکردندا، وەك گەمارۆی ئابووری، ئاساییە کە دیبلۆماسییەت ئەم شێوازە دوژمنکارییەی باسمان کرد لە پێوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا پیاکات، بەڵکو ئەم کارە بە ڕوون و ئاشکرا دەردەکەوێت لە سەردەمی شەڕ و ژیانی نێودەوڵەتی نوێ و هاوچەرخ، هەروەها سەردەمە کۆنەکان بەم چەشن و شێوازە ئاشنابوون، چونکە شێوازی کارکردنی

---

(٧٨٨) عزالدين فودة: الدبلوماسية، ٤٩.

دەوڵەتە بە هەموو دامودەزگاکانییەوە بە هیوای گەیشتن بـە ئامانجـە سیاسـیەکانی، و جێبەجێکردنی وەك یەك لە کاتی شەڕ و ئاشتیدا.[٧٨٩]

سەرەڕای ئەوەی زۆربەی پێکهـاتنی مـیرە کـورد و بوەیهییـەکان پـاش لەیـەکتالآنی سەربازی نێوانیان، یاخود هەڕەشەی کرداری کە لە لایـەن بوەیهییەکانـەوە بـوو، بـەڵام دەتوانین بڵێین ئەو رێکەوتن و پێکهاتنەی نێوانیان وەك هەنگاوێکی سەرەتایی بووە بـۆ کۆتاییهێنان بە گرژی و ئاڵۆزی پێوەندیەکانی نێوانیان و پاشـان رەخـساندنی کـەش و هەوایەکی لەبار تا رادەیەك بۆ دەستپێکردنی پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوانیـان.

(معز الدولة البویهی) چاوی بڕیبووە موڵکەکانی (حەسنەویە) و فەرمانی دەرکـرد بۆ (ینال گوش)ی سەرکردەی کە سوپایەك لە بـەنو تـەغلبی حەمـدانی کۆبکاتــەوە و بیانبات بەرەو شارەزوور بۆ کوشتاری (حەسنەویە) و کاتێك میر بەهەواڵی هێرشـەکەی زانی دەرچوو بۆ شەڕ لەگەڵیاندا و ڕێیان بە سوپاکەی گـرت، و لـە رۆژئـاوای (اربـل- هەولێر) بەیەکیاندا و (ینال گوش) شکاو رایکـرد بـۆ موصـڵ،[٧٩٠] و (حەسـنەویە) بەسەرکەوتویی و بەدەستکەوتی زۆرەوە گەڕایەوە، کاتێ ئەم هەواڵە ناخۆشەش گەیشتە (معز الدولة) سوپایەکی گەورەی دیکەی نارد بۆ دینەوەر، و تالآنی کـرد و ئـاگری لـە گوندەکانی بەرداو کاتێك میر بەمەی زانی سوپایەکی سازدا بۆ بەرەنگاربوونەوەیان لـە ڕێگە، بەڵام خۆش بەخت بـوون کـە لەبەرەنگاربوونــەوە ئـەم سـوپایە ڕزگاریـان بـوو، لەبەرئەوەی لەو کاتــەدا (رکـن الدولـة البـویهي) لـە جـەنگێکی بـەزەبردا بـوو دژی کوردەکانی (جرجان) کوردی گورگان،[٧٩١] نزیکی شکاندن بوو، و داوای یارمەتی لـە (معز الدولة)ی برای کرد ئـەویش ناچـار بـوو پـەیمانی ئاشـتی لەگـەڵ (حـسنویە)دا ببەستێت، بەمەرجێ ناوی لە وتار (خطبة)دا بهێنێ، بەڵام (حەسنەویە) ئەم مەرجـەی ڕەتکـردەوە و پێـی داگـرت لەسـەر دەسـتپێکردنەوەی جـەنگ، بـەڵام (معـز الدولـة)

---

(٧٨٩) مامون الحموي: الدبلوماسية،٨٦.

(٧٩٠) ابن الاثير: الكامل، ٨/ ٤٤٩.

(٧٩١) ابن مهلهل: الرسالة الثانية، ٣٨، ٣٩.

ژمارەیەك میوو ڕیش سپی نارد بۆ ڕازیکردنی و پەنجا هەزار دیناریشیان بۆ بردبوو ئەویش بە گوێی کردن و پەیمانی لەگەڵدا بەست، بەم شێوەیە پێوەندییەکانی لەگەڵ بوەیهییەکاندا باش بوو، بەڵام جارێکیتر لە ساڵی (٣٥٦ك/ ٩٦٧ز)دا پێوەندیان تێکچوو، و ئەم جارەیان لە نێوان (حسنویە)و (عز الدولة بختیار بن معز الدولة)دا، کە لە نێوانیاندا ئاگری جەنگێکی بەزەبر هەڵگیرسا، بووە هۆی لاوازبوونی (بەختیار) و زیادبوونی هێزو دەسەڵاتی (حەسنەویە) لە ساڵی (٣٥٧ك/ ٩٦٧ز)دا پەیمانێکی ئاشتیان لە نێوانیاندا بەست، و (عز الدولة بختیار) دیارییەکی زۆری نارد بۆ (حەسنەویە) و لەم کاتەشدا دەستدرێژیەکانی (ابو تغلب الحمدانی) زیادی کردبوو، لەبەرئەوە (عز الدولة) داوای یارمەتی لە (حەسنەویە) کرد دژی (ابو تغلب) بۆ شکاندنی زەبرو هێزی و لاوازکردنی دەسەڵاتی، بەمەرجێك کەڕێ بە (حەسنەویە) بدات بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی و فراوانکردنی سنووری ولاتەکەی تا زێی گەورە لە (اربل و موصل)دا.[٧٩٢] (حەسنەویە)یش بە سوپایەکەوە ڕۆیشت بەرەو موصڵ و لەهەمان کاتدا جێگری (بەختیار) سوپایەکی دیکەی لە بەغدادەوە نارد، و سوپای (ابو تغلب)یان شکاند و هەردوو سوپای (حەسنەویە) و (بەختیار) ڕاویان نا هەتا (الرقە) و دواتر (حەسنەویە) بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە بۆ موصڵ و لەوێشەوە بۆ (اربل)، و دوای ئەوەی کاروباری تێدا ڕێکخست، ڕۆیشت بەرەو شارەزوور لەوێشەوە گەڕایەوە بۆ دینەوەر، کە کردبووی بەجێگەی خۆی.[٧٩٣]

لە کۆتاییەکانی ساڵی (٣٥٩ ك/٩٦٩ز)دا ولاتی میرنشینی (حسنویە) ڕووبەڕووی هێرش و پەلاماری سوپای (رکن الدولة البویهي) بووەوە بە سەرکردایەتی (ابن العمید)ی وەزیر کە لەو کاتانەدا کۆچی دوایی کرد و (ابو الفتح)ی کوڕی شوێنی گرتەوە، ئەم میرە، واتا (ابو الفتح) پێش دەستپێکردنی شەڕ لە ساڵی (٣٦٠

(٧٩٢) ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٤/ ١٣٦.

(٧٩٣) حسام الدين علي غالب: الكرد، ص١٣٢- ١٣٣.

ك/٩٧٠ز)دا دەربارەی ئاشتی نامەیەکی ئاراستەی میر (حسنویە) کرد، و مەرجی (ابو الفتح) بۆ ئاشتی ئەوە بوو کە دەبێت میر (حسنویە) بڕیك پارە بۆ سوپاکەی خەرج بکات، و ئەوەیش کە مایەوە بخرێتە خزینە - گەنجینەی سوڵتان (رکن الدولة)، تا لە بەرانبەر ئەوەدا (ابو الفتح) دڵنیا بێت لە چاککردنی پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوان (حسنویە و رکن الدولة).[٧٩٤] ئەم ڕێکەوتنە بە بەشداری هەندێك کەس جێبەجێ کرا،[٧٩٥] و هەندێ مەرج لە سەر (حسنویە) دانرا بەپێدانی بڕێك پارە و دیاری (رکن الدولة)یش لە سەر ئەو مەرجانە رازی بوو.[٧٩٦]

دەتوانین بڵێین هۆکاری پاڵنەری بوەیهییەکان بۆ ئەم ئاشتی و ڕێکەوتننامەیە لە دوو توێی تێکستە مێژووییەکاندا کە(مسکویە) باسی لێوە دەکات، سوپای بوەیهی لە دۆخی ئامادەباشیدا نەبوو بۆ شەڕکردن لەگەڵ سوپای حسنویەدا، بەڵکو سوپاکەی پەرتەوازە بوون و هەموویان سەرقاڵی یاری و ڕاو شکار بوون، و (ابن العمید) نەیتوانی کونترۆڵی حەز و ئارەزووەکانی سوپاکەی بکات بەهۆی ئەو نەخۆشییەی کەوا تووشی بوو، هاوکات زۆربەی سەربازەکانی لە دەوری کوڕەکەی (ابو الفتح) کۆبوونەوە کە بە کەم ئەزموونی و هەڵچوون ناسرا بوو،[٧٩٧] واتە سوپای بوەیهی لە سەرکردایەتی و بناغە و بنچینەیەوە دابەش ببوو، هاوکات ئامادەباشیش نەبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای حسنویە لە لایەك، و لە لایەکی دیکە مردنی (ابن العمید) و هاتنی کوڕەکەی (ابو الفتح) بۆ سەرکردایەتی سوپاکە ورەی سوپای بوەیهی ڕووخاند بۆ شەڕکردن، چونکە پیاوێکی کەم ئەزموون بوو، هاوکات ئارەزووی گەڕانەوەی هەبوو بۆ (الری) بە ئامانجی دەستکەوتنی وەزارەتی (رکن الدولة)، بۆیە پەلەی بوو بۆ ئاشتی و بەستنی

---

(٧٩٤) مسكويه: تجارب الامم، ٢/ ٢٧٠ - ٢٧٤ ؛ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٥ / ٣٧١.

(٧٩٥) احمد غفار قزويني: تاريخ جهان ارا، ١٦٧ - ١٦٨.

(٧٩٦) مسكويه: تجارب الامم، ٢ / ٢٧٤، حسام الدين علي غالب: الكرد،١٣٧-١٣٨.

(٧٩٧) تجارب الامم، ٢/ ٢٧٣.

ڕێکەوتننامە.[798]

بەڵام سەبارەت بە ڕازیبوونی (بدر بن حسنویە) سەر ئەنجام بوو، چونکە هەڵوێستی بەرانبەر سوپای بوەیهی هەڵوێستیکی بەرگرییانە بوو، هاوکات ویستی خۆی تووشی ئەو شەڕە نەکات لەگەڵ سوپای (ركن الدولة)ی بوەیهیدا، بەڵکو پێی باش بوو کە ئەو ڕێکەوتنەی بەپارە لە گەڵدا بکات بە ئامانجی خۆ تەرخانکردن بە هەستانەوە و بوژانەوەی میرنشیە تازە پێگەیشتووەکەی.

لە ساڵی (٣٧٤ك/٩٨٤ز)دا پاش ئەوەی سوپای (باذ الكردي) بەرانبەر سوپای بوەیهی شکستی هێنا، بوەیهییەکان ویستیان شوێنی بکەون بۆ دیاربەکر و کۆتایی بە دەسەڵاتی بهێنن، بەڵام بێ سوود بوو، بۆیە بوەیهییەکان ڕێگەی ئاشتی و دیبلۆماسییان پێ باش بوو بۆ هێورکردنەوەی ئەو بارودۆخە و دڵنیابوون لە سنوورییان لەلای باکووری ڕۆژئاواوە، بەم چەشنە ڕێکەوتننامەی نێوانیان واژۆ کرا بە مەرجێك نیوچەی دیاربەکر و بەشێك لە (طور عابدين) بە دەستی بادەوەبێت،[799] لە هۆکارە پاڵنەرەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە لە لایەن بوەیهییەکانەوە، ئامادەنەبوونی سوپای بوەیهی بوو بۆ شوێنکەوتنی سوپای (باد) لە دیاربەکر بەشێوەیەك کە سەربازەکان ملکەچی فەرمانی سەرکردەکانیان نەدەبوون،[800] ئەمەش خۆی لە خۆیدا ببووە هۆی شکستهێنانی پیلانی بوەیهییەکان بۆ لێدانی (باد) بە هەموو شێوەیەك، جا چی لە ڕێگای هاوپەیمانی لەگەڵ میر (سيف الدولە الحمداني) یاخود هەوڵدان بێت بۆ تیرۆرکردنی بادی کوردی.[801] هەروەها پەنابردنی بادی کوردی بۆ ڕێکەوتننامە لەگەڵ بوەیهییەکاندا تەنها ڕاییکردنی کات بوو لە پێناو مانەوەی میرنشینەکەیدا، هاوکات هاوتایی نەبوونی هێز لە نێوان هەردوولادا، چونکە هێرش و پەلاماری بوەیهییەکان

---

(٧٩٨) مسكويه: هـ. س، ٢/ ٢٧٤ : ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٣٧١.

(٧٩٩) الروذراوري: ذيل، ٣/ ٨٦ – ٨٧ ؛ابن الاثير: الكامل، ٧ / ١٢٣.

(٨٠٠) الروذاراوري: هـ. س، ٣/ ٨٧ : ابن الأثير: الكامل، ٧/ ١٢٣.

(٨٠١) الروذاراوري: هـ. س، ٣/ ٨٦–٨٧ : عبد الرقيب يوسف: س – پ، ١/ ١٠٠ – ١٠١.

ئەم جارە ئامانجی دەست بەسەراگرتنی نێوچەکە و کۆتاییهێنان بوو بە دەسەڵاتی بادی کوردی ئەگەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەی نەبوایە کە باسمان لێوە کرد.

بۆیە دەبینین باد خۆی دەست پێشخەر بوو بەناردنی نامە بۆ فەرماندەی بوەیهییەکان (زیار بن شهراکویە)، بە شێوەیەك دەسەڵاتی کەم بووەوە لەسەر دیاربەکر و بەشی رۆژئاوای (طور عابدین)،[٨٠٢] کە ئەمەش وای لێکرد رازی بێت بە پاشکۆیەتی و ملکەچی بۆ بوەیهییەکان لە دەقی وەڵامی میر (صمصام الدولة) بۆ نامەی فەرماندەکەی (سعد الحاجب) دەربارەی ئاشتی و رێکەوتننامەکە لەگەڵ میر بادی کوردیدا.[٨٠٣]

لە ساڵی (٣٩٢ك/١٠٠٢ز)دا ئاشتەواییەك لە نێوان میر (ابو الفتح محمد بن عناز) و(عمید الجیوش) روویدا بە ناوبژیکردنی یەکێك لە کەسایەتیەکان بە ناوی (الصاحب ابو القاسم)، پاش ئەوەی پێوەندیەکانیان رووی لە خراپی دەکرد، وا دەردەکەوێت کە (ابو القاسم)ی ناوبراو لەلای پێشەوای سوپا چوو بۆ لای (ابو الفتح) و داوای لێکرد ملکەچی بێت و دژایەتی نەکات، لە بەرانبەردا (ابو القاسم) پەیمانی پێدا کە شتەکان بە دڵی ئەو دەبێت، بەمەش رێکەوتنەکە لە نێوانیاندا واژۆ کرا.[٨٠٤]

لە ساڵی (٤٠١ك/١٠١١ز)دا میر (حسام الدولة ابو الشوك العنازي) رێکەوتننامەیەکی لەگەڵ وەزیر (فخر الملك أبو غالب) واژۆ کرد، بەمەش پێوەندیەکانی لەگەڵ بوەیهییەکاندا جێگیربوو. پاش مردنی میر (ابو الفتح محمد بن عناز) و هاتنی کورەکەی (ابو الشوك) و وەرگرتنی دەسەڵاتی میرنشینەکە، چونکە پێوەندیەکان بە شێوەیەك تێکچووبوون تا گەیشتە رادەی سەرهەڵدانی شەڕ لە نێوانیاندا، بەڵام دوای شکانی لەگەڵیان رێککەوت بە هەوڵ و چالاکی میر (ابو

---

(٨٠٢) الروذراوري: ذيل، ٣/ ٨٧ ؛ابن الاثير: الكامل، ٧ / ١٢٣.

(٨٠٣) القلقشندي: صبح الاعشى ٨/٣٥٠– ٣٥٢.

(٨٠٤) الصابي: تاريخه، ٤/ ٤٤٩ ؛ حسام الدين علي غالب: الكرد، ص٢٠٥–٢٠٦.

الشوك) توانرا پێوەندی نێوانیان لەگەڵ (فخر الملك)دا چاك بکرێتەوە.[٨٠٥]

دەربارەی سەلجوقیەکان، (طغرلبگ) توانی لەساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) بچێتە نێو شاری بەغدا و کۆتایی لە دەوڵەتی بوەیهی و زیندانیکردنی دوا پاشایان بەناوی (الملك الرحیم) لە قەڵای طبرق لە شاری (الری) بهێنێ.[٨٠٦] بەڵام پێوەندییان بە میرنشینی مەروانی و پلانی چوونیان بۆ ئەو نێوچانەی کە سەر بەم میرنشینە بوو، ئەوا بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتانەی کە هەوڵی دەستبەسەراگرتنی هەرێمی ئاذربیجانیاندا بۆ دوورخستنەوەی مەترسیان ئەمەش لە ڕێگەی هێنانی کچی یەکێك لە میرەکانیان.[٨٠٧]

بەڵام ئەم ژنهێنانە ئامانجی خۆی بەدی نەهێنا، و لە دەسەڵاتی هەڵگەڕانەوە، بۆیە ناچار بوو لە ساڵی (٤٣٢ك/١٠٤٠ز) خوانێکی گەورە ئامادە بکات و ژمارەیەکی زۆر بانگێشت بکات، بەڵام لە پاش خواردن و خواردنەوە دەستی بەسەر (٣٠) سی لە گەورە پیاوانیدا گرت و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن، بۆیە غوزەکان ناچار بوون شاری ورمێ بەجێبهێڵن رووە و وڵاتی هەکاری حەشارگەی کوردەکان بڕۆن، بەمەش نەوەستان، بەڵکو بەردەوامبوون لە شوێنکەوتنی کوردەکان کە پەنایان بردە بەر چیاو دەربەند و ئەشکەوتەکان، ئەوەندەی پێ نەچوو کوردەکان خۆیان کۆکردەوە و هێرشیان کردە سەر غەزەکان و نزیکەی (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد پیاویان لێ کوشتن،[٨٠٨] و ژمارەیەکی

---

(٨٠٥) ابن الاثیر: الکامل، ٧/ ٢٥٥.

(٨٠٦) ابن الاثیر: الکامل، ٦/ ١٨١ ؛ ابن خلدون: العبر، ٢/ ٢٨٩ ؛ هەرچەندە (عبدالرقیب یوسف) ئاماژەی بەوە داوە کەوا (الملك الرحیم) لە قەڵای سیروان لە کوردستانی باشور زیندانی کراوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (الدولە الدوستکیة، ٢١٩/١) بەڵام عبدالرقیب بە هەڵەچووە بۆ نیشانکردنی قەڵای سیروان، راستیەکەی قەڵای سیروانی ئەو سەردەمە دەکەوێتە نێوچەی پیشکۆ لە رۆژهەڵاتی چیای کبیرکوە سەر بە لوڕستانی ئێستا لە ناحیەی تورهان، پاشماوەکەی بە سەراوکالان یاخود شیروان ناسراوە، بڕوانە ( حسام الدین علي غالب: الکرد، ص٢٨-٢٩).

(٨٠٧) احمد کسروی: شهریاران گمنام، ٢/ ٦١-٦٢ ؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٢٨٩.

(٨٠٨) ابن الاثیر: الکامل، ٦/ ٤٢؛ ابن خلدون: العبر،٤/ ٥٠٥ ؛ موکریانی: کوردستان، ٢٧٣،٢٧٥.

زۆریان لیّ بەدیل گرتن و لە نێوانیاندا (٧) حەوت لـە سـەرکردەکانیانی تێدا بـوو، سوپاکەیان پەرتەوازە بوون، و ئەوانەی مانەوە هەڵهاتن، بەمەش ناچار کران ئاذربیجان بە جێبهێڵن.[٨٠٩]

لە ساڵی (٤٣٢ك/١٠٤١ز)دا (ابراهیم ینال) برای طغرلبگ بڕیاریدا بەرەو شـاری ڕەی بڕوات. غوزەکان ناچاربوون هەڵبێن و هەرێمی چیا بە جێبهێڵن بۆ آذربیجان، بەڵام نەیانتوانی تێدا نیشتەجێ بن، لەبەر ئەو کارە ناشرینانەی کە بەرانبەر دانیشتوانەکەی ئەنجامیاندا جگە لە ترسیان لە (ابراهیم ینال)، ڕوویـان کـردە (زوزان) بەڕێبەرایـەتی هەندێ لە دیلە کوردەکان کە پێشتر بەدیلی گیرابوون. هەندێکیان ڕێگەی (جزیـرە ابـن عمر)یان گرتە بەر، بەسـەرداریتی یـەکێك لـە گـەورەکانیان بـە نـاوی (مـنـصور بـن قزاوغلی) و توانی کـونترۆڵی بەشـی ڕۆژهـەڵات بکـات،[٨١٠] بـەڵام بەشـێکی تریـان نزیکەی (١٠) دە هەزار سەرباز دەبوون بە سەرکردایەتی (بوقاونا صـغلی) لـە سـاڵی (٤٣٤ ك/١٠٤٢ز)دا ڕوویان کـردە شـاری میافـارقین و گـەمارۆیان خـستە سـەری و پەلاماری دەورەبـەریان دا و تاڵانیـان کـرد پـاش تونـدکردنی گـەمارۆی سـەر شـاری میافارقین میر (نـصر الدولـة) بـڕی (٥٠) پـەنجا هـەزار دینـاری دەدانـێ بەمـەرجێ گەمارۆکـەیان هەڵگرتایـە و بگەڕێنـەوە شـوێنی خۆیـان، بـەڵام ڕازی نـەبوون بـەو داواکاریە.[٨١١]

شایانی باسە کە پاش ماوەیەك هەردوو سەرکردە (بوقاونا صغلی) خـەرێکی مـەی خواردنەوە دەبن و ڕێژەیەکی زۆر دەخۆنەوە، هەر لەو دانیشتنەدا بـە شـەڕ هـاتن و بـە چەقۆ لـە یەکتریانـدا و هـەردووکیان یـەکتریان کوشـت، لـە ئـەنجامی ئـەم شـەڕەدا سەربازگەکەیان تێکچوو، لەم کاتەدا میر (نصر الدولة) ئـەم هەلـەی قۆسـتەوە و بـە

---

(٨٠٩) ابن الاثیر: الکامل، ٦/ ٤٢ – ٤٣.

(٨١٠) ابن الاثیر: الکامل، ٦/ ٤٢ – ٤٣.

(٨١١) الفـارقي: تاریخـه، ١٦٠، بـەڵام بـە شـێوەیەکی دیکـە بـاس کـراوە لای (ابن الاثیر: الکامل، ٤٢/٦؛ ابن خلدون: العبر، ٤/٢٦٠).

سوپاکەی هێرشی کردە سەر سەربازگەکەیان و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و هەندێکی لێ بە دیل گرتن و توانی دەست بەسەر هەموو سەروەت و سامانیاندا بگرێت.[812]

سەبارەت بەو غوزانەی کە بەشی رۆژهەڵاتی (جزیرە ابن عمر)یان داگیر کرد، میر (سلیمان بن نصر الدولة) والی جزیرە لەگەڵ گەورەکەیان (منصور بن قزاوغلی) رێکەوت بە هیوای تەواوبوونی وەرزی زستان، کاتێك ئەم وەرزە تەواو بوو، میر (سلیمان) خوانێکی لە سەر شەرەفی (منصور بن قزاوغلی) میری غەزەکان ئامادەکرد و لە کاتی ئامادەبوونیدا گرتیان و بەندیان کرد،[813] بەمەش غەزەکان لە وڵاتدا پەرش و بڵاوبوونەوە. کاتێك (قرواش بن المقلد) بەم کارەی زانی سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد، و کوردە بشنویەکانی قەڵای فنك پێوەندییان پێوە کردن، جگە لە سوپای میر (نصر الدولة)، شوێن غوزەکان کەوتن و شەڕیان لەگەڵ کردن، غەزەکان هەوڵی ئاشتی و رێکەوتنیاندا ئامادەبوون هەموو ئەو شوێنانەی دەستیان بە سەریدا گرتبوو بیگێڕنەوە، بەڵام بە داواکارییەکەیان رازی نەبوون، ئەمەش وای کرد کە غەزەکان شەڕی مان و نەمان بکەن، وەك (ابن الاثیر) دەڵێت: "ئەوەی مردن نازانێت"،[814] توانیان شکست بە کورد و عەرەبەکان بەیەکەوە بهێنن و دووبارە گەڕانەوە جەزیرە و گەمارۆیاندا، و بەشێکی دیکەیان روویان کردە دیاربەکر و نێوچەکەیان وێران کرد و بە کاری ئاشرین و تاڵانی، ئەمەش وای لە میر (نصر الدولة) کرد کە رێگەی دیبلۆماسی بگرێتە بەر ئەویش بەناردنی نامە و پارە لەگەڵ پەیمانی ئازادکردنی سەرکردەکەیان (منصور) کە لە زیندانی کوڕەکەیدا بوو، بەرانبەر وازهێنانی لەو

---

(٨١٢) الفارقي: تاريخه، ١٦١.

(٨١٣) ابن الاثير: الكامل، ٦/ ٤٣: ابن خلدون:العبر، ٤/ ٢٦٠.

(٨١٤) إبن الأثير: الكامل،٤٣/٦؛ ابن خلدون: العبر،٢٦٠/٤.

کارانەی کە لە نێوچەکەدا ئەنجامی دەدەن، ئەوانیش بەو داواکاریە رازی بـوون، کاتێـك (منصور)ی سەرکردەیان ئازاد کرد و لەگەڵ هەندێ پارە بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیـەی نێوانیان، لە پەیمانەکەیان پەشیمان بوونەوە و بەردەوامبوون لە کارەکـانی خۆیـان لـە هێرش و پەلامار و وتاڵانی کردندا.[815]

لە میانەی ئەم ڕووداوانەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کـە هەڵمـەت و هێرشـەکانی غـەزەکان ببـووە سەرچـاوەی مەترسـی بـۆ سـەر میرنـشینی مـەروانی و میرنـشینە کوردیەکانی دیکە، بۆیە میر (نـصر الدولـة) هەوڵیـدا شـێوازی دیپلۆماسـی بـەکار بهێنیت لە ڕێگەی ئاشتی و ڕێکەوتن و پارەپێدان،[816] لە بەر زۆری ژمارەیان و هاتنی هەڵمەتەکانیان یەك لە دوای یەك، و کاتێك ئەم شێوازانە هـیچ بەرهـەم و ئامـانجێکی بەدەست نەهێنا، ئەوجا ناچـار پـەنای بـردە بـەر گەورەکـەیان سـوڵتان (طغـرلـبگ) بەنامەیەکی سکاڵا ئامێز لە دەستی غەزەکان کە چۆن خەڵکەکەیان کوشت وڵاتەکەیان وێران کردووە،[817] (طغرل بگ) بە نامەیەك وەڵامی دایەوە وتی: "پێم ڕاگەیاندرا کەوا میللەتەکەمان گەیشتە وڵاتتان و تۆ نەرمیت نواند و دڵیانت ڕاگـرت بـە پـارە، و تـۆ خاوەن پێگەیەکی گرنگی چیت پێویستە پێت بدرێت بۆ شەڕی کافرەکان".[818] پاشـان پەیمانی پێدا کەوا خەڵکانێك دەنێرێتە لایان بۆ بەجێهێشتنی وڵاتەکەیان.

ئەم نامە نێردراوە ساڵی (٤٣٥ك/١٠٤٣ز) سەرەتای درووستبوونی پێوەندی نێـوان سوڵتان (طغرل بك) و میر (نصر الدولة) بـوو، و ئـەم پێوەندیـە دیپلۆماسـییە زیـاتر جێگیر بوو کاتێك لە ساڵی (٤٤١ك/١٠٤٩ز)دا سوڵتان (طغرل بگ) داوای لـە مـیر (نصر الدولة) کرد کە لە وڵاتەکەی وتاری هەینی بـەناوی ئـەوەوە بێـت،[819] ئـەویش

(٨١٥) الكامل، ٦/ ٤٣.

(٨١٦) الفارقي، تاريخه، ١٦٠؛ ابن الاثير: الكامل، ٦/ ٤٣ ؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٢٦٠.

(٨١٧) ابن الاثير: الكامل، ٦/ ٤٤؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٢٦٠.

(٨١٨) ابن الاثير: الكامل، ٦/ ٤٤، ابن خلدون: العبر، ٤/ ٢٦٠.

(٨١٩) ابن الاثير: الكامل، ٦/ ١٤٦.

داواکەی قبوڵ کرد کە وتاری هەینی لە هەموو میرنشینەکەیدا بەناوی ئەوەوە بێت، بەمەش میر (نصر الدولة)ی مەروانی ملکەچ و گوێڕایەڵی سەلجوقیەکان بوو، هەر ئەمەش بوو (پادشای رۆم)* داوای لێکرد کەوا هەوڵی ئازادکردنی پادشای (ابخاز)(٨٢٠)** بدات کە لە شەڕی غەزەکاندا بە فەرماندەیی (ابراهیم ینال) بە دیل گیرابوو بۆ ئەم مەبەستەش میر (نصر الدولة) نوێنەری خۆی (شێخ الاسلام) بە ناوی (أبو عبدالله بن مروان)ی رەوانەی لای سوڵتان (طغرل بگ) کرد، ئەویش بەبێ بەرانبەر ئازادی کرد ئەمەش کارێکی گەورە و مەزن بوو لای (نصر الدولة) و پادشای رۆم.(٨٢١)

لە میانەی رووداوەکانی ساڵی (٤٤٦ك/١٠٥٤ز)دا (ابن الاثیر) دەیگرێتەوە کە میر (نصر الدولة) سوپایەك و دیاریەکی زۆر وەك هاوکاری بۆ سوڵتان (طغرل بك) لەکاتی پێشڕەویکردنی لە هەرێمی ئەرمینیادا،(٨٢٢) و گەماروی ملازگرد و خۆ ئامادەکردن بۆ هێرش و پەلاماری وڵاتی رۆمدا دەنێرێ.(٨٢٣)

---

* پادشای ڕۆم:- ناوی (مونوماخوس) کە بە کەستەنێنی نۆیەم ناسرابوو توانی لە نێو ساڵانی (٣٤٣-٤٤٧ك/١٠٤٢-١٠٥٥ز) ئیمپراتۆری وڵاتی بێزەنتە بێت. (نعیم فرح: تاریخ بیزنطە السیاسی، ٢٤٣).

(٨٢٠) المسعودي: مروج الذهب، ١/ ٢٢٦.

** پادشای ابخاز:- ناوی (قاریط) بوو لە ساڵی (٤٤٠ك/١٠٤٩ز) بە دیلی گیرا کاتێك (ابراهیم ینال) هێرشی کردە سەریان، بۆ ئازادکردنی خۆی نزیکەی (٣٠٠) هەزار دینار و دیاری بەبڕی (١٠٠) هەزار دیناردا، بەڵام وەڵام نەدرایەوە.(ابن الاثیر: الکامل، ٤٨/٨).

(٨٢١) ابن الاثیر: الکامل، ٦/ ١٤٦.

(٨٢٢) الکامل، ٦/ ١٧٢.

(٨٢٣) ابن الاثیر: هـ - س، ٦/ ٢٤٦ - ٢٤٧؛ ابن کثیر: البدایة والنهایة، ١٢ / ١٠٠ - ١٠١.

## دیبلۆماسییەت و چارەسەرکردنی کێشەکان بە ڕێگەی ئاشتی

ئەوەی پێوەندی بە کۆمەڵگەکانەوە هەیە بۆ چارەسەکردنی کێشەکانی نێوانیان بە ڕێگەی ئاشتی پێوەندی بە ڕۆڵی دیبلۆماسییەوە هەیە، ئەو ڕۆڵە گرنگەی کە تا ئەمڕۆ کاری پێدەکرێت تیۆری بالادەستی دەوڵەتە، و زۆرجار ڕێگە نادات پەنا ببرێتە بەر یاساو دادگا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان، بەڵکو تا ئێستەش دەرگاکان والایە لە پێش دیبلۆماسییەتدا بۆ جموجولکردن لەم بوارەدا.[824]

دەوڵەت و میرنشینە کوردیەکان لە ڕێگەی بالوێز و نوێنەرە دیبلۆماسییەکانیانەوە هەولی چارەسەرکردنی ناکۆکی و کێشەکانیان دەدا. ڕەنگە ئەو دانوستاندنانە تەنها پێویستی بە گۆڕینی نامە و یاداشت هەبووبێت، جاری واش هەیە ئەو دانوستاندنانە درێژە دەکێشێت یاخود پێویست بە ناردنی یەکێك لە بەرپرسانیان بە راپۆرتێکی دەربارەی سیاسەتی دەرەوە دەکات، یان بەیەکگەیشتنی نوێنەری هەردوو وڵات بۆ گفتوگۆکردن لەو بارەیەوە، ئەمە و جگە لە هەندێ وردەکاری کە هەرلایەك پەنای بۆ دەبەن بەپێی پێویستی ڕووداوەکە و گرنگی ململانێ و ناکۆکیەکە لەو سەردەمەدا.

دوابەدوای ئەوەی خیلافەتی عەبباسی تووشی لێکترازان و بەش بەش بوون بووە، چەند میرنشینێك کە میر و پادشا و سوڵتانەکان کێبڕکێی فەرمانڕەواییان لەسەر دەکرد، ئەو دەمە پێوەندیە دیبلۆماسییەکان چووە چوارچێوەی کاری سیاسییەوە بە ئامانجی هێورکردنەوەی جیاوازییە سیاسیەکانیان و نەهێشتنی ناکۆکیە هەرێمیەکان کە زۆر جار لە نێوان فەرمانڕەوای هەرێمەکان و خیلافەتدا لە لایەك و لە لایەکی دیکەوە لە نێوان میر و فەرمانڕەواکان خۆیاندا دروست دەبوو، خیلافەتی عەبباسی بە پەرۆش بوو بۆ دەستتێوەردان و چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان میری هەرێمەکان، لەبەرئەوەی خیلافەت دەسەڵاتی باڵا بوو و ئەوان دەسەڵاتی شەرعیان لەو وەردەگرت،

---

(٨٢٤) عزالدين فوده: النظم الدبلوماسية، ٣٤.

بۆیە تێبینی ئەوە دەکەین کە زۆربەی دەست تێوردانەکانی خیلافەت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بە ئاشتی کۆتایی هاتووە بۆ رەزامەندی خەلیفە و دانپێنانی دەسەلآتی بووە.

بێگومان هەموو کارێك و پێوەندییەك سەرەتاکەی سادە و ساکار و لەسەرخۆیە، جا هەر لەسەر ئەو بنەمایە پێوەندییە دیبلۆماسییەکانی نێوان میرنشینە کوردییەکان و دەوڵەتانی دیکە بەهەمان جۆر و شێوە سادە و ساکار بووە، چونکە تاکە رێگەش بووە بۆ رێکخستنی پێوەندییەکانی نێوانیان، هەروەها شێوەیەکی کاتیشی بەخۆیەوە بینیووە، مەبەست لە دیبلۆماسییەت لەو کاتانەدا ئاڵوگۆڕ و گواستنەوەی بریندار و لاشەی کوژراوانی مەیدانی شەڕ و شۆڕ بووە، دەتوانین بڵێین دیبلۆماسییەت تەنیا رێگە بووە لە نێوان دەوڵەتاندا بۆ چارەسەرکردنی شەڕ و پێکدادان و بەگژیەکداچوون، هەر لەبەر ئەمەش بووە رێزێکی زۆری لێگیراوە و بایەخی پێدراوە، وەك یاسایەکی نێودەوڵەتی پێڕەو کراوە، و بەهەند وەرگیراوە.

هەر لەسەر ئەم بنەمایەش بەرەوپێش چووە و گەشەی سەندووە، خۆ لەکاتی بەستنی هەر پەیماننامەیەك لە نێوان هەر یەك لەو وڵاتانەدا نوێنەری دیبلۆماسی خۆیان بۆ هەڵسوراندنی ئیش و کارەکانی دیبلۆماسییەت لە نێوانیاندا هەبوو، مەڵبەندی یاساش بۆ نوێنەرایەتی دیبلۆماسییەتی ئەو سەردەمە لەلایەن میر یان سوڵتانەوە دەسەلآتیان پێ دەدرا، بەو پێیە کارەکانیان ئەنجام دەدا و مەرکەزی یاساشی وەردەگرت، لە هەمان کاتیشدا لەلایەن میرنشینی پێشوازیکەرەوە رێزێکی بێ سنوور بۆ نوێنەری دیبلۆماسی دانرابوو، چونکە نوێنەرەکە نوێنەری میرە یان سوڵتان، لەوکاتەدا میر حوکمداری لەژێر بەرگێکی تاکرەویدا پەیرەو دەکراو بەرێوە دەبرا، چونکە دەسەلآت بەشێوەیەکی گشتی لەژێر دەستی میردا بوو، بۆیە لەراستیدا نوێنەرەکان بەشێوەیەکی راستەوخۆ نوێنەری وڵاتەکەیان نەبوون، بەڵکو نوێنەری میر بوون، لەگەڵ ئەوەشدا نوێنەرەکە سوودی لە جیاوك و پاراستەکان وەردەگرت، بەتایبەتی لەکاتی سەردانیدا بۆ دەوڵەتی خانەخوێ کە پارێزگاری تەواوی لێدەکرا لەکاتی پەلاماردان و دەستدرێژیکردنە سەری و داکۆکی لێدەکراو زۆرجاریش دیاری پێشکەش دەکرا،

لەهەمان کاتدا سوودی لـە پارسـتەی دادوەری وەردەگـرت بەتایبـەتی لەوکاتـەدا کـە بەڕەسمی دەچووە ولاتێکی دیکە، کە نامەیەکی لە میرەوە بېردایە یان بەئیش و کاری میر بچووبایە، سوودی لەو نوێنەرایەتیە وەردەگرت کە هەر نوێنەرێکی ولاتێکی بیانی لـە ولاتێکی دیکەدا هەیەتی، بەلام ئەگەر چوونەکەی بۆ ئیش و کار و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بوایە ئەوا بێگومـان سوودی لەو جیاوك و پاراستنە وەرنەدەگرت، چونکە نوێنـەری دیپلۆماسی هەر کاتێك ئەو کارەی بۆی چووبوو تەواوکردبا ئەوا کۆتایشی بەوە دەهـات کە دیپلۆماسییە، کەواتە دیپلۆماسییەتەکە تەنها پێوەندی بە ئیشە دیپلۆماسییەکەوە بوو.

بەلام ئـەو نـاکۆکی و ململانیانـەی نێـوان مـیر و فـەرمانڕەوایی هەرێمـەکان کـە خیلافەت هەموو هەولێکی دیپلۆماسیانەی خستەگەڕ بۆ چارەسەرکردنی کێـشەکانیان پێش ئەوەی شەڕی چەکداری لە نێوانیاندا ڕووبـدات و چارەسـەرکردنی کێـشەکان بـە ڕێگەی ئاشتی و لـە ڕێگـەی نزیککردنـەوەی بۆچـوونەکان و نـاردنی نوێنـەر بـۆ لای هەردوولا و بانگکردنیان بۆ پایتـەخت و پـەیمان بەنووسـین لـە هـەردوولا وەردەگـرت، خیلافەت نوێنەری خۆی دەنارد بۆ ئـەوەی هەولـەکانی بـۆ ئاشـتی سـەرکەوتوو بێـت، هەروەها (ابن الاثیر) لە میانەی ڕووداوەکانی سالی (٣٤٢ك/٩٥٣ز)دا باس دەکـات و دەلێت: "نوێنەری خەلیفە (الطائع بـالله) لـە خۆراسـان گەڕایـەوە کـە بـۆ ئاشـتی و ڕێکەوتنی نێوان (رکن الدولة) بوەیهی و(نوح بن محمود بن سبکتکین) خاوەن خۆراسـان ڕەوانە کرابوو"، هەروەها باس لە ناوبژیوانی خەلیفە (القـائم بـأمر الله) دەکرێـت بـۆ ڕێکەوتن لە نێوان (طغرل بك)ی سەلجوقی و (جلال الدولة البـویهي)دا.* پـێ دەچـێت ئەو سەرکەوتنەی(ابن أبو الشوك)و هۆزەکەی شاژنجان بەدەستیان هێنا لە دامرکانەوەی هەلگەڕانەوەی تورکەکان، ئەمەش وای کردبێـت (معـز الدولـة البـویهي) پاراسـتنی

---

* جلال الدولة:- ناوی (ابو الطاهر بن بها الدولة) لە میرە بوەیهییەکانی عێراق بوو، لە سالی (٤١٨ك/١٠٢٧ز) فەرمانڕەوایی عێراقی گرتە دەست، لە سالی (٤٣٥ك/١٠٤٤ز) کۆچی دوایی کرد. (ابو الفداء: المختصر،١٦٧/٢؛ابن کثیر: البدایة والنهایة، ٥٥/١٢/٦).

ڕێگای ئیستراتیجی نێوان بەغداو ڕەی پێ بسپێرێت، لەم بارەیەوە (مسکویە) دەڵی "... ابن ابو الشوك لە هۆزی شاژنجان جێگری یەکەی کارگێڕی حولوان و پارێزەری ڕێگای...." بوو.[٨٢٥]

بەپێی ئەو نەریتە باوە (معز الدولة البويهي) بارمتەکانی لە (ابن ابو الشوك)ی[٨٢٦] کوردی وەرگرت بۆ دڵنیابوون لە گوێڕایەڵی، ئەویش لە ترسی گۆڕینی هەڵویستی بوو بۆ هێزێکی دیکە، چونکە هەڵکەوتی شوێنی ئەم هۆزە (شاژنجان) لە خاڵێکی گرنگی جیاکەرەوەی نێوچەی دەسەڵاتی (ركن الدولة)ی برایدا بوو.[٨٢٧]

سەرەڕای ئەو پێوەندیە دیبلۆماسییانەی نێوان (ابو الفتح) و فەرماندەی بوەیهییەکان، وەك یەکێك لە لایەنە پێوەندی دارەکان کە پشتی پێ دەبەسترا لە کاتی ئەو قەیرانانەی ماوەی جارێك ڕووبەڕووی دەسەڵاتی بوەیهی دەبووەوە،[٨٢٨] جگە لەوەی (هلال الصابي) پێی دەوت "النجيب"،[٨٢٩] خانەدان یاخود نجیب زادە، جێگەی ئاماژەپێکردنە کە پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوانیان تێکچوو بەهۆی دامەزراندنی یاخود دانانی (ابو علي بن استاذ هرمز) وەك (عميد الجيوش – پێشەوای سوپا) لە لایەن (بهاء الدولة) وەك جێگر لە سەر عێراق لە جیاتی (أبو جعفر الحجاج)، ئەمەش گەیشتە ڕادەی هەڵگەڕانەوە و گوێرایەڵ نەبوون، (الصابی) تاکە سەرچاوەی مێژووییە باس لەم ڕووداوە دەکات، هاوکات باس لە هۆکاری ئەم هەڵوێستەی (أبو الفتح) ناکات، بەڵام پێ دەچێت ئەو توندوتیژییە کە پێشەوای سوپا پێڕەوی دەکرد لە کاتی هاتنی بۆ بەغدا بە هیوای قەڵاچۆکردنی عەییارییەکان و ئەوانەی ئاسایشی وڵاتیان

---

(٨٢٥) تجارب الامم، ٢/ ١٥٥.

(٨٢٦) مسكويه: تجارب الامم، ٢/ ١٥٦.

(٨٢٧) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە بەشی سێیەمی ئەم نامەیە چونکە بە دوورو درێژی باسمان لێوە کردووە.

(٨٢٨) هـ. س، ٤/ ٣٣٨ – ٣٣٩، ٤٢٢ – ٤٢٤.

(٨٢٩) الفيروز آبادي: معجم القاموس المحيط، رتبه وثقه– خليل مأمون شيما، دار المعرفة، بيروت، ٢٠٠٥، ١٢٦٢؛ الزبيدي: تاج العروس، ١/ ٤٧٧.

تێکداوە،[830] و هەندێ لایەنگری خۆیاندا بەسەری (ابو الفتح)دا.[831]

ئەم جۆرە ڕێکەوتننامانە بە کۆنووسێکی فەرمی دەنووسرا و هەموو هەوڵەکانیان دەنووسی ئەگەر بەسەرکەوتوویی تەواو بوایە، ئەمەش بە ئامادەبوونی نوێنەری خەلیفە و هەردوولا کۆدەبوونەوە لە سەر شێوازی کۆنگرەیەك و هەردوولا سوێندییان دەخوارد کە مەرجەکانی ڕێکەوتننامەکە جێبەجێ بکەن.

ئەگەر بارودۆخەکان گونجاو بێت و ڕێکەوتننامەکەی نێوانیان بەهەند وەریگیرایە خۆی لە خۆیدا لە دایکبوونی هێزێکی نوێ بوو، ئەم ڕێکەوتننامانە دان پیانان بوو بە سیستمیکی نوێ کە بارودۆخەکە هێنابوویە ئاراوە، چونکە مانەوە لە سەر سیستمی کۆن لەم بارودۆخەدا تەنها کێشەکانی ئاڵۆزتر دەکرد.

لە دێرزمانەوە پێوەندیە سیاسی و دیپلۆماسییەکان بەکارهاتوون بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بەتایبەتی گۆڕانی بارودۆخی ئاڵۆز و ناکۆکی و شەڕ بۆ بارودۆخی هێمنی و ئاشتی و ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامە. لە ماوەی فەرمانڕەوایی دەوڵەت و میرنشینە کوردیەکاندا بە هەموو قۆناغە جیاوازەکانیەوە ئەم پرۆسەیە جێبەجێ دەکرا، ئەویش لە پاش ڕوودانی شەڕەکە یان لە پێش دەستپێکردنی شەڕ وەك لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان بۆ کردووە.

---

(830) ابن الاثير: الكامل، 5/551-552 ؛ ابن كثير: البداية والنهاية، 11/330 ؛ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، 4/206 ؛ ابن خلدون: العبر، 4/469.

(831) بڕوانە بەشی دووەمی ئەم توێژینەوە.

## ئەمانەت و پەنابەری سیاسی

لەسەردەمی نوێدا بیرۆکەی حصانەی باڵوێز و ڕێزگرتنی بەندە بە بنەمای عورف و یاسای نێودەوڵەتی لەگەڵ دەقی یاسا نێودەوڵەتیەکاندا کە لە کاروباری دیبلۆماسییدا دیاریکرا.[(٨٣٢)]

بەڵام لەسەردەمی پێشوودا، حصانەی وڵاتان لەسەردەمی ئیسلامیدا پشتی بەست بە ئەحکامە ئایینەکان کە یاسای مامەڵەکردنی باڵوێزەکانی لەگەڵ پاراستنیاندا دیاریکرد، هەروەها ئیمتیازاتی تایبەتیان هەبوو، بانگەوازی گرنگ و پاراستنی و فەرامۆشکردنی دەبێتە هۆی غەزەبی خواوەند،[(٨٣٣)] شەریعەتی ئیسلامیش لەم بوارەدا یاسای روون و ئاشکرای خستەڕوو، دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(د.خ) بەنێردراوی وت:- "بەخوا سەرم دەپەڕاندی گەر کوشتنی نێردراو ڕێگەپێدراو بوایە".[(٨٣٤)]

بەو پێیە لەسەردەمێکی زۆر زوو لەمێژوویاندا، موسڵمانەکان جۆرێك لەپاراستنیان بۆ نێردراوە ناموسڵمانەکان دابین کردبوو کە دەگەیشتە پاراستنی گیانیان، موسڵمانەکانیش لەسەر ئەم ڕێنمایانە ڕۆشتن کە لە شەریعەوە هاتبوو، هەموو خەلیفە و میر و پادشاکان پەیڕەویان دەکرد.

ئەو پاراستنەش لەسەر بنەمای شەریعە بوو کە پێغەمبەر (د.خ) کە دانەری بنچینەی دەوڵەتی ئیسلام بوو لەسەری دەڕۆیشت، ئەم پاراستنە و سەلامەتیە پاش پەیڕەوکردنی بۆ ماوەیەکی زۆر لەلایەن موسڵمانەکانەوە، بووە نەریتێك و بنەمایەك کە پێویست بوو پەیڕەو بکرێت لەلایەن بەرپرسانی دەوڵەتی ئیسلامیەوە.[(٨٣٥)]

ئەوەی پێوەندی بەئێمەوە بێت سەبارەت بەجۆری پاراستن کە موسڵمانەکان پەیڕەویان

---

(٨٣٢) لائیحەی ڤیینا ساڵی (١٨١٥) و پرتۆکۆڵ اکس لاشابل و ئەو شەریعاتەی لەپاشی هات.

(٨٣٣) او بنهایم: القانون الدولي العام، ٦٧٨/١.

(٨٣٤) مجيد خدوري: السلم والحرب في شرعة الأسلام، ٢٢٠- ٢٢٨.

(٨٣٥) ابن هشام: سيرة النبي، ٦٠٠/٢.

دەکرد ئەوەیـە کـە پـەیمانی ئاسـایش و ئاشـتی دەبـێ بپـارێزرێ لەلایـەن دەسـەڵاتی ئیسلامیەوە لەماوەی مانەوەی لە دەوڵەت یان ئەو میرنشینەی بۆی نێـردراوە. ئەمـەش ئیمام یان جێگەرەکەی دەیبەخشیە یەکێك لە چـەند جـەنگاوەرێك کـە وەك نێـردراوی میللەتەکەی ئەژمار بکرێت بەمەسـتی دانوسـتاندن، جـەنگاوەرەکان لـە بەرامبـەردا گیانیـان دەپـارێزراو پـاش کۆتـایی هـاتنی ئەرکـەکانیان گەڕانـەوەیان لەلایـەن دەسەڵاتدارانەوە بۆ وڵاتەکەیان زامن دەکرا.[٨٣٦]

گرنگی ئاسایش بۆ نێردراوە بیانیەکان بەمەبەستی ئاسانکاری هاتووچۆ و مانـەوەی بوو لەو وڵاتەدا ئەمـەش بەپێی یاساکان بوو ورۆژاندی بابەتی (حصانه المقر) پاراسـتنی شوێن وەڵامی ئەمە ئەوەیە کە ئەم سیستمە لـەو سـەردەمەدا نـەبوو نەلـە دەوڵـەت و میرنشینەکانی رۆژهەلات و نـە لـە رۆژئـاوا و کـەس بـاس لـەوە ناکـات کـە بینـای باڵوێزخانە هەبووبێ لەو سەردەمـەدا و ئەم سیستمە زیاتر لە نوێگەریەکانی سەردەمی نوێیە.

دەوڵـەت و میرنـشین یـان دەسـەڵاتە سیاسـیەکان لـە سـەرەتای درووسـتبوونیانەوە بەناوبانگبوون لە دابینکردنی ئارامی و ئاسایش یان ئەوەی پێی دەوترێت پاراسـتن بـۆ نێردراوەکانیـان بـە جیـاوازی ئایینـەکانیان، ئەمـەش بـەپێی یاسـای شـەریعەتی دیبلۆماسیی بۆ باڵوێزەکـان بـەجۆرێك کـە بتـوانن ئەرکـەکانیان بـە باشـترین شـێوە جێبەجێ بکەن لە ماوەی مانەوەیاندا هەروەها گرنگیدا کە هـەموو جـۆرە حـصانەیەك دابین بکرێت بۆ باڵوێز و هەموو ئەندامانی شـاندی دیبلۆمـات لەگـەڵ خزمـەتکار و کۆیلەکان. ئەم حصانەیە هەموو ئەندامانی شاندەکەی دەگرتەوە و هەر سوکایەتیەك بە کەسێك لەو شاندە سوکایەتی بوو بە کەسایەتی باڵوێز.[٨٣٧]

(أبو یوسف الفقیه) دەڵێت:- "والیەکان کە نێردراوێك بهاتایا پرسـیاری نامەکـەی

---

(٨٣٦) مجید خدوری: السلم والحرب في شرعة الأسلام، ٢٢٠- ٢٢٨.

(٨٣٧) مجید خدوري: س. پ، ٢٢١- ٢٢٢.

لیّ دەکرد، گەر وتی من نێردراوی فلان پادشام و ناردومی بۆ قیسار پادشا، ئەمە نووسراوەکەیەتی پێمە، و هەر شتێکی دیکە کە پێمە لە شمەك و ئاژەڵ و پارە و کویلە..." (٨٣٨).

هەروەها دەڵێت:- "گەر هاتوو موسڵمانەکان دەستیان گرت بەسەر کەشتیەکدا و خاوەنەکەی بڵێ من نێردراوی فلان پادشام و ئەمە نووسراوەکەی پادشایە پێم و ئەمەش شمەکەکانیەتی لەکەشتیەکدا، پێویستە لەسەری کە بیاخاتە پێشەوە بۆ پشکنین گەر راستیان کردبا قەبوڵ دەکران"(٨٣٩) بەپێی ئەم یاساو بنەمایە، هەموو نێردراوەکان و شاندەکان لەلای ئەو دەوڵەت یان میرنشین پارێزراو بوون جا گەر لەرێگەی وشکانی یان دەریاییەوە هاتبان گیان پارێزراو دەبوون و کەس رێگری نەدەکردن و تووشی مەترسی نەدەبوون و ئەوەی پەیوەندی هەبوو بەپێداویستیەکانی بالوێز و هاورێکانی، هەموو مافێکیان پارێزراو بوو بەتەواوی لەرووی پاراستنی گیانی و کەرامەتی بەوە دڵنیابوون دەست بەسەر پارە و مالیدا نەدەگیرا، بەلام نێردراوی موسڵمانەکان جیابوون لەو مەرجانە بەهۆی گەورەیی پایە و شکۆداریان، و ئەگەر لەساڵێك زیاتر لە ولاتدا بمانایانەوە ئەوە مافی هاولاتیبوونی هەبوو وەك بالوێزە بیانیەکان.(٨٤٠)

حصانە (پاراستن) کە دەدرێتە نێردراو بەهۆی کارەکەیەوە ئەرك و فرمانێکی گرنگ بوو، چونکە وای دەکرد کە بتوانێت بەباشی ئەرکەکانی بەبێ ترس و دلەراوکێ جێ بەجێ بکرێت، میرنشین و دەوڵەتەکان بەدرێژایی ئەو مێژووە، بەردەوام بوون لەسەر پاراستنی ئەو بنەمایە و پابەندی ئەرکی مۆراڵەکانی بوو، کە ئەمەش پەرۆشی دەسەلمێنێ لە جێبەجێ کردنی یاساکانی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکان وەك جوانترین وێنای شارستانی و مرۆیی. دەوڵەت و میرنشینەکان تەنها گرنگیان نەدەدا بەنێردراو و شاندەکان و پاراستنی سەلامەتیان و وەرگرتنی (أوراق الإعتماد) نووسراوی

---

(٨٣٨) كتاب الخرج، دار الحداثة، بيروت، ١٩٩٠، ١٨٨.

(٨٣٩) هـ -س،١٨٨.

(٨٤٠) الشيباني: شرح السرخسي على السير الكبير، حيدر اباد، الدكن، ٤/٦٦- ٦٧.

باوەڕپێکراو، بەڵکو چەند تایبەتمەندیەکی لەوە زیاتریش بوو لەوانە لێخۆشبوون لە باجدانی (عشر المکوس) کە لە گەشتیاران وەردەگیران، لەم بارەیەوە (أبو یوسف) دەڵێت:- "لەنێردراوی پادشای ڕۆم باج وەرنەدەگیرا و لەوکەسەش کە ئەمانەتی پێدراوە".[841]

جگە لەو نێردراوانەی کە کاری بازرگانیان دەکرد، وتی "گەر نێردراوەکان کاڵاو شمەکیان پێ بوو بۆ بازرگانی ئەوە تەنها دەیەکیان لێ وەردەگیرێت، خۆ ئەگەر نا ئەوە هیچیان لێ وەرناگیرێت".[842]

(فقهاء)کان باس لە (ئەسپ، هێستر، کۆیلە، شمەکی قەدەغەکراون لەبەرئەوەی بەسوودن بۆ جەنگ).[843] و لەبەرئەوەی یەکێکە لەئامرازەکانی سوڵتانی مەزن "ئەگەر شتێکیان لەو جۆرە بکڕیایە ئەوا دەبوو بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانی و پارەکانیان وەربگرنەوە"،[844] لە شتە پۆزەتیڤەکانی دیکەی باڵوێزەکان ئازادی خواپەرستی و ماوەی مانەوەیان لەو دەوڵەتەی دەنێردرێن بۆی کە ئاسایش و ئارامیان بۆ فەراهەم دەکات لە پەیڕەوکردنی ڕێوڕەسمە ئاینیەکانیان لە ڕوانگەی پەیام و بەها مرۆیی و شارستانیەکەی.

کاتێک (مجد الدولة)ی بوەیهی گەیشتە تەمەنی گەورەیی لە ساڵی (٣٩٧ك/١٠٠٦- ١٠٠٧ز)دا دەسەڵاتی لەدایکی وەرگرت کە وصی بوو لەسەری پاش مردنی باوکی (فخر الدولة) لە ساڵی (٣٨٧ك/ ٩٩٧ز)دا،[845] یەکەم کاری دامەزراندنی (أبو علی)بوو وەك وەزیر، کە هەر زوو کەوتە ڕاکێشانی فەرمانده و

---

(٨٤١) الخراج، ١٨٨؛ مجید خدوري: س- پ، ٢٢٥- ٢٢٦.

(٨٤٢) ابو یوسف الفقیه: الخراج، ١٨٨.

(٨٤٣) مجید خدوري: س-پ، ٢٢٥.

(٨٤٤) ابو یوسف الفقیه: الخراج، ١٨٨، الشیباني: س- پ، ٢٠٦/١.

(٨٤٥) ابن الأثیر: الکامل،٥٢٥/٥؛ ابن الوردي، تاریخه،٣٠٤/١؛ ابن کثیر:البدایة والنهایة،٣٢٢/١١_٣٢٣.

میرەکان بەلای خۆیدا دژ بە خاتون (السیده خاتون)ی دایکی (مجد الدولة)دا، و هەروەها رواندنی تۆی گومان لەناخی (مجد الدولة) بەرامبەر بە دایکی، کاتێك کە نەیکرد دایکی تورە بوو چوو بۆ قەلا وەك بەلگەیەك بۆ نارەزایی دەربرین هەروەها (مجد الدولة)ش بەو کارەی دایکی دلگران بوو، بۆیە لەرێی پیاوەکانیەوە خستیە ژێر چاودێرییەکی توندەوە نەوەك دایکی داوای یارمەتی لە هەندێ میر و فەرمانده بکات بۆ هاوکاریکردنی- تا دەسەلات لەدەستیدا بهێنێتەوە- بەلام دایکی شەوێك بە فرت و فێلّ هەلهات و خۆی گەیاندە قەلای (بدر بن حسنویه) وەك باشترین شوێن کە بچێت بۆی[846] پاش چەند رۆژێك گەیشت، لەوێش میر (بدر بن حسنویه) بە باشی مامەلەی لەگەلّ کرد و رێزی گرت و پاراستن (حصانه)ی دیبلۆماسیی پێدرا وەك میرێك لەلای میرنشینی (حسنویه) وریایی و لەخۆبردوویی گەیشتە ئاستێکی مەزن تا وای لێهات ولاتەکەی بووە ئەو شوێنەی خەلّك داوای پەنابەری و ئارامی لێبکات و لەو پیاوانەش کە داوای پەنابەرییان لێکردبوو "ابو العباسی الضیی، وەزیری (مجدالدولة بن فخر الدولة)، (القاسم بن بختیار)، (أبو العباس أحمد بن واصل)، خاوەنی بصره و سیراف، (ابو الهیجاء محمد بن عمران)، کوری خاوەن (بطیحة) و ئەوانی دیکە".[847]

(ابو الشوك) پیاوێکی بەخشندە و میواندۆست بووە و بارەگاکەی پەناگەیەك بووە بۆ راکردن و پەنابەران، وەك ئەوانەی پەنایان بۆ دەبرد دوای ئەوەی لە جەنگدا شکستیان دەهێنا، لەکاتی کێشە و ململانێی نێوان (المقلد بن ابو الاغر بن مزید) و (دبیس بن

---

(٨٤٦) زۆرێك لە میرو فەرماندەکانی بوەیهییەکان هەلدەهاتن بۆ لای میرنشینی حسنویە، لەبەر سەختی سروشتی نێوچەکەیان، جگە لە پێشوازی و رێزگرتن و پاراستنیان، لەم بارەیەوە بروانە: (ابن الأثیر: الکامل، ٥/٥٧٧-٧٨؛ الحنبلي: شذرات الذهب، ١٤٩/٣؛ الذهبي: تاریخ الأسلام، ٣٨١-٤٠٠).

(٨٤٧) الروذراوری: س-پ، ٣٢٧/٣؛ هلال الصابی: تاریخە، ٤٢٨/٤-٤٤٩، ٤٢٩-٤٥٢؛ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٩٩/١، ٧٣؛ ابن الأثیر: الکامل، ٥٦٨/٥؛ ابن کثیر: البدایة والنهایة، ٣٢٢/١١.

مزید الاسدی)ی برای، (المقلد) لـه سـالّی (٤٢٠ك/ ١٠٢٩ز)دا لـه ڕووبـاری دیجلـه پەڕیەوە، دوای ئەوەی (دبیس) یارمەتی بۆ هات لەلایەن (جلال الدولة) و دوای ئـەوەی (المقلد) زانی کە ئەو نەخشەیەی کێشابووی بۆ مانەوە و شکستی هێناوە، ڕایکـرد بـۆ لای (ابو الشوك) و وەك پەنابـەر مایـەوە تـا بـارودۆخی بـاش بـوو،[٨٤٨] هەنـدێکیش پەنایان بۆ دەبرد دوای ئەوەی شۆڕشیان لەدژدا هەڵدەگیرسـا، وەك (عمیـد الدولـة ابـو سعد بن عبدالرحیم)ی وەزیری (جلال الدولة) لە ساڵی (٤٢٦ك/ ١٠٣٥ز)دا پەنای بۆ برد، دوای ئەوەی سەربازەکانی لە دژی هەستان و لەلای مایەوە تا لە سـاڵی (٤٢٧ك/ ١٠٣٦ز)دا جارێکیتر بانگ کرا بۆ کاری وەزیری.[٨٤٩]

وا دەردەکەوێت پێوەندییەکانی نێوان (ابو الشوك) و بەنوعوقەیل باش نەبووە و لـە ساڵی (٤٢١ك/ ١٠٣٠ز)دا شاری داقوقای ئابلۆقەدا کە بەدەست (مـالك بن بدران بـن المقلد العقیلی)ەوە بوو، کاتێك ماوەی ئابلۆقەکە درێژەی کێشا کەسـێکی نـارد بـۆ لای (مـالك) تا پێی بڵێت ئەم شارە کاتی خۆی هی باوکی بووە و ئێستاش پێویستە بۆ ئـەم بێت و داوای لێکرد کە شارەکەی بداتە دەست بۆ ئەوەی خـوێنی موسـڵمانان نـەڕژێت، بەڵام (مـالك) ئەم داوایەی ڕەتکردەوە، (أبو الشوك)یش ئابلۆقەکەی توندکرد و بـە زۆر داگیری کرد، (مـالك)یش داوای لێکرد ژیانی خۆی و هاوەڵەکانی بپارێزێـت و موڵـك و ماڵەکەشی بپارێزێ، ئەویش تەنها ڕازی بوو بە پاراستنی ژیـانی خـۆی، کاتێـك (ابـو الشوك) پرسیاری هۆی بەدەستەوەنەدانی شارەکەی لێکرد، وەڵامـی دایـەوە بـەوەی کـە ئەگەر ئەو کارەی ئەنجام بدابا عەرەبەکان تانەیان لێدەدا، (ابو الشوك)یش وەڵامەکـەی پەسەند کرد و ڕێزی لە ئازایەتی و خۆڕاگری کرد، لەبەرئەوە لێی بورد و موڵك و مـاڵ و هاوەڵەکانی پاراست و دواتریش بەسەلامەتی لە شـارەکە چـووە دەرەوە، بـەم شـێوەیە

---

(٨٤٨) ابـن الأثـير: الكامـل، ٩/ ٣٩٧؛ ابـن خلـدون: العـبر، ٥٩٤/٤ حـسام الـدين علـي غالـب: الكرد٢١٢.

(٨٤٩) ابن الأثير: الكامل، ٩/ ٤٤٣ : حسام الدين علي غالب: الكرد، ص٢١٢-٢١٣.

(ابو الشوك) داقوقای گیرایەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی باوکیدا بیبوو.[850]

دەوڵەتی مەروانی لە نێودەوڵەت و میرنشینەکانی سەردەمی خۆی بە جێگیری سیاسی و ئاسایشی ناوخۆ و خۆشگوزەرانی نێوبانگی ڕۆیشتبوو، بەتایبەتی لەسەردەمی میر (نصر الدولة) وەك (الفارقی) دەیگێڕێتەوە و دەڵێ "لەهەموو لایەك خەڵکی لێقەوماو و داماو و کەم دەرەتان و پەناهەندەی سیاسی ڕوویان تێدەکرد و بەڕێزەوە پێشوازی لەو هەموو خەڵکە دەکرد و ئەمانەتی پێ دەبەخشین جگە لە ئەسبابی ژیان، هاوکات پیاوە سیاسیە ناودارەکان پەنایان دەبرد بۆ لای دەوڵەتی دۆستەکی وەك (الملك العزیز)ی بوەیهی لە ساڵی (٤٣٥ك/١٠٤٤ز) لە بەغدا و موصل جێگای نەبوو لەلای (نصر الدولة)ی کوردی زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکراو ئەمانەت و حصانەی پێ بەخشرا تاوەکو ساڵی (٤٤١/١٠٤٩ز) کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ شاری بەغدا.[851]

ئەمە و جگە لە هەندێ کەسایەتی سیاسی ناودار وەك (الوزیر أبو القاسم المغربی) و (الوزیر أبن الجهیر الموصلی) کە لەلایەن دەوڵەتی دۆستەکیەوە ئەمانەتیان پێ بەخشرا، هەروەها میرێکی تورکی بەناوی (ابن خان) پاش تورەبوون لە باوکی پەنای بردە لای دەوڵەتی دۆستەکی، هاوکات (الوزیر عمید الدولة ابو سعید- محمد بن الحسین بن الرحیم) وازی لە کاری سیاسی هێنا و ژیانێکی ئاسایی بۆ خۆی هەڵبژارد لە دورگەی (بوتان). و لە نێو پەناهەندە سیاسیەکانی دیکە وەلی عهد (ابو القاسم عبدالله (المقتدی بأمر الله) کە ببووە خەلیفەی عەبباسی لەپاش مردنی باپیری (القائم بأمر الله).[852] بۆیە دەتوانین بڵێین (نصر الدولة) بەم کارانەی نێوبانگی ڕۆیشتبوو لە نێوچەکە لە ئەمانەت و حورمەت و ڕێز لە میوانەکانی بەگشتی و پەناهەندە

(٨٥٠) ابن الأثیر: الکامل، ٩/ ٢٩٧؛ حسام الدین علي غالب: الکرد، ٢١٣.

(٨٥١) الفارقي: تاریخه،١٤٥.

(٨٥٢) ابن الجوزي: المنتظم،١٣٤/٨؛ الفارقي؛ تاریخه،١٥٣ ابن الأثیر: الکامل١٨٩/٩.

سیاسیەکانی بەتایبەتی.

لەڕاستیدا ئەم کارەشیان بۆ دابونەریتی کوردەواری دەگەڕێتەوە، چونکە گەلی کورد هەمیشە ئاشتیخواز و شەڕنەویست بووە، بڕوای بە یەکەوە ژیان و هاوبەشی لەگەڵ یەکتردا هەبووە، بەتایبەتی ژیانی هاوبەشی لەگەڵ دەرو دراوسێ، هەردەم ویستوویەتی کێشەکانی لەڕێی گفتوگۆ و دانوستاندنەوە چارەسەر بکات، ئەگەرچی پێوەندییە دیپلۆماسیەکانی ئەوسا کاتی بوون، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کارە دیبلۆماسییەکانی نوێنەرانی کورد لەپێناوی ئاشتیدا بووە.

## دیوانی نووسینی نامە و ڕۆڵی لە نامەکاری دیبلۆماسیدا

دیـوانی نووسـینی نامــە (الأنـشاء) دەزگایـەکی کـارگێڕیی تایبەتـە بـە نامــە فەرمیەکانی دەوڵەت، لە نێویـشیاندا نامــە دیبلۆماسـییەکانە. دەزگەیـەکی پتـەو و ڕێکوپێك بووە و فەرمانبەرانی ڕاهێنراو کاریان تێدا دەکرد، دەبوایە نامــەکان بـەوردی بپشکنرایە لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی کارەکەیاندا.[853]

بێگومان زۆر بە بایەخ و بەڕێکوپێکی ئیش و کارەکان لەم دیوانەدا دەکرا و تیایـدا نووسراوی فەرمی دەردەچوو، لەوانەش دانراوی هەمەجۆر، کە هەندێك لە لێپرسـراوانی باڵادەست لـە دیـوانی داڕشـتندا دایـان نـابوو، وەك دەسـتوورێکی ورد، ئامانجیـشیان ڕێکخستنی کارەکان و چـاککردنی کـەم و کوڕێکـانی ئـەو نامانـە بـوو، کـە لێـوەی دەردەچوو.[854]

بەناوبانگترین و دەرکەوتووترین ئەم ڕێسایانەش هی ئـەو ماوەیـە بـوو، کـە تیایـدا پێوەندییەکان لە نێوان دەوڵەت و میرنشینە کوردیەکاندا دامــەزرا لەگـەڵ هێزەکـانی دەوروبەردا.

کتێبـــی (التعریـــف بالمـصطلح الـشریف)ی (العمــري) و(صــبح الاعــشی)ی (القلقشندی) بایەخێکی تەواویان لەم بوارەدا هەبوو، کەوا ئەمانە لەو کتێبانەی دیکە جیادەکرانەوە کە بۆ کارکردن لە دیوانی داڕشتندا هەبوون، ئەوەش بەهۆی گـشتگیری و زۆری زانیارییەکانیان و وردبینی و پشکنیـنی ناوەکە لە بارەیانەوە کراوە.

بە شێوەیەکی گشتی ئەم ڕێسا و دەستورانە سوربوون لەسەر ئەوەی هەرچی پێوەندی بە ڕێڕەوی کارەوە هەبێت لە دیوانـدا بکرێـت (ڕۆبنرێـت لـە سـەری)، هەندێکـشیان هەستان بە لێدوانی وردتر و درێژتر کە پێوەندی پێوەی هەبێت، و ڕێکخستنی کارگێڕی

---

(853) البنداري: تاريخ دولة آل سلجوق،97.

(854) حسام الدين علي غالب: اذربيجان، 402.

بۆ ئەم دەزگەیە کە کاریان تێدا دەکرد. هەروەها بنچینەکان و ڕەسمەکان یان ئەو بنەمایانەی، کە پێویست بوون شوێنکەوتەی بووایە لە نووسینگەکاندا، جیاوازیان بەپێی پلەوپایە و بارودۆخی ئەوە، نامەیان ئاڕاستە دەکرد، هەروەها بەپێی ئەو باس و مەبەستانەی کە بەهۆیانەوە نامەکان دەنێردران.

دیوانی نووسینی نامە (الأنشاء) بەیەکێك لە دیوانە گرنگەکانی دەوڵەت دادەنرێت، سەرەتا لە کاتی دامەزراندنیدا بە دیوانی نامەکان دەناسرا، هەر بۆیە بە دیوانی نامەکان ناودەبرا، پاشان ناوی دیوانی داڕشتن زاڵبوو بە سەریدا، و ئەوەی سەرپەرشتی ئەم دەزگایەی دەکرد بە (خاوەنی دیوانی نامەکان) ناودەبرا.[٨٥٥]

لەو دیوانەدا کۆمەڵێك فەرمانبەر و کارمەند کاریان دەکرد، خاوەنی دیوان پیاوێکی شارەزا و پسپۆر و دیپلۆمات بوو، شارەزاییەکی تەواوی لە کاروباری دەرەوەدا هەبوو، زۆرجار دەستی شیعر و ئەدەبی هەبوو، زانایەکی دینی بوو، لە زانین و زمان و داڕشتن و نووسیندا دەستێکی باڵای هەبوو، ئەم وەزارەتە بۆ پێوەندییەکانی دەرەوە زۆر گرنگ بوو، بۆیە لەلای میر (نصر الدولة) ڕێزی تایبەتی هەبوو.

لەهەمان کاتدا ئەم دیوانە جێی بەستنی پەیمان و مۆرکردنی ڕێککەوتنەکان بوو لە نێوان میرنشینە کوردیەکان و وڵاتانی دیکەدا، لە کۆتایی نووسینەکاندا خاوەنی دیوان لەسەر هەردوو دیو مۆری دەکرد و ناوی تەواوی خۆی نیشان دەدا. لەو سەردەمانەدا مۆر دەخرایە ناو گڵێکی خاو و زۆر نەرمەوە، کە پێی دەگوترا "گڵی مۆرکردن" و بۆ مۆرکردن بەکاردەبرا هەر کارێك و ئەرکێکی دەرەوە هەبوایە لەم دیوانەدا ئەنجام دەدرا، هەر نامەیەکیش لە دەرەوە بهاتایە ئەوا دەدرایە ئەم دیوانە و دوایی چی پێویست بوایە جێبەجێی دەکرد، هەروەها کۆکردنەوەی زانیاری و گەیاندنیان بە دیوانی نامە و داڕشتن نوێنەرانی دیبلۆماسی لەکاتی هاتوچۆکردنیاندا بۆ دەرەوەی وڵات ئەنجامیان دەدا، ئەم

---

(٨٥٥) عباس اقبال: وزارت در عهد سلاطین بزرگ سلجوقي، تح- محمد تقي دانش ويحى ذكاء، طهران، ١٣٣٨ه-س/١٩١٩م، ص٢٩.

دیوانە جگە لەو ئەرکانەی باسمانکردن پێشوازی لە سەرۆکانی وڵاتانی دەرەوە دەکرد و جۆری ئەم پێشوازییانەی ڕێك دەخست، فەرمانبەرێکی تایبەت هەبوو بۆ ڕێکخستن و هەڵگرتنی نامەکان و ڕێککەوتنەکان، هەروەها سەبارەت بە بازرگانیکردنی دەرەوە وەك مەڵبەندی کۆنسوڵی وابوو، بەتایبەتی لەکاتی هێنانی کەلوپەلدا لە وڵاتانی بیانییەوە.[٨٥٦]

(هلال الصابي) دەڵێت: "هیچ کەسێك سەرپەرشتی ئەم دیوانەی نەدەکرد ئەگەر خۆی ڕەوانبێژ نەبوایە".[٨٥٧]

خاوەنی ئەم دیوانە پلەوپایەیەکی گەورەی هەبوو لەلای خەلیفەکان، چونکە نهێنییەکانیان بۆ دەدرکاندن و ئاگاداری نهێنیە شاراوەکانیان بوون، لەبەرئەوە پێویست بوو ئەو کەسانەی بەڵێنی سەرۆکایەتی دیوانیان هەبوو، بەهرە و توانای تایبەتیان هەبێت، جیاواز بێت لە خەڵکی دیکە، و دەربڕین و زمانی ڕەوان بێت و خاوەن کەسێتییەکی بەڕێز و شکۆدار بێت لە شاردنەوەی نهێنیەکاندا.[٨٥٨]

نووسەرانی دیوانی نامەکان پلەوپایەی بەرزیان هەبوو لەلای خەلیفەکان و میرەکان، و لە زۆر لە کاروبارەکاندا ڕاوێژیان پێدەکرا و هیچیان لا شاراوە نەبوو هەر کاتێ بیانویستایە لەبەردەستیا ئامادەبوو، ئەمەش کارێك بوو بەکەسی دیکە نەئەگەیشت.[٨٥٩]

---

(٨٥٦) عبدالرقيب يوسف: س. پ، ٢/ ١٢٨/ ١٣٠.

(٨٥٧) تحفة الأمراء في تاريخ الوزراء، ٩.

(٨٥٨) التنوخي: الفرج بعد الشدة، ٢/ ٣٦.

(٨٥٩) الصابي: تحفة الأمراء، ٩.

نووسەرەکانی ئەم بوارە دەبوو شارەزاییەکی تەواویان لە زانستەکانی زماندا هەبێت و، ئەم هونەرە پێوەندی بە هەموو زانستەکانی ترەوە هەبوو،[860] هەروەها نووسەر (الكاتب) لەدەوڵەتی عەبباسیدا بەتایبەتی نووسەری نامە (کاتب الرسائل) لەبەر گرنگی پلەکەی نووسەرەکە دەبوو بەشێوەیەکی گشتی شارەزایی لەهەموو زانستەکاندا هەبێت، بەتایبەتی زانستە ئایینیەکان لە (قورئان و فەرمووودەی پێغەمبەر) و زمانی عەرەبی و وێژە و مێژوو و بیرکاری،[861] و نووسەرە بەتواناکان هەڵدەبژێران بۆ بەڕێوەبردنی ئەم پلەیە، چونکە ئەمانە ڕەنگدانەوەی ئاستی وێژەیی میرنشینەکە بوون، هەروەها بەهۆی ئەو توانا و کارلێککردن و باوەڕپێکردنەوەی هەیان بوو دەنێردران بۆ جێبەجێکردنی کارە نهێنی و ڕامیارییەکانی میرنشینەکە.[862]

زۆرجار نووسەرانی ئەم دیوانە لەگەڵ خەلیفەدا لە ئەنجوومەنی دادوەری دادەنیشتن بۆ تەماشاکردن لە ستەمکارییەکان و مۆرکردنی فەرمانەکان بە مۆری خەلیفە یان میر، پلەوپایەی نووسەری نامەکان، پلەوپایەی پێ دەدرا و زۆرجاریش پلەوپایەی وەزارەتی وەردەگرت[863] ئەگەر یەکێك دەستنیشان بکرایە بۆ پلەوپایەی نووسەری نامەکان، بۆ خانەی خەلیفە بانگ دەکرا و کاڵاو جلوبەرگی تایبەتی لە دوای خوێندنەوەی پەیمانەکەی لەبەردەکرا. جلوبەرگی خەڵاتکراویش بریتی بوو لە قەڵغانێکی دیبقی لەگەڵ مێزەرێکدا، و هەروەها سواری ئەسپیش دەکرا.[864]

---

(٨٦٠) طاش كبرى زادة: مفتاح السعادة ومصباح السيادة في موضوعات العلوم، تحقيق: كامل بكري و عبدالوهاب ابو النور، القاهرة، (د. ت)، ج١، ص٢٢١؛ حاجي خليفة: كشف الظنون عن اسامي الكتب والفنون، دار العلوم، بيروت، ١٩٦٧، ج١، ص١٨١.

(٨٦١) ابن خلدون: المقدمة، ص ص١٢٥، ١٢٦؛ محسن محمد حسين: اربيل في العهد الاتابكي، بغداد، ١٩٧٦، ص٢١٥.

(٨٦٢) ابن خلدون: المقدمة، ص١٢٥.

(٨٦٣) الثعالبي: يتيمة الدهر، ٢/ ٢٤٤ — ٢٤٥؛ حسن ابراهيم حسن: النظم الاسلامية، ١٩٣.

(٨٦٤) الروذراوري: ذيل تجارب الامم، ١٥٣ — ١٥٤.

خاوەنی ئەم دیوانەش دەرگەوانی (الحاجب) هەبوو،[٨٦٥] کە لەلای دەرگاکەوە دەوەستا و نەیدەهێشت کەس بچێتە ژوورەوە بۆ لای، مەگەر دوای ڕەزامەندی خۆی نەبێت، هەروەها کارگوزاری هەبوو[٨٦٦] خزمەتی کارمەندانی دیوانیان دەکرد (باوەڕ بەنووسین و نووسراوەکانی دەکرا و هاوکات جێگەی متمانە بووە، لەهەمان کاتدا زمانحالی دەوڵەتیش بوو کە ترسێنەر بوو بۆ دوژمن، و پێگەی قسەکانی سەرنج ڕاکێشی دڵ بوو بە نەرم و نیانی وتارەکەی، کەس لە کافرەکان (مسوڵمان نەبێت) بۆی نەبوو کە ئەم پلەوپایەیە وەربگرێ.[٨٦٧]

(ابن خلدون) لە بارەی ئەم کارەوە دەڵێ: بوونی ئەم کارە لە دەوڵەتی کۆندا، (ڕەسەندا) لە بیابان نشیندا پێویست نییە، بەڵام جەخت لەسەر پێویستی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ئەکاتەوە، و ڕەوانبێژی لە دەستەواژەی مەبەستداردا.[٨٦٨]

دیوانی نامەکان بەناوی دیوانی داڕشتنەوە ناسراوبوو، هەروەکو باسمان کرد، (الخوارزمي) دەڵێت: "داڕشتن لە وتە بەکارهاتووەکانە لە دیوانی نامەکاندا، واتە کاری کۆپی، نووسەر بەکاری دەهێنێت، دەخرێتە بەردەستی خاوەن دیوان بۆ زیادکردنی، یان بۆ کەمکردنەوەی یان مانەوەی وەك خۆی و فەرمانکردن بەناردنی".[٨٦٩]

لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی عەباسی و دەوڵەتی فاتمیەکان لە میسردا بەم نێوە ناسرابوو، و لەلای سەلجوقیەکان بە دیوانی (الطغراء)* دەناسرا، و لە وڵاتی مەغریبدا

(٨٦٥) الصابي: تحفة الأمراء، ٩.

(٨٦٦) الفارقي: س. پ، ٩.

(٨٦٧) القلقشندي: صبح الاعشى، ١/ ٩٣ – ٩٦.

(٨٦٨) المقدمة، ١٦١ – ١٦٢.

(٨٦٩) مفاتيح العلوم، ٥.

* الطغراء: دیوانێکە، کاری ئەوەیە دانانی نیشانەیەك یان هێمایەك وەکو وێنەیەك لەسەر نووسراوەکان.

بەناوی (پێنووسی باڵا) ناسرا بوو.[870]

ئەم دیوانە لە دیوانە نایابەکان بوو هەر کەسێك بیگرتایەتە دەست لەلای خەلیفە هەنگاوێك ئەچووە پێشەوە، چونکە خۆی نامەکانی بە مۆرکراوی وەردەگرت پاشان پیشانی خەلیفەی دەدا، هەر ئەو فرمانی دەکرد بە نووسەرەکان بە دابەزاندن و وەڵامدانەوەی نامەکان، ئاگاداری نامەی هاتوو و رۆیشتوو بوو، خەلیفەش لە زۆر کاروباردا ڕاوێژی بە سەرۆکی دیوانی داڕشتن دەکرد، و ئاگاداری هەموو شتەکان بوو.[871]

(الکازرونی) دەڵێت: "...فەرمانە بەڕێزەکان، لەدیوان دەردەچوون..... بۆ پاشاکان بە پێشەکیەکی جوان، و جارێکیش بە ترساندنیان لە ئاکامەکان، فەرمانی پاشاکان ترسی لە (دڵیدا) کەم دەکرایەوە، بەرانبەر دەکرایەوە بە نوێنەرایەتی و واژەکردنی ڕێوڕەسمەکانی لە ئێستەدا، دوای پیرۆزبایی لێکردن و ڕاهاتنی لەسەر دووربینییەکانی".[872]

سیستمی کارگێڕی مینشینی مەروانی بێ توانا بوو لەسەر داخوازییەکانی پێش کەوتنی کۆمەڵگە و پەرەپێدانی بەرەو باشتر، بۆیە وەزیری مەغریبی هەوڵی بەرزبوونەوە و داهێنانی دەدا وەك ئەوەی لە هەردوو دەوڵەتی عەباسی و فاتمیدا هەبوون، دەستی کرد بە دامەزراندنی (ناظری دیوان) و دیوانی داڕشتن و نامەکان.[873]

بەڵام ئەرکەکانی خاوەن دیوانی داڕشتن و نامەکان و کاروبارەکان، وەك ئەوەی مێژوونووسان دیاریان کردبوو لە سەدەکانی نێوەڕاستدا پێکهاتبوو لە: "نووسینی نامە فەرمیەکانی پادشا بۆ پادشاو میر و گەورە پیاوانی دەوڵەت، و نووسینی ڕێکەوتن

---

(٨٧٠) المقريزي: الخطط، ٣/ ٧٢.

(٨٧١) المقريزي: الخطط، ٢/ ١١٦؛الجهشياري: الوزراء والكتاب، ٣٤،٤٠.

(٨٧٢) مقامة قواعد بغداد في الدولة العباسية، تحـ: كوركيس عواد وميخائيل عواد، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٦٢، ١٦.

(٨٧٣) الفارقي: تاريخه، ١٣١.

نامەکان و پەیماننامەکان لە نێوان دەوڵەتەکەی و دەوڵەتانی دیکەدا. لە سەردەمی عەباسیەکاندا خاوەنی دیوانی دارشتن لە کۆتایی نامەکەدا ناوی خۆی دەنووسی و بە مۆری سوڵتانیش مۆری دەکرد، کە بریتی بوو لە پوولێکی نەخشەدار، ناوی پاشا، یان سوڵتان یاخود ئاماژەیەکی لەسەر بوو، و لە قوری سووری هەڵدەکێشا کە بە ئاو توابۆوە و پێی دەوترا (مۆری قورین) و لەکاتی پێچانەوە و پێوەلکاندا لەسەر لایەکی نامەکە مۆر دەکرا ".[874]

لەوانەیە خاوەن دیوانی دارشتن هەستابووایە بەکاری باڵیۆزخانە بۆ دەوڵەتە بیانیەکان بۆ ئەرکی فەرمی کە بوو بە سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەت یان میرنشینەکە.

بەم شێوەیە دەبینین خاوەنی ئەم پلەوپایەیە وەك وەزیری دەرەوە بوو. ئەم دیوانە نامەکانی لە دیوانی پۆستە وەردەگرت و خاوەنەکەی نووسەرێکی هەبوو نامەکانی رێك دەخست.[875]

لە میرنشینی مەروانیەدا ئەم پلەوپایەیە گرنگی هەبوو، (الفارقی) ناوی خاوەنی دیوانی دارشتنی نامەکانی پێدابوون لە سەردەمی (نصر الدولة) و وەزیر (أبو القاسم ألاصبهاني)دا، ئەویش (أبو سعيد كبير الكاتب بن بختيشوع الخازن) کە لە ساڵی (٤١١ك/١٠٢٣ز) تازەکردنەوەی مزگەوتی (فارقين)ی گرتە ئەستۆ. بەڵام خاوەنی ئەم پلەوپایەیە لە سەردەمی وەزیر (أبو القاسم المغربي)دا، ئەدیب و شاعیر (أبو نصر احمد بن يوسف المنازي) بوو، لە بارەیەوە (الفارقی) وتوویەتی (وەزیر لە وەزارەتا مایەوە.... و تێروانینی دیوان دەستکەوتێك بوو بۆ (کوری بەرەکە) لە نێوان دەستی وەزیر و نووسەری دارشتن و نامەکانی منازی شێخ (أبو نصر)دا، کە لە خەڵکی منازگرد (مەلاذکرد) بوو، شاعیرێکی چاکەکار و بەخشندە بوو، توانایی تێدا بوو، و زۆرجار دەنێردرا بۆ لای پادشای رۆم لە قوستەنتەنیە.[876]

---

(٨٧٤) ابن خلدون: المقدمة، ٢٤٣.

(٨٧٥) حسن احمد محمود: العالم الاسلامي في العصر العباسي، ١٤٤.

(٨٧٦) تاريخ الفارقي، ١٣١.

ناوی کەسی سێیەمیان بەدەست گەیشتووە کە ئەم پلەوپایەی وەرگرتووە، ئەویش (أبوالفرج الزهرجي)یە کە نووسەرێکی دیار و بەناوبانگ بوو لەنامەی (إبن القارح) بۆ (أبو العلاء المعري) تێ دەگەین کە (أبوالقاسم) نووسەری (نصر الدولة) بوو لە دەوروبەری ساڵی (٤٢٤ك/١٠٣٦ز)دا. بەم شێوەیە دەبینین کە ئەم فەرمانگە گرنگە لە دەوڵەتی کوردیدا هەبووە، و (مەنازی) لە ئەستۆی گرتووە لە سەردەمی وەزیری مەغربییدا، دەوڵەتیش لە کاری دیبلۆماسییدا دەینارد بۆ دەوڵەتی بێزەنتە.

هەروەك مێژوونووسان وتوویانە(مەنازی)ش هەڵدەستا بە سەردانی وڵاتی شام و دواتریش بۆ بەغداد.[٨٧٧] بەلایەنی کەمەوە دووجار سەردانی وڵاتی (شام)ی کردووە پێش سەردەمی میر (نصر الدولة)، هەروەها لە سەردەمی میر (مهد الدولة)شدا سەردانی کردووە، و یەکەمیان لە سەردەمی میر حەسنەوەیدا بووە، و هەروەها وەك دەردەکەوێ لە ئاماژەپێکردنی مێژوونووساندا لە دوو سەردانەکەیدا لەگەڵ (أبو العلاء المعري)کۆبۆتەوە کە سەرسام بووە بە (مەنازی). نێوان هەردوو سەردانەکە ماوەی (١٥) ساڵ بوو، ڕەنگە بەکاری دیبلۆماسیی نێردرابێت بۆ هەردوو دەوڵەتی فاتمی و عەباسی.[٨٧٨]

سەرچاوە مێژووییەکان هیچ زانیارییەك دەربارەی دارێژەران و نووسەران لە سەردەمی (هەزبانیەکان)دا لە (أربل) ناخەنە ڕوو. ئەمەش مانای ئەوە نییە، کە میرەکانیان نووسراویان نەبووە، بەڵام ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دیوانی تایبەتیان نەبووە بە نامە و داڕشتن، بەڵام (الطغرائي) هەیە کە شاعیرێکی بەناوبانگ بووە و لە سەردەمی هەزبانیەکان لە اربل ژیاوە، هەروەها سەبارەت بە هەزبانیەکان لە (ئازەربایجان) ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە چوارچێوەی ڕووداوە مێژووییەکان کە

---

(٨٧٧) ابن خلكان: وفيات الاعيان، ١/ ٤٤؛ العماد الأصبهاني: خريدة القصر وجديدة العصر، ٣٤٨/٢؛ الحموي: معجم البلدان،١٦٧/٧؛ ابن الوردي: ٣٤٩/١؛ ابن كثير: البداية، ٥٤/١٢؛ الحنبلي: شذرات الذهب، ٢٥٩/٣؛ حسن الباشا: الفنون الاسلامية، ٣٦٧/٢.

(٨٧٨) عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية: ٢/ ٨٣ – ٨٤.

هەزبانیەکان ئەم کارەیان زانیوە، ئەوەش بە بەڵگەی ئەوەی کە (دیسم بن إبراهیم)ی کوردی لە ساڵی (٣٣٠ك/٩٤١ز)، (ابو القاسم علی بن جعفر) کردوویەتی بە وەزیری خۆی، دوای ئەوەی لەلای خۆی نووسەر بوو لە ئازەربایجان.[٨٧٩] هەمیشە بۆ گرتنەئەستۆی ئەم دیوانە بەناوبانگترین نووسەری ڕەوانبێژی یان هەڵدەبژارد، بەپێی ئەوەی ئاوێنەیە و ئاستی شارستانیەتی دەوڵەتی تێدا ڕەنگ دەداتەوە ئەبێت بەتوانا بێت لە سەر قایل و ڕازیکردن و کاریگەری هەبێ بەسەر بەرانبەردا. هەروەها گوزارشتە لە بارەی توانای میرنشینەکەوە. (محمود بن أحمد الخجندی) ئەم پلەوپایەی کە کەوتبووە ئەستۆ لە (سنجار) وەری گرت، نووسین و دارشتنیشی بۆ (عماد الدین زەنگی)یش هەبوو، هەروەها زانایەك بوو لە زمان و ڕێزمان (ڕستەسازی) و فیقھ و ئەدەبدا.[٨٨٠]

---

(٨٧٩) مسكويه: تجارب الامم،٢/٣١؛ ابن الاثير: الكامل،٣٨٨/٨؛ابن خلدون، تاريخ،٤/٥٠٠.

(٨٨٠) القفطي: انباه الرواة على ابناء النحاة، ٣/ ٢٦٤.

# پرۆژەی ژنهێنانی سیاسی

ئەم جۆرە پێوەندیە پێوەندیە دیبلۆماسییانە لەپاڵ لایەنی کەسێتی بۆ پێوەندی و نزیکبوونەوە چەند واتایەکی سیاسی هەیە، و ئەم جۆرە شێوازە لە پێوەندی دیبلۆماسی نێوان میری دەوڵەت و میرنشینە کوردیەکان و هێزە سیاسیەکانی نێوچەکەدا وەك (عەبباسی و بوەیهی و سەلجوقی....هتد) بوونی هەبووە. ئەمەش لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا بوو کە جیهانی ئیسلامی بەدەستیەوە دەیناڵاند، چونکە چەند بنەماڵەیەك دەسەڵات و فەرمانڕەواییان لە نێو خۆیاندا دابەش کرد، و هەندێکیان لەسەر حسابی ئەوی دیکە دەسەڵاتیان فراوان دەکرد، هاوکات خەلیفەی عەبباسی هەڵوێستی نەبوو لە ئاست ئەو گۆڕانکارییانەی لە ناوچەکەدا ڕوویاندەدا.

ماناو ناوەڕۆکی ژن و ژنخوازی لە نێوان میر و پادشاکاندا لە چوارچێوەی پێوەندییە دیبلۆماسییەکاندا لەم توێژینەوەی ئێمەدا زۆر لەوە فراوانترە کە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەیە، ئەم ژن و ژنخوازیە یاخود خزمایەتیە تەنها لە پێناو ئامانجی سیاسی یان دەستگرتن بەسەر خیلافەت یا دەسەڵاتی سیاسی لە نێوچەکەدا بووە.

لە دێر زەمانەوە ئەم پرۆسەیە گرنگترین ئامرازی پشتیوانی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان بووە، هەندێ جاریش وەك کارتی فشار بەکارهاتووە بۆ ئاشتبوونەوەی سیاسی، چونکە بەکارهێنانی ئەم شێوازە کۆمەڵایەتیە ئامرازێکە بۆ پێشخستنی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان، لە بەرئەوەی ئەم پێوەندیە خزمایەتیە زۆر بەهێزترە لە پێوەندیە سیاسییەکە، چونکە زۆرجار بەرژەوەندییە تایبەتەکانن کە ڕۆڵی کاریگەر دەگێڕن لەم جۆرە پێوەندیانەدا.

بۆیە دەبینین ئەم ژن و ژنخوازیە (خزمایەتیە) لە نێوان میر و پادشا و خاوەن دەسەڵاتەکاندا تا رادەیەك بەڵگەیە بۆ بەرانبەری و هاوتایی ئەمەو جگە لە ڕێك و کۆکبوونی سیاسی نێوانیان، هەروەها دابینکردنی لایەنگیری و پشتگیری بۆ یەکتر.

ئەو زانیارییانەی کە سەرچاوەکان بۆمانیان پاراستوە دەربارەی پرۆسەی ژن و ژنخوازی لە نێوان میری دەوڵەت و میرنشینە کوردیەکان و هێزە سیاسیەکانی ئەو قۆناغە مێژووییە لە میانەیەوە تیشك دەخەینە سەر پێوەندیە دیبلۆماسییەکانیان، بۆ نموونە لە ساڵی (٣٨٠ك/٩٩٠ز)دا پرۆسەیەکی ژن و ژنخوازی نێوان میرنشینی حەسنەوی و دەسەڵاتی بوەیهی روویدا بە مارەبڕینی کچی میر (بدر بن حسنویە) لە کوڕی میر (فخر الدولة البویهي) ناسراو بە (مجد الدولة ابو طالب رستم)، لە ڕێگەی (ابو عیسی شاذي الکردي)یەوە.[881]

بەمەش پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی هەردوولا جێگیر بوو. ئەمە و جگە لە خزمایەتیە سیاسییە کوردییەکە کە لە ساڵی (٤٠٦ك/١٠١٥ز)دا لە نێوان میر(طاهر بن هلال بن بدر) لەگەڵ (أبو الشوك بن أبو الفتح محمد العنازی)دا روویدا، بەتایبەتی پاش واژۆکردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتیی نێوان هەردوولا، بۆ پاڵپشتی ئەم ڕێکەوتننامە (طاهر بن هلال) خۆشکی (ابو الشوك العنازی) هێنا، ئەمەی دواییان ئامانجی خۆی هەبوو لەم خزمایەتیە بۆ ئەوەی لایەنی (طاهر) بۆ خۆی مسۆگەر بکات.[882]

لەبەر گرنگی پێوەندی و هاوڕێیەتی عقیلیەکان بۆ میرنشینی مەروانی، میر (نصر الدولة)ی کوردی پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی لەگەڵیاندا بە ڕێگەی ژن و ژنخوازی یا

---

(٨٨١) لە هەندێ گێڕانەوەدا، لەکاتی مردنی (فخر الدولة) ساڵی (٣٨٧ك/٩٩٧ن)، تەمەنی کوڕەکە (ابو طالب رستم_مجد الدولة) چوار ساڵ دەبوو (الروذراوري: ٢٩٧/٣؛ابن الأثیر،١٣٢/٩) ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە وا لە ساڵی (٣٨٣ك/٩٣٣ن) لە دایك بووە، پێچەوانەی وتەکەی ابن الأثیر لە جێگای دیکە (٦٩/٩) کەوا (مجد الدولة) لە ساڵی (٣٧٩ك/٩٨٩ن) لە دایك بووە، هەروەها پێچەوانەی (مجمل التواریخ والقصص) لە ساڵی (٣٨٠ك/٩٩٠ن) مارەی کچەکەی (بدر بن حسنویە)ی بڕی، لەسەر ئەم بنەمایە ساڵی (٣٧٩ك/٩٨٩ن) لە دایك بووە، و تەمەنی (٨) ساڵان بووە کاتێك باوکی مردووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (حسام الدین علی غالب: الکرد، پەراوێز (٢) لاپەڕە (١٥٣).

(٨٨٢) ابن الاثیر: الکامل، ٥/ ٦١٢ ؛ حسام الدین علی غالب: الکرد، ص١٨٧.

خزمایەتی سیاسی بەهێز کرد، ئەوەبوو کچێکیان دایە میر (قرواش بن المقلد)، کە لە سالّی (٣٩١-٤٤٢ك/١٠٠٠-١٠٥١ز) دەسەلاّتی گرتە دەست، و هەردوو میر هاوکاریی یەکترییان دەکرد لە کاتی مەترسی و هەڕەشەی ناوخۆ یاخود دەرەوەدا. بۆ نموونە لە سالّی (٤١٧ ك/١٠٢٦ز)دا میر (نصر الدولة) یارمەتییەکی سەربازی پێشکەش بە (قرواشی) زاوای کرد لە دژی (بدرانی) برای کە ململانێی دەسەلاّتی لەگەڵدا دەکرد.[883]

لە سالّی (٤١٠ك/١٠١٩ز)دا میر (نصر الدولة) خاوەنی میرنشینی مەروانی خزمایەتییەکی سیاسی لەگەڵ میرنشینی شەدادیدا درووستکرد بە هێنانی خاتوو (فضلونة) کچی فضلوني یەکەم، ئەمەش بەڵگەیە بۆ بوونی پێوەندی دیبلۆماسی لە نێوان هەردوو میرنشینی کوردیدا.[884]

سەبارەت بە پێوەندی دەرەوە، لە سەردەمی هەردوو میردا (أبو علی بن مروان) و(أبو الفضائل بن سعد الدولة)، پێشکەوتنی گەورەی بە خۆیەوە بینی تا رادەیەك گەیشتە ژن و ژنخوازی، ئەوە بوو (أبو علي) پێوەندی لەگەڵ میرنشینی حمدانی زۆر پتەو و جێگر بوو ئەویش لە ڕێگەی خزمایەتی سیاسییەوە بوو، کاتێك لە کۆتاییەکانی سالّی (٣٨٦ك/٩٩٦ز)دا کۆمەڵێك لە پیاوماقوڵانی خزمی خۆی رەوانەی شاری حەلەب کرد[885] بۆ ئەوەی (ست الناس) کچی میر (سعد الدولة شریف بن سیف الدولة الحمداني) لێ مارە بکەن، میری حمدانی پێشوازی لێکردن و ڕەزامەندی و خۆشحالّی خۆی پیشاندا بۆ ئەم خزمایەتیە، و ئەم خوازبێنیە بە مارەیی (٢٠٠) دوو سەد هەزار درهەم جێبەجێ کرا.[886]

ئەم هەنگاوە ڕەهەندی سیاسی و دیبلۆماسی خۆی هەبوو، و بەڵگەیە بۆ ژیری و

---

(٨٨٣) ابن الاثير: الكامل، ڕووداوەکانی سالّی ٤١٧ك.

(٨٨٤) الفارقي: تاريخه، ١٢١؛محمد امين زكي: تاريخ الدول والامارات الكردية، ٩٣.

(٨٨٥) ابو الفداء: تقويم البلدان، ٢٦٦.

(٨٨٦) الفارقي: تاريخه، ٧٢؛ ابن الاثير: الكامل، ٥/ ٤٨٥.

لێهاتوویی (أبو علی الحسن بن مروان). میر (ابو علی) ئارەزووی وابوو سازدانی ئاهەنگی ژنهێنانەکەی لە شاری ئامەد (دیاربەکر) بکات، بۆ ئەم مەبەستەش میافارقینی بەجێهێشت بە هاوڕێیەتی (شیروە بن مم)و بەڕێکەوتن بۆ شاری ئامەد،[887] بەڵام کاتێك (ابو علي) گەیشتە شاری ئامەد بۆ سازدانی ئاهەنگەکەی و گواستنەوەی پێتەختەکەی، و لە کاتی گەیشتنی کەژاوەی بووك بۆ ئەو نێوچەیەی دەکەوتە نێوان ئامەد و ئورفا (الرها)، میر (ابو علي) تیرۆر کرا و بوکەکەیش گەڕایەوە شاری حەلەب،[888] بەڵام پێوەندیەکان لە سەردەمی (ممهد الدولة)، بەردەوام بوو وەك چۆن لە سەردەمی براکەیدا هەبوو، هەروەها خاتوو (ست الناس)ی هێنا،[889] و لە ساڵی (٣٨٨ك/٩٩٨ز) ڕێورەسمی ژنهێنانەکەی لە شاری میافارقین ئەنجامدا.[890]

میر (ابو علي) لە سەردەمی (باد بن دوستك) ڕێککەوتننامەیەکی تایبەتی لەگەڵ میرنشینە ئەرمەنییەکان بەست و پێوەندیەکانیان لەگەڵیان چاك کرد بە درووستکردنی پرۆسەی خزمایەتی (ژن و ژنخوازی) بە هێنانی کچی (سنحاریب) پاشای (السناسة)، ئەم خزمایەتیە ببووە هۆی بەهێزکردنی پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوان گەلی کورد و ئەرمەنی. بەمەش (أبو علي) لایەنێکی گرنگی لە سیاسەتی دەرەوەی جێبەجێ کرد لەسەر بنەمای جێگیرکردنی هاوڕێیەتی لەگەڵ هەموو دەوڵەت و میرنشینەکانی ڕۆژهەڵات بە تایبەتی لەگەڵ مەسیحیەکان وەك (دەوڵەتی بێزەنتی و میرنشینە ئەرمەنیەکان)،[891] هەروەها ئەوەی لەگەڵ دەوڵەتە

---

(٨٨٧) الفارقي: تاريخه، ٧٤.

(٨٨٨) الفارقي: هـ. س، ٧٦ - ٧٧؛ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (ابن الاثير: الكامل،٥/ ٤٨٥؛ ابن خلدون: العبر، ٤/ ٣١٦).

(٨٨٩) عبد الرقيب يوسف: الدولة الدوستكية، ٢/ ٦٠.

(٨٩٠) الفارقي: تاريخه، ٨٠

(٨٩١) ابن الاثير: الكامل، ٨٢/٦؛ عبدالرقيب يوسف: س-پ،١٢٨/١-١٣٠.

ئیسلامیەکان جێبەجێ کرد وەك پێوەندیە دیبلۆماسییەکان لەگەڵ دەوڵەتی عەبباسی و فاتمی و بنەماڵەی حمدانیەکان لە حەلەب، ئەمەش وایکرد جێگرەکانی هەمان سیاسەتی ئەوان پیادە بکەن و ژیانێکی خۆش و ئاسودە و پڕ لە هێمنی و ئاسایش بەرقەرار بکەن بۆ دانیشتوانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان.

لێرەدا جێگەی ئاماژەپێکردنە کە (نصر الدولة)ی مەروانی چوار ژنی هەبوو،[(٨٩٢)] یەکەمیان (فضلوية) کچی فضلوني یەکەم،[(٨٩٣)] لە بەری ئەم ژنە سێ کوڕی هەبوو بە نێوەکانی (سعيد و شاهنشاه و ابو الحسن)، و دووەمیان کچی (شرف الدولة قرواش بن المقلد العقيلي)، و سێیەمیان کچی سنحاریب پادشای سناسنەی ئەرمەنی، و کوڕێکی لێ بوو بە ناوی میر (أبو دلف)، و دوا ژنیان گۆرانیبێژی میسری خاوەن (الاستاذ فرج) بوو.[(٨٩٤)]

لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە میر (نصر الدولة)، ئامانجی سیاسی خۆی هەبوو لە پشتی پرۆسەی ئەم ژنهێنان و خزمایەتییەوە، بەشێوەیەك کە دڵنیا دەبێت لەو هۆزانەی کە خزمایەتی لەگەڵدا درووست کردوون، ئەمەش لەگەڵ سیاسەتی دیبلۆماسیی ئەودا دەگونجێت بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخی نێوچەکانی دەووبەری، ئەمە جگە لەوەی دەتوانێت لە کاتی پێویستدا داوای هاوکاری و یارمەتیان لێ بکات.[(٨٩٥)]

لە ساڵی (٤٠٤ ك/ ١٠١٣ز)دا (أبو الحسن علي بن مزيد الاسدي) میری بەنی مزيد چوو بۆ لای (ابو الشوك العنازي) بە مەبەستی شەڕکردن،[(٨٩٦)] بەڵام هەردوولا

---

(٨٩٢) الفارقي: تاريخه، ١٢١ – ١٢٢؛ ابن الأثير: الكامل، ٦/ ٢١٥ ؛ الصفدي: الوافي بالوفيات، ٨/ ١٧٧.

(٨٩٣) الفارقي: تاريخه، ١٢١.

(٨٩٤) الفارقي: تاريخه، ١٢١ – ١٢٢؛ ابن شداد: الاعلاق الخطيرة، ٣/ ١/ ٣٥٤ – ٣٥٥.

(٨٩٥) لەم بارەیەوە بڕوانە: ( ابن الاثير: الكامل، ٦/ ٧٧، ٩٤).

(٨٩٦) بۆ زیاتر زانیاری بروانە: (ابن الاثير: الكامل، ٥/ ٦٠٢).

بەبێ شەڕکردن ڕێکەوتن، و ئەم ئاشتیە خزمایەتییەکی سیاسی لێکەوتەوە ئەویش بەهێنانی خوشکی (ابو الشوك)[897] بۆ (ابو الاغـردبيس) (٣٩٤-٤٤٧ك/١٠٠٣-١٠٥٥ز) کوڕی (ابو الحسن علی بن مزيد)،[898] بەرهەمەکانی ئەم خزمایەتیە لەسەر پێوەندیەکانی هەردوولا کاریگەری باشی هەبووە، بۆ نموونە لە ساڵی (٤٠٥ ك/١٠١٤ز)دا سوارەکانی هۆزە کوردییەکان بەتایبەتی هەردوو هۆزی شاژنجان و چاوان چوونە پاڵ مەزیدیەکان و دژی بەنی دبیس جەنگان، و ئەنجامی ئەم شەڕە بە شکستی بەنی دبیس و دەست بەسەراگرتنی سەروەت و سامانیان لەلایەن مزیدیەکان بە سەرۆکایەتی (علی بن مزيد) کۆتایی هات.[899] لە سەردەمی (احمد بن مروان) پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی نێوان دەوڵەتی دۆستەکی و عوقیلیەکان ئاڵۆزی تێ کەوت بەهۆی ئەوەی (احمد بن مروان) دەستی خستە نێو کاروباری عوقیلیەکان و هاوکاری (قرواش العقيلی)ی کرد لە دژی بەدرانی برای، ئەوەش پاش ئەوەی هەردوو برا لە ساڵی (٤١٧ك/١٠٢٦ز) لەسەر دەسەڵات چوون بەگژ یەکدا،[900] بەڵام ململانێکە بە شێوازێکی دیکە گۆڕدرا، ئەوەش بەهۆی ئەوەی هەردوو برا ئاشتبوونەوە و بەدرانیش خۆی بۆ دژایەتیکردنی (احمد بن مروان) ئامادە کرد و پەلاماری نێوچەی (نصيبين)ی دا و لە ساڵی (٤١٩ك/١٠٢٨ز) دووجار بەسەر سوپای (احمد بن مروان)دا سەرکەوت لە بەرامەردا (احمد) بە سێ هەزار سەربازەوە پەلاماری بدرانی دا و بەسەختی تێکشکا،[901] لەلایەکی ترەوە (احمد بن مروان) (هناء بنت قرواش)ی هێنا و پێوەندییان ڕووی لە بەهێزی کرد،[902] بەکورتی پێوەندی ئەم دوو هێزە لەسەر

(٨٩٧) ابن الاثير: الكامل، ٥/ ٦٠٢.

(٨٩٨) الذهبي: تهذيب سير اعلام النبلاء، ٢/ ٤٢.

(٨٩٩) ابن الاثير: الكامل، ٥/ ٦٠٤ – ٦٠٥، ابن الوردي: تاريخه، ١/ ٣١٦.

(٩٠٠) ابن الاثير: الكامل، ٣١٦/٧.

(٩٠١) ابن الاثير: هـ. س، ٣٣١/٧-٣٣٢.

(٩٠٢) الفارقي: تاريخه، ١٢١.

پاراستنی بەرژەوەندییەکانی و ڕێزگرتن لەیەکتر لەلایەك و چاوبڕینە موڵك و سامانی یەکتر لەلایەکی ترەوە وەستا بوو لەم ڕووەوە (قرواش العقیلی) لە ساڵی (٤٢٦ك/١٠٢٣ز) بۆ بەرگرتن لە شاڵاوی ڕۆمەکان داوای هاوکاری لە (احمد بن مروانی) زاوای کرد.[٩٠٣]

لە پێوەندییە دیبلۆماسییەکان و لە چوارچێوەی ژن و ژنخوازی سیاسی لە نێوان میرنشینی عەنازی و دەسەڵاتی بوەیهیدا لە گێڕانەوەکەی (ابن الاثیر)دا وا دەردەکەوێت کە کچی میر (حسام الدولة ابو الشوك الكردي)[٩٠٤] خێزانی کوڕی (جلال الدولة)ی[٩٠٥] بوەیهی بووبێت کە بە (الملك العزيز)[٩٠٦] ناسراو بوو، هاوکات تێبینی ئەوە دەکرێت جێبەجێکردنی پرۆسەی ئەم خزمایەتیە بە مەبەستی ئامانجی سیاسی بووە لەلایەن (ابو الشوك)ەوە، چونکە هەر خۆی بەزۆر (طلاق — جیابوونەوەی) کچەکەی لە (الملك العزيز) وەرگرت،[٩٠٧] پاش ئەوەی بۆی دەرکەوت کە (الملك العزيز) ناتوانێت، دەسەڵاتی سیاسی لە بەغدا وەربگرێت لە ساڵی (٤٣٥ك/١٠٤٣ز)،[٩٠٨] لێرەدا ڕوونتر ئامانجی سیاسی ئەم ژن و ژنخوازیە دەردەکەوێت کاتێك (أبو الشوك) ویستی لەم پرۆسەیە خۆشەویستی بوەیهییەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بەڵام بەهیوا و ئاواتەکانی نەگەیشت پاش ئەوەی (الملك العزيز) کاریگەری باشی هەبووە دەسەڵاتی سیاسی لە دەستدا بەهۆی مردنی (جلال الدولة)ی باوکیەوە.

سەبارەت بە پێوەندیە دیبلۆماسییەکان لە چوارچێوەی ژن و ژنخوازی سیاسی نێوان

---

(٩٠٣) ابن الاثير: الكامل، ٩/٨.

(٩٠٤) ابن الاثير: الكامل، ٦/ ٨٤.

(٩٠٥) ابو الفداء: المختصر، ٢/ ١٦٧؛ ابن كثير: البداية والنهاية، ١٢/ ٥٥.

(٩٠٦) الذهبي: العبر، ٣/ ٢٨١؛ الصفدي: الوافي بالوفيات، ١٣ / ٣١٥.

(٩٠٧) ابن الاثير: الكامل،٦/ ١٢١.

(٩٠٨) ابن الاثير: الكامل، ٨/ ٣٧ ؛ابن خلدون: التاريخ، ٤/ ٥/ ١٠٣٤ ؛حسام الدين علي غالب: الكرد،٢٢٠.

دەوڵەت و میرنشینە کوردیەکان و غەزە سەلجوقیەکاندا و بۆ بەهێزکردنی ئەو جۆرە پێوەندیە هەندێ لەو خزمایەتیە سیاسیە جێبەجێ کرا ئەگەر کەمیش بێت، بەڵام ئەم ژن و ژنخوازییە سیاسیەی نێوانیان هەبووە.

ئەم پێوەندیەی نێوان هەردوولا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هەڵمەتی غەزەکان بۆ سەر هەرێمە کوردیەکان لەکاتی هێرشیان بۆ سەر اذربیجان سالّی (٤٢٠ك/١٠٢٩ز) یەکەم ژن و ژنخوازی سیاسی نێوان میر (وهسوذان الروادي) و کچی یەکێك لە میرەکانی غەزەکان، روویدا،[٩٠٩] ئەم میرە کوردیە ناچار بوو ئەم خزمایەتیە بەئەنجام بگەیەنێت لەپێناو دوورخستنەوەی شەڕ و مەترسیان لە میرنشینەکەیان، هەروەها بەهیوای وەرگرتنی یارمەتی لە دژی هەموو ئەو دوژمنانەی کە دەوروبەری اذربیجانیان لە باکوور و ڕۆژئاوادا گرتبوو لە (رۆم و ئەرمەن و کەرج)، هاوکات بەشێك لە میرەکانی شەدادی دژایەتیان دەکرد، هەرچەندە وهسوذان ناچار بوو بۆ بەستنی ئەم ژن و ژنخوازیە،[٩١٠] بەڵام ئەم خزمایەتیەی نێوان کورد و غەزەکان لە کارە ئاساییەکان بووە، لێرەدا جێگەی ئاماژەپێکردنە کە بەرهەمی ئەم خزمایەتیە ئیجابی بوو بۆ میرنشینی رەوادی، ئەگەر بەکاتیش بێت، چونکە رزگاری بوو لە هێرش و پەلامار و تالآنکردن.

میر (هەزار اسب بن بنكير)ی کوردی کە بەناوبانگترین فەرماندە کوردیەکان بوو لە سوپای سەلجوقیدا، لەلایەن سوڵتان (الب ارسلان) بە پێدانی خوشکەکەی خۆی بەناوی (صفيه خاتون)خەلآت کرا،[٩١١] ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم میرە کوردیە پلەوپایەیەکی مەزنی هەبووە لای سوڵتان و دەسەڵاتی سەلجوقیەکان، هاوکات هەموو تێکستە مێژووییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە میر (هەزار اسب) جێگای رێزو

---

(٩٠٩) ابن الاثير: الكامل، ٨ /٣٨١.

(٩١٠) حسام الدين علي غالب: اذربيجان، ١٥٦-١٥٧؛ نیشتمان بشیر محمد: الكرد والسلاجقة، ١٦٧.

(٩١١) ابن الاثير: الكامل، ١/ ٦١.

ستایش بووه لەلای سولّتان (طغرل بگ و الب ارسلان)، تەنها ئەوە بەسە كە وتـار لـە شارەكانی وەك (ئەهواز و خوزستان و بصره) بەناوی ئەوەوە بووە.[٩١٢]

جێگەی ئاماژەیە بۆكردنە كە پێوەندیە دیبلۆماسییەكانی نێوان میرانـی میرنـشینی عەنازی و سولّتان (طغرل بگ) پڕ بووە لە ململانێ و ناكۆكی.

پێدەچێت نەریتی نزیكبوونەوە لە نێوان بنەماڵەكان لە ڕێگەی ژن و ژنخوازییەوە لـە جیهانی سیاسـەتدا جێبـەجێ كرابێـت، زۆرجـار پێوەندیـە سیاسـیەكان بڕیـاری ئـەو خزمایەتیەی دەدا، ئەمـەش لە نێو لق و پۆی بنەماڵـە كوردییـەكانی ئەیوبیـدا بـەدی دەكرا، یان لە نێـوان خـۆی و بنەماڵـە دەسـەڵاتدارەكان ڕووی دەدا كـە پێویـستی بـە جێگیركردنی پێوەندی سیاسی هـەبوو، لەبەرئـەوەی گرێبەسـتی هاوسـەرێتی بەڵگـەی خۆشەویـستی هاوشـێوەی نێـوان دوو مەملەكەتـە، یـاخود دڵنیـابوون و زامنكردنـی هاوكاری و یارمەتی پادشایەك لە پادشایەكی لە خۆی بـەهێزتر، یـان خۆپاراسـتن لـە تەماعكاریی و چاوچـنۆكی، هـەروەها هـیچ مـەرجێك نـەبووە بـۆ تـەواوكردنی ئـەو خزمایەتیە لە نێوان مـیر و بنەماڵـە دەسـەڵاتدارەكاندا، تـەنها مـەرجی ئیـسلامەتی نەبێت.

---

(٩١٢) ابن الجوزي: المنتظم، ٨/ ١٦٨؛ سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، ١٣٦.

# بەشی چوارەم
# كۆتایی پێوەندیە دیبلۆماسییەكان

## تەوەرەی یەكەم

- پچڕانی پێوەندییە دیبلۆماسییەكان
- هۆكارەكانی پچڕانی پێوەندییە دیبلۆماسییەكان
- شوێنەوارەكانی پچڕانی پێوەندیە دیبلۆماسییەكان

## تەوەری دووەم

- شوێنەوارە ڕاستەوخۆكان لەسەر لایەنە بەشەڕهاتووەكان
- شوێنەوارە ناڕاستەوخۆكان لەسەر وڵاتان و میرنشینە كوردییەكان
- شوێنەوارە لەسەر نێردەكان و ئەندامانی و هاوكارانی

# تەوەرەی یەکەم
# پچڕانی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان

ئەگەر دامەزراندنی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان و ناردنی نێردە دیبلۆماسییەکان پێویست بەڕێکەوتن بکات یان لەسەر بنەمای ڕەزامەندی هەردوولابێت، ئەوا پچڕانی ئەو پێوەندیانە و کۆتاییهاتنی ئەرکی ئەو نێردە دیبلۆماسییانە لە حاڵەتی هەبوونیاندا پێویست بەو جۆرە ڕێکەوتن و ڕەزامەندیە ناکات.[913]

پچڕانی پێوەندی دیبلۆماسیی ڕێوشوێنێکی تاك لایەنە، و تەنها دەربڕینی ئیرادەی یەك لایەنە بێ هیچ ڕێکەوتنێکی پێشوەخت. وێڕای ئەوەی ڕێوشوێنێکی یەك لایەنەیە، کارێکی خۆش نیە،[914] و لە هەمان کاتیشدا شێواز و دیاردەشە، شێوازە چونکە هەندێ جار دەبێتە ئەلتەرناتیڤی جەنگ، بەڵام بەیەکجاری نایسڕێتەوە، دیاردەیە، چونکە بە تێکچوونێکی دیاریکراو دادەنرێت لە سیستمی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا.

بەو شێوەیە پێدەچێ پچڕاندنی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان کارێکی ئیستنابی،[915] بێ لە دەوڵەتێکی ئازاددا کە پەنای بۆ دەبات بێ ئەوەی هۆکار و فاکتەرەکانی ئاشکرا بکات، وێڕای ئەوەی کە هەندێ جار لەگەڵ پرەنسیپ و ئەو ئەحکامانەی کە هەن، تێك ناکەنەوە و گوزارش لە دیاردەی تێکچوونی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکانیش دەکەن.

هەروەها دەشێ بڵێین کارێکی نادرووست و ترسناکیشە کە گوزارش لە سەرهەڵدانی قەیرانێکی توند دەکات لە پێوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا، کە پێویستە پەنای بۆ نەبرێت

---

(٩١٣) علي حسين الشامي: الدبلوماسية، ٣٥٥.

(٩١٤) ابو هيف: س. پ، ٢٣٤.

(٩١٥) كابيه: س. پ، ١٨٠ – ١٨١.

مەگەر لە بارودۆخێکی زۆر نائاساییدا نەبێت.[916]

لەبەرئەوە "دەبێتە هۆی کۆتایی هاتنی پێوەندیە توندو تۆڵەکان...و ئەگەری پەنابردنە بەر شێوازی زۆرە ملێ و کردەوەی توندوتیژ بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکیەی کە بۆتە هۆی وەرگرتنی ئەو ڕێوشوێنە ترسناکە".[917]

بەو مەزەندەیەی کە پچڕانی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان دیاردەیەکی تێکچوونی سیستمی نێودەوڵەتیە، کە واتە برینی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان لە حاڵەتی بوونی گرژیەکی زۆردا لەوانەیە ببێتە هۆی درووستبوونی گرفتێکی گەورە لە بەردەم گەشەکردنێکی ئازاددا لە پێوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا.[918]

ئاشکرایە لە مێژوودا کورد بەوە ناسراون کە خاوەنی نەزعەیەکی سەربەخۆیین و هەموو جۆرە ـملکەچی و ژێردەستەییەك ڕەتدەکەنەوە، ئەمەش بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بەسەر تیرە و خێڵە کوردیەکانی نیشتەجێی ناوچە شاخاویەکاندا جێبەجێ دەبێت، بۆیە دەشێ بوونی ئەو هەموو قەڵا و قوللە و مەتەرێزانەی کە درووستیان کردوون بۆ پاراستنی شار و گوند و شوێنی نیشتەجێبوونیان، لێکدانەوەیەك بێت بۆ ئەو ڕاستیەی سەرەوە، هەروەها سەرهەڵدانی ژمارەیەك لە قەوارەی سیاسی کە خۆیان لە میرنشینە کوردیەکاندا دەبیننەوە لە هەردوو سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچیدا پشتڕاست کردنەوەیەك بێت بۆ ئەو نەزعە سەربەخۆخوازیەی لە هەست و نەستی کورددا هەیە و ژمارەیەك لە شارنشین و گەڕیدە موسڵمانەکان تێبینی ئەو جۆرە دیاردانەیان کردووە و بەچەند ئاماژەیەکی کورت ئاوڕیان لێداوەتەوە، بەڵام بەکەڵك بوون.[919]

---

(٩١٦) کابیە: س. پ، ١٧٩ – ١٨٠.

(٩١٧) ابو هیف: س. پ، ٢٣٢.

(٩١٨)علي حسين الشامي: س. پ، ٣٥٩.

(٩١٩) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (حکیم احمد مام بکر: الکرد وبلادهم، ٢٥٧ وما بعدها).

پێوەندی میرنشینە کوردیەکان لەگەڵ بوەیهییەکاندا پێوەندیەکی دیبلۆماسیی نەبووە بەشێوەیەکی بەردەوام، بەڵکو هەندێ جار دووچاری گرژی بۆتەوە، لە ئەنجامی ناکۆکی نیوان بەرژەوەندیەکانیان و هەوڵی بوەیهییەکان بوو بۆ فراوانکردنی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیان لە سەردەمی هەندێ لە فەرمانڕەوانیان وەك (عضد الدولة)، ئەمەو وێڕای بزوتنەوە سەربازیەکانی میرنشینە کوردیەکان و هەوڵدانیان بۆ دەربازبوون لە بازنەی سیاسەتی بوەیهییەکان. ئەوەی جێی ئاماژە پێکردنە لێرەدا ئەوەیە کە هەڵوێستی بوەیهییەکان لەبەرامبەر ئەو میرنشینانەدا بەپێی سروشتی سەرهەڵدان و گەشەکردنیان و هەڵوێستی میرە کوردەکان لە ئاست دەسەڵاتی بوەیهییەکاندا جیاوازی هەبووە، بۆ نموونە پێوەندی سیاسی بوەیهییەکان شەقڵێکی دیبلۆماسیی لە کاتێکدا سروشتی جەنگی بەخۆوەگرتبوو لەگەڵ میرنشینی مەروانیدا لە سەردەمی دامەزرێنەرەکەی میر (باد)ی کوردی ئەمەش بە تەبیعەتی حاڵ دەگەڕێتەوە بۆ ئاشنایەتی سیاسی نێوان بوەیهییەکان و عەنازیەکان کە لەو ماوەیەدا گەشەی کردبوو، ئەمە لەلایەك، لە لایەکی ترەوە، بۆ جیاوازی بەرژەوەندیەکانیان لەگەڵ میر (باد)ی کوردیدا، لەڕووی هەوڵە بەردەوامەکانی لەلایەن ئەمەی دواییان بۆ دەربازبوون لەسەرجەم ئەو لەمپەر و گیروگرفتانەی کە دەبنە بەربەست لە بەردەم ئازادی جوڵانەوەکانی لە نێوچەی دیاربکر و جزیرەدا.[920] ئەمەو وێڕای ئەو پێوەندیە دیبلۆماسییانەی نێوان هەردوو لایەنی کوردی و بوەیهی.[921] کە زۆری نەخایاند، و هەندێ جار گرژی و ئاڵۆزی دەکەوتە نێوانیان لە ئەنجامی تەماحی میرە کوردەکان لە دەرفەت هێنانیان لە هەلومەرجی سیاسی نێوچەکە، بۆ فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتیان و سەپاندنی باج و سەرانە لەسەر ڕێگەی کاروانی بازرگانیەکان بۆ بوژانەوەی ئابووری میرنشینەکەیان،[922] ئەم مەسەلانە لەگەڵ ویست و ئارەزووی

---

(٩٢٠) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (قادر محمد حسن: الامارات الكردية، ٩٣).

(٩٢١) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: بەشی دووەمی ئەم توێژینەوەیە.

(٩٢٢) مسكويه: تجارب الامم، ٢/ ٢٧٠ ؛ ابن الاثير، ٥/ ٣٦٨.

بوەیهییەکاندا یەکی نەدەگرتەوە، چونکە ئەوان مەبەستیان بەتەنها داگیرکردنی نێوچە شاخاویەکان نەبوو، بەڵکو گەرەکیان بوو دەست بەسەر تەواوی خیلافەتی عەبباسیەکاندا بگرن، ئەمەش بەفیعلی هاتەدی.

بێدەنگبوونی بوەیهییەکان لەو چالاکیە سەربازیانەی کە میر (حسنویە الکردی) لە بارودۆخێکی دیاریکراودا پێی هەڵدەستا دەگەرێتەوە بۆ سەرقاڵبوونیان بە شەر و ململانێکانیان لەگەڵ دوژمنەکانیاندا، بۆیە چاوەروانی دەرفەتێکی لەباریان دەکرد بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ دەسەڵاتی میری کوردی دابنێن، کاتێك ناکۆکی کەوتە نێوان میر (حسنویە الکردی) و حاکمی نەهاوەند (سهلان بن مسافر) [(٩٢٣)] لە ساڵی (٣٥٩ك/ ٩٦٩ز)دا، ئەو هەلە بۆ بوەیهییەکان رەخسا، کاتێك ناکۆکیەکان بەرادەیەك قوڵ بووە تا کار گەیشتە ئەوەی (سهلان بن مسافر) جەنگی لە دژی میر (حسنویە کوردی) راگەیاند، بەڵام لەو شەرەدا (سهلان بن مسافر) بەخۆی و ئەو دەیلەمیانەی لەگەڵیدابوون شکستیان هێنا و پاشەکشەیان کرد بۆ شوێنێك تا خۆیانی تێدا پەنا بدەن، بەڵام (حسنویە الکردی) لە هەر چوار لاوە گەمارۆی دان و ئاگری بەردایە دەوروبەری سەربازگەکەیان، گەرمای ئەو ئاگرە تینی بۆ سوپاکەی هێنا، کاتەکەش وەرزی هاوین بوو، بۆیە ناچاربوون داوای سەلامەتی و ئەمان بکەن، ئەوەبوو (حسنویە الکردی) دڵی پێیان سوتا و ئەمانی پێ بەخشین. [(٩٢٤)]

لەراستیدا یارمەتیدانی (نصر الدولة) لەم سات و کاتەدا تەنها لە ترسی زۆرداری بێ ئامانی سەلجوقیەکان بووە، چونکە پێوەندیەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی دۆستەکی و بیزەنتی باش بوو، بەڵام ئەم کارە ببووە هۆی تێکچوونی ئەو پێوەندیە دیبلۆماسییەی نێوانیان.

سەبارەت بە پێوەندیەکانی نێوان میرنشینی مەروانی و دەوڵەتی فاتمیەکان ئەوا لە

---

(٩٢٣) ابن الفوطي: تلخيص معجم الآداب في معجم الالقاب، ج ٤/ م١/٤٣٤.

(٩٢٤) مسكويه: تجارب الامم، ٢/٢٧١؛ ابن الاثير: الكامل، ٥/ ٣٦٨؛ بۆ زیاتر زانیاری بروانە: (حسام الدين علي غالب:الكرد، ١٣٥-١٣٧).

نێوان هەڵکشان و داکشاندا بوو (المد والجـزر) پێوەندیـەکان ئـاڵۆز و نـاجێگیربوون و بەندبوون بە بەرژەوەندی کاتیەوە، پشتیان بە هیچ ڕێکەوتننامەیەکی عەقاندی یـاخود ئیتنییەوە نەبەستبوو، کەواتە گومان لەوەدانیە کە بڵێین، ناکرێت میر (نصر الدولة) و میرنشینەکەی بخەینە نێو بازنەی بانگەوازی فاتمیەکان، جا پاسـاو و مـشتومڕ و بـاس وخواسی ڕابەرانی فاتمیەکانەوە هەر چیەك بێت، چونکە (نصر الدولة) ناتوانێت ڕێگـە بـدات بـەو ڕێبـازە ئیتنیـە لـە میرنـشینەکەیدا بڵاوبێتـەوە، بـەدەر لـەوەی لەسـەر مینبەرەکانەوە دانیشی پێدانراوە، ئەمەش بەهۆی دابڕانی لەگەڵ ڕیبازی سـوننیدا کـە بوونی لە میرنشینەکەیدا دەگەڕێتـەوە بـۆ مـەرجەعیەتەکـەی لـە بەغـدای پایتـەختی خیلافەتی عەبباسییەوە بەو ئیعتبارەی کە خەلیفە مەرجەعی باڵای ڕێبـازی سـوننیە، سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی ڕەعیەتەکەی کورد و ئـەو موسـڵمانانەی تـریش بـوون کـە لەسەر ڕێبازی سوننە بوون.[(٩٢٥)]

هەروەها خاڵێکی گرنگ هەیە نابێت لەیادی کەین، ئەویش ئەوەیە کە زۆربەی ئـەو میرنشینە عەرەبیانەی کە لە دەورووبەری بیابان پەیدابوون و توانیان دەست بگرن بەسەر هەندێ شاری وەك (موسڵ و حەڵـەب و حیللـە و تـەرابلس) کـە بوونـە شیعە وەك، (حەمدانیـەکان و عوقیلیـەکان و مەزیدیـەکان)، بـە پێـچەوانەی میرنـشینە کوردیەکانەوە، وەك، (حسنویە و عناز و هذبانی و مروانی و شدادی...هتد) کە هەر بە سونیەتی مانەوە، وێڕای هەندێ سـیفاتی هاوبـەش کـە هـەردوولا (کـوردو عـەرەب) پێکەوە کۆدەکاتەوە، وەك کۆچەری و سیستمی خێڵەکی و گەلێکی تریش.

بەرژەوەندیەکان دووریـەکان نزیکدەکاتـەوە نـەك ڕێبـازە ئیتنیـەکان، ئەمـەش بـۆ سروشتی پێگەی جوگرافی میرنشینەکان دەگەڕێتەوە، ئەوەتا دەبینین عەرەبەکان مامەڵە و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ نێوەندە شیعیەکاندا لە (نەجـەف و کەربـەلا) بـەهێزتر بـووە بەهۆی نیشتەجێبوونیان لەو نێوچانەدا، بەڵام کورد بەهۆی دووریان لـەو نێوچـانەوە و،

---

(٩٢٥) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (٣).

ئاوێتەبوونیان لەگەڵ ڕێبازی شیعیدا بەو ڕادەیە نەبووە، ئەمەش وایکردووە کە زیاتر بەڕێبازی سوننیەوە پەیوەست بن. بانگەوازی (بساسیری) ڕۆڵی گەورەی هەبوو لە ناچارکردنی میر (نصر الدولة) لە پشت کردنە عەبباسیەکان و ڕاگەیاندنی پشتیوانی خۆی بۆ فاتمیەکان،[٩٢٦] بەدرێژایی یەك ساڵی تەواو هەموو لایەك پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە خیلافەتی عەبباسی لاوازبووە، تەنها بانگەوازی (بساسیری) بۆ میرەکانی جزیرەی فوراتی کە وتار بۆ فاتمیەکان بدەن و بەگەیشتنی بانگەواز کاری فاتمی شیوازی بۆ (الرحبة)،[٩٢٧] وایکرد کە ئەرازووی هێزەکان لە بەرژەوەندی فاتمیەکان و پشتیوانانیان لە میرنشینە عەرەبیەکان بشکێتەوە، ئەوەبو وایکرد (نصر الدولة) ملکەچی خۆی بۆ خەلیفەی فاتمی (المستنصر بالله)* لە ساڵی (٤٥٠ك/١٠٥٨ز)،[٩٢٨] ڕابگەیێنێت، و پێوەندیەکانی یاخود پشتیوانی خۆی بۆ خیلافەتی عەبباسی بپچڕێنێت، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ملکەچ بوون بۆ خیلافەتی فاتمیەکان بەدەر لە هەڵوێستێکی سیاسی هیچی تر نەبوو کە (بساسیری) بە حوکمی ئەو هێزە توانایەی بەسەر میرنشینەکاندا هەیبوو، لە ناویشیاندا میرنشینی مەروانی، ئەمە گۆڕانێکی مەزهەبی نەبوو بۆ میر (نصر الدولة)یان بۆ ڕەعیەتەکەی، بەڵام بە نەمانی بانگەوازی (بساسیری) کە لەلایەن سوڵتانی سەلجوقی (طغرل بەگەوە)

---

(٩٢٦) ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٥/ ١-٢.

(٩٢٧) ابن عبدالحق: مراصد الاطلاع، ٦٠٨/٣.

* المستنصر بالله: ناوی (المستنصر ابو تميم معد)ە کوڕی خەلیفە (الظاهر الفاطمي)ە، لە ساڵی (٤٢٧ك/١٠٣٥ز) لەتەمەنی (٧) حەوت ساڵیدا بەیعەتی پێدرا، زیاد لە (٦٠) شەست ساڵ حوکمرانی وڵاتی مصر بوو، لەو ماوەیەدا ملکەچی زۆری بۆ ڕاگەیاندرا لە (صقليە واليمن والحجاز والموصل) جگە لە بەغدا کە نزیکەی یەك ساڵ وتار بەناوی ئەوەوە دەخوێندرایەوە. (حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام، ١٦٨/٤).

(٩٢٨) ابن الاثير: الكامل، ١١٩/٦، ٢٠٣ ؛ ابن الوردي: تاريخه، ٣٥٢/١ ؛ الذهبي: العبر، ٢٩٥/٢.

تەفر و توناکرا و گەڕانەوەی هەیبەت و شکۆمەندی بــۆ خیلافــەتی عەبباســی (نــصر الدولة) هەڵسا بەگێڕانەوەی خوتبە بۆ خەلیفەی عەبباسی.

## هۆكارەكانی پچڕانی پێوەندییە دیبلۆماسییەكان

پـچڕانی پێوەندیــە دیبلۆماســییەكان تــەنها كۆتــایی هــاتنی ئــەركی نێــردە و ئەندامەكانی نیە، بەڵكو داخستنی تەواوی نێردە هەمیشەییەكانیشە، بەڵام ئەو پچڕانە بەو مانایە نایەت كە هەنـدێ لـەو دەسـتور و ئەحكامانـەی بەمەبەسـتی ڕێزگـرتن و پاراستنی بەرژەوەنـدی وڵاتــان و رعایاكانیــان داڕێـژراون فـەرامۆش بكـرێن و بخرێنــە پشتگوێ، ئەگەر نا شەڕ و پێكدادان بەرپا دەبێت.[929]

گەلی هۆكار هەن كە دەبنە پچڕانی پێوەندیـە دیبلۆماسـییەكان وەك، ئـەو كـردەوە نادرووستانەی دەوڵـەت یـاخود ئەنـدامانی نێـردە دیبلۆماسـییەكان ئـەنجامی دەدەن، بەتایبەت ئەوانەی كە پێچەوانەی شێوازی دیبلۆماسییە یاخود ئـەو هەڵـسوكەوتانە و ئــەو كردەوانــەی كــە زیــان بــە سیــستمی حەصــانات و امتیــازاتی دیبلۆماســی دەگەیەنێت.[930] جگە لەوە هۆكاری دیكە هەن پێوەندیان بە مەسەلەی تۆڵەسـەندنەوە و منشار و ناڕەزایی و مامەڵەكردن بەهەمان شێوەوە هەیە، یاخود ئەوانەی پێوەنـدیان بە سزای بەكۆمەڵەوە هەیە، دوای ئـەوە كۆمــەڵێك هۆكـاری دیكــە هــەن پێوەنـدیان بەدەستدرێژی كردنە سەر خەڵكەوە یان ڕەعایەكانە و یاخود بەماڵ و داراییــەوە هەیــە، یــاخود پێوەنــدیان بــە پێــشێلكردنی پەیماننامەیەكــەوە یــاخود بــە پرۆتوكــۆلێكی نێودەوڵەتی یاخود پێـشێلكردنی ســەروەری هەرێمێكــەوە هەیــە، ئەمانــە و ســەرەڕای هۆكارەكانی سوكایەتیكردنی ڕاستەوخۆ بە دەوڵــەت و برینــداركردنی هەیبــەتی ئــەو دەوڵەتە، یاخود ئەوانەی پێوەندیان بە جیاوازی ئایـدۆلوژی یـاخود سیاسـیەوە هەیـە، یاخود ئەوانەی پێوەندیان بە بەرژەوەندیە هەستیارەكانی دەوڵەتەوە هەیە.[931]

---

(٩٢٩) علي حسين الشامي: الدبلوماسية، ٣٥٩: سموحي فوق العادة: الدبلوماسية، ١٢٢.

(٩٣٠) كابيه: س. پ، ١٧٨– ١٨٣: ابو هيف: س. پ، ٢٣٢ – ٢٣٦.

(٩٣١) علي حسين الشامي: س. پ، ٣٦٠.

بایەخ و گرنگی پۆلێنکردنی ئەو هۆکار و فاکتەرانە هەر چۆنێك بێت، دەبێ بەشێوەیەکی تایبەت ئاماژە بەو هۆکارە شاراوانەی پشت پچڕانی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان بکەین، کە پێویستە هۆکارەکان روون و ئاشکرابن، و دەوڵەتیش مەبەستی خۆی لەو پچڕانە بخاتە روو.[932] ئەو هۆکارانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد هەرچۆنێك بن دەبێ دیسانەوە ئاماژە بەگرنگترین ئەو هۆکارانە بکەینەوە کە ئەوانەن پێوەندیان بە جەنگەوە هەیە، و ئەوانەش کە پێوەندیان بە گۆڕینی سیستمی دەسەلاتەوە هەیە، بە ڕێگەیەکی نا دەستوری بێت لە ڕێگەی کودەتاوە بێت کە مەسەلەی دانپیانان یاخود دانپیانەنان بەو حکومەتە تازەیەوە دەخاتە ڕوو، ئەو هۆکارانە تەنها کاریگەریان لەسەر یەکخستنی تەواوی چالاکیەکانی نێردە (البعثة)کە و داخستنی نەبێت، بەڵکو ڕەنگە کاریگەری ڕاستەوخوی لەسەر چالاکی هەموو دەوڵەت ببێت، یاخود سەرجەم ئەو پێوەندی و پرۆتوکۆلانەش بگرێتەوە کە لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا بەستراون لە بواری ئابووری و بازرگانی و کونسولگەریدا.

ئەو هۆکارانە دووبارە دەبنە هۆی پچڕانی بە کۆمەڵ بۆ پێوەندیە دیبلۆماسییەکان کە لە چوارچێوەی تەکەتولێکی سیاسیدا دێنە دی لە لایەن کۆمەڵێك لەو دەوڵەتانەی کە بەشێك لەو تەکەتولە یان ئەو هاوپەیمانیە پێکدێنن جا لەسەر ئاستێکی سیاسی یان سەربازی، یاخود نەتەوەییەوە بێت.[933]

لە ئەنجامی سەرهەڵدانی ناکۆکیەکانی نێو بنەماڵەی بوەیهییەکان و بلاوبوونەوەی پشێوی لە نێوان سەربازان و سەرکردەکانیان، هەندێ لە سەرکردەکان و وەزیرەکان و تەنانەت میرەکانیش لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەیاندا بۆ مەترسیەکان و لە دەستدانی پۆست و پایەکانی دەسەلاتیان ناچاربوون پەنا بۆ هەندێ لە میرەکانی کورد بەرن بۆ

---

(٩٣٢) کابیە: س. پ، ١٨٠.

(٩٣٣) کابیە: س – پ، ١٨١؛ علي حسن الشامي: س – پ، ٣٦٢.

ئەوەی خۆیان لە سایە و سێبەری ئەواندا پەنابدەن، ئەوەی کە بۆمان ئاشکرا دەبێت لێرەدا ئەوەیە، هەندێ لە میرە کوردەکان لەو ماوەیەدا گەیشتبوونە رادەیەك لە دەسەلات و هێزی سەربەخۆیی، توانیان ئاسایش و ئارامی لە ولاتی خۆیاندا بەتەواوی مەیسەر بکەن بەجۆرێك ببووە پەناگەیەکی ئارام بۆیان، و لە هەمان کاتیشدا هۆکارێك بوو بۆ لێلکردنی بێگەردی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان، یاخود یەکێك بوو لە هۆکارەکانی پچڕانی ئەو جۆرە پێوەندیانە.

لە سالی (٣٨١ ك / ٩٩١ ز)دا، میر (بهاء الدولة)ی بوەیهی لەگەل سەرکردەکەیدا (أبو نصر خواشاذە) ناکۆکی کەوتە نێوانیان و میر خستیە بەندیخانەوە،[٩٣٤] دوای ماوەیەك (أبو نصر) توانی لە بەندیخانە رابکات و خۆی بگەیێنێتە (بطائح)،[٩٣٥] ویستی پەنا بۆ ولاتی میر (فخر الدولة) بوەیهی لە (ری) بەرێت لە رێگەی میر (بدر بن حسنویە) کە بەدر نامەی بۆ نارد و بەلێنی پێدا هەرچی لە توانایدا بێت بۆی بکات، (أبو نصر) لە چاوەڕوانی گەیشتنی نێردراوی بدر بوو تا بانگهێشتی بکات، بەلام مەرگ رێگەی پێنەدا و بەر لەوەی کارەکەی ئەنجام بدات لە سالی (٣٨٥ ك/ ٩٩٥ ز) کۆچی دوایی کرد.[٩٣٦]

کاتێك کوڕەکانی میر (عز الدولة بختیار)، (أبو نصر) و (أبو القاسم) لە سالی (٣٨٩ ك/ ٩٩٩ ز)[٩٣٧] شکستیان هێنا لە بەرامبەر هێزەکانی میر (بهاءالدولة) لە شیراز، (أبو نصر) رایکرد بۆ ولاتی (الدیلم)، بەلام (أبو القاسم) پەنای بۆ ولاتی میر

(٩٣٤) ابن الاثیر: الکامل، ٧/ ١٥٥.

(٩٣٥) الزمخشري: الجبال والامکنة والمیاه، ٢٦.

(٩٣٦) الروذراوري: ذیل تجارب الامم، ٣/٢٦٥ – ٢٦٦ ؛ حسام الدین علی غالب: الکرد، ص١٥٢-١٥٣.

(٩٣٧) ابن الاثیر: الکامل، ٧/١٩٠ – ١٩٣.

(بدر بن حسنويه) برد، و ماوەیەك لەلای مایەوە و دوایی بەرەو (البطيحة) ڕۆیشت.[٩٣٨]

لە ساڵی (٣٩٣ ك/ ١٠٠٣ ز)دا (أبو العباس الضبي)،[٩٣٩] وەزیری میر (مجد الدولة)ی بوەیهی ڕایکرد بۆ وڵاتی میر (بدر بن حسنويه) دوای ئەوەی داوای پەنابەری لێکرد لە ئەنجامی تێکچوونی پێوەندی (أبو العباس) لەگەڵ دایکی (مجد الدولة) لەسەر مەسەلەی تاوانبارکردنی بەدەرمانخواردکردنی (الأصبهبذ)ی برا گەورەی دایکی (مجد الدولة)، بەرەو وڵاتی بدر ڕۆیشت و بەدریش داوای پەنابەریەکەی پەسەند کرد.[٩٤٠] هەرچەندە لە سەرەتادا دوو دڵ بوو لە پەنادانی و دەیویست هەر لە (الری) بیهێڵێتەوە تا چارەسەری کێشەکەی دەکات لەگەڵ ئەو خاتونە (دایکی مجد الدولة)، چونکە (بدر) گەرەکی بوو ئەو پێوەندیە باشەی لەگەڵ میر (مجد الدولة) و خاتونی دایکیدا هەیەتی بپارێزێت و درێژەی پێبدات، بەڵام هەندێ لە کاربەدەستانی وڵاتی بوەیهییەکان لە ڕەی، نەخشە و پلانی ئەوتۆیان داڕشتبوو کە تێکدان و شێواندنی ئەو پێوەندیەی لێ بکەوێتەوە، یەکێك لەوانە (أبو علي الحسين بن القاسم العارض) بوو کە بە (الخطير) ناسرابوو، ئەو هانی (أبو العباس)یدا بۆ ئەوەی پەنا بۆ بەدر بەرێت تا خۆی جێگەی ئەو بگرێتەوە لە وەزارەتدا، لەڕاستیدا پلانەکەی سەری گرت و ئەوەی بۆ هاتە دی، بەڵام دوای ئەوەی (أبو العباس) لە شاری (بروجرد) جێگیربوو، کە سەر بە هەرێمی دەسەڵاتی میر (بدر بن حسنويه) بوو، هاوڕێکانی لە دەوری کۆبوونەوە، هەموو ئەوانەش بوو بەهۆی ئەوەی کە گرژی بکەوێتە نێو پێوەندیەکانی (بدر و مجد الدولة)، بۆیە دەبینین (الخطير) مانەوەکەی لە وەزارەتدا درێژەی نەکێشا و سەرئەنجام دەستگیر

---

(٩٣٨) الروذراوري: ذيل تجارب الامم، ٣/٣٢٦ – ٣٢٧؛ ابن الاثير: الكامل،٧/١٩٨؛ ابن خلدون التاريخ، ٤/٥/٩٨٨.

(٩٣٩) الثعالبي: تحفة الوزراء، تح: ابتسام مرهون الصفار وحبيب الراوي، بغداد، ١٩٧٧م، ٥٦.

(٩٤٠) الصابي: التاريخ، ٤/٤٤٩ – ٤٥١ ؛ ابن الاثير: الكامل، ٧/ ٢١٨ ؛ ابن كثير: البداية، ١١/ ٣٥٥.

کرا، هەر لەو سەروبەندەدا کەسێکی دیکە بەناوی (أبو سعد محمد بن اسماعیل) هەوڵیدا جێگەکە (الخطیر) لە وەزارەتدا بگرێتەوە، بدر حەزی نەکرد ئەم کارە ڕووبدات، چونکە ناکۆکی و دوژمنایەتی لە نێوانیاندا هەبوو.[941] بدر دەرفەتی بوونی (أبو العباسی) وەك پەنابەر لای خۆی قۆستەوە ویستی لە ڕێگەی بەکارهێنانی سەربازیەوە (أبو العباس) بگەڕێتەوە بۆ وەزارەت، بۆ ئەو مەبەستەش سوپایەکی سێ هەزار کەسی بە سەرۆکایەتی (أبو عیسی شاذي بن محمد) ئامادەکرد، بەڵام بێ سوود بوو، (أبو سعد بن الفضل) لە وەزارەت جێگیربوو، و ماوەی دوو ساڵ لە پۆستەکەیدا مایەوە، لەدوایدا ناکۆکی کەوتە نێوان ئەو و سەربازەکانی و ناچار بوو ڕابکات، ئەویش زانی وڵاتی میر (بدر بن حسنویه) باشترین پەناگەیە، دوای ئەوەی کێشەکانی لەگەڵ میر بدردا یەکلایی کردەوە، میریش ڕێزی لێنا و گەڕاندیەوە بۆ وەزارەت، بەڵام دەرکەوت کە بدر إعترافی پێنەکرد بۆیە (الخطیر أبو علی) کەوتە دژایەتیکردنی و هەڵسا بەهاندانی خاوەن هەرێمەکانی ئەو دەوروبەرە لە دژی میر بدر، بەڵام هەوڵەکانی (الخطیر أبو علی) بێ سوود بوون، لە هۆکارە گرنگەکانی دروستبوونی تێکچوونی ڕەوشی سیاسی لە سەردەمی دەسەڵاتی بدر لە سەرەتای سەدەی (٥ك –١١ز)دا یاخیبوونی (هلال بن بدر) بوو، کە (الخطیر أبو علی) ڕۆڵی کاریگەری هەبوو لەو یاخیبوونەدا.[942] بەم جۆرە دەبینین ئەوی میر بدر پێی هەستا لە ڕووی داڵدەدانی هەڵاتوان لە کۆشکی بوەیهییەکانەوە لە (الری) کاریگەری خراپی هەبوو لەسەر پێوەندی نێوان بدر و بوەیهییەکان، پەنادانی ئەو پەنابەرانەی باسمانکرد بۆ میرنشینەکەی و پیلانگێڕانی هەندێ لە وەزیرە دەسەڵاتدارەکان کاریگەری زۆری هەبوو لە تێکچوونی ئەو پێوەندیانەدا، بەڕادەیەك دەتوانین بڵێین دەسەڵاتی بوەیهییەکان لە (الری) دووچاری پشێویەکی زۆر بوو لە دوای مردنی میر (فخر الدولة)، ئەوەبوو دەسەڵاتی شەرعی

---

(٩٤١) الصابي: التاريخ، ٤/٤٥٣ – ٤٥٤.

(٩٤٢) الصابي، س–پ، ٤٥٥–٤٥٩؛حسام الدين علي غالب: الكرد، ١٥٦–١٥٧.

دابەشبوو لە نێوان میر (مجد الدولة) و دایکی (شیرین خاتون)، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کە لەو بەینەدا وەزیرەکان ببنە خاوەن دەسەڵاتێکی گەورە لە سیاسەتی دەوڵەتدا.

میر (أبو الشوك الكردي) داڵدەی وەزیری بوەیهی (أبو سعيد بن عبد الرحيم)ی دا، [943] دوای ئەوەی وەزارەتەکەی میر (جلال الدولة)ی جێهێشت، لە ئەنجامی دروستکردنی ئاژاوە و پشێوی لەلایەن سەربازانی میر (جلال الدولة) و لاوازی ڕۆڵی میر لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات و دواتر تێکچوونی ڕەوشی وەزارەتەکەی، وەزیر وەك پەنابەر لای میر (أبو الشوك) مایەوە تا کێشەکە چارەسەرکرا و دواتر جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆ وەزارەتەکەی.[944] ئەمەش بەڵگەیەکە بوونی جۆرێك لە گرژی نێوان میر (أبو الشوك) و میر (جلال الدولة) دەسەلمێنێت. دوای مردنی میر (جلال الدولة) میری بوەیهی لە ساڵی (٤٣٥ ك/١٠٤٤ز)دا سەربازی لەشکرەکەی لە دەوری کوڕەکەی (الملك العزيز أبو منصور) کۆبوونەوە و ملکەچی خۆیان بۆ فەرمانەکانی دووپاتکردەوە، بەو مەرجەی پارەو پوڵیان پێببەخشێت لە بەرامبەر ئەو متمانەیە (البيعة)دا، بەڵام (العزيز) داواکەیانی جێبەجێ نەکرد، بۆیە بەرهەڵستکارە نەیارەکە (أبو كاليجار)کە خاوەنی ئەهواز بوو، ئەو دەرفەتەی قۆستەوە و نامەی بۆ سوپا و سەربازەکان نووسی و بە پارە و ماڵ فریوی دان و ملکەچی فەرمانەکانی خۆی کردن، عزیز ناچاربوو ڕابکات و پەنای بۆ هەندێ لە میرەکانی ئەو دەوروبەرە برد، بەڵام لای هیچیان جێگیر نەبوو، لەبەرئەوە بڕیاریدا داوای پەنابەری لە میر (أبو الشوك الكردي) بکات بەڵکو داواکەی قەبوڵ بکات، چونکە پێوەندی زاوایەتی (المصاهرة) لە نێوانیاندا هەبوو.

---

(٩٤٣) الصفدي: الوافي بالوفيات، ٨١٣.

(٩٤٤) ابن الاثير: الكامل، ٩١٨ : ابن خلدون، التاريخ، ٩٣٢/٤/٣: حسام الدين على غالب: الكرد،٢١٢-٢١٣.

بـەڵام مـیر داوای پەنابەریەکـەی قـەبوڵ نـەکرد و ناچاریـشیکرد کـچەکە تـەڵاق بدات.[٩٤٥]

میر (أبو الشوك) ئەو هەڵوێستەی لەپای ئەوەبوو دەیویست پێوەنـدی دیپلۆماسـیی لەگەڵ (أبوکالیجار) ببەستێت، کە دواتر بوو بە میری عێـراق، لەبـەر ئـەوەبوو داوای پەنابەری نەیارەکەی ڕەتکردەوە. دوای ئەوە (الملك العزیز) چوو بۆ لای (إبراهیم ینـال) و هەوڵی بەدەستهێنانەوەی دەسەڵاتەکەی دایـەوە، و چـووە نـاو بەغـداوە بـە مەبەسـتی ئەنجامدانی کودەتایەکی سەربازی، بەڵام هەر زوو پلانەکەی ئاشکرابوو، بۆیـە بڕیاریـدا خۆی بگەێنێتە میر (نصر الدولة) وەك پەنابەر ماوەیەك لەلای مایـەوە تـا لـە سـاڵی (٤٤١ك/١٠٤٩ ز)دا لە شاری میافارقین کۆچی دوایی کرد.[٩٤٦]

دوای ئەوەی میر (أبو علي الحسن بـن مـروان) تـوانی هـەردوو شـاری میافـارقین و ئامەد لە شەڕ و مەترسی حەمدانیەکان بەدوور بگرێت، هەوڵیـدا پێگـەی دەسـەڵاتی خۆی لەو دوو شارەدا قایم بکات بەهۆی پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی ژیرانە، ئەویش خۆی لە قایلکردن و ڕێکەوتندا دەبینیەوە کە لەگـەڵ چـین و تـوێـژە جیاوازەکـانی کۆمەڵـدا ئەنجامی دەدا، بەڵام ئەو سیاسەتەی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا لە میافارقین تا ساڵی (٣٨٤ ك/٩٩٤ز)، ئەم بارودۆخەش وای لێکرد کە لەلای دەرکەوان و یـاوری تایبـەتی خۆی (مەم)[٩٤٧] سکاڵا لە دەست خـەڵکی میافـارقین بکـات دەربـارەی نالـەباریان و خراپی هەڵسوکەوت و مامەڵەیان لەگەڵ خۆیی و دەستوپێوەندەکەیدا، بەم شێوەیە بـۆ (مەم) هاتە گوتار: "توانام بەسەر ئەمانەدا ناشـکێت، و ئەوانـە لـە ژێـر فـەرمان و دەسەڵاتی مندا نین، و هیچ دەرەتانێکم لەگەڵیاندا نیە....".[٩٤٨]

---

(٩٤٥) ابن الاثیر: الكامل، ٣٧/٨؛ابو الفداء: المختصر، ١٦٧/٢؛ ابن خلدون: التاریخ، ١٠٣٣/٥/٤، ١٠٣٥.

(٩٤٦) الصفدي: الوافي بالوفیات، ٣١٥/١٣؛ حسام الدین علي غالب: الكرد، ص٢٢٠.

(٩٤٧) الفارقي: تاریخه، ٦٦.

(٩٤٨) م — س، ٦٦.

(الفارقي) باس لەو هۆكارە دەكات، كە واى لە دانيشتوانى ميافارقين كردووە ڕقيان لە سياسەتى مير (أبو علي بن مروان) بێتەوە، و بەم جۆرە باسى دەكات: "چونكە خەڵكى ميافارقين حەزيان بە فەرمانڕەوايى (بنو حمدان) دەكرد و هيچ دەسەڵاتێكى تريان قەبوڵ نەبوو"،[949] بۆ ئەوەى ئەو مەسەلەيە پشتڕاست كاتەوە ڕووە و ئەوەى كردۆتە بەڵگە، ئەو مەيخورانەى سەرخۆش دەبوون دەست درێژيان دەكردە سەر سەربازان و دەست و پێوەندەكانى مير وەك سوكايەتى پێكردن.[950]

بەردەوام پێوەنديەكان ڕوو لە خراپبوون بوون لە نێوان هەردوولادا، ئەوەى زياتر پێوەنديەكانى بە ئاڕاستەيەكى خراپتردا برد، ئەو ڕووداوە بوو كە دەستدرێژى تێدا كرايە سەر يەكێك لە كوڕە مامەكانى مير (أبو علي) و زۆر پەست و نيگەرانى كرد، لە كاتێكدا ئەو بە سوارى ئەسپەكەى دەچێتە ناو بازاڕێك و وڵاخەكەى تەرس دەكات.... ئەمە واى لە خەڵكى بازاڕەكە كرد، كوڕە مامەكەى مير ناچار بكەن كە خودى خۆى ئەو تەرس پيساييە پاكبكاتەوە و فڕێى بدات،[951] فارقى دەربارەى ئەو ڕووداوە بەم جۆرە ڕاى خۆى دەردەبڕێ: "هەر كاتێك سەربازێك ياخود كوردێك دەستدرێژيەك بكاتە سەريان لە نێوەندى بازاڕدا ئەو كەسە ڕووبەڕووى لێدان دەبێتەوە تا نزيكى مەرگ بێ ئيزنى مير و والى".[952]

ئەو ڕووداوە واى لە مير كرد كە بير لە سەركوتكردنيان بكاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە ڕاوێژى بە (مەم) كرد بۆ ئەوەى پلانێك دابڕێژێت تۆڵەى بەرودوايان لێبكاتەوە، بەڵام وەڵامى (مەم) ئەوەبوو: "تۆ ئەو توانايەت نيە بتوانيت هيچ كردەوەيەك لە دژيان ئەنجام

---

(٩٤٩) تاريخ الفارقي، ٦٦.

(٩٥٠) هـ. س، ٦٦.

(٩٥١) الفارقي: هـ. س، ٦٧.

(٩٥٢) هـ. س، ٦٧.

بدەیت، ئەوەی پێویستە تەنها ئارامگرتنە".[٩٥٣] کاتێك میر سوور بوو لەسەر مەسەلەکە، مەم پلانێکی بۆ دانا.

پلانەکەی (مەم) بریتیبوو لەوەی چاوەڕوانی ڕۆژی جەژن بێت کە جەژن هات و خەڵك دەرچوونە دەرەوەی شورەی شار بۆ نوێژکردن، ئەو کاتە دەرگەی شوراکەیان لەسەر داخات، دوای ئەوە دەتوانێت ئەو کەسەی مەبەستیەتی بکوژێت یاخود دەستگیری بکات.[٩٥٤]

کاتێك جەژن هات میر پلانەکەی جێبەجێ کرد، و خەڵکەکەی فریودا، و واخۆی نیشاندا کە دەیەوێ بچێتە دەرەوەی شار بۆ نوێژکردن وەك نەریتێکی باو لەو سەردەمەدا، یەکەم ڕێوشوێنێك گرتیە بەر، خستنەخوارەوەی شێخی شارەکە بوو لەسەر شوراکەوە کە ناوی (محمد بن أبو الصقر)بوو،[٩٥٥] و کوشتنی کۆمەڵێك لە کەسانی نزیکی شێخ و دەرکردنی کۆمەڵێکی دیکە لە شارەکە، بەم جۆرە توانی کۆنترۆڵی شارەکە بکات و دەسەڵاتی خۆی تێدا بچەسپێنێت بەجۆرێك خەڵکەکەی چاوترسێن کرد لەو شارەدا هیچ کەسێك توانای بەربەرەکانی نەبوو لە ئاست میردا، و ڕەوشی ئارامی و ئاسایش بەرقەرار بوو تا کۆتایی سەردەمەکەی.[٩٥٦]

ئەوەی ئاشکرایە، خەڵکی شاری میافارقین کورد نەبوون، بەڵکو تەنها چینی دەسەڵاتدا کە بریتی بوون لە میر و بنەماڵە و دەست و پێوەندەکانی لە سەربازان کوردبوون. ئەمەش بە ڕوونی لە ئاماژەکەی (الفارقی) لەیەك لە خاڵەکانی ناکۆکی نێوان میر و دەست و پێوەندەکانی لەلایەك و خەڵکی شاری میافارقین لەلایەکی ترەوە دەردەکەوێت:

---

(٩٥٣) هـ. س، ٦٧.

(٩٥٤) الفارقي: تاريخه، ٦٧: ابن الاثير: الكامل، ٥/ ٤٨٥ : ابن خلدون، العبر، ٣١٦/٤.

(٩٥٥) ابن الأثير ئاماژەی بەوە داوە کەوا (کوردەکان جلوبەرگی خەڵکیان بردووە)؛ بڕوانە الكامل، ٤٨٥/٥.

(٩٥٦) الفارقي، تاريخه، ٦٧.

"هەر كاتێك سەربازێك یاخود كوردێك دەستدرێژی بكاتە سەریان لە نێوەندی بـازاڕ ڕووبەڕووی لێدان دەبێتەوە تا نزیكی مەرگ...وە باسمان كرد".[957]

---

(٩٥٧) الفارقي، تاريخه، ٦٧.

## شوێنەوارەکانی پچڕانی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان

ئەگەر پچڕانی پێوەندییە دیبلۆماسییەکان ڕێوشوێنێکی یەك لایەنە بێت و گوزارش لە ئیرادەی ئەو دەوڵەتە بکات کە بڕیاری لەسەر داوە، ئەوا لە هەمان کاتیشدا ڕێوشوێنێکی إستنسابی مەترسیداریشە، چونکە دەبێتە هۆی درووستکردنی بارودۆخێکی نوێ، کە شوێنەوار و کاریگەری نەك تەنها لەسەر ڕاگرتنی چالاکی یەکجارەکی نێردە دیبلۆماسییەکە و داخستنی یەکجارەکی سەبارەت بەو دەوڵەتەی ئەو بڕیارەی وەرگرتووە دەبێت، بەڵکو کاریگەری لەسەر ڕاگرتن و کۆتایی هاتنی چالاکی نێردە دیبلۆماسییەکەی ئەو دەوڵەتەش دەبێت کە ئەو بڕیارەی پێگەیشتووە، یاخود بە واتایەکی دیکە ئەو ڕێوشوێنە بە تەنها کاریگەری لەسەر نێردەکە و ئەندامەکانی هەردوو دەوڵەتەکە نابێ و بەس بەڵکو کاریگەری سلبی لەسەر چالاکی هەردوو دەوڵەتی پێوەندیدار دەبێت بەشێوەیەکی گشتی. ئەمەش لە میانەی ئەو شوێنەوارانەوە دەردەکەوێت کە لە بڕیاری ئەو پچڕانەوە سەرهەڵ دەدەن، جا چ لەسەر ئاستی نێردە و ئەندامەکانی (البعثة وأعضائها) یاخود لەسەر ئاستی هاوڵاتیانی (الرعایا) و پێوەندیەکانی تری نێوان هەردوو دەوڵەتەکە بێت.

بەڵام سەبارەت بە چارەنووسی نێردەکە و ئەندامەکانی، کاتێك پێوەندیەکانی دەپچڕێت سەرجەم چالاکیەکانی نێردەکە دەوەستێت و دادەخرێت، و ئەندامەکانیشی هەرێمەکە جێدێڵن. لەم حاڵەتەدا، هۆکارەکانی ئەو پچڕانە هەرچییەك بێت، سیستمی حەصانات و إمتیازاتە دیبلۆماسییەکان هەرگیز ناوەستێت یاخود کۆتایی پێنایەت، وێڕای وەستانی ئەرکە دیبلۆماسییەکان و داخستنی نێردەکە.

سەبارەت بە شوێنەوارەکانی پچڕانی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان لەسەر پێوەندیە نێودەوڵەتیەکانی دیکە، لێرەدا جیاوازی نێوان پچڕان و حاڵەتی جەنگ و حاڵەتی هەڵپەساردن و حاڵەتی گۆڕانی ڕژێمی دەسەڵاتدار بەدەردەکەوێت، لە حاڵەتی جەنگدا

بەتەنها پێوەندیە دیبلۆماسییەکان ناپچڕێن و بەس، بەڵکو کاریگەری لەسەر تەواوی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکانیش دەبێت، هەموو پێوەندیە ئابووریە بازرگانیەکان و هاتووچۆ و (المواصلات) گەیاندنەکان (الأتصالات) و پێوەندیە کونسولیەکان پەکیان دەکەوێت و ڕادەوەستن، و پرۆتۆکۆلە دووقۆڵیەکان ڕۆڵ و کاریگەری نامێنێت، بەڵام لە حاڵەتەکانی تردا، بەتایبەت پچڕانی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان، کاریگەری لەسەر ئەو پێوەندیە نێودەوڵەتیانەی دیکە نابێت، مەگەر هۆکاری پچڕانی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان جەنگ بێت.[958]

ئەو سیاسەتە ژیرانەیەی کە میر حسنویە لە ژیانیدا پەیڕەوی کرد میرنشینەکەی بەدوورگرت لە زۆرێك لەو ململانێ و ناکۆکیانەی کە ئاسایی لە نێوان کوڕان و خزمەکاندا ڕوو دەدەن، بەڵام بە مردنی و بەجێنەهێشتنی وەسیەتنامەیەك لەدوای خۆی سەبارەت بە دەستنیشانکردنی یەکێك لە کوڕەکانی لەدوای خۆی بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایی میرنشینەکەی بگرێتە ئەستۆ بوو بەهۆی ئەوەی کە ناکۆکی شەخسی لە نێوان کوڕەکانیدا سەرهەڵدا،[959] لە لایەکی ترەوە (عضد الدولة) ئەو دەرفەتەی لەدەست خۆی نەدا، کە لە دوای مردنی حسنویە بۆی ڕەخسا تا جارێکی دیکە بێتەوە جوڵە بەمەبەستی نەهێشتنی میرنشینی حسنویە کە زۆرجار ئەوانیش دەرفەتیان لە ناکۆکیە شەخسیەکانی نێوان کوڕانی خێزانی بوەیهییەکان دەهێنا بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆیان و چەسپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر بەشی هەرە زۆری هەرێمی چیاکاندا کە خاوەن سامانێکی زۆر گەورەبوو، لە خۆشیاندا (عضد الدولة)، دەمی ئاوی دەکرد بۆی،[960] تا هەلێکی بۆ بڕەخسێت و بیخاتە سەر سنووری قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی. ئەوەی زیاتر هەلۆیستی کوڕەکانی حسنویەی لاوازکرد، ئەو ناکۆکی و دووبەرەکییە بوو کە کەوتە نێوان هاوپەیمانەکانیشیان، لەبەرئەوە (عضد الدولة) دەستیکرد بە جموجۆڵ

---

(958) کابیە: س. پ، 180: علي حسين الشامي: س. پ، 365– 367.

(959) مسكويه: تجارب الامم، 2/415.

(960) مسكويه: تجارب الامم، 2/415 – 416.

و جێبەجێکردنی هەلی لەناوبردنی میرنشینی حسنویە، هەر بۆ ئەو مەبەستە خەزنەدارەکەی خۆی (أبو نصر خورشید یزدیار)ی نارد بۆ لای هەر یەکێك لە (فخر الدولة) و (مؤید الدولة) و (قابوس بن وشمکیر)[961] و نامەی تایبەتی بۆ ناردن بەئومێدی ئەوەی ناکۆکیەکانیان چارەسەر بکەن و کێشە و گرفتەکانیان وەلا بنێن، تا هەموو هێز و تواناکان یەکبخرێن بۆ بەرەنگاربوونەوەی کوڕەکانی (حسنویە) و دەست بگرن بەسەر تەواوی ولاتەکەیاندا، بەتایبەتی ئەو ناکۆکی و دووبەرەکییەی لە نێوانیاندا سەری هەڵدا، بوو بەهۆی ئەوەی هەندێکیان خۆیان بدەنە پاڵ (عضد الدولة)، لە نێویاندا (بەختیار بن حسنویە) بوو کە دەستی بەسەر (قەڵای سرماج)دا گرت، کە هەرچی پارە و سەروەت و سامانی باوکی هەبوو لەناو ئەو قەڵایەدا بوو، چونکە قەڵاکە هی باوکی بوو، بەختیار پێوەندی بە (عضد الدولة)وە کرد و ملکەچی خۆی بۆ ئاشکرا کرد، لە دوایدا ڕایەکەی گۆڕی، لە کاتێکدا هەندێ لە براکانی: (عبد الرزاق) و(أبو العلاء)، و (أبو عدنان)، چونە پاڵ (فخر الدولة)، و خۆیان گەیاندە لای لە هەمەدان، ئەویش گرتنیە خۆی و ڕێزی لێگرتن و هیچ گوێی بە بانگەوازی (عضد الدولة)ی برای نەدا سەبارەت بە یەکخستنی هێزەکانیان بۆ نەهێشتنی میرنشینە کوردیەکە.

لەبەرئەوە هەر بەزوویی (عضد الدولة) سوپایەکی گەورەی تەییارکرد کە کۆمەڵێك لە سەرکردەی مەیدانی هاوکاری بوون و بەرەو هەرێمی چیاکان پێشڕەویان کرد.[962]

هەر کە سوپاکە لە هەمەدان نزیکبۆوە، سەرکردەکانی (فخر الدولة) و وەزیرەکەی و پیاوانی حسنویە، داوای پەنادانیان لە (عضد الدولة) کرد، بەمەش (فخر الدولة) لاوازبوو و کەسی وای بەدەورەوە نەما، هەمەدانی بەجێ هێشت و بێ بەرگری سوپای (عضد الدولة) هاتە ناوی و بەرەو ولاتی (دەیلەم) هەلات، دوایش بەرەو (گرگان)

(٩٦١) ابن الاثیر: الکامل، ٥/٤٤٥-٤٤٦ ؛ ابن کثیر: البدایة والنهایة، ١/٣٥٠.

(٩٦٢) الروذراوري: ذیل تجارب الامم، ٣/١٠ ؛حسام الدین علی غالب:الکرد،١٤١-١٤٢.

پەنای برد بۆ (قابوس بن وشمكير) برد، (عضد الدولة)ش دەستی گرت بەسەر هەموو ئەو ناوچانەی لەژێر دەستی (فخر الدولة)دا بوون لە هەمەدان و ڕەی و ئەو ناوچانەی نێوانیشیان و سپاردی بە براكەی (مؤيد الدولة). كە ئاشت بووە لە گەڵی و كردی بە جێنشین و جێگری خۆی لەو وڵاتانەدا.[٩٦٣]

ئینجا (عضد الدولة) بەرەو وڵاتی حسنويه بەرێكەوت، و توانی نەهاوەند و دینەوەر داگیر بكات، و لەشكرێكیشی بەسەركردایەتی (أبو الوفا طاهر بن محمد)ی لە مانگی (ذي الحجة)ی ساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز)دا نارد بۆ داگیركردنی قەڵای سرماج، دوای گەمارۆدانی قەڵاكە توانیان داگیری بكەن و بەختیاری كوڕی حەسنویەش دەستگیر بكەن، هەرچی ماڵ و زەخیرەیەكی ناو قەڵاكەش هەبوو بەتاڵان بردیان و دەستیانگرت بەسەر چەندین قەڵای تردا كە تابعی كوڕەكانی حەسنویە بوون و ماڵ و دەستكەوتێكی زۆریان وەك غەنیمە دەستگیربوو.[٩٦٤]

بەڵام كوڕەكانی تری حسنويه (عبدالرزاق و أبو علاء و أبو عدنان و بختيار) پێوەندیان بە یەكێك لە سەركردەكانی (عضد الدولة) (أبو نصر خوشاذة)وە[٩٦٥] كرد لە كاتی ڕەتبوونی سوپای بوەیهی بەهەرێمی نێوان حولوان و قرمیسین (كرمانشاه)دا، یاخیبوونی خۆیان لە (عضد الدولة) ڕاگەیاند، بۆیە هەموویانی لە چەند چادرێكی سەربازگەی (خرطاه) داناو لەگەڵ هەندێ لە كەسانی نزیك بەوان لە نووسەران و پیاوماقوڵانی كورد خستینە ژێر چاودێرییەكی وردەوە لە ترسی ئەوەی نەكو ڕابكەن.

لە هەمان كاتیشدا بانگهێشتی براكانی تری كرد كە مابوون: (بدر و عاصم و عبد

---

(٩٦٣) الروذراوري: ذيل تجارب الامم، ١٠/٣.

(٩٦٤) الروذراوري هـ-س، ١٠/٣ ؛ الذهبي: العبر، ٥١٣/٤؛حسام الدين علي غالب:الكرد،١٤١-١٤٢.

(٩٦٥) ابن الاثير: الكامل، ٥١١/٥.

الملك)، لەناویاندا یەکێکیان هەڵبژارد کە (بدر) بوو، ڕێزی لێناو کردی بە سەرکردەی کوردە بەرزیکانەکان (الكرد البرزيكانيين)، و شمشێر و پشتێنی زێڕی کرد بەبەردا، و بە سواری ئەسپێکی زین زێڕین (السرج الذهبي) خەڵاتی کرد، سەرەڕای ئەمانەش نازناوی دەرگەوانی (الحاجب)،[٩٦٦] پێبەخشی، بەڵام زرێپۆش (الدراعه)یدا[٩٦٧] هەر یەکێك لە (عاصم و عبدالملك) وەك خەڵات، سەرباری بەرگی دیباجە و شمشێری شان و سواری دوو ئەسپی زین زێڕینی کردن. لە کاتێکدا سەرجەم دەستگیراوەکان لە کوڕانی حەسنەویە و دەستوپێوەندە کوردەکانی تری کوشت و ماڵ و سەروەت و سامانەکانیشیانی بەتاڵان برد. (الروذراوري) بەم دەربڕینە ئاماژە بەو ڕووداوە دەکات: "... سەرجەم ئەوانەی دەستگیرکرابوون لە کوردەکان شمشێری خستە سەر گەردنیان و خشڵ و زێڕەکانیشی بەتاڵان برد".[٩٦٨] و لە شوێنێکی تردا دەڵێت: "سەرجەم کوڕەکانی حەسنەویەی کوشت".[٩٦٩]

ئەو خەڵاتکردنە تایبەتیەی (بەدر) کە لەلایەن (عضد الدولة)وە ئاراستەی کرا لە سەرکردایەتیکردنی کوردە بەرزیکانیەکان و دەست و پێوەندەکانی بێ دوو براکەی (عاصم و عبدالملك) ئیرەیی و ڕقیانی وروژاند، ئەوەبوو کاری کردە سەر یەکێکیان کە (عاصم) بوو، ئەویش یاخیبوونی خۆی و هەندێ لەو کوردانەی کە بەو ڕەوشە نوێیەی ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی بوەیهییەکان ڕازی نەبوون ئاشکراکرد، ئەمەش وای لە (عضد الدولة) کرد کە لەشکرێکی گەورە بەسەرکردایەتی (أبو الفضل المظفر بن

(٩٦٦) صبحي الصالح: النظم الاسلامية نشأتها وتطورها، ٣٠٦ – ٣٠٧.

(٩٦٧) الخطيب: معجم المصطلحات والالقاب التاريخية، ١٧٧.

(٩٦٨) ذيل تجارب، ٩/٣ ؛ ابن الاثير: الكامل، ٤٣٩/٥.

(٩٦٩) الروذراوري: ذيل، ١٢/٣.

محمد) ناردە سەریان و توانی ئەو هێزە کوردیە بەرهەڵستکارە تەفروتوناکات و (عاصم)یش بەدیل بگرێت کە سواری حوشترێکی کرد و جلی سوری پێ لەبەرکرد، ئیتر لەوکاتەوە لەچاو بزر بوو، واتە ئەویش و هەموو براکانی تری کوژران جگە لە بدر.[970]

(٩٧٠) الروذراوري: ذيل، ١٢/٣؛ ابن الاثير: الكامل، ٤٤٢/٥؛حسام الدين على غالب:الكرد،١٤٤-١٤٥.

## تەوەری دووەم

## شوێنەوارە ڕاستەوخۆکانی لەسەر لایەنە بەشەڕهاتووەکان

جەنگ، ڕێبازیکە لەو ڕێبازانەی بۆ یەکلاییکردنەوەی ناکۆکیەکانی نێوان دەوڵەتان کە لە ڕێگەی هێزەوە، دەگیرێتە بەر. جەنگ شێوازێکی توندوتیژە، قەڵەم دەگۆڕێتەوە بە شمشێر.[971]

جەنگ کردەوەیەکی سەربازیە لە نێوان دوو لایەنی ناکۆك "هەر لایەنێك هەرچیەکی هەیە لە ئەسباب و هۆکارەکانی وێرانکردن و کاولکردن بەکاری دێنێت، بۆ داکۆکیکردن لە بەرژەوەندیەکانی و مافەکانی خۆی یاخود لە پێناو سەپاندنی ئیرادەی خۆی بەسەر لایەنی بەرامبەردا، جەنگ تەنها لە نێوان دەوڵەتاندا دروست دەبێت"،[972] لە دوایدا "جەنگ گۆڕان لە پێوەندیە نێودەوڵەتیەکان بەدوای خۆیدا دێنێت".[973]

بێگومان جەنگ کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر پێوەندیە دیبلۆماسییەکان هەروەك پێشتر بینیمان. جەنگ بەهۆی دروستبوونی گرژی و ئاڵۆزیەك یاخود بەهۆی نیگەرانی لایەنێکیان لە سیاسەتی لایەنەکەی تریان یاخود بەهۆی بوونی ناتەبایی لە بەرژەوەندیەکاندا تارادەی کەڵەکەبوون و پەنگخواردنەوە سەرهەڵدەدات. لێرەدا کۆمەڵێك ڕێوشوێن هەیە دەشێ پەنای بۆ ببرێت بەر لەوەی بریار لە هەڵایسانی جەنگ بدرێت و ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداری جێگەیان بگرێتەوە، ئەویش هەموو دەوڵەتێك

---

(٩٧١) علي حسين الشامي: الدبلوماسية، ٣٦٩.

(٩٧٢) مجذوب: القانون الدولي، ٢٧٣.

(٩٧٣) هـ. س، ١٧٧.

دەتوانێت لە ڕێگـەی نێـردە دیبلۆماسـییەکانەوە نیگەرانیـەکانی خـۆی بـە دەوڵـەتی بەرامبـەر ڕابگـەیێنێت وەك ئـەوەی، بەرپرسـی نێـردە دیبلۆماسـییەکە بەکەسـێکی ناشایستە لە قەڵەم بدات، و داوا لە دەوڵەتەکـەی بکـات کـە بانگهێـشتی بکاتـەوە، یاخود پەنا بەرێت بـۆ دانـانی سـنورێك بـۆ هاتووچـۆ و جموجۆڵـەکانی لـە نـاوخۆی هەرێمەکەدا، یاخود قەبارەی نێردە دیبلۆماسییەکە بچوك بکاتەوە بۆ ئاستێکی نـزمتر. دەوڵەتی بەرامبەریش واتە دەوڵەتی متمانەپێکراویش دەتوانێت بەرپەرچی بداتـەوە بـە تۆڵەکردنەوە و پەنا بۆ هەمان شێوازی مامەڵە بەرێت. ئەو ڕێوشـوێنانەی کـە دەکـرێ پەنایان بۆ ببرێت لەو جۆرە حاڵەتانە لە گرژی و لە جـۆرە حاڵەتـەکانی تریـشەوە وەك، داگیرکردن یاخود دەست بەسەراگرتن یاخود گۆڕینی ڕژێمی دەسـەڵاتدار. دەبێتـە هـۆی لاوازکردنی یاخود هەڵپەساردنی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان بەر لە پچڕانی.[974]

بەڵام لە حاڵەتێکدا گـەر قەیرانەکـە بـەجۆرێك تەشـەنە بکـات و بگاتـە ئاسـتی گرژیەکی زۆر، ئەوسا دەکرێ پەنا ببرێتە بەر بڕینی پێوەندیە دیبلۆماسییەکان، یـاخود پەنا ببرێتە بەر جەنگ کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پچڕانی پێوەندیە دیبلۆماسییەکانی لێدەکەوێتەوە، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوەیە کە دەشێ هەندێ جار ناکۆکی لـە نێـوان فەقیهەکان یاخود لە نێوان پرەنسیپی گشتی و پەیڕەوکردن سەرهەڵدەدات.[975]

جـەنگ بەشـێوەیەکی تیلقـائی پێوەندیـە دیبلۆماسـییەکانی نێـوان دەوڵـەتان دەپچڕێنێت، چونکە لەگـەڵ دەسـتدرێژیەکانی نێوانیـان یـەك ناگرێتـەوە.. و ئـەو دوو هۆکارە بۆ نەمانە — واتە پچڕانی پێوەندیە دیبلۆماسـییەکان و جـەنگ کـە ئـەنجامی دیارنەمانی یەکێك لە ڕێسا یاساییەکانە بۆ درووستکردنی پێوەندی دیبلۆماسیی.. کە ئەمەش پەیوەستە بە ئیرادەی هاوبەشـی هـەردوو دەوڵەتەکـە بـۆ دامەزرانـدنی نێـردە

---

(٩٧٤) علي حسين الشامي: س. پ، ٢٧٠.

(٩٧٥) عز الدين فوده: س – پ، ١٢٧.

دیبلۆماسییەکان، ئەمەش ئیرادەیەکە بە ڕێکەوتن تەرجەمە دەکرێت واتە دێتە سەر ئەرزی واقیع.[976]

ئەو جەنگ و شەڕ و شۆڕە سەربازیانەی لە نێوان هەندێ لە میرنشینە کوردیەکان و بوەیهییەکاندا بەرپادەبوون، هۆکارەکەی بۆ نەزعەی فراوانخوازی هەندێ لە میرەکانی هەردوولا دەگەڕێتەوە، هەندێ جار شێوەی هەڵمەتەکانی تەمێکردنی بەخۆوە دەبینی بۆ لاوازکردنی لایەنی بەرامبەر یاخود بۆ بەفیڕۆدانی هێز و توانای سەربازی هەمان لایەن لە هەندێ جاری تردا.

دوای ئەوەی میر (عضد الدولة) لە ساڵی (٣٦٧ ك/ ٩٧٧ز ) دەستی بەسەر خیلافەتی عەبباسیدا گرت هێز و دەسەڵاتی زیادی کرد، و توانی دوای ساڵێك دەست بەسەر تەواوی ناوچەکانی دیاربکر و جزیرەدا بگرێت و حەمدانیەکانی لێ دەربکات،[977] بەم شێوەیە دەبینین (عضد الدولة)، لە نێو سەرجەم میرەکانی بوەیهی لەو ماوەیەدا دەرکەوت، ویستی لەگەڵ بەرهەڵستکارانیدا کێشەکانی یەکلا بکاتەوە و ڕووبەری قەڵەمڕەوی مەملەکەتەکەی فراوانتر بکات،[978] ئینجا میر (عضد الدولة) بەرەو ناوچە شاخاویەکان پێشڕەوی کرد لە ساڵی (٣٦٩ك/ ٩٧٩ز)دا لە قۆناغی یەکەمدا سوپایەکی نارده سەر (بنو شەیبان) لە ناوچەی شارەزوور، کە پێگە و دەسەڵاتێکی باشیان لە ناوچەکەدا بەدەست هێنابوو، و لە نێوان بەنوشیبان و کوردەکانی شارەزووردا تێکەڵاوی و ژن و ژنخوازی هەبوو، مەبەستی (عضد الدولة) لەو هێرشەیدا بۆ سەر بەنوشیبان، ئەوەبوو کە لە شارەزوور دایانبڕێ بۆ ئەوەی نەتوانن

---

(٩٧٦) کابیە: س – پ، ١٨٠.

(٩٧٧) مسکویه: تجارب، ٣٨٨/٢ – ٣٩١ ؛ ابن الاثیر: الکامل، ٩٢/٧ – ٩٥ ؛ ابو الفداء: المختصر، ١١٩/٢ – ١٢٠.

(٩٧٨) الیافعي: مراة الجنان وعبرة الیقظان في معرفة ما یعتبر من حوادث الزمان، وضع حواشیه خلیل المنصور، دار الکتب العلمیة، بیروت، ١٩٧٧، ٣٢٦/٢: (spuler) Bartold: The Muslim World, Translated by, F.R.C. Bagly,(Leiden,١٩٦٨)P١,١,p.٧٥.

خۆیانی تێدا قایم بکەن، سەرەنجام توانی بەسەریاندا زاڵ بێت.[٩٧٩] لە قۆناغی دووەمدا بەرەو باکوور و باکووری خۆرهەڵات بۆ وڵاتی براکەی میر (فخر الدولة) و میر حەسنەویەی کوردی پێشڕەوی کرد، بەنیازی تۆڵەسەندنەوە لێیان، لەسەر ئەوەی پشتگیری دوژمنەکەیان کە بەختیار بوو، لە کاتی ناکۆکیەکانیدا لەگەڵ بەختیاردا، بەڵام میر حەسنەویەی کوردی لە ساڵی (٣٦٩ک/٩٧٩ز)دا کۆچی دوایی کرد و کوڕەکانی پەرتەوازە بوون هەروەك پێشتر باسمانکرد.[٩٨٠]

کاتێك میر (عضد الدولة) لە ساڵی (٣٦٧ک/٩٧٧ز)دا (موصل)ی داگیرکرد، میر بادی کوردی بەهۆی سەرکردەی بوەیهی (زیار بن شهراکویه) ئامادەی لای (عضد الدولة) بوو، بەڵام باد لە هەیبەت و جەبەروتی (عضد الدولة) ترسا و هەڵات، (عضد الدولة) کەوتە سۆراخی و ویستی دەستگیری بکات، چونکە بە پیاوێکی (جوامێر و بەزەبر و شەڕکەری) دەزانی، بەڵام باد لە دەستی دەربازبوو و لە تیشە چیاکانی دیاربکر خۆی گرتەوە هەتا هێز و توانای پەیدا کردەوە.[٩٨١]

ئەوەی جێگەی ئاماژەیە ئەوەیە، (باد الکردي) کەسێکی خاوەن پێگە و دەسەڵاتێکی زۆر بوو لە نێوچەکانی دیاربکر و موصل بەر لەوەی (عضد الدولة) ئەو نێوچانە داگیر بکات و بیانخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بە دەلیلی ئەوەی وەك سەرۆك عەشیرەتێك ئامادەی قاپی (عضد الدولة) بوو لە موصل، ڕەنگە ویستبێتی ملکەچی خۆی بنوێنێت و پێوەندیی دیبلۆماسیی لەگەڵدا ببەستێت بۆ ئەوەی دەسەڵاتەکەی لە ناوچەکەدا لەدەست نەدات، یان (عضد الدولة) مەبەستی لە بانگهێشتنی بۆ ئەوە بووبێت کە بەلای خۆیدا بەکێشی بکات یاخود بۆ ئەوەی بە ئاسانی دەستگیری بکات، یاخود ئامادەبوونەکەی بەهۆی (زیار بن شهراکویه) بەڵگەیەك بووبێت لە بوونی پێوەندی پێشینە لە نێوان باد و بوەیهییەکاندا.

---

(٩٧٩) مسکویه: تجارب، ٢/٣٩٨– ٣٩٩؛ ابن الاثیر: الکامل، ٧/٩٩؛ امین زکي: خلاصة، ١٣٣.

(٩٨٠) مؤلف مجهول: مجمل التواریخ، ٣٩٤؛ ابن الاثیر: الکامل، ٧/ ١٠١.

(٩٨١) الروذراوري: ذیل تجارب الأمم، ٣/٨٤؛ ابن الاثیر: الکامل، ٧/ ١٢١.

دوای مردنی (عضد الدولة)ی بوەیهی، ڕەوشەکە بۆ میر (باد الکردی) لەبار بوو تـا ڕەهەندی دەسەڵاتی خۆی لە دیاربەکردا فراوان بکات، لەبەرئەوەی ئەو نێوچانە بەدەست بوەیهییەکانەوە بوو، بێگومان شـەڕ و پێکـدادان و جـەنگ و کوشـتار لـە نێوانیانـدا بەرپابووە، بەڵام باد ڕووبەڕووی کێشە و گـرفتی زۆر نەبۆتـەوە لەدەسـت بەسـەراگرتنی هەندێك لەو شارو ناوچانەدا، وەك شاری (ئەرجیش) دوای ئەو (ئامەد و میافـارقین) و گەلێ ناوچەی دیکە لە دیاربەکر کە لە ژێر دەستی بوەیهییەکانی دەرهێنا.[982]

هەروەها خەڵکی شاری (نصیبین) لە دژی والی بوەیهییەکان کە نـاوی (أبـو علـی الحسن بن بشر الراعي) بوو، ڕاپەڕینیان بەرپاکرد کە پیاوێکی زاڵە و ستەمکار بـوو، سوکایەتی بە هەموو بـەها پیرۆزەکـانی خـەڵکی ناوچـەکە دەکـرد، لـەو ڕاپەڕینـەدا خەڵکەکە توانیان والی بکوژن و یەکێك لە سەرکردەکانی کورد دەسـتی گـرت بەسـەر شارەکەدا کە زۆری نەخایاند پیشتیوانی خۆی بۆ مـیر بـادی کـوردی ڕاگەیانـد،[983] و شاری نصیبینی لکاند بە هەرێمی دەسەڵاتی بادەوە، ئیتر باد دەسـەڵاتی تـەواوی خـۆی بەسەر هەموو ناوچەکانی (دیاربەکر و جزیرە و نصیبین)دا سەپاند.[984]

بەم جۆرە دەبینین دەسەڵاتی باد لە نێوچەکەدا سەری هەڵدا، لـە میانـەی پێوەندیـە دوژمنکاریەکانی لەگەڵ بوەیهییەکاندا لە لایەك و پشتگیری خەڵکی سڤیلی ناوچـەکە لەلایەکی ترەوە، بۆیە سەرکردەی بوەیهی (أبو سعد بن بهرام بن أردشیر) بـە فـەرمانی میر (صمصام الدولة) بە لەشکر و سوپایەکی گەورەوە کەوتە ڕێ بۆ بەرەنگاربوونـەوەی باد و شەڕکردن لە گەڵیدا، شەڕ لە نێوانیاندا هەڵایسا، و بەشکستی سـوپای بـوەیهی

---

(٩٨٢) ابن الاثير: الكامل، ٧/ ١٢١ – ١٢٢ ؛ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ١٢١/٤.

(٩٨٣) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم، ٨٤/٣.

(٩٨٤) الفارقي: تاريخه، ٥١ – ٥٢.

کۆتایی پێهات وێڕای بەدیل گرتنی کۆمەڵێك لە هاوڕێ و کەسە نزیکـەکانی أبوسـعد لە دەیلەمیەکان.[985]

(باد) سەلماندی نەك هەر لەو جەنگاوەرە سـەرکەوتوانەیە کـە ناوبـەناوێك لـە دژی دەسەڵاتی بوەیهییەکان دەجەنگێن و بەس، بەڵکو کەسێکی خـاوەن نەسـەب و شـەرەف بوو، بەنیاز بوو دەسەڵاتێکی سیاسی لە ناوچەکەدا دابمەزرێنێت، مەترسی ئەو بۆ سـەر بوەیهییەکان زیادیکرد بەتایبەتی دوای ئەوەی ئاشکرای کرد کە نیازی گرتنی بەغـدا و لابردنی دەیلەمیەکانی هەیە، لەبەرئەوە میر (صمـصام الدولـة)ی بـوەیهی سـوپایەکی گەورەی پێکەوەنا و ئەنجارەیان (زیار بن شـهراکویە)ی دەستنیـشانکرد وەك سـەرکردەی ئەو لەشکرە، زیار کەوتە ڕێ بۆ جەنگ لە دژی میر باد، کاتێك لەشکری بوەیهی نزیـك بـۆوە میرّبـاد ڕێگـەی پێگـرتن و شـەڕ لـە نێوانیانـدا دەسـتی پێکـرد لـە سـاڵی (٣٧٤ك/٩٨٤ز)دا کە ئەو شەڕە کۆتایی پێهات باد شکستی هێناو، بەرەو دەوروبـەری باکووری موصل پاشەکشەی کرد، و ژمارەیەکی زۆر لە سەربازان و خزمـەکانی بـەدیل گیران و لە بەغدا سوکایەتیان پێکرا، و جارێکی دیکـە دەیلەمیـەکان (موصـل)یـان داگیر کردەوە.[986]

دوای ئەوە زیار ویستی ڕەگ و ڕیشەی باد لـە ناوچـەکەدا هەڵکێـشێت، لەبەرئـەوە بڕیاریدا دوو سوپا بنێرێت تا شوێنیان کەوێت، سـوپایەکیان بەسـەرکردایەتی (سـعد الحاجب) لە ڕێگەی جزیرەی (إبن عمر)ەوە، و ئەوی تریان بەسەرکردایەتی (شکر الخادم) لە ڕێگەی نصیبینەوە، بـەڵام ئـەنجارەیان سـوپای بـوەیهی گوێیـان بـە فەرمانـەکانی سەرکردەکانیان نەدا و قایل نەبوون پێشڕەوی بکەن و لەگەڵ باد بجەنگن، وادیاربوو لـە هەوڵی ئەوەدا بوون خۆیان بەدوور بگرن لە شەڕ لەگەڵ میر باد دا، دوای هەوڵێکی زۆر (سـعد الحاجـب) پـەنای بـردە بـەر سـازدانی پیلانێـك بـۆ تـیرۆر (بـزرە کـوڕی —

---

(٩٨٥) الـروذراوري: ذيـل، ٨٤/٣ ؛ابـن الاثـير: الكامـل، ١٢١/٧–١٢٢ : ابـن خلـدون: التـاريخ، ٩٧٧/٥/٤.

(٩٨٦) الروذراوري: ذيل تجارب الأمم، ٨٦/٣؛ ابن الاثير: الكامل، ١٢٣/٧.

إغتيال)كردنی باد، بۆ ئەو مەبەستە پیاوێکی مزیدودا و چووە ناو چادری میر باد لە شەودا و شمشێرێکی لێدا، بەڵام لاقی برینداربوو زۆری نەمابوو بەسوێی ئەو لاقە برینداره‌یه‌وه بمرێت، ئینجا دوای ماوەیەك چاکبۆوە، دوای ئەوەی بوەیهییەکان لەسەرجەم پیلان و فرت و فێڵەکانیان شکستیان خوارد و نەیانتوانی لە ناوچەکەدا دەسەڵاتیان پێ لەق بکەن، بەناچاری پەنایان بۆ دانوستاند و ئاشتبوونەوە برد.[987]

کاتێك میر (شرف الدولة)ی بوەیهی عیراقی داگیرکرد و (صمصام الدولة)ی دەستگیر کرد و جێگەی ئەوی لە دەسەڵاتدا گرتەوە، لە ساڵی (376 ك/986ز)دا یەکەم جوڵانەوەی لە ناوچەکەدا، هێرشکردنە سەر میر (بدر بن حسنویه) بوو، چونکە چووبووە پاڵ مامی میر (فخر الدولة) و یەکێك بوو لە پشتیوانانی ئەمەش لەبەرئەوەی پێوەندیی میر (شرف الدولة) پێوەندیەکی گرژ و ئاڵۆز بووە لەگەڵ مامیدا میر (فخر الدولة)، هەر لەو کاتەوەی میر (فخر الدولة) دەسەڵاتی لە (الري و أصبهان) گرتە دەست لە ساڵی (373ك/983ز)، گەلێك ناکۆکی و دوژمنایەتی کەوتۆتە نێوانیان، و هەر یەکێکیان کینە و شەڕی لە دڵیدا حەشار دابوو لە دژی ئەوەکەی تریان،[988] دوور نیە ئەو پێوەندیە باشەی میر (صمصام الدولة) کە دوژمنی ڕاستەقینەی (شرف الدولة) بوو لەگەڵ هەر یەکێك لە میر بدر و میر (فخر الدولة) هەیبوو، گرنگترینی ئەو هۆکارانە بووبێ کە وای کرد (شرف الدولة) هێرش بکاتە سەر میر بدر، چونکە بە هاوڕێی دوژمنەکەی دانابوو، بە دەلیلی ئەوەی میر (صمصام الدولة) کاتێك ساڵی (376ك/986ز) لە لایەن هێزەکانی میر (شرف الدولة)ەوە هەراسانکرا هەندێ لە هاوەڵەکانی ڕێنماییان کرد کە پەنا بۆ وڵاتی میر (بدر بن حسنویه) بەرێت بۆ ئەوەی

---

(987) الروذراوري: هـ. س، 3/86 – 87؛ ابن الأثير: هـ. س، 7/ 123؛ ابن العبري: تاريخ مختصر الدول، 172؛ عبد الرقيب يوسف: الدولة الدوستكية، 1/ 96 – 99.

(988) ابن الاثير: الكامل، 7/ 118.

نامەیەك بنووسێت بۆ مامی میر (فخر الدولة) و داوای یارمەتی لێبکات.[(٩٨٩)]

ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە پێوەندیی میر (صمصام الدولة) پێوەندیەکی بەهێز بووە لەگەڵ میر (بدر حسنویە)دا. میر (شرف الدولة) سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر میر بدر، سەرکردایەتی ئەو سوپایەشی بەسەر تیپی سوپاکەی (قراتکین الجهشیاری) سپارد، مەبەستی میر (شرف الدولة) لە پشتی ئەو هێرشە، یەك لەو دوو مەسەلەیە بوو: یان رزگاربوون لە دەست میر بدر ئەگەر قراتکین سەرکەوت بەسەریدا، یان رزگاربوون لە دەست قراتکینی سەرکردەکەی ئەگەر میر بدر سەرکەوت بەسەریدا. چونکە میر (شرف الدولة) مەترسی لە زیادبوونی دەسەڵاتی سەرکردەی ناوبراو هەبوو، چونکە خەریکبوو دەست بخاتە نێو ئیشوکاری دەوڵەتەکەیەوە. بۆیە (شرف الدولة) ویستی بەم شێوەیە لە خۆی دوور بخاتەوە و ئاسودە بێت.

شەر لە نێوان هەردوو لەشکرا لە نزیك (قرمسین)ساڵی (٣٧٧ك/٩٨٧ز) هەڵایسا، لە سەرەتادا میر بدر شکا و پاشەکشەی کرد، سوپای قراتکین وایانزانی جەنگیان بردەوە، و شوێن لەشکرەکەی بدر نەکەوتن، لە وڵاخەکانیان دابەزین، دوای ئەوە سەعاتێکی پێنەچوو میر بدر هێرشێکی کتوپڕی کردنە سەر بەجۆرێك فریانەکەوتن سواری وڵاخەکانیان بن، سوپای میر بدر سەرکەوت بەسەریاندا و کوشتارێکی زۆری لێکردن. قراتکین و هەندێ لە هاوڕێکانی دەربازبوون و هەڵاتن و بەسەر شۆڕی خۆیان کردەوە بە بەغدادا.[(٩٩٠)]

لە ساڵی (٣٧٧ك/ ٩٨٧ز)دا پێوەندیی میر (باد الکردی) لەگەڵ بوەیهییەکان جارێکی دیکە بە ئاراستەیەکی خراپدا تێپەڕی، دوای ئەوەی ماوەیەکی باش پێوەندیی هەردوولا جۆرێك لە ئارامی و سەقامگیری بەخۆوە بینی کە ماوەی سێ ساڵی خایاند،

---

(٩٨٩) الروذراوری: ذیل تجارب الأمم، ١٢٩/٣، ابن الاثیر: الكامل، ١٣٠/٧ ؛ حسام الدین علی غالب: الكرد، ص١٤٧.

(٩٩٠) الروذراوری: ذیل تجارب الأمم، ٣/ ١٣٩-١٤٠ : ابن الجوزي: المنتظم، ١٣٦/٧؛ ابن الأثیر: الكامل، ١٣٢/٧-١٣٣.

بەهۆی ئەو پەیماننامەیەی کە لە نێوان هەردوولادا مۆرکرا لە ساڵی (٣٧٤ك/٩٨٤ز)،[991] بەڵام لە دوای مردنی سەرکردەی بوەیهییەکان (سعد الحاجب) میر باد الکردی جارێکی دیکە لە هەوڵیدابوو کە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی لە ناوچەکەدا فراوان بکات، بۆیە دەستی کرد بە جموجۆڵی سەربازی، ئەمەش بوو بە جێگەی نیگەرانی و دڵەڕاوکێ لەلای بوەیهییەکان.[992]

میر (شرف الدولة)ی بوەیهی سەرکردە (أبو نصر خواشاذ)ی نارده سەر موصل و سوپایەکی باشی بۆ ئامادەکرد، میر باد لەو ماوەیەدا توانی دەست بگرێت بەسەر (طور عابدین)دا، (أبو نصر) هەوڵیدا بەرە و نصیبین بەڕێ بکەوێ لەوێ لە دژی باد جەنگ بەرپا بکات، بەڵام دیار بوو متمانەی تەواوی بە توانای سوپاکەی نەبوو، لەبەرامبەر سوپای میر باددا، لەوە دەترسا کە چارەنووسی ئەویش وەك چارەنووسی هەردوو سەرکردە (أبو سعد بهرام إبن أردشیر) و(أبو القاسم سعد بن محمد الحاجب)ی لێبێت کە پێشتر لەسەر دەستی میر باد بەسەریان هات. بۆیە (أبو نصر) کەوتە نامە ناردن بۆ بەغدا بۆ ئەوەی سەرباز و پارە و زەخیرەی بۆ ڕەوانە بکرێت، بەڵام ئەو پێداویستیانەی داوای کردبوو دواکەوت، ئەمەش وای لێکرد پەنا بەرێتە بەر بەخشینی زەوی و زار بە عەرەبی (بنو عقیل) لەو ناوچانەی دەکەونە بەرامبەر باد بۆ ئەوەی سۆز و عاتیفەیان بەلای خۆیدا ڕاکێشێت و ڕێگەش لە فراوانبوونی دەسەڵاتی باد لەو ناوچانەدا بگرێت.[993]

لە بەرامبەر ئەوەدا دەبینین میر بادی کوردی پەنای بۆ تەکتیکێکی جەنگی برد بۆ تۆقاندنی سوپای بوەیهی، (الروذراوری) بەم ناونیشانەوە دەیگێڕێتەوە:

"باسکردنی تەکتیك کە باد ئەنجامیدا هەر کەس چاوی پێکەوتبایە لە ترسانا توشی شۆك دەبوو"، (باد) ژمارەیەکی زۆری لە مانگا هێنا و لەسەر چیاکان بەڕیز

---

(٩٩١) الروذراوری: ذیل تجارب الأمم، ٣/٨٦-٨٧؛ابن الأثیر:الکامل،١٢٣/٧: انور المائي: الاکراد في بهدینان، ١٠٦.

(٩٩٢) ابن الاثیر: الکامل، ١٣٣/٧.

(٩٩٣) الروذرواري: ذیل تجارب، ١٤٣/٣؛ ابن الاثیر: الکامل،١٣٣/٧.

ڕایگرتن، و هەندێ لە پیاوەکانیشی لە نێوانیان دانا بە شمشێرەکانیان و ڕمەکانیانەوە بۆ ئەوەی دەوشانەوە یان بە ئاڕاستەی دوژمن دابنوێنێت کە سوپایەکی یەکجار زۆری ئامادەی هێرش کردنە سەریان تەییار کردووە، بەمەش وورەی دوژمنی پێ دەڕوخێنێ.[994]

لە هەنگاوێکی دیکەیدا باد براکەی (أبو الفوارس بن دوستك)ی نارد بۆ شەڕی دوژمنەکانی، بەڵام شکستی هێنا و لەو شەڕەدا کوژرا، ئیتر هەردوولا بۆ ماوەیەك بەرامبەر بەیەك وەستان، هەتا میر (شرف الدولة) مرد، خواشاذە هەواڵی مردنەکەی ئاشکرا نەکرد و گەڕایەوە بۆ موصل و لەوێ هەواڵی مردنەکەی ئاشکرا کرد، لەو لاشەوە میر باد ناوچە شاخاویەکانی خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.[995]

لەبەرئەوەی میر (شرف الدولة)ی بوەیهی ساڵی (٣٧٩ك/٩٨٩ز) کۆچی دوایی کرد و ئەو ڕووداوانەش کە پێوەندیان بەو ڕووبەڕووبوونەوە هەیە و لە سەرچاوەکاندا و لە چوارچێوەی ڕووداوەکانی ساڵی (٣٧٧ك/٩٨٧ز)دا هاتووە، لەبەرئەوە ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان هەردوولادا ماوەی دوو ساڵ بەردەوام بوو بێ ئەوەی شەڕێکی یەکلاکەرەوەی چارەنووسساز لە نێوانیاندا بەرپا بێت. پێدەچێ (أبو نصر خواشاذە) لەو ماوەیەدا هیچ هێرشێکی نەکردبێتە سەر میر (باد)، بەڵکو هەوڵیداوە هێڵێکی بەرگری لە عەرەبەکانی (بنو عقيل) وەك ناوبڕێك لە نێوان خۆیی و لە نێوان میر باددا درووست بکات، بەتایبەت دوای ئەوەی هیچ کەرەسە و تفاقی پێویستی بۆ هێرشکردنە سەر باد بەدەست نەگەیشت، دوای ئەوەی کە (أبو الفتح محمد بن عناز) لە ساڵی (٤٠١ك/١٠١٠ز)دا کۆچی دوایی کرد، حوکمڕانی میرنشینی عەنازیە کەوتە دەست

---

(٩٩٤) ذيل تجارب الأمم، ٣/ ١٤٤.

(٩٩٥) الروذرواري: ذيل تجارب الأمم، ١٤٥/٣؛ الكامل، ١٣٣/٧-١٣٤ : ابن خلدون: التاريخ،٤/٥/٩٧٨ ٩٧٩.

